# ساڵێک لەگەڵ ئەبووزولەدا

ئەندامی پێشووی بزووتنەوەی ئیسلامی و ئەنسارولئیسلام

ئامادەکردنی
موختار هووشمەند

2012/2011ی زایینی



# ساڵێك لەگەڵ ئەبوو زەکەریا
# ئەندامی پێشووی بزووتنەوەی ئیسلامی و ئەنسارولئیسلا

ئامادەکردنی: موختار هووشمەند

٢٠١٢/٢٠١١

ناوی کتێب: سالێك لەگەڵ ئەبو زەکەریا
ئامادەکردنی : موختار هۆشمەند
سالی: 2011- 2012
تیراژ: 500دانــە
ژمارەی سپاردنی ( 1782) ی سالی 2014ی پێدراوە

پێشەکی: ئیسلامی سیاسی یەك لەو چەمکە گرنگ و هەستیارانەیە کە لە کاتی دەرکەوتنیەوە تاکوو ئێستا هۆکاری دروستبوونی چەندین گرووپ و ڕێکخراو بووە. ئەم چەمکە وەك ئایدۆلۆژیا گەلێ پان و بەربڵاوەو ڕەهەند و ڕێچکەی جۆراوجۆری لە خۆی گرتووەو هەر کام لەم ڕەهەند و ڕێچکانەش بە شێوازێك یان لە شکڵی ئۆرگان و ڕێکخراوێکی تایبەت و دیاریکراودا هەوڵی بە کردەوەییکردنی مەرام و مەبەستە ئایینی و ڕێکخراوەییەکانی خۆیان ئەدەن. ئەمڕۆکە چالاکیی هەندێ لەم گرووپانە سنووری هەرێمییەکانی تێپەڕاندووەو لە بەشێکی زۆری وڵاتان و ناوچەکانی جیهاندا لە شکڵی کاری توندوتیژی یان تەبلیغ و بانگەشەدا بەرجەستە بۆتەوە. توندوتیژی گرووپ و ڕێکخراوە ڕادیکاڵە ئیسلامییەکان بۆتە هەڕەشە بۆسەر هێمن ترین وڵاتانی جیهان و ڕەوشی ئەمنیی ئەم وڵاتانەی بەرەو ئاڵۆزی بردووە. کوردستان یەك لەو وڵاتانەیە کە ساڵانێکی دوور و درێژە ئیسلامی سیاسی هەم وەك فیکرەو هەمیش وەك ڕێکخراو تیایدا سەری هەڵداوە، بە واتایەکی تر بزاڤی ئیسلامخوازیی لە کوردستان مێژوویەکی چەندین ساڵەی هەیەو ئەم بزاڤە لە ماوەی ساڵانی ڕابردوودا گەلێك ئاڵوگۆڕی بەخۆیەوە بینیوە. هەنووکە هەموو ڕەوت و ڕەهەندەکانی ئیسلامی سیاسی –ئیسلامی میانەڕەو و ڕادیکاڵ– چ وەك فیکرەو چ وەك ئۆرگان و ڕێکخراو، لە کوردستاندا بوونیان هەیەو هەرکام لەم ڕەوت و ڕێکخراوانە خاوەن پێگەو جەماوەری تایبەتی خۆیانن. بۆیە پێویستە لایەنە جۆراوجۆرەکانی ئیسلامی سیاسی شی بکەینەوەو بە ئاگایی و شارەزاییەکی زیاترەوە بڕوانینە ئەو گرووپ و ڕێکخراوانەی کە ئەکەونە بازنەی ئەمجۆرە ئیسلامەوە. بەو مەبەستە وتووێژێکی تایبەتمان لەگەڵ چالاکێکی دێرینی ئەم بوارە لە کوردستان، پێکهێناوە کە بە هۆی ئەندامبوونی لە ڕێکخراوە جۆراوجۆرە ئیسلامییەکانداو ئەو شارەزایی و ئەزموونانەی لە ماوەی چەندین ساڵ چالاکیی ڕێکخراوەییدا بە دەستی هێناوە، بە شێوەیەکی ورد و سەرنجراکێش وەڵامی پرسیارەکانمان ئەداتەوە.

ئەم وتووێژە لە یەکێك لە زیندانەکانی ئێراندا بە شێوەی نهێنی و لەوپەڕی بێ ئیمکاناتیدا ئەنجام دراوەو ڕەنگە کەم و کورتی زۆری پێوە دیار بێ. لە ڕاستیدا لە کەش و هەوای ئەمنییەتی زیندانەدا کە نووسینی چەند دێڕ نووسراوەی ئاسایی تاوانەو دەبێتە هۆی درووستبوونی گرفت و کێشە بۆ هەر بەندییەك –بە تایبەت بۆ کەسێك کە بە هۆکاری سیاسییەوە گیرابێ– ئەنجامدانی وتووێژێکی دوورودرێژی ئاوا، پڕ زەحمەت و مەترسیدارە بەڵام پێویستیی ئەنجامدانی ئەم وتووێژە هەم ئێمەو هەمیش ئەبوو زەکەریای هێنایە سەر ئەو باوەڕە تاکوو بە بێ هیچ ترس و دوودڵییەك ئەنجامی بدەین. هەرچەند وتووێژەکە لە لایەن من و هاوڕێیەکی زیندانییەوە ئەنجام دراو قورسایی کارەکە لە سەر شانی ئێمە بوو بەڵام ئەگەر یارمەتی و هاوکاری چەند زیندانییەك نەبووایە ئەنجامدانی ئەمکارە بە تەنیایی مومکین نەبوو. بۆیە جێگای خۆیەتی سوپاسی زەحمەت و ماندووبوونی هەموویان بکەم بە تایبەت ئەو برادەرەی لە خولی یەکەمی وتووێژەکەدا لەگەڵم بوو. بەداخەوە لە بەر هۆکاری ئەمنی و لە سەر داوای خۆیان ناتوانم ناوی ئەو کەسانە بهێنم و بە نیسبەت ئەبوو زەکەریایشەوە کە تاکوو ئێستا لە زینداندایە، لە سەر داوای خۆی لە هێنانی ناوی ڕاستەقینەی ئەو خۆم دەبوێرم. هەروەها پێویستە داوای لێبووردنی لێ بکەم کە نەمتوانی دەقی وتووێژەکەی بە تایپکراوی بۆ بنێرمەوە ناو زیندان تاکوو پێش چاپکران و بڵاوبوونەوە، بیخوێنێتەوەو دوایین تێبینی خۆیی لە سەر بدات. بۆیە دڵنیای ئەکەمەوە بەوپەڕی ئەمانەت و هەستیارییەوە نووسینەکانی ئەوم تایپ کردووەو جگە لە کورتکردنەوەو دەستکاری کردنێکی سنووورداری زمانەکەی، لە باری مەفهوومییەوە هیچ دەستێوەردانێکم تیایدا نەکردووە.

ئەم کتێبە لە شکڵی وتووێژێکی دوورودرێژدا ئەنجامدراوە بەڵام چونکوو لە ڕووی مەفهوومییەوە (وتووێژ) کورت و سنووورداره بۆیە بە باشم زانی ناوی کتێبەکە بنێم (ساڵێك لەگەڵ ئەبوو زەکەریا). بە درێژایی وتووێژەکە هەوڵمان داوە بە بێ لایەنگری کردن لە فیکرە یاخود لایەن و ڕێکخراوێك، پرسیار ئاراستەی ئەبوو زەکەریا بکەین و ئەگەر لە شوێنێکیشدا تێکگیران و دژبەرییەك لە نێوان ئێمەو ئەودا هاتبێتە ئاراوە، مەبەست لێی باشتر دەرخستنی ڕاستییەکان و ڕەواندنەوەی گومانەکان بووە. هەرچەند بە هۆی شوێن و شێوازی ئەنجامدانیەوە، ئەم وتووێژە کەم و کورتییەکی زۆری

پێوە دیارە بەڵام هیوادارم توانیبێتمان زانیاری پێویست ببەخشینە خوێنەر و وەڵامی بەشێك لە پرسیارەكانی ئەومان دابێتەوە.

بەو هیوایە
موختار هووشمەند
٤ی ئەیاری ٢٠١٣ی زایینی

**پرسیارکردن لەو ڕێباز و ڕوانگە ئیسلامییەی بە «سەلەفییەت» ناسراوە پێویستی بە دیدێکی مێژوویی‌یە، هەر بۆیە بۆ دەسپێکردنی ئەم باسە باشتر وایە ڕەوتێکی مێژوویی بگرینەبەر و لە سەرەتاکان بڕوانین. جەنابت دەسپێکی ئەو هەوڵانەی بە ژیاندنەوەی بیری ئیسلامی یان (الاحیاء الفکر الاسلامیە) ناوبانگی دەرکردووە، دەگەڕێنیتەوە بۆ کێ و کام سەردەم و قۆناغ؟ بۆیە ئەم پرسیارە دەپرسین چونکوو پێمان وایە سەلەفییەتیش بەشێکە لە بەرهەم و ئایینزاکانی بزووتنەوەی بووژاندنەوەی بیری ئیسلامی و ئەمانەوێ بەم شێوەیە لە واتاو مانای خودی سەلەف و سەلەفییەتیش بگەین.**

(الحمدالله و الصلاة السلام علی رسوله الأ◌مین و علی اله و اصحابه الطیبین الطاهرین) پێش هەر شتێك پێویستە ئاماژە بەو حەقیقەتە بکەم کە کردنەوەی دەرگای ئاوا باسێك هەستێکی گەورەی بەرپرسیارێتیم لا ئەورووژێنێ چوونکوو لەمبارەیەوە گەلێك لێکۆڵینەوە کراوەو گەلێ بیرمەند و مامۆستا قسەیان لەسەر کردووەو پێم وا نییە وتەکانی من دڵۆپێکی تر بەو دەریا مەزنە زیاد بکات. سەرباری ئەوەش هەوڵ ئەدەم بە پێی توانام تیشك بخەمە سەر هەندێ لایەنی ئاشکراو شاراوەی مێژووی بیروباوەڕی ئیسلامخوازی. بەلاَم بە پێچەوانەی ئێوە من ناموەێ ناوی (الاحیاء الفکر الاسلامیە)ی بۆ بەکار بهێنم چونکوو لەو باوەڕەدام ئیسلام و ئیسلامیبوون نەك زادەی بیرکردنەوە نییە بەڵکوو وەك ڕووناکییەك وایە کە خوای گەورە بە مەبەستی ڕێنمایی و هیدایەتیان خەڵاتی ئەو مرۆڤانەی کردووە کە شایستەن. بەڵگەیشم بۆ ئەم قسەیە واتە بۆ ئەوەی کە ئیسلام ڕێنماییە، ئەوەیە کە خوای گەورە لە ئایەتی ٥٦ی سوورەی (القصص)دا ئەفەرموێ: (إنك لا تهدی من اجببت ول◌کن الله یهدی من یشاء و هو أعلم بالمهتدین). بۆیە لە باتی وشەی بووژانەوە یان (الحیاء ) دەستەواژەی (تەشەنەکردن) بەکار ئەهێنم. لە ڕاستیشدا ئیسلام و ئیسلامیبوون لە ساتەوەختی پەیدابوون و هاتنە سەر زەوییەوە، لە تەشەنەکردندا بووە نەك ئەوەی لە هەلومەرج و سەردەمێکدا تووشی فەوتان یاخود نیوەفەوتان بووبێت و پاشان سەری هەڵدابێتەوە. کەواتە ئەوەی لە درێژەداو لە وەلاَمی پرسیارەکانی ئێوەدا ئەیڵێم تیشك خستنە سەر مێژووی تەشەنەکردنی جموجووڵی ئیسلامییە نەك (الاحیاء الفکر الاسلامیە). جا هەرچەند من خۆم بە سوارچاکێکی لێهاتووی ئەم مەیدانە نازانم بەلاَم هیواخوازم بتوانم بەم وتووێژە خشتێك لەسەر ئەو دیوارە دابنێم کە ناوی مێژووی سەرهەڵدان و تەشەنەکردنی جموجووڵی ئیسلامییە.

وەکوومێژووی ئایینی ئیسلام، هەموو شتێك باسکراوەو بە هەزاران نووسراوەو سەرچاوە لە بەردەستدان کە باس لە هاتنی ئیسلام و تەشەنەکردن و جێگیربوونی ئەم ئایینە لە ڕووی زەویدا ئەکەن. بەڕای زۆرێك لە بیرمەندان و خاوەن ڕایان، سەردەمی پێغەمبەری ئیسلام و هاوەلاَنی بە سەردەمی زێڕینی دەسەلاَتداری ئیسلامی لە تەمەنی هەزار و چەند سەد ساڵەی ئەم ئایینەدا دائەنرێت. هەر کەسێکی موسوڵمان کە جارێك پێغەمبەری (درودی خوای لێ بێ) بینیبێ بە هاوەڵ دێتە ئەژمار و ئەم هاوەلاَنەش تا کاتی مردنی دوایەمین کەسیان بە جیلی یەکەمی ئەو سەردەمە زێڕینە حیساب ئەکرێن و جیلی دووهەمی ئەو سەردەمە زێڕینەش بەو کەسانە ئەوترێ کە بە لانی کەمەوە هیچ نەبێ جارێك یەك هاوەڵ یان سەحابەیەکی پێغەمبەریان بینیبێ. ئەم جیلە پێیان ئەوترێ «تابیعی». ئەوان تا ئاوابوونی تەمەنی دوایەمین کەسیان، بەشێکی ئەو قۆناغە زێڕینە واتە قۆناغی دەسەلاَتداریی ئیسلامییان بۆخۆیان تەرخان کردووەو تیایدا خزمەتیان بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام کردووە. پاشان هەر کەس بە موسوڵمانی بەلانی کەمەوە جارێك لە تەمەنیا دانەیەك لەم «تابیعی»یانەی بینیبێ، بە «تابیعی تابیعی» ناو ئەبرێت. دواتر زانایان و بیرمەندانی ئیسلامی سەحابەو تابیعی و تابیعی تابیعیەکانیان کردۆتە سەرمەشقی خۆیان بۆ فێربوونی ئەحکامەکان چونکوو هەروەك لە سەرەوە ئاماژەم پێکرد

ئەو سێ جیلە لە هەموو کەس زیاتر لە پێغەمبەری ئیسلامەوە نزیکن. لە سەرمەزهەبە گەورەکان تەنیا «ئەبوو حەنیفە» (سرووەی خوای لێ بێ) تابیعی تابیعی بووە کە حەوت (تابیعی) بینیوەو زۆر دڵی بە بینینی ئەوان خۆش بووە.

بەڵام لە مێژووی ئەم سێ جیلە بەدواوە هەر کەس و زانایەك چ لە نووسراوەکانیدا چ لە رێڕەوی ژیانیدا پێڕەویی لە رایەکانی ئەوانەوە کردبێت، ناو و مۆرکێکی تایبەتی بۆخۆی دەستەبەر کردووەو پێی وتراوە «سەلەف». هەرچی مێژووش بەرەوپێش بڕوات ئەوا پێناسەو بۆچوونی جیاجیا بە نیسبەت سەلەفییەتەوە دێتە ئاراوە بەڵام هەر ناوێکی پێوە بلکێندرێت و هەر پێناسەیەکی بۆ بکرێت هیچ لە ماناکەی کەم ناکاتەوەو هیچ ئاڵوگۆڕێك لە مەفهوومەکەیدا دروست ناکات. سەلەف و سەلەفییەت بە گشتی هەوڵی گێڕانەوەی خەڵك و کۆمەڵگا بۆ ئەو قۆناغە زێڕینە ئەدەن و لەم پێناوەشدا بەشێکی زۆری تەشەنەکردن و پەرەسەندنی ئەو جموجووڵە ئیسلامییەی لە ساڵان و سەدەکانی رابردوودا بە تایبەت لەم دواییانەدا شاهیدی بووین، لە سەر شانی سەلەفییەکان بە تایبەت سەلەفییەتی جیهادی بەڕێوە چووەو ئەچێت.

**ئیستە پرسیار ئەوەیە ئاخۆ نووسینەوەو تۆمارکردنی قورئان یاخود شەڕە یەك لەدوای یەکەکانی سەدەکانی یەکەم لە نێوان خودی موسوڵمانان و لە نێوان ئەوان و ناموسوڵماناندا، یان فتووحاتی ئیسلامی چ پێوەندییەکیان هەیە بە دەرکەوتنی بیری سەلەفییەتەوە. چونکوو لە نێو موسوڵماناندا بە دەیان بۆچوون و مەزهەبی جیاجیامان هەیەو سەلەفییەت تەنیا یەکێکە لەو دەریا بێشومارە. واتە ئایا ئەتوانین بڵێین جیاوازیی بیروڕاکان لەسەر پەیامی خودا، بووە بەهۆی دروستبوونی بیری سەلەف یان کەوتنە بەر مەترسیی دەسەڵاتی ئیسلامی هۆکاری ئەم بابەتە بوو؟**

ئەم پرسیارە دوو باسی گرنگی تیادایە، یەکەم تۆمارکردنی قورئان کە بەربەستی دانا لە رێگەی پەرتەوازە بوون و جیاوازیی بیروڕاکان. دووهەم شەڕی نێوان موسوڵمانان و میللەتانی ناموسوڵمان و فتووحاتی ئیسلامی کە مێژووەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ جەنگە سەرەتاییەکانی دوای دامەزراندنی دەوڵەتی مەدینە لە لایەن خودی پێغەمبەرەوە (سرووەی خوای لێ بێ)، وەك سەرایاکانی و غەزاکانی بەدر و ئوحود و ....هتد. دەربارەی پێوەندیشیان بە بیری سەلەفییەتەوە ئەبێ بڵێم ئێمەی ئوممەتی ئیسلامی بەهۆی ئەو دەرووەی کە خوای گەورە لێمانی کردۆتەوە توانیمان بە سەربەرزی و سەرکەوتوویی خۆمان لە ناو گێژاوی ئەو هەموو تەنگ و چەڵەمەو گرفتانە بکێشینە دەرەوە کە لە سەرەتای جێگیربوون و چەسپانی پەیامە ئاسمانییەکەدا لە سەر زەوی، تووشمان بوو. سەلەفییەتیش هیچ گرێکوێرەیەکی دروست نەکردووە کە ئیمکانی کردنەوەی نەبێت بەڵکوو درێژەدەری هەمان رەوت و رێچکە بووە. لە وەڵامی پرسیاری پێشوودا باسی سەلەف و سەلەفیم بۆ کردن، لە رووی زمانەوانییەوە سەلەف بە مانای «پێش»ە و بەو کەسەش ئەوترێ سەلەف کە پێشتر ژیاوە، لە ئەدەبیاتی سەلەفییەتدا مەبەست لە (پێشتر) هەمان سەردەمی زێڕینی دەسەڵاتداریی ئیسلامە. بە واتایەکی تر بەو کەسانە ئەوترێ سەلەف کە هەوڵی گەڕانەوە بۆلای ئەو سەردەمە زێڕینە ئەدەن.

لە رووی مێژووییەوە سەرەتای سەلەفییەت و بەکارهێنانی بیری سەلەف ئەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای سەدەی شەشەمی کۆچی واتە سەردەمی «ئبن تەیمییە» (رەحمەتی خوای لێ بێ). لەو سەردەمەدا ئەگەری بەکاربردنی (یاسا)کەی چەنگیزخانی مەغۆل لە ناو عالەمی ئیسلامیدا مشتومڕێکی زۆری خستبووە نێوان موسوڵمانانەوە و مشتوومڕەکەش زیاتر لەسەر ئەوە بوو کە تا چەند و چۆناوچۆن ئەتوانن کار بەو یاسایە بکەن و......، لێرەوە کۆدەنگییەك لە نێوان زانایانی ئیسلامییدا دروست بوو کە باسی لە پێویستی گەڕانەوە بۆ دەقی ئایینی و ئەسڵەکان و سەرەتاکانی دەسەڵاتداریی ئیسلامی ئەکرد. لەو قۆناغەدا ناوی ئبن تەیمییە زیاتر بەرجەستە بوویەوەو هۆکاری ئەمەش ئەوە بوو کە ئەو لە ناو جەرگەی گومان و جەنگ و جیهاد و کێشەکەدا بە نووسراوەو وتارەکانی خۆی هەوڵی رەواندنەوەی گومانەکان و

گەڕانەوە بۆسەر ئەسڵە ڕاستەقینەکانی دا. بەڵام سەرهەڵدانی تەوژمی سەلەفییەت لە عالەمی ئیسلامی و ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی «موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب»، ئەم سەرهەڵدانە لە نیوەدوورگەی عەرەبی یان سعوودییەی ئێستاداولە ناوەڕاستی سەردەمی دەسەڵاتداریی عوسمانییەکانەوە دەستی پێ کرد. بە هۆی ناکۆکی و جیاوازی نێوانیانەوە، عوسمانییەکان موحەممەد عەلی پاشای میسریان ڕاسپارد تاکوو دەست بداتە سەرکوتکردنی سەلەفییەکانی سعوودییەو ئەوانەی پێڕەو و شوێنکەوتووی موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب بوون.

بە نیسبەت ئەو بەشەی پرسیارەکەیشتانەوە کە وتووتانە ئایا دروستبوونی سەلەفییەت هۆکارێك بووە بۆ کەوتنە بەر مەترسی دەسەڵاتی ئیسلامی، بەڕای من پاش پێغەمبەری ئیسلام (درودی خوای لێ بێ)، دەسەڵاتی ئیسلامی سێجار کەوتۆتە بەر هەڕەشەی لەناو چوونەوە. یەکەم، کەوتنە بەر هەڕەشەی هەڵگەڕاوەو لە ڕێگا دەرچووان لە سەردەمی ئەبووبەکری سدیقدا (خوای لێ ڕازی بێ). دووهەم، هێرشی تەتەر و مەغۆل لە سەردەمی ئبن تەیمییەدا. سێهەم، ڕووخانی دەسەڵاتی عوسمانی پاش شەڕی یەکەمی جیهانی. هەرچەند چەندەها ڕووداوی مەترسیداری تریشمان بووە – شەهیدبوونی خەلیفەی سێهەم و کێشەی نێوان عێراق و شام یان شەڕە گەورەکانی نێوان ڕۆم و موسوڵمانان و دواتر شەڕی نێوان خاچپەرستان و موسوڵمانان و هتد– بەڵام تەنیا لەو سێ جارەدا کە باسم کرد ئەگەر و مەترسی لێکترازانی هەمە لایەنەو تەواوەتی دەسەڵاتی ئیسلامی هەبووەو لە نموونەکانی تردا سەرباری گەورەیی قەبارەی قەیرانەکان و دژواریی گرفتەکان، کەم تا زۆر دەسەڵات هەر لە دەست موسوڵماناندا ماوەتەوە.

لەم سێ قۆناغە هەستیارەدا جڵەوی هەوڵەکان بۆ گەڕاندنەوەی ئەو سەربەرزی و دەسەڵاتەی لە موسوڵمانان زەوت کرابوو بە دەست سەلەفییەتەوە نەبوو؛ بە واتایەکی تر لەو سەردەمانەدا خەڵکی بەو ئاستە نەبوونەتە سەلەفی کە هەوڵی گەیشتنەوە بە سەروەری و دەسەڵاتی لە دەستچوو بدەن یان داکۆکی و بەرگری لەو دەسەڵاتانەوە بکەن کە بە دەستیانەوە مابوو. تەنانەت لە سەرەتای سەردەمی موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهابیشدا کە سەلەفییەت وەك تەوژم و دەستەیەکی ناسراو دەرکەوتبوو، عەبدولوەهاب و شوێنکەوتووەکانی هێشتا بیروباوەڕی خۆیان بە تەواوی نەکردبووە هەوێنی دەسەڵاتێکی تۆکمەی ئیسلامییانە.

وەکوو دوایین بڕگەی وەڵامی ئەم پرسیارە ئەتوانم بڵێم: هەرکات مەترسی لەکار خستن، دواخستن یان (تەقلیل) کردن لە چوارچێوەی بنەما سەرەکییەکانی ئیسلام و شەرعی خوای گەورەدا بێتە ئاراوە ئەوا گروپێك خەڵکی موسلیح و ئەهلی ئیسلام هەوڵی ڕاستکردنەوەو پێشگرتن بەم شتانە ئەدەن. لە ئەدەبیاتی ئیسلامییدا بەو کەسانە ئەوترێ «سەلەفی». هەروەها مێژووش نیشانی داوە کە سەلەفییەکان زیاتر لە هەموو تەوژمێکی تری ئیسلامی، لە کات و ساتە ناسك و هەستیارەکاندا بە هانای دینەکەیانەوە ڕۆیشتوون و بە هەموو شێوەیەك پارێزگارییان لە ئایینی ئیسلامەوە کردووە.

**ئەڵبەت وەك بەناوبانگە ئەڵێن بنەچەی ئەو فیکرییەتەی ئێستا بە ئیسلامی سەلەفی ناسراوە دەگەڕێتەوە بۆ ئیمام ئەحمەدی حەنبەل کە دەیەویست ئیسلام بگەڕێنێتەوە سەر بنەما سەرەتاییەکانی خۆی، چونکوو بە باوەڕی ئەو لە دوای تابیعینی تابیعینەوە ڕەوتی گشتیی ئیسلام بەلاڕێدا چوو بوو و دەبا هەڵەکان ڕاست بکرایەتەوەو شەریعەتی ڕاستەقینە لەسەر بنەمای «سەلەف» سەر لە نوێ ڕێك بخرایەتەوە. ئایا جەنابت ئەم ڕایەت قبووڵە؟**

پێشتریش باسم کرد کە ئەوانەی پێیان وابووە یان پێیان وایە بۆ نەهێشتنی هەر گیر و گرفتێك پێویست بە گەڕانەوەیە بۆسەر دەق و ئەسڵە شەرعییەکان، ژمارەیان زۆر زۆرە کە ئاساییە ئیمام ئەحمەدیش(رحمة الله) وەك سەرمەزهەبێك کەسێکی دیاری ناو ئەم خەڵکە بێئەژمارە بووبێت. بەڵام بە نیسبەت پرسیارەکەتانەوە دەربارەی ئەو، پێویستە لە

سەرەتادا ئەوەتان پێ بڵێم کە ئیمام ئەحمەد خۆی یەك لە زانایانی سەلەف بووە نەك سەلەفی یان یەکێك لەو زانایانەی کە باسمانکردن واتە یەك لە تابیعی تابیعییەکان. هەروەها ئەو سەرمەزهەبی یەکێك لە چوار مەزهەبەکەی عالەمی ئیسلامی واتە مەزهەبی حەنبەلییە. ئەمە لە حاڵێکدایە کە پێشتریش وەکوو یەکێك لەو سەرمەزهەبانەی کە ئەکەوێتە بازنەی تابیعییەکانەوە ئاماژەمان بە ناوی ئیمام ئەبوو حەنیفە کرد.

بەڵام ناوهێنانی ئیمام ئەحمەد وەك زانایەکی سەلەف و گرێدانی سەلەفییەت بەوەوە، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە ئەو خۆی (محدث) واتە حەدیس گێڕەوە یان حەدیس بێژ بووەو کتێبێکی گرنگیشی بە ناوی (مسند ألامام احمد) لەمبارەیەوە نووسیوە کە نزیکەی ٢٠ بەرگەو هەموو ئەو فەرموودانەی لەخۆ گرتووە کە لەوەوە وەرگیراوە. هەروەها ئیمام ئەحمەد لە زانستی فەرموودەدا واتە لە (علم الحديث)دا پلەی موجتەهیدی بووەو ئەمەش بەو هۆیەوەکە زیاتر لە سەد هەزار حەدیسی بە ریوایەتی جیاوازەوە لەبەر بووە. زانایانی حەنبەلی هەندێ جار جیاواز لە زانایانی سێ مەزهەبەکەی تر ناویان لێ براوە چونکوو ئەوان لە ترسی ئەگەری روودانی گرفت و کێشەی جۆراوجۆردا گەلێ ئەحکامی پێشینەهاتوویان تۆمار کردووە. هەر بەم بۆنەیەوە (أرأيت)یان پێ وتراوە، ئەوان بەردەوام وتوویانە (أرأيت ان كذا، أو أرأيت ان كذا، أو أرأيت ان كذا.....هتد) واتە: (باشە گەر بینیت واپێش هات وابوو یان بینیت واپێش هات وابوو یان بینیت واپێش هات وابوو...هتد). ئینجا ئەوان هێندە لە سەر ئەم میتۆدە سووربوون کە جاری وابووە کەوتوونەتە ژێر رەخنەی ئەو خەڵکانەوە کە ئەو هەموو وردکردنەوەیەیان بە پێویست نەدەزانی. هەروەها ئیمام ئەحمەد پلەی بوێری و ئازایەتی لە راستکردنەوەی گومان یان (شوبهە)ی خەلقی قورئاندا پێ براوە، ئەڵبەت ئەو تاقە زانای ئەم بوارە نەبووە بەڵام بە هیچ جۆر روخسەتی بەکار نەهێناوەو سوور بووە لە سەر رەتکردنەوەی ئەو شوبهەیەو لە سەر ئەو هەڵوێستەش توندی بەندیخانە کراوە. هەروەها ئەم بوێری و شێلگیرییە بووە هۆی ئەوە تاکوو لە کاتی وەفاتیدا ژمارەیەکی زۆر لە موسوڵمانان بەشداری لە مەراسیمی بەخاکسپاردنیدا بکەن بە جۆرێك کە تا ئەو کات شتی وا رووی نەدابوو و بۆ هیچ خەلیفەو والی و سەرکردەیەك رێورەسمی ئاوا بەرێوە نەچووبوو. ئەمانە هەمووی نیشانەی پلەبەرزی ئیمام ئەحمەد و کاریگەری ئەو بوو لە مێژووی ئیسلامدا، بەڵام سەرباری ئەوەش پێم وانییە بنەچەی سەلەف و سەلەفییەت لە ئیمام ئەحمەدەوە سەرچاوەی گرتبێ. من ناڵێم سەلەفییەت هیچ پێوەندییەکی بەم پیاوەوە نییە بەڵام لەو باوەڕەدا نیم کە بنەچەی ئیسلامی سەلەفی زیاتر پێوەندیی بە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و سەردەمەکەی ئەوەوە بێت.

سەبارەت بەوەش کە وتووتانە ئەو واتە ئیمام ئەحمەد «ئەیویست ئیسلام بگەڕێنێتەوە سەر بنەما سەرەتاییەکانی خۆی» پێویستە بڵێم لەو سەردەمەدا هێشتا ئەوەندە شتی تازە پەیدا نەبووبوو و بەلارێداچوونێکی وەها نەهاتبووە ئاراوە، تەنیا وەك کێشەیەکی تازەو گەورە مەسەلەی شوبهەو گومانی مەخلووقبوونی قورئان لە ئارادا بوو. بۆیە ئیمام ئەحمەد هەوڵی وەڵامدانەوە بەو شوبهەیەو ئەو پرسیارانەی دا کە لەمبارەیەوە هاتبوونە ئاراوەو لەم پێناوەشدا هەنگاوی بە کردەوەی هەڵگرت. ئەڵبەت لە هەموو سەردەمێکدا شتی تازەو بەلارێداچوون هەبووە، بۆ نموونە لە سەردەمی خەلیفەی چوارەممان واتە لە سەردەمی ئیمام عەلیدا(خوای لێ رازی بێ) خەواریجەکان سەریان هەڵدا. دەربارەی ئەوەش کە ئیمام ئەحمەد پێی وا بووبێ لە دوای تابیعینی تابیعینەوە رەوتی گشتیی ئیسلام بەلارێدا چووە، وەك باسم کرد ئەو خۆی زانای سەلەف بووە، بۆیە ئەو قسەیە هەڵەیەو پێوەندیی بەوەوە نییە.

مەبەستمان لە خستنە بەردەستی ئەو پرسیارە ئاشکراکردنی سەرەتای سەرهەڵدانی بیری سەلەفییەت لە مێژووی ئیسلامدایە نەك ئەوەی بمانەوێ سەرەتایەکی دەستکرد و ناواقیعی بۆ ئەم رێبازە دیاری بکەین، ئیتر ئەمێنێتەوە بۆ جەنابت کە سەرەتای سەلەفییەت ئەگەڕێنیتەوە بۆ کێ و کام قۆناغ. ئەوەی لە سەرچاوە ئیسلامییەکاندا دەربارەی بیری

**سەلەف بڵاو بۆتەوە نیشانەری ئەوەیە کە ئیمام ئەحمەدی حەنبەل وەك سەرەتای ئەم ڕێبازە ئایینییە ناو براوە، ئەڵبەت دیارە ئەو تەنیا سەرەتاو دەسپێکەری ئەم ڕێبازەیە نەك تەواوکەری. ئەگەر تۆ لە سەر ئەم رایە نیت ئەی کێ بە دەسپێکەر دەزانی؟**

وەك پێشتر باسم کرد، گەڕانەوە بۆسەر دەق و ئەسڵە شەرعییەکان کێشەو مشتومڕی هەموو سەردەمەکان بووە بە تایبەت دوای ئەو سێ جیلەی کە باسم کردن، هەرکەس داکۆکیی لەسەر گەڕانەوە بۆ دەقەکان کردبێت ئەوا لەو باوەڕەدا بووە کە ئەبێ تێگەیشتنی دەقەکان بە پێی تێگەیشتنی ئەو سێ جیلە بێت و ئەو سێ جیلەشیان بە سەلەف ناو بردووە. ئەڵبەت ناوی تریشیان بۆ بەکار هێناون بۆ نموونە «ئەهلی سوننەو جەماعە» یاخود «عامة المسلمين» یان «جماهير العلماء»، بەڵام بە چوار مەزهەبەکەیان وتووە «جمهور العلماء»و لێرەدا تەنیا مەبەست ئەو چوارە بووەو بەس. هەرچەند ئەو کەسێکی بلیمەت و زانایەکی گەورەی ئیسلامی بووە بەڵام هیچ بەڵگەو رایەکم نەبینیوە یان نەبیستووە باس لەوە بکات ئیمام ئەحمەد بناغەدانەر و دامەزرێنەری سەلەفییەت بووە. سەبارەت بەوەش کە کێ بە دەسپێکەری ئەم ڕێبازە ئەزانم، پێم باشە لە هەمان باسەکەی پێشوومانەوە دەست پێ بکەین و بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی ئبن تەیمییە و هێرشی تەتەر و مەغوولەکان، ئەمە سەرەتای دەسپێکردنی حکوومەتی عوسمانی بوو کە نزیکەی شەشسەد و بیست و چەند ساڵی زایینی درێژەی کێشاو لە سەردەمی شەڕی یەکەمی جیهانیدا کۆتایی پێهات. هەم ئبن تەیمییەو هەم موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب لەم قۆناغە گرنگ و مێژووییەدا واتە لە سەردەمی دەسەڵاتداریی عوسمانییەکاندا سەریان هەڵداوە.

**کەواتە ئەتوانین بڵێین جەنابت ئبن تەیمییە بە دەسپێکەر دەزانی، بەڵام خۆ ئبن تەیمییەیش تا رادەیەك لەژێر کاریگەریی ئیمام ئەحمەدی حەنبەلدا بووە. بە ئاستی یەکەم رێژەی ئەم کاریگەرییە چەند بووەو بە ئاستی دووهەم جیاوازییەکانی ئبن تەیمییە لەگەڵ زانایانی پێش خۆی چی بوو؟**

نە تەنیا ئبن تەیمییە بەڵکوو زۆربەی زۆری زانایانی دوای ئیمام ئەحمەد لە زۆربەی رایەکانیاندا پشتیان بە قسەکانی ئەو بەستووە چونکوو وەك پێشتر باسم کرد ئیمام ئەحمەد جگە لەوەی (مفقه) یان (فقيه) بووە، (محدث) واتە فەرموودە گێڕەوەش بووە. بۆیە ئەو یەکێك بووە لە سەرچاوە باوەڕپێکراوە بەرجەستەکانی زانستی ئیسلامی و رایەکانی بە متمانەوە لە لایەن پیرەمەندانی ئیسلامییەوە وەرگیراوە. سەرباری ئەوەش من هیچ بەڵگەیەکم نەدیوە کە ئبن تەیمییە لە مەسەلەی گەڕانەوەدا بۆ فەرموودەکان، ئیمام ئەحمەدی هەڵبژاردبێ و ئەوی لە شەش (صحيح)ە بەناوبانگەکە کە بە (صحاح الستە) ناسراون و بریتین لە (بخاری، مسلم، ابوداوود، نسائی، ترمذی و ابن ماجه) بە باشتر زانیبێت. لە راستیدا (مسند)ەکەی ئیمام ئەحمەدیش وەك هەموو (سنن) و (مسند)ەکانی تری دوای ئەو کاری پێ کراوەو لەوان سەرتر نییە بەڵام بۆ تێگەیشتن لە رادەی کاریگەریی ئیمام ئەحمەد لەسەر ئبن تەیمییە و جیاوازییەکانی ئەو لەگەڵ زانایانی تردا، پێویستە بە کورتە باسێکە دەربارەی ئبن تەیمییە. لە سەردەمی ئەودا جگە لە هێرش و شاڵاوی سەربازیی تەتەر و مەغۆل بۆسەر ناوچە ئیسلامییەکان، عالەمی ئیسلامی دووچاری شاڵاوی فیکریش بووبوویەوە، بۆ نموونە تێکەڵاوبوونی ڕای فەلاسەفەی یۆنان و بابل و ئاشوور یان ڕای ئەهلی کەلام و (بلاغە) لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامی. هەروەها دابڕان و جیێکەوتنی تەواوەتی دەستەی عەلەوییەکان و لادانیان لە ڕێبازی ئەهلی سوننەو جەماعە کە تەنانەت عەرزەو شوێنی نیشتەجێبوونی جیاواز لە ئەهلی سوننەیشیان بۆخۆیان هەڵبژارد و کەوتنە تاکڕەویکردن و دامەزراندنی دەسەڵات و حکوومەت لەو جێیانەی کە ئەهلی سوننەو جەماعە دەستی پێیان نەئەگەیشت. هەروەها وەك نموونەیەکی تر

سەرەتادا ئەوەتان پێ بڵێم کە ئیمام ئەحمەد خۆی یەك لە زانایانی سەلەف بووە نەك سەلەفی یان یەکێك لەو زانایانەی کە باسمانکردن واتە یەك لە تابیعی تابیعییەکان. هەروەها ئەو سەرمەزهەبی یەکێك لە چوار مەزهەبەکەی عالەمی ئیسلامی واتە مەزهەبی حەنبەلییە. ئەمە لە حاڵێکدایە کە پێشتریش وەکوو یەکێك لەو سەرمەزهەبانەی کە ئەکەوێتە بازنەی تابیعییەکانەوە ئاماژەمان بە ناوی ئیمام ئەبوو حەنیفە کرد.

بەڵام ناوهێنانی ئیمام ئەحمەد وەك زانایەکی سەلەف و گرێدانی سەلەفییەت بەوەوە، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە ئەو خۆی (محدث) واتە حەدیس گێڕەوە یان حەدیس بێژ بووەو کتێبێکی گرنگیشی بە ناوی (مسند ألامام احمد) لەمبارەیەوە نووسیوە کە نزیکەی ٢٠ بەرگەو هەموو ئەو فەرموودانەی لەخۆ گرتووە کە لەوەوە وەرگیراوە. هەروەها ئیمام ئەحمەد لە زانستی فەرموودەدا واتە لە (علم الحدیث)دا پلەی موجتەهیدی بووەو ئەمەش بەو هۆیەوەکە زیاتر لە سەد هەزار حەدیسی بە ریوایەتی جیاوازەوە لەبەر بووە. زانایانی حەنبەلی هەندێ جار جیاواز لە زانایانی سێ مەزهەبەکەی تر ناویان لێ براوە چونکوو ئەوان لە ترسی ئەگەری ڕوودانی گرفت و کێشەی جۆراوجۆردا گەلێ ئەحکامی پێشینەهاتوویان تۆمار کردووە. هەر بەم بۆنەیەوە (أرأيت)یان پێ وتراوە، ئەوان بەردەوام وتوویانە (أرأيت ان كذا، أو أرأيت ان كذا، أو أرأيت ان كذا.....هتد) واتە: (باشە گەر بینیت واپێش هات وابوو یان بینیت واپێش هات وابوو یان بینیت واپێش هات وابوو...هتد). ئینجا ئەوان هێندە لە سەر ئەم میتۆدە سووربوون کە جاری وابووە کەوتوونەتە ژێر رەخنەی ئەو خەڵکانەوە کە ئەو هەموو وردکردنەوەیەیان بە پێویست نەدەزانی. هەروەها ئیمام ئەحمەد پلەی بوێری و ئازایەتی لە راستکردنەوەی گومان یان (شوبهە)ی خەلقی قورئاندا پێ براوە. ئەڵبەت ئەو تاقە زانای ئەم بوارە نەبووە بەڵام بە هیچ جۆر روخسەتی بەکار نەهێناوەو سوور بووە لە سەر رەتکردنەوەی ئەو شوبهەیەو لە سەر ئەو هەڵوێستەش توندی بەندیخانە کراوە. هەروەها ئەم بوێری و شێلگیرییە بووە هۆی ئەوە تاکوو لە کاتی وەفاتیدا ژمارەیەکی زۆر لە موسوڵمانان بەشداری لە مەراسیمی بەخاکسپاردنیدا بکەن بە جۆرێك کە تا ئەو کات شتی وا رووی نەدابوو و بۆ هیچ خەلیفەو والی و سەرکردەیەك ڕێورەسمی ئاوا بەڕێوە نەچووبوو. ئەمانە هەمووی نیشانەی پلەبەرزی ئیمام ئەحمەد و کاریگەری ئەو بوو لە مێژووی ئیسلامدا، بەڵام سەرباری ئەوەش پێم وانییە بنەچەی سەلەف و سەلەفییەت لە ئیمام ئەحمەدەوە سەرچاوەی گرتبێ. من ناڵێم سەلەفییەت هیچ پێوەندییەکی بەم پیاوەوە نییە بەڵام لەو باوەڕەدا نیم کە بنەچەی ئیسلامی سەلەفی زیاتر پێوەندیی بە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و سەردەمەکەی ئەوەوە بێت.

سەبارەت بەوەش کە وتووتانە ئەو واتە ئیمام ئەحمەد «ئەیویست ئیسلام بگەڕێنێتەوە سەر بنەما سەرەتاییەکانی خۆی» پێویستە بڵێم لەو سەردەمەدا هێشتا ئەوەندە شتی تازە پەیدا نەبووبوو و بەلاڕێداچوونێکی وەها نەهاتبووە ئاراوە، تەنیا وەك کێشەیەکی تازەو گەورە مەسەلەی شوبهەو گومانی مەخلووقبوونی قورئان لە ئارادا بوو. بۆیە ئیمام ئەحمەد هەوڵی وەلامدانەوە بەو شوبهەیەو ئەو پرسیارانەی دا کە لەمبارەیەوە هاتبوونە ئاراوەو لەم پێناوەشدا هەنگاوی بە کردەوەی هەڵگرت. ئەڵبەت لە هەموو سەردەمێکدا شتی تازەو بەلاڕێداچوون هەبووە، بۆ نموونە لە سەردەمی خەلیفەی چوارەممان واتە لە سەردەمی ئیمام عەلیدا(خوای لێ رازی بێ) خەواریجەکان سەریان هەڵدا. دەربارەی ئەوەش کە ئیمام ئەحمەد پێی وا بووبێ لە دوای تابیعینی تابیعینەوە رەوتی گشتیی ئیسلام بەلاڕێدا چووە، وەك باسم کرد ئەو خۆی زانای سەلەف بووە، بۆیە ئەو قسەیە هەڵەیەو پێوەندیی بەوەوە نییە.

مەبەستمان لە خستنە بەردەستی ئەو پرسیارە ئاشکراکردنی سەرەتای سەرهەڵدانی بیری سەلەفییەت لە مێژووی ئیسلامدایە نەك ئەوەی بمانەوێ سەرەتایەکی دەستکرد و ناواقیعی بۆ ئەم ڕێبازە دیاری بکەین، ئیتر ئەمێنێتەوە بۆ جەنابت کە سەرەتای سەلەفییەت ئەگەڕێنیتەوە بۆ کێ و کام قۆناغ. ئەوەی لە سەرچاوە ئیسلامییەکاندا دەربارەی بیری

**سەلەفی بڵاو بۆتەوە نیشانەری ئەوەیە کە ئیمام ئەحمەدی حەنبەل وەك سەرەتای ئەم ڕێبازە ئایینییە ناو براوە، ئەڵبەت دیارە ئەو تەنیا سەرەتاو دەسپێکەری ئەم ڕێبازەیە نەك تەواوکەری. ئەگەر تۆ لە سەر ئەم رایە نیت ئەی کێ بە دەسپێکەر دەزانی؟**

وەك پێشتر باسم کرد، گەڕانەوە بۆسەر دەق و نەسلە شەرعییەکان کێشەو مشتومڕی هەموو سەردەمەکان بووە بە تایبەت دوای ئەو سێ جیلەی کە باسم کردن، هەرکەس داکۆکیی لەسەر گەڕانەوە بۆ دەقەکان کردبێت ئەوا لەو باوەڕەدا بووە کە ئەبێ تێگەیشتنی دەقەکان بە پێی تێگەیشتنی ئەو سێ جیلە بێت و ئەو سێ جیلەشیان بە سەلەف ناو بردووە. ئەڵبەت ناوی ترشیان بۆ بەکار هێناون بۆ نموونە «ئەهلی سوننەو جەماعە» یاخود «عامة المسلمين» یان «جماهير العلماء»، بەلام بە چوار مەزهەبەکەیان وتووە «جمهور العلماء»و لێرەدا تەنیا مەبەست ئەو چوارە بووەو بەس. هەرچەند ئەو کەسێکی بلیمەت و زانایەکی گەورەی ئیسلامی بووە بەلام هیچ بەڵگەو رایەکم نەبینیوە یان نەبیستووە باس لەوە بکات ئیمام ئەحمەد بناغەدانەر و دامەزرێنەری سەلەفییەت بووە. سەبارەت بەوەش کە کێ بە دەسپێکەری ئەم ڕێبازە ئەزانم، پێم باشە لە هەمان باسەکەی پێشوومانەوە دەست پێ بکەین و بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی ئبن تەیمییە و هێرشی تەتەر و مەغوولەکان، ئەمە سەرەتای دەسپێکردنی حکوومەتی عوسمانی بوو کە نزیکەی شەشسەد و بیست و چەند ساڵی زایینی درێژەی کێشاو لە سەردەمی شەڕی یەکەمی جیهانیدا کۆتایی پێهات. هەم ئبن تەیمییەو هەم موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب لەم قۆناغە گرنگ و مێژووییەدا واتە لە سەردەمی دەسەڵاتداریی عوسمانییەکاندا سەریان هەڵداوە.

**کەواتە ئەتوانین بڵێین جەنابت ئبن تەیمییە بە دەسپێکەر دەزانی، بەلام خۆ ئبن تەیمییەیش تا رادەیەك لەژێر کاریگەریی ئیمام ئەحمەدی حەنبەلدا بووە. بە ئاستی یەکەم ڕێژەی ئەم کاریگەرییە چەند بووەو بە ئاستی دووهەم جیاوازییەکانی ئبن تەیمییە لەگەڵ زانایانی پێش خۆی چی بوو؟**

نە تەنیا ئبن تەیمییە بەڵکوو زۆربەی زۆری زانایانی دوای ئیمام ئەحمەد لە زۆربەی رایەکانیاندا پشتیان بە قسەکانی ئەو بەستووە چونکوو وەك پێشتر باسم کرد ئیمام ئەحمەد جگە لەوەی (مفقه) یان (فقيه) بووە، (محدث) واتە فەرموودە گێڕەوەش بووە. بۆیە ئەو یەکێك بووە لە سەرچاوە باوەڕپێکراوە بەرجەستەکانی زانستی ئیسلامی و رایەکانی بە متمانەوە لە لایەن بیرمەندانی ئیسلامییەوە وەرگیراوە. سەرباری ئەوەش من هیچ بەڵگەیەکم نەدیوە کە ئبن تەیمییە لە مەسەلەی گەڕانەوەدا بۆ فەرموودەکان، ئیمام ئەحمەدی هەڵبژاردبێ و ئەوی لە شەش (صحيح)ە بەناوبانگەکە کە بە (صحاح السته) ناسراون و بریتین لە (بخاری، مسلم، ابوداوود، نسائی، ترمذی و ابن ماجه) بە باشتر زانیبێت. لە راستیدا (مسند)ەکەی ئیمام ئەحمەدیش وەك هەموو (سنن) و (مسند)ەکانی تری دوای ئەو کاری پێ کراوەو لەوان سەرتر نییە بەلام بۆ تێگەیشتن لە رادەی کاریگەریی ئیمام ئەحمەد لەسەر ئبن تەیمییە و جیاوازییەکانی ئەو لەگەڵ زانایانی تردا، پێویستە بە کورتە باسێکە دەربارەی ئبن تەیمییە. لە سەردەمی ئەودا جگە لە هێرش و شالاوی سەربازیی تەتەر و مەغۆل بۆسەر ناوچە ئیسلامییەکان، عالەمی ئیسلامی دووچاری شالاوی فیکریش بووبوویەوە، بۆ نموونە تێکەڵاوبوونی ڕای فەلاسەفەی یۆنان و بابل و ئاشوور یان ڕای ئەهلی کەلام و (بلاغە) لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامی. هەروەها دابڕان و جێکەوتنی تەواوەتی دەستەی عەلەوییەکان و لادانیان لە ڕێبازی ئەهلی سوننەو جەماعە کە تەنانەت عەرزەو شوێنی نیشتەجێبوونی جیاواز لە ئەهلی سوننەیشیان بۆخۆیان هەڵبژارد و کەوتنە تاکڕەویکردن و دامەزراندنی دەسەلات و حکوومەت لەو جێیانەی کە ئەهلی سوننەو جەماعە دەستی پێیان نەئەگەیشت. هەروەها وەك نموونەیەکی تر

ئەتوانین ئاماژە بە سەرهەڵدانی عیرفان و سۆفیگەری بکەین کە بەرهەم و کاردانەوەی شیعە و کەلتووری هیندی و خاچپەرستی بوو. ئەم تەوژم و بیرۆکانە هەرکام بە جۆرێك بووبوونە هەڕەشە بۆسەر بیروبۆچوونی موسوڵمانان و هەرکام بە شێوەیەك کاریگەری لەسەر زانایان و نیمچە زانایان و کۆمەڵی موسوڵمانان بە گشتیی دانابوو. بۆ نموونە ئیمام غەزالّی کە کەمێك پێش ئبن تەیمییە ژیاوە، یەکێك لەو کەسانە بوو کەوتبووە ژێر کاریگەری ئەم رەوتە چەواشانەوەو کتێبێکی گەورەی بە ناوی (احیاء علوم الدین) دەربارەی بیروبۆچوونەکانی ئەو سەردەمە نووسیوە. ئەو دواتر وازی لە بەلاغەو کەلام هێناو بەرەو دەقە ئیسلامییەکان گەڕایەوە.

ئەو سەردەمە پڕ بووە لە جیهاد و رووبەڕووبوونەوەی ترسناك و کێشمەکێشی سەخت و دژوار هەروەها پارچەپارچەبوونی موسوڵمانان لەباری بیروباوەڕەوەو سەرهەڵدانی بۆچوونە ئەسڵ شێوێنەکانی وەك یاساکەی چەنگیز و شوبهەو گومانەکانی تر کە هەموو ئەمانە کۆمەڵگای ئیسلامییان دووچاری تەنگەژەو بشێوی کردبوو. بۆیە زانایانی ئەو سەردەمە هەرکەسەو بە پێی توانای خۆی هەوڵی بەربەرەکانێی ئەم دۆخ و ئاڵۆزییانەی ئەدا. بەڵام ئبن تەیمییە خاڵی کۆکردنەوەو هاندانی خەڵکی بوو بۆ رووبەڕووبوونەوەی تەتەر و مەغۆل و تەنیا کەسێك بوو کە بە نیسبەت ئەو پێشهاتانەی بەسەر موسوڵماناندا هاتبوو فتوای لێ وەرئەگیرا. سەرجەم بەرهەمەکانی ئەو پیاوە بیرمەند و مەزنە لە بواری فتوادا، لە کتێبێکی ٢٨ بەرگیدا بە ناوی (مجموع فتاوی) کۆ کراوەتەوەو لە چاپ دراوە. هەروەها ئەم کتێبە تەواوی ئەو نامانەی ئبن تەیمییەشی لەخۆگرتووە کە بە مەبەستی دەرهێنانی خەڵکانی چەواشەکراو لە گومڕایی و سەرلێشێواوی بەملاولای دونیای ئیسلامدا بڵاو بوونەتەوە. بەشێکی تری بەرهەمەکانی ئبن تەیمییە بریتییە لە بەرهەمە مەنهەجی و عەقیدەتییەکان کە ئەم بەرهەمانە بە زۆری لە کتێبێکدا بە ناوی (السیاسة الشرعیه فی الراعی و الراعیه) جێگایان بۆتەوە. ئەم کتێبە سەرباری بچووکبوونی لەباری قەبارەوە، یەکێکە لە هۆکارەکانی ناوبانگ دەرکردنی ئبن تەیمییە، ژمارەی بەرهەمەکانی ئەم پیاوە زۆر فەراوانەو بێگومان ئەو یەکێك بووە لە پڕ بەرهەمترین زانایانی ئیسلامی. هەروەها ئەو چەندها قوتابیشی پەروەردە کردووەو بەرجەستەترینی ناویان (ابن قیم جوزیە)یە کە خاوەنی چەندها کتێب و بەرهەمی دیار و ناسراوە.

بە گشتیی ئەتوانین بڵێین ئەو هەموو پێشهات و رووداوانەی لەو سەردەمەدا دەقەومان، ئبن تەیمییەیان ناچارکرد وەڵام و فتوای تازەیان بۆ بدۆزێتەوەو دیارەکەسێکیش کە بە درێژایی تەمەنی ئاوەها سەرقاڵی رەتکردنەوەی شوبهەکان و وەڵامدانەوە بە رووداو و دیاردە تازەکان بووبێت ئاساییە لەگەڵ زانایانی تری ئەو سەردەمەدا جیاوازیی هەبێت. ئەو بەهۆی سووربوون و پێداگربوونی لەسەر باوەڕ و بۆچوونەکانی، چەندین جار توندی بەندیخانە کراو دواجار هەر لە بەندیخانەشدا گیانی لە دەست دا. کەمتر زاناو موفتییەکمان هەیە کە بە قەدەر ئبن تەیمییە پێداگری لەسەر راستکردنەوەی لادان و چەواشەکارییەکان و بەگژاچوونەوەی نەیارانی ئیسلام کردبێت و پاش خۆیشی پێشوازییەکی ئاوا لە بەرهەمەکانی کرابێ و تاکوو ئێستاش وەك سەرچاوەی گرنگ چاویان لێ بکرێت و بخوێندرێنەوە. ئەمانە هەموو ئەو هۆکارانەن کە ئبن تەیمییەیان لە زانایانی پێش خۆی جیاکردۆتەوە.

ئەڵبەت لە هەندێ سەرچاوەشدا، وەك (الکامل فی التاریخ) و (النهایة فی غریب الحدیث و الاثر) دا سەرچاوەو سەرەتای سەلەفییەت دەگەڕێنرێتەوە بۆ سەدەی چوارەمی کۆچی و رێکتر بڵێین ساڵی ٣٢٣ی مانگی. دەوترێ کە کۆمەڵێ لە ئەهلی حەدیس بانگەشەی گەڕانەوەیان بۆ سەلەفی ساڵح و کرداری پێغەمبەری ئیسلام دەکرد و ئەمەش بوو بە سەرەتای سەلەفییەت. بۆ وێنە «ئەبوو موحەممەد حەسەن کوڕی عەلی کوڕی خەلەفی بەربەهاری» ناسراو بە «بەربەهاری» یەکێك

**بووە لە یەکەم هەڵگرانی درووشمی سەلەفییەت و تەنانەت بۆ یەکەم جار دەستی دابووە تەکفیرکردنێکی بەربڵاوی شیعەکان. تۆ ئەم رایەت قبووڵە کە بەربەهاری و هاوڕێیانی لە سەدەی چوارەمدا سەلەفییەتیان هێنایە ئاراوە؟**

ئەوەی راستی بێ ئا لەم گۆشەی بەندیخانەیەوە دەستم بەو سەرچاوانەی باستانکردووە ناگاو ئاگام لەو بابەتە نییەو بۆیە رەنگە نەتوانم بە باشی ئەو هەموو لق و پۆپەی مێژووی ئیسلام و سەلەفییەت شی بکەمەوە. تەنیا ئەتوانم بڵێم ئیمامی بەربەهاری یەکێك بووە لە ئیمامانی ئەهلی سوننەو جەماعەو هیچی تر.

**دیارە رۆڵی ئبن تەیمییە لە کردنەوەی دەلاقەی سەلەفییەتدا لە هەموو کەسێ گرنگتر بووە، بەڵام با ئاوڕێکیش بدەینەوە لە ئیمام موحەممەدی غەزالی، چونکوو بەرهەم و بیروبۆچوونەکانی غەزالی دەورێکی بەرچاویان لە مێژووی بیری ئیسلامیدا گێڕاوە. بەتایبەت دوای ئەوەی وازی لە فەلسەفەو کەلام و بەلاغە هێناو میتۆدی گەڕانەوەی راستەوخۆ بۆ دەق و ئەسڵە شەرعییەکانی هەڵبژارد. ئایا ئەتوانین بڵێین غەزالی لە بەرهەمهێنانی سەلەفییەتدا دەوری گێڕاوەو ئەگەر دەوری هەبووە چۆناوچۆن و بە چ ئاستێك بووە؟**

ئەڵبەت من ناڵێم رۆڵی ئبن تەیمییە لە کردنەوەی دەلاقەی سەلەفییەتدا لە هەموو کەسێ گرنگتر بووە بەڵکوو ئەتوانم بڵێم وا (مەشهوور)ە کە سەلەفییەت لە هەموو کەس زیاتر بە ناوی ئەوەوە بڵاو بۆتەوە یان وا باس ئەکرێ کە ئەو دامەزرێنەری ئەم بیروباوەڕە بووە لە سەدە سەرەتاییەکاندا، ئەگەرنا پێش لە دایکبوونی ئەویش خەڵکانێك واتە هەندێ لە زانایانی ئیسلامی سەلەف و شوێنکەوتووی سەلەفەکان بوون. هەروەها ژمارەیەکی ئێجگار زۆری زانایانیش خۆیان سەلەف بوون کە ناویان لە ریزبەندی ئەو سێ جیلەدا تۆمار کراوە کە پێشتر باسم کردن. سەردەمی ئیمامی غەزالی و ئبن تەیمییە لێك نزیك بووەو دەشێت هەندێ دیاردەی هاوبەش لە ژیانیاندا دەوری گێڕابێت. غەزالی بەشێك لە ژیانی خۆی تەرخان کردبوو بۆ زانستی کەلام و بەلاغەو مەنتیق و فەلسەفە بەڵام بەشی کۆتایی تەمەنی خۆی بە (أصول و نصوص و فیقه)ەوە بەسەر بردووە، نازانم لە بواری تەفسیر و فەرموودەشدا کاری کردووە یان نا؟ بۆ وەڵامدانەوە بەو پرسیارەش کە ئایا غەزالی لە پێکهاتنی سەلەفییەتدا دەوری گێڕاوە یان نا، ئەتوانم بڵێم ئەو بە وازهێنان لە زانستانە چەواشەکان و ئەو وەرچەرخانەی لە کۆتایی تەمەنیدا کردی، خزمەتی بەو تێگەیشتنە کردووە کە بە تێگەیشتنی سەلەفییانە لێك ئەدرێتەوە. هەڵگەڕانەوەی ئیمام غەزالی لە فەلسەفە خاڵێکی گرنگی وەرچەرخان بوولە مێژووی ئەندێشەی ئیسلامیداو بەو پێیە کە سەلەفییەکانیش فەلسەفە رەت ئەکەنەوە هەروەها بە پێی پێگەو جێگەی تایبەتی ئەو پیاوە لە دونیای زانستی ئیسلامیدا، ئەتوانین پاشگەزبوونەوەی ئەو لە فەلسەفەو کەلام وەك بەهێزکەری شێوەو روانگەی سەلەفییانە بۆ ئایینی ئیسلام لە قەڵەم بدەین. دیارە ئەو گۆڕانکارییە ریشەییەی بەسەر فیکر و ژیانی ئەودا هاتووە بێگومان هۆکارێکی جیدی لە پشتەوە بووە دەنا زانایەکی گەورەو بەرجەستەی وەك غەزالی لەخۆوە جێگۆڕکێ بە بیروباوەڕی خۆی ناکات. بۆیە ئەبێ هۆکارەکە زۆر بەهێز بووبێ کە توانیویەتی لەو ئاستەدا جێی سەرنجی ئەو بێت و زەمینەی بۆ پێکهاتنی ئاڵوگۆڕێکی ئاوا گەورە لەدا فەراهەم کردووە. غەزالی بە کەڵك وەرگرتن لەم میتۆدە تازەیە توانیبووی بەسەر گومان و شوبهەکاندا سەرکەوێت و بە گژیاندا بچێتەوەو لەوێوەش وەڵامی رێك و دروست بۆ ئەو پرسیارانە بدۆزێتەوە کە لەو سەردەمەدا هاتبوونە ئاراوە؛ ئەو توانیی خەڵك لە دوودڵی و گومان و شتی خەیاڵی و ناڕاست رزگار بکات و دیارە ئەمەش یەکێکە لە مەبەستە سەرەکییەکانی سەلەفییەت و بۆیە ئەتوانین ئیمامی غەزالی بە یەکێك لە گەشەپێدەرانی بیروباوەڕی سەلەفییەت ناو ببەین.

لە نێو قوتابیانی ئبن تەیمییەدا یەکێکیان خاوەن بەرهەم و نووسراوی فراوان و بەرچاوە کە ناوی «ابن قیم»ە. ئبن قەییم لە سەقامگیرکردن و پەرەپێدانی بۆچوونەکانی مامۆستاکەی خۆی واتە ئبن تەیمییەدا دەوری گەورەی گێڕاوە، ئایا دەتوانین ئەو بە درێژەپێدەری بیری سەلەفییەت لە دوای ئبن تەیمییە بزانین؟ هەروەها ڕۆڵ و جێگەی ئبن قەییم لە بزاڤی ئیسلامخوازیدا چۆناوچۆن لێك ئەدەیتەوە؟

نە تەنیا ئەو بەڵکوو چەندین و چەند زانای تریش لە سەردەمی ئبن قەییم و دوای ئەویش هەریەکەیان پێناسەکەری بەشێکی ئەو بۆچوونە بوون. ڕاستە ئبن قەییم بەهۆی کتێبە نایابەکانییەوە ناوێکی دیار و زەقە بەڵام بنەمای ئەو ناوبانگەی بە دەستی هێناوە ئەگەڕێتەوە بۆ ڕۆڵی ئبن تەیمییەی مامۆستای چ لە ڕووی نووسراوەو فتواکانیەوە چ لە ڕووی گرنگبوونی ئەو سەردەمەی پیایدا تێپەڕیوە. ئەڵبەت ئبن تەیمییە بە تەنیایی ئەو ڕۆڵەی نەگێڕاوەو لە ناو بنەماڵەکەیدا باپیری زانایەکی گەورەی سەردەمی خۆی و خاوەن چەندەها کتێب و بەرهەم بووە. جا ئەگەر ئەم هۆکارەو چەند هۆکاری تر کە پێشتر ئاماژەم پێدان، لە بەناوبانگ کردنی ئبن تەیمییەدا دەوریان بووبێت ئەوا چەندین هۆکاری هاوشێوەی ئەمانەش هەیە کە ناوبانگیان بەخشیوەتە قوتابییەکەی ئەو واتە ئبن قەییم جووزیە. ئەڵبەت ناکرێ چاوپۆشی لەوەش بکەین کە ئبن قەییم ئینسانێکی زیرەك و بە تواناو دڵسۆز و دونیا بە کەمزان بووەو لایەنی دونیا بە کەمزانییەکەی بەسەر خەسڵەتەکانی تریدا زاڵ بووە. بۆیە کتێبەکانی ئەو بوونەتە سەرمەشقێکی ناوازە بۆ ئەوانەی ویستوویانەو ئەیانەوێ (ورع)ێکی دروست و تەواو پیادە بکەن بە بێ ئەوەی تووشی زێدەڕۆیی یان کورتهەڵاتن بن. ئبن قەییم جگە لەوەی مامۆستای بواری (زهد) و (ورع)ی بووە، لە ئاستێکی بەرزیشدا شارەزایی لە تەفسیر و عەقیدەو(علم النفس)دا بووە. ئەو خاوەن کتێبێکی زۆر ناوازەیە لە بواری (سیاسة الشرعیە)داو هەروەها نزیکەی ٦٠ کتێبێکی تریشی هەیە. بە پێچەوانەی مامۆستاکەی، کتێبەکانی ئەو لە ڕووی پۆلێنکردنی بابەتەکانەوە زۆر ڕێکوپێکن و هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە لە سەردەمی ئەودا بارودۆخ و دەرفەتی کتێبنووسین باشتر و لەبارتر بووە. بە گشتی ئبن قەییم جووزییە یەکێك لەو بیرمەندە ئیسلامیانەیە کە لای سەلەفییەکان جێگەو پێگەیەکی بەرزی هەیە.

ڕەنگە بتوانین سەدەی دوازدەهەم بە دیارترین و ئاشکراترین سەردەم لە کۆی تەمەنی بیری سەلەفییەت بزانین کە بە دەرکەوتنی موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب گیانێکی تازە بە بەر سەلەفییەتدا کرایەوە. ئایا دەتوانین وەهابییەت وەك درێژەی ڕێبازی ئبن تەیمییەو ئبن قەییم ناوزەد بکەین؟ بە گشتی با ئاوڕێ لە چۆنایەتی و شێوازی سەرهەڵدانی وەهابییەت و ڕەوتی گەشەکردنی ئەم ڕێبازە بدەینەوە.

ئەتوانین سەردەمی موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب بە سەردەمی پەیدابوونی دەستەو تاقمی سەلەف بەم ناوەوە واتە بەناوی خودی موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهابەوە ناو ببەین. لەو سەردەمەدا هەموو ئەو تیۆر و بۆچوونانەی پێشتر لە لایەن کەسانی ترەوە هاتبوونە ئاراوە، شکڵی تاقم و گرووپیان بەخۆوە گرت و دواتر لە چوارچێوەی دەسەلاتی وەهابیەتدا قاڵبێکی کردەوەییان بەخۆوە گرت و لە تیۆری بوونی ڕووت دەرهاتن. ئەڵبەت ئەم بیروباوەڕە لەو سەردەمەدا چەند گەشەو نەشەی کردووە بە هەمان ڕادەو بگرە زیاتر لەوەیش تووشی سەرکوتکردن و بەدناوکردن بۆتەوەو گەلێ دژواری و سەختی بەسەر هاتووە کە پێویستە لە زەمینەی حکوومەتی عوسمانیدا خوێندنەوەی بۆ بکەین. هەروەها ئەشتوانین وەهابیەت بە درێژەپێدەری ڕێگەی ئبن تەیمییەو ئبن قەییم بزانین چونکوو سەردەستەی وەهابیەت موحەممەدی کوڕی

عەبدولوەهاب بوو کە ئەویش بە رادەیەکی زۆر لەژێر کاریگەری ئەم دوو کەسە بە تایبەت ئبن تەیمییەدا بووەو سوودی زۆری لە نووسراوەو فتواکانی ئەوان وەرگرتووە. بۆ تێگەیشتن لە شێوازی سەرهەڵدان و رەوتی گەشەکردنی وەهابیەت، پێویستە بگەڕێینەوە بۆ حکوومەتی عوسمانییەکان و ئەو باس و خواسانەی کە پێوەندییان بەم حکوومەتەوە هەیە.

**کەوایە با بچینە سەر باسی عوسمانییەکان و زەمینە مێژووییەکانی سەرهەڵدان و گەشەکردنی ئەو حکوومەتە گەورەیەی دونیای ئیسلام. دوو سەدە پێش لەدایکبوونی موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب ئیمپراتۆریای عوسمانی دامەزرابوو و خۆی بە (اُم القرا )ی ئیسلامی و سوڵتانەکانیشی بە خەلیفە ناوزەد دەکران. بە ئاستی یەکەم دەوڵەتی عوسمانی چۆناوچۆن دامەزراو بە ئاستی دووهەم و لە پێوەندی لەگەڵ باسەکەی خۆماندا، موحەممەد بن عەبدولوەهاب رای چی بوو بەرانبەر بەم دەسەڵاتەو چ جۆر پێوەندییەک لە نێوانیاندا دروست بوو؟**

لێکۆڵینەوە لە زەمینەو هۆکارەکانی سەرهەڵدانی عوسمانییەکان و ئەو هەموو جەنگ و رووداوانەی لە دوو توێی حکوومەتە شەش سەد ساڵییەکەی ئەواندا رووی داوە باسێکی چڕوپڕ و درێژەو لە مەجالی ئەم وتووێژەدا نییە. هەرچەند ئەگەر بمانەوێ بە باشی لە مەسەلەکە بگەین ناچارین خۆمان لەم باسە درێژە بدەین بەڵام لێرەدا هەوڵ ئەدەین بە ئاماژەدانێکی کورت و تۆکمە ئاوڕێک لەو سەردەمە بدەینەوە. پێش دروستبوونی دەسەڵاتی عوسمانی، عەباسییەکان حوکمڕانی دونیای ئیسلام بوون کە لە ناو دەوڵەتی گەورەی عەباسی و دەرەوەی ئەم دەوڵەتەیشدا دەوڵەتی گەورەو بچووکی تر سەریان هەڵدابوو. یەک لەوانە سەلجووقییەکان بوون کە لە تورکانی موسوڵمان پێک هاتبوون و چەندین سەدە حوکمڕانییان کردبوو، لە کۆتایی حوکمڕانییەکەیاندا تووشی لاوازییەکی زۆر هاتبوون و نەیانئەتوانی بە باشی سنوورەکانی دەسەڵاتی خۆیان بپارێزن و بەم بۆنەیەوە لە شەڕی رۆمییەکاندا شکستێکی گەورەیان خوارد. لەو سەردەمانەدا خێڵە تورکێکی موسوڵمانی کۆچەری لە ناوچەی ئەنادۆڵدا ژیانیان بەسەر ئەبرد، ئەوان بە بینینی هێزە شکستخواردووەکەی سەلجووقییەکان هەست و غیرەتی موسوڵمانانەی تا رادەیەک ئاوێتە بە نەتەوەگەرایی ئەوانی بۆ جیهادکردن دژی رۆمییەکان و پشتیوانیکردن لە موسوڵمانان هان دا. بۆیە پاڵیان بە سەلجووقییەکانەوە داو لەگەڵ ئەواندا کەوتنە شەڕی رۆمییەکان و سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. پاش تەواوبوونی شەڕەکە، فەرماندەی سەلجووقییەکان داوای لە سەرۆکی ئەو خێڵە تورکە واتە «سلێمان پاشا» –باوکی ئەو «عوسمان»ەی کە دواتر دەسەڵاتی تورکەکان بە ناوی ئەوەوە دامەزرا– ئەکات تاکوو ببێتە جێنشینی ئەو لە ناوچە ئازادکراوەکاندا، ئیتر لێرە بەدواوە ئەم دوو خێڵە تورکە بوونە هاوپەیمانی یەکتر و فتووحاتی تریشان کرد. سەرەنجام لە ساڵی ١٢٩٨ی زایینیدا عوسمانی کوڕی سلێمان پاشا دەسەڵاتی عوسمانی دائەمەزرێنێ کە پاش ماوەیەک ئەبێتە دەسەڵاتی یەکەمی دونیای ئیسلام، هەروەها ناوەندی خیلافەت ئەگوێزرێتەوە بۆ پایتەختی عوسمانییەکان واتە ئەستەمبووڵ. سەرباری هەموو ئەمانەش حکوومەتی عوسمانی نەیتوانی ببێتە تاکە ناوەندی خیلافەت و لە چەندین شوێنی دونیای ئیسلامەوە شەرعییەتی ئەم حکوومەتە ئەخرایە بەر گومانەوەو هەندێ جار ئەو گومان و جیاوازییانە شەڕی گەورە گەورەشیان لێ ئەکەوتەوەو بە هۆیانەوە موسوڵمانان بەگژ یەکتردا ئەچوونەوە. بۆ نموونە ئەتوانین ئاماژە بە شەڕەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەگەڵ ملووکەکانی میسر و حکوومەتی سەفەوییە لە ئێران بکەین.

لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا لیژنەی باڵای فتوا هەبووەو بەڕێوەبەرانی پەیمانگاکانیان خەڵکانی خوێندەوار و شارەزا بوون بەڵام بەڕێوەبەری گشتیی بەشی شەرعی دەوڵەت پلەو پایەیەکی تایبەتی بووەو پێی وتراوە (شیخ الاسلام)و بە شێوەیەکی گشتیی کاروبارە شەرعییەکانی دەوڵەتی بەڕێوە بردووە. ئەم (شیخ الاسلام)انە هەندێ جار بە پێی

بەرژەوەندییەکانی حکوومەت فتوایان دەرکردووەو ئەمەش هەندێ جار بۆتە هۆی پشتگوێخستنی فتواکان لە لایەن موسوڵمانانەوەو نارەزایەتی ئەوانی لێ کەوتۆتەوە. بۆ وێنە لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا شێخەلئیسلامی سەردەم فتوایەك دەرئەکا کە تیایدا بەهۆی بەربڵاوبوونی هێزەکانی سوپای ئیسلام و دژواربوونی شەڕەکان لە خاکی کافراندا، ڕێگا بە سەربازانی سوپای ئیسلام ئەدات لە کاتی تەنگانەو ناچاریدا گۆشتی بەراز بخۆن و بۆ شکاندنی تینوێتیش مەشرووب بخۆنەوە. بەڵام سەربازەکان ئامادە نەبوون ئەم فتوایە قبووڵ بکەن و وتیان ئامادەین بمرین بەڵام شتی حەرامکراوی وەك گۆشتی بەراز و مەشرووب ناخۆین و ناخۆینەوە. هەروەها بڕیارێکی تری یەك لە شێخەلئیسلامەکانی عوسمانی فتوای سەرکوتکردنی وەهابیەکان واتە شوێنکەوتووانی موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب بوو کە دواتر باسی دەکەین.

موحەممەد بن عەبدولوەهاب لە ساڵی ۱۷۰۲ی زایینی (۱۱۱۵ی ك) لە شاری عویەینەی وڵاتی حیجاز لە دایك بووە. عویەینە شاری زانست بووەو موحەممەدیش هەر لە منداڵییەوە دەستی بە خوێندن و لەبەرکردنی قورئان کردووەو دواتریش لە بوارەکانی تری ئایینی و ئیسلامیدا درێژەی بە خوێندن داوەو وەك باس کراوە، ئەو مرۆڤێکی چالاك و زیرەك و بیرتیژ بووە. عەبدولوەهاب هەر لە سەرەتای گەنجێتییەوە بانگەشەی گەڕانەوە بۆلای ئەسڵە ئیسلامییەکان کردووەو بەم شێوەیە ڕێگاو میتۆدێکی سەلەفییانەی گرتۆتە بەر. باوکی موحەممەد یەکێك لە دادوەرانی ناسراوی شاری عویەینە بووەو لە ریزی زانایانی حەنبەلیدا لە قەڵەم دراوە. موحەممەد لە سەرەتادا بە رادەیەکی زۆر لە ژێر سێبەر و کاریگەری باوکیدا بووە بەڵام پاش مردنی باوکی ناوبانگی دەرکردووەو ناسراوە. بیروبۆچوونەکانی موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب لای زۆربەی خەڵکی عویەینە قبووڵ نەدەکرا بۆیە دەریان کرد و ئەویش دواجار لەگەڵ یەکێك لە حاکمانی ناوچەیەکی حیجاز بە ناوی (مُحمد بن سعود) پێکهات و بە یارمەتی و پشتیوانی ئەو بەردی بناغەی دەسەڵاتێکی ئیسلامی دانا. دواتر عەبدولعەزیزی کوڕی موحەممەد بن سعوود بووە زاوای موحەممەد بن عەبدولوەهاب و ئەمەش پێوەندییەکانیانی پتەوتر کرد و بنەماڵەی سعوود بەیعەتیان بە عەبدولوەهاب دا. بۆیە ئەوان دوای ئەوەی لە شەڕە یەك لەدوای یەکەکاندا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، هەموو وڵاتی حیجازیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوەو «وەهابیەت»یان وەك ئایینی رەسمی ئەم وڵاتە ڕاگەیاند. پاش مەرگی موحەممەدی کوڕی سعوود لە ساڵی ۱۷۶۰ی زایینیدا، عەبدولعەزیزی کوڕی دەسەڵات گرتەدەست و لە سەردەمی ئەودا رووبەری دەسەڵاتەکەیان گەلێ بەربڵاوتر بۆوەو گەیشتە عێراقیش. پاشانیش بەرەبەرە.وەك رکابەرێکی جیدی دەوڵەتی عوسمانی خۆی نیشان داو بوو بە هەڕەشە بۆسەر ئەم دەسەڵاتە ئیسلامیە.

وەك پێشتر باسم کرد، دوای ئبن تەیمییەو ئیمامی غەزاڵی، کێشەی نێوان فەلسەفییەکان و دژە فەلسەفییەکان لەسەر خواناسی و کوفر و بیدعەو چەمکە ئیسلامییەکانی تر درێژەی پەیدا کرد و دیارە لەم قۆناغەدا موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب لەسەر میتۆدی سەلەفییەت دژ بە فەلسەفەو کەلام و بەلاغە وەستاوەتەوە. بە پێچەوانەوە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا سۆفیگەری و فەلسەفەخوازی لە برەودا بوو و ئەمەش یەکێکی تر بوو لە کێشەو خاڵە ناکۆکەکانی نێوان ئەم دوو دەسەڵاتە ئیسلامیەی ئەو سەردەمە. ئەم ناکۆکییە لە ئاستێکدا بوو کە یەککگرتوویی (فهم) و (کلمه)و (منهج) لە ناو چوو بوو و پەرش وبڵاویەکی گەورە عالەمی ئیسلامی تەنیبۆوە. عوسمانییەکان خۆیان عەجەم بوون و زیاتریش لە ناوچە عەجەم نشینەکاندا دەسەڵاتدار بوون، لە ناو ئەواندا رەمزی پابەندبوون بە دین بریتی بوو لە سۆفیگەری واتە (تصوف).

سەرەنجام ئەم دوو دەسەڵاتە واتە عوسمانییەکان و وەهابییەکان بەگژ یەکدا چوونەوەو شەڕێکی بەردەوامی چەند ساڵە لە نێوانیاندا هاتە ئاراوە، رەنگە راست نەبێ ئەگەر بوترێ ئەوان یەکتریان بە کافر زانیوە بەڵام هەڵەمان نەکردووە ئەگەر بڵێین بە مەبەستی ئیدارەو مەسڵەحەتی گەورەتر(توقیە)یان لەگەڵ یەکتر کردووە. (توقیە لە زمانی عەرەبیدا بە مانای ئەوەیە کە لە کاتی ترسی تیاچوون و تەنگانەدا بیروباوەڕی خۆت دەرنەخەیت و بیشاریتەوەو بە بیروباوەڕی کەس یان

لایەنی دەسەڵاتدار رازی بێت) بۆیە من پێم وایە شەڕی نێوان عوسمانییەکان و وەهابییەکان زیاتر لەسەر دەسەڵات بووە تا لەسەر عەقیدەو مەنهەج. بەم شێوەیە حکوومەتی بەنی سعوود لەسەر بنەمای ئەندێشەکانی موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب کە درێژەپێدەری رێبازی ئبن تەیمییەو سەلەفییەت بوو، دامەزراو گەشەی کردو ئەتوانین ئەمە بە یەکەم دەرکەوتنی رێکخراوەیی و بە یەکەم حکوومەتی سەلەفییەت لە قەڵەم بدەین.

**ئەڵبەت هەندێ لە مێژوونووسان گومانێك دەخەنە سەر حکوومەتی بەنی سعوود گوایە بریتانیا کە ئەودەم دژبەرێکی ئیمپراتۆریای عوسمانی بوو دەستی هەبووە لە هاتنەسەرکار و بەهێزبوونەوەی وەهابییەکان و بەنی سعووددا. ئایا لە بنەڕەتدا بریتانیا رۆڵی گێڕاوە لە دروستبوونی ئەو حکوومەتەداو ئەگەر بوویەتی بە چ ئاست و شێوەیەك بووە؟**

من لەگەڵ ئەوەدا نیم ئەم دەوڵەتە یەکسەر لەژێر سێبەری ئیستیعماری ئینگلیزدا بووبێت و بە پشتیوانی ئینگلیزییەکان سەری هەڵدابێ، بەڵام ئەبێ دان بەوەدا بنێم کە ئەوکات ئینگلیزییەکان و فەرەنسییەکان دوژمنی سەرسەختی عوسمانی بوون بۆیە جێی سەرسووڕمان نییە ئەگەر ئینگلیز و دەوڵەتی یەکەمی سعوود بۆ لاوازکردن و شکستدانی عوسمانییەکان و بەهێزکردن و هێشتنەوەی دەسەڵاتی خۆیان لە بەرانبەر هێزە بێشومارەکانی عوسمانیدا سوودیان لە یەکتر وەرگرتبێ.
لە سەردەمی عەبدولعەزیز لە ساڵی ١٨٠٠ی زایینیدا کێشەو مشتومڕی دەسەڵات ئەکەوێتە نێوان ئەو و بنەماڵەی خەزووری واتە بنەماڵی شێخ موحەممەد بن عەبدولوەهابەوە (پاش مردنی موحەممەد بن عەبدولوەهاب، عەبدوڵڵای کوڕی شوێنی گرتبۆوە). ئینگلیزییەکان موداخەلەی کێشەکەیان کردووەو رێکیان خستوونەتەوە، رێکخستنەوەکەش لەسەر ئەوە بووە کە دین و دەوڵەت بە جیا ئیدارە بکرێت واتە بنەماڵەی شێخ کاروباری دینیی وڵات بەڕێوە بەرن و کاروباری ئیداری ودەوڵەتدارییش لە لایەن بنەماڵەی سعوودەوە راپەڕێنرێت. هەروەها دوای رووخانی دەوڵەتی یەکەمی بەنی سعوود بە دەستی ئیبراهیم پاشای عوسمانی و دوور خستنەوەو لە سێدارەدانی نزیکەی چوارسەد کەس لە ئەندامانی هەردوو بنەماڵەکەی عەبدولوەهاب و سعوود و وێرانکردنی شاری دەرعییە، دەوڵەتی دووهەمی بەنی سعوود بە پاڵنەری و یارمەتی ئینگلیزییەکان دامەزرایەوە. مەبەست لەم هاندان و پشتیوانیکردنەش لاوازکردن و دژایەتیکردنی عوسمانییەکان بوو. هەر لە چوارچێوەی ئەم پشتیوانیکردنەدا بوو کە سوپای ئینگلیز لە ساڵی ١٨٢٠ی زایینیدا لە رێگای دەریاوەو بە پشتیوانی ئاگری تۆپە دەریاییەکان، چووە سەر شاری (رأس الخیمە) و بە تەواوی وێرانی کرد.
بۆیە لەگەڵ ئەوەدا کە حاشا لە یارمەتیدان و پشتیوانیکردنی ئینگلیزییەکان لە بەنی سعوود ناکەم بەڵام پێم وانییە ئەو حکوومەتە یەکسەر دەسکردی ئەوان بووبێت و خاوەن هیچ شەرعییەتێکی خەڵکی و جەماوەریی نەبووبێ. ئینگلیز تەنیا لەبەر دژایەتیکردنی عوسمانییەکان پشتیوانی لە وەهابییەکان و بەنی سعوود کردووە نەك ئەوەی لایەنگری بیروباوەڕی سەلەفییەت و وەهابییەت بووبێت.

**ئێستە تا رادەیەك لە چۆنیەتی سەرهەڵدان و گەشەکردنی بیری سەلەفی لە رووی مێژووییەوە تێگەیشتین و با جارێ واز لە گێڕانەوەی مێژوو بهێنین و بچینە سەر بنەماکانی عەقیدەی ئەم رێبازە فیکری و سیاسییەی دونیای ئیسلام. وەك دیارە گرنگترین خاڵی سەلەفییەت گەڕانەوەی راستەوخۆو بێناوبژییە بۆ دەقی ئایینی، واتە سەلەفییەت قاییل بەوەیە هەموو تاکێکی موسوڵمان بۆی هەیە کتێبی پیرۆز بخوێنێتەوەو خوێندنەوەی تایبەتی خۆی بۆ بکات. ئەمە لە حاڵێکدایە**

که له دینی سوننەتیدا خەڵکی ئاسایی ناتوانن ڕاستەوخۆ دەست بدەنە تەفسیرکردنی قورئان و پێویستە لە ڕێگەی موفتی و مامۆستاکانەوە لە قورئان رابمێنن. بۆچی سەلەفییەت ئەم گۆڕانەی دروست کرد و ڕەخساندنی دەرفەتی لێوردبوونەوەی تاکی لە دەقی دینی ئەتوانێ چ شتێکی تازە پێشکەش بە دینی ئیسلام بکات.؟

بەڵێ هەر موسوڵمانێك بۆی هەیە قورئان بخوێنێتەوە بەڵام ئەگەر مەبەست لە خوێندنەوەی تایبەت، تەفسیر و لێکدانەوە بێ پێویستە بڵێم ئەوە بۆ هەموو تاکتیك یان هەموو ئاستێك نییە بەڵکوو ئەبێ ئەو ئەهلییەتەی کە تاکێك لە ڕووی خوێندنەوەوە بە دەستی هێناوە پلەو پایەی موفەسیری پێ بدات. منیش دەقاودەق ئەو ڕایەتانم قبووڵە کە لە دینی سوننەتیدا خەڵکی ئاسایی ناتوانن ڕاستەوخۆ دەست بدەنە تەفسیرکردنی قورئان و پێویستە لە ڕێگەی موفتی و مامۆستاکانەوە لە قورئان رابمێنن و لەسەر ئەو باوەڕە نیم سەلەفییەت کە لە ڕوانگەی منەوە مانای دینداریی ڕاستەقینە ئەدات شتێکی تازەی بەو تێڕوانینە کۆنە (سوننەتییە) زیاد کردبێت. نە خۆم لە وەڵامی پرسیارەکانی پێشوودا ئاوەها شتێکم وتووەو نە شتێکی وایشم لە سەلەفییەکانەوە بیستووە، مەگەر ئەوەی کەسێك تازە باوەشی بە ئایینەکەی باو و باپیرانیدا کردبێتەوەو گڕ و کفی گەنجێتی و کەم ئەزموونی و تازەکاری تووشی هەندێ حەماسەتی هەڵەو پەلەی کردبێ.
بەڵام سەبارەت بە دوابەشی پرسیارەکەتان کە وتووتانە سەلەفییەت ئاوا دەرفەتێکی رەخساندووە، من پێم وایە دینەکە بۆخۆی وایە نەك ئەوەی سەلەفییەت دەرفەتی ڕەخساندبێت. خوای گەورە لە ئایەتی ٢١ ی سووڕەتی ئەلحەشردا دەفەرموێ: {..... رسوله الأ○مين و تلك الامثل نضر بهالناس لعلهم ينفكرون }واتە:«ئەوانە کۆمەڵە نموونەیەکن کە بۆ خەڵکی ئەهێنینەوە تاکوو بیر بکەنەوە». کەواتە خوای گەورە لە ڕێگەی نووری قورئان و هیدایەتەکانییەوە زۆر پێداگرانەو بە (اصرار)ەوە هانمان ئەدا تاکوو سەرنجی ئەو نموونانە بدەین کە قورئان بۆی گێڕاوینەتەوە. بەڵام ئەم ڕامان و شیکردنەوەو تەفسیرانە هەروا هەڕەمەکی و خۆڕایی نییە کە هەر کەسەو لە ئاستی خۆیەوە بە پێی تێگەیشتن و عەقڵییەتی خۆی لێکدانەوەی بۆ بکات. وەك پێشتریش باسم کرد پێویستە کەسێك دەقەکان لێکبداتەوە کە ئاگادارییەکی تەواوی لە نزیکترین جیل بە سەردەمی دابەزینی قورئان و شێوەی تێگەیشتنی ئەو جیلە لە تەفسیرکردنی قورئان هەبێ، ئەبێ بزانێت ئەوان لە کوێدا یان لە چ بەشێکی دەقەکەدا پێیان وابووە مەجالی زیاد بیر لێکردنەوەو بڕەودان بە شیکردنەوەی دەقەکە هەیە تاکوو ئەویش ئاواو بەم شێوازە پەرەی پێ بدات، نەك بە ئارەزووی خۆی بیرۆکە بهێنێ و تێکەڵی بیروبۆچوونی ئەهلی ئیسلام و زانایانی ئیسلامی بکات و ئیتر حەق و ناحەق تێکەڵاو بێت و نەناسرێتەوە.
بە پێی ئەو مەرجانەی کە باسمان کرد و لە ڕێی ئەم نموونانەوە، پێتان ئەڵێم کە ئەتوانین چ شتێکی تازە پێشکەش بە دینی ئیسلام بکەین:
١-لە ڕێی (فوائد)ەوە ئەتوانین قازانجی تازە لە ئایەتەکان وەربگرین وەك چۆن ئبن قەییم لە کتێبی (فوائد)دا باسی کردووە.
٢-ئەتوانین لە ژێر سێبەری خودی قورئاندا تەفسیری تازە بۆ قورئان بکەین بە مەرجێك لە ئەسڵەکان لانەدەین، وەکوو ئەوەی (سيد قطب) له (فی الضلال القران)دا نووسیویەو کاری پێ کردووە.
٣-ئەتوانین مانای ئایەتێك بە ئایەتێکی تر لێك بدەینەوە وەك ئیمامی (سونقەیتی مووریتانی) کە هاوچەرخی خۆمانەو چل ساڵێك ئەبێ مردووە. ئەو لە کتێبی (اضـواء البيـان فـى شرع القران بـالقرآن)دا باسی ئەم شێوازەی کردووەو بە کردەوەش بەڕێوەی بردووە. هەرچەند سێ بەرگی کتێبەیشی بۆ تەواو نەکرا بەڵام دواتر یەکێك لە قوتابییەکانی ئەم کارەی کرد، ئەم کتێبە لە ناو تەفسیرەکاندا لە ڕیزی تەفسیرە یەکەمەکاندایەو لە شێوەو شێوازی خۆیدا هێشتا هەر یەکەمە.

٤-دۆزینەوەو ئاشکرا بوونی ئیعجازەکانی قورئان، وەك پەنجەمۆری مرۆڤەکان کە هەرکەسەو پەنجەمۆری خۆی هەیەو هی هیچ کەس لەوی تر ناچێت. ئەمە لە قورئاندا ئاماژەی پێ کراوەو پاشان لە رووی زانستییشەوە سەلمێندراوە. تەفسیرکەرانی سەلەف وتوویانە یەکێك لە باشترین تەفسیرکەرانی قورئان زەمەنە کە تاکوو زیاتر براوەتە پێش، شتی سەرسووڕهێنەرتر لە قورئاندا ئەدۆزرێتەوە.

٥-نموونەیەکی زۆر تازەتریش هەیە کە (ئەبوو قەتادەی فەڵەستینی) پێشکەشی کردووە. ئەو لە سەردەمی شەڕی ئیسلامییەکانی جەزایر و حکوومەتی ئەو وڵاتەدا، بە مەبەستی پشتیوانیکردن لە ئیسلامییەکان زنجیرە وتارێکی لە گۆڤارێکدا بڵاو کردەوە کە لە لەندەن دەرئەچوو. پاشان ئەم زنجیرە وتارە لە دووتوێی کتێبێکدا بەناوی (مقالات بین منهجین) بڵاو کرایەوەو دواتریش بە شێوەیەکی رێکوپێکتر و لە ژێر ناوی (الجهاد و الاجتهاد)دا لە لایەن دەزگایەکی چاپ و پەخشەوەو بڵاوکرایەوە.

ئەڵبەت لێرەدا مەبەست لە خوێندنەوەی تاکی ئەوەیە کە ئیجازە بە هەموو تاکێکی موسوڵمان ئەدرێ خۆی راستەوخۆ قورئان بخوێنێتەوەو بە پێی تێگەیشتنی خۆی لەو دەق و ئایەتانە تەفسیری چەمکە دینییەکان بکات. ئەوەی شایانی ئاماژە پێدانە ئەوەیە کە لەم جۆرە خوێندنەوەیەدا تێگەیشتنەکان زیاتر تێگەیشتنی رووکەشن و کەمتر قووڵبوونەوەیان تێدا ئەبینین، یان بە زمانێکی تر روونکردنەوەو دەرکێشانی پەیام و ناوەرۆکە شاراوەکان لە وشەو ئایەتەکانی قورئاندا بایەخێکی ئەوتۆی نامێنێ و تەنیا واتا رووکەش و ئاشکراو روونەکان دەکەونە بەرچاو. ئایا سڕینەوەی موفتی و موفەسیرەکان و راستەوخۆبوونەوەی پێوەندیی تاکەکان لەگەڵ قورئاندا ناتوانێ ببێتە هۆی سادە بوونەوەو لە مانا خاڵیبوونەوەی قورئان؟

لە لایەکی ترەوە پێشتر تا کەسێك لە حوجرەو لای مامۆستایانی زانکۆ و جامیعەو مەکتەبە ئیسلامییەکان نەیخوێندایەت و بڕوانامەی لەو سەرچاوە باوەڕپێکراوانەی کۆمەڵگاوە وەرنەگرتبایەت بۆی نەبوو وەك چالاك یا خود مامۆستاو تەفسیرکەری دینی کار بکات. بەڵام لەم میکانیزم و سیستەمە تاکییەدا چ پێوەر و کەسێك پێمان ئەڵێ کێ سەلاحییەتی ئەو کارەی هەیەو کێ نییەتی؟

وابزانم پێشتر وەڵامی ئەم پرسیارەم داوەتەوەو نازانم مەبەست لە دووبارەبوونەوەی چییە. سەلەف و خەلەف لێکدانەوەو تەفسیری قورئان بە بێ عیلم و ئەهلییەت بە هەڵە ئەزانن. ئەگەر شتێك بنەماکەی هەڵە بێ ئیتر چ مانایەکی هەیە قووڵبوونەوەی تیابێت یان نا؟! قاعیدەیەکی ئوسوولییمان هەیە کە ئەڵێ: {ما بُني على الفاسد فهو فاسد}، واتە هەر شتێك لەسەر ئەساسێکی خراپ ساز بکرێت، بەرهەم و سازکراوەکەیشی خراپە.

منیش وەك ئێوە دژی ئەوەم مانای قورئان بە رووکەش تێبگەین، قورئان پەیامێکی ئاسمانی پیرۆزە چ بە شێوەی رووکەش سوودی لێوەربگیرێت یان لە رێگەی (صحیح)ەوە واتە بە عیلمەوە، ئەوا هەریەکەو لە ئاستێکدا لە خێر و بەرەکەتی ئەم پەیامە پیرۆزە بەهرەمەندت ئەکا. هەروەك چۆن لە کوردەواری کۆنی خۆیشماندا باو بووە، پێم وایە نابێ کەسی بێ عیلم و نەخوێندەوار خۆی لە قەرەی تەفسیری قورئان بدات. بە گشتی قاییل بە لێکدانەوەی تاکی بۆ قورئان نیم و میکانیزمی بێ سەرەوبەرەی خۆ فڕێدانە ناو مانای قورئانەوە رەت ئەکەمەوە. سەنگی محەکی ئیزندان بە

لێکدانەوەی قورئان ئەوەیە کە پێویستە موفەسیر چاو لە زانا گەورەکان بکات و قسەی ئەوان بکاتە پاڵپشتی قسەکانی خۆی، ئەو کاتەیە کە کارایی و سوودەکانی ئەوەی کە خوێندوویەتی، دەرئەکەوێت. بێگومان ئەگەر کەسی تەفسیرکەر ئەم شێوەیە بەکار بهێنێت ئەوا روون ئەبێتەوە تا چەند لەسەر رێی راستەو چەندەش بە لارێدا چووە.

کەواتە ئەوە رەت دەکەیتەوە کە سەلەفییەکان لە تەفسیرکردن و ئیزندان بە تەفسیرکردندا گەلێ ئاسانگیرن و ماڤ ئەوکارە تەنانەت بەو کەسانەش ئەدەن کەپسپۆڕایەتییەکی تایبەتیان لە زانستە ئیسلامییەکاندا نییەو تەنیا باوەڕیان بەو دینە هەیە؟ بیرمان نەچێ سەلەفییەکان ئەڵێن قورئان کتێبێکی موبین و روونەو پێویست ناکات لە خۆڕا قووڵی بکەینەوەو مانای سەیر و سەمەری فەلسەفییانەی بۆ هەڵێنجێنین. تەنانەت یەک لە هۆکارەکانی دژایەتیکردنی فەلسەفەش هەر ئەمەیەو بە باوەڕی سەلەفییەت فەلسەفەو کەلام و بەلاغە قورئان سەخت ئەکەنەوەو ناهێڵن جەماوەری موسوڵمان بە ئاسانی لێی بگات. کەچی ئەوەی تۆ دەیڵێی رێک ئەو شتەیە کە لای سوننەتگەراکان ئەیبینین، بەڵام لە راستیدا سەلەفییەکان لەم بارەیەوە جیاواز لە دیدی سوننەتییانە بیر ئەکەنەوە. بۆیە زیاتر لەوەی مەبەستمان بۆچوونی شەخسی جەنابت بێ مەبەستمان ناسینی بۆچوونی سەلەفییەتە بە گشتی سەبارەت بە چۆنیەتیی خوێندنەوەو بەکارهێنانی قورئان، رەنگە ئالەم مەسەلەیەدا بۆچوونی جەنابت لەگەڵ سەلەفییەتدا یەک نەگرێتەوە.

با جارێ واز لە رای من و قسەی من بهێنین. جیاوازییەک کە لەم بارەیەوە لە نێوان سەلەڤ و ناسەلەفیدا هەیە ئەوەیە کە ناسەلەفییەکان دان بە هەندێ لە واتا راستەوخۆکانی قورئاندا نانێن و ئەڵێن مرۆڤ توانای تێگەیشتنی زۆرێک لە ئایەتەکانی نییە، بە تایبەت لە پۆلێنبەندی ئایەتە (مُتشابە)کاندا کە پێچەوانەی ئایەتە (مُحکم)کانەو لە ۲۹ سوورەتی قورئاندا بەرچاو ئەکەون. هەروەها حەدیس و فەرمایشی (احاد) بۆ وەرگرتنی زۆرێک لە ئەحکامەکان رەت ئەکەنەوەو پێیان وایە وەرگرتنی فەرموودەیەک کە تەنها یەک هاوەڵ گێڕابێتییەوە یاخود لێی گێڕدرابێتەوە نامومکینە. بە تایبەتی کە ئەحکام شتێکی هەوانتە نییەو نابێ تەنها لەسەر ئەساسی یەک فەرموودەی ئاوا، ئەحکام دابڕێژرێت. لە بەرانبەردا سەلەفییەکان پێیان وایە کۆی قورئان بۆ مرۆڤ و بۆ جن کە وەکوو مرۆڤ هاتۆتە خوار، سادە دارێژراوە تاکوو مرۆڤ تێی بگات و لە راستیدا هیچی تیا نییە کە مرۆڤ نەتوانێ لێی بگات چونکوو ئەگەر وانەبووایە ئەوا موبینبوونی قورئان (روون و ئاشکرابوونی) رەت ئەکرایەوەو ئەمەش وەکوو ئەوە وایە کە بەشێکی قورئان رەت بکەیتەوەو لەگەڵ رەتکردنەوەی هەموو قورئاندا هیچ جیاوازییەکی نییە.

ئایەتە موتەشابیهەکان جۆرێک دارێژراون کە چەندین تەفسیر هەڵئەگرن و لە هەرکامی ئەم تەفسیرانە تێگەیشتین ئەتوانین کاری پێ بکەین ئەگەرنا ئەتوانین لە رێی فەرموودەوە لێی بگەین و کاری پێ بکەین. هیچ کاتیش تەفسیرەکردنەوەی ئەم ئایەتانە لە یەک تەفسیردا کورت ناکرێتەوە و هەموو تەفسیرە راستەکان سەلمێنەری ئەوەن کە خوای گەورە هەر خۆی واتای راستەقینەیان ئەزانێت و لەوانەیە ئەم تەفسیرەی مەبەست بووبێ یاخود فلان تەفسیری تر و....هتد. ئایەتی موحکەمیشمان هەیە کە ماناکەی راستەوخۆ لە رووکەش و رواڵەتی ئایەتەکەدا دەردەکەوێ، بۆ نموونە بڕینی دەستی دز

که مەبەستەکەی بە تەواوی ئاشکرایە. بەڵام سەرباری ئەمەش هێشتا هەندێ بەشی ئەم ئایەتانەش ناروونەو تەنیا لە ڕێگەی فەرموودەوە ئەتوانین لەو لایەنە نامەعلوومانە بگەین و ڕێگەی جێبەجێکردنیان بدۆزینەوە، ئالێرەدایە ڕۆڵی گرنگی فەرموودەو زانستی ڕیوایەت و پیاوانی بەستێنی گێڕانەوە دەرئەکەوێ. لەمەشدا جیاوازییەك لە نێوان سەلەفی و ناسەلەفیدا هەیە، سەلەفییەکان ئەڵێن زۆربەی هەرە زۆری ئەحکامە سەرەکی و گرنگ و بنەڕەتییەکانی ئیسلام لە سەر بنەمای فەرموودەی جۆری (احاد) واتە ئەو فەرموودانەی لە یەك سەرچاوە وەرگیراون و سەرچاوەکەش تەنیا ئاماژە بە گێڕانەوەی یەك هاوەڵ ئەدات، دامەزراوە. جا ئەگەر لە ئەحکامدا واز لە فەرموودەی ئاحاد بهێنین زۆربەی زۆری ئەحکامە ئیسلامییەکان (تعطیل) ئەبن یان ئەگەری ئەو دێتە ئاراوە کە بە پێی دەقی ئایەتەکان ئیسلام زۆر زۆر دوورە لە ئاوا حاڵەتێك و ئیتر ئەو کاتە سەرجەم دینەکە ئەکەوێتە بەر گومان و پرسیارەوەو بە ناچار ئەبێ شتی تر تێکەڵ بە دینی ئیسلام بکرێت کە بە هیچ جۆرێك لە ئیسلامدا ڕێگەی پێ نەدراوە. بۆ نموونە هەرچەند بە ئاشکرا باسی بڕینی دەستی دز کراوە بەڵام خۆ وردەکارییەکانی دیاری نەکراوە واتە دیاری نەکراوە بڕی ئەو دزییەی کە ئەبێتە هۆی بڕینی دەستی دزێك ئەبێ چەند بێت یان لە ئاست دزی کۆیلەدا ئەبێ چی بکرێت، ئەگەر دزەکە کافر بوو ئەبێ چی لێ بکرێت، لە دزیکردنی کافر لە کافردا چۆن بکەین و چەندەها شتی تری لەم بابەتە کە هەموو ئەمانە تەنیا لە ڕێگەی وردبوونەوە لە ڕەفتاری پێغەمبەری ئیسلام (سڵاو و درودی خوای لێ بێ) و هاوەڵەکانیەوە ڕوون ئەبێتەوە. هەروەها پێویستە ڕەفتاری ئەوانیش بە پێی شێوازی تێگەیشتن واتە (فهم)ی سەلەف لێکبدرێتەوە نەك هەر یەکەو بە ناوی زانایی و فەیلەسوفگەراییەوە بە مەیلی خۆی واتاو مانای بۆ هەڵبژێرێ.

ئالێرەدا ڕۆڵی ڕیوایەت برەو پەیدا ئەکات و بمانەوێ و نەمانەوێ ڕیوایەتیش هەندێکی بە شێوەی ئاحاد بە دەستمان گەیشتووەو بە درێژایی مێژوو زانایانی ئیسلامی کاریان پێ کردووە. بۆیە سەلەفییەکان ئەڵێن: «ئەگەر واز لە فەرموودەی ئاحاد بۆ ئەحکام بهێنین ئەوا وازمان لە بەشێکی گەورەی ئیسلام هێناوە چونکوو هەندێ لە ئەحکامەکانیمان نامەعلووم کردووە. ئەمە بە مانای وازهێنانە لە زۆرێك لە ئەحکامە سەرەکییەکان یاخود بە مانای وازهێنانە لە خەڵك تاکوو هەر کەسەو بە ئەقڵ و ماریفەی خۆی ڕایان لەسەر بدات و هەردووکی ئەمانەش لە ڕوانگەی سەلەفییەتەوە ڕەت و هەڵەیە.» لە ڕوانگەی سەلەفییەتەوە باشتر وابوو فەرموودەکان لە چەند سەرچاوەو هاوەڵێکەوە وەربگیرایەو لەو ئاحادبوونە دەربهاتایە بەڵام مادام لە سەرچاوەی ڕاست و باوەڕپێکراویشەوە بیسراوەو یەك هاوەڵ گێڕاویەتەوە، ئەوە جێگای نکۆڵیکردن نییە بەڵکوو پێویستە هۆکاری تاك سەرچاوەبوونی بگەڕێنینەوە بۆلای خواو ئەو موقەدەراتەی کە تەقدیری کردووەو بە تەواوی باوەڕمان پێیەتی. خوای گەورە هەر خۆی لە حیکمەتی ئەم مەسەلەیە ئەگات و بێگومان حیکمەتی زۆری تیادا بینراوە کە لێرەدا دەرفەتی شیکردنەوەیمان نییە.

**لە جێگەیەکدا باسی ئەوەت کرد کە دەکرێ بە پێی زەمەن تەفسیری تازە بۆ قورئان بکرێ. ئایا ئەمە بۆ ئەوەیە کە دینی ئیسلام لەگەڵ دیاردەو هەلومەرجە نوێیەکانی سەردەمدا بگونجێنرێ و بتوانێ وەڵامدەرەوەی سەردەم بێت؟ ئەگەر وایە ئەی گەڕانەوە بۆ سەلەف و ڕابردوو چ مانایەکی هەیەو ئایا ئەم دوو شتە دژایەتییەکی جەوهەرییان پێکەوە نییە؟**

نەخێر مەبەستم ئەوە نییە بە پێی زەمەن تەفسیرەکان تازە بکرێنەوە تاکوو دیاردەو هەلومەرجەکانی سەردەم وەڵام بدرێتەوە. بەکارهێنانی قورئان مادام بە شێوەی (صحیح) واتە بە عیلمەوە بێت ئەگەر تەنانەت لەسەر شێوازە کۆن و سوننەتیەکەش بێ، وەڵامی هەموو سەردەمێکە تا قیامەت. بەڵام کاتێك ئەڵێن زەمەن باشترین تەفسیری قورئانە –ئەڵبەت ئەمە قسەی زاناکانمانە– مەبەستمان ئەوەیە هەرچی زەمەن بەرەوپێش بڕوات زیاتر خونچەی گوڵە پڕ ماناو پڕ پیت و بەرەکەتەکانی قورئان ئەپشکوون و پەردە لە سەر ئەسراری فەرمایشەکانی خوای گەورە لا ئەدرێت. وەك چۆن خوای پەروەردگار لە ئایەتی ٥٣ی سوورەتی فورقان و ئایەتی ١٩ی سوورەتی رەحماندا باسی دوو دەریای کردووە کە پێکەوەن بەڵام ئاوەکانیان تێکەڵ نابێت. ئێستاکە ئەو ئاوانە دۆزراونەتەوەو وێنەکانیشیان بڵاوبۆتەوەو هەموو کەس ئەتوانێ بیانبینێ و گەورەیی دەسەڵاتی خوای بۆ دەربکەوێ.

ئاشکرایە هیچ گۆڕنکارییەکی تازەی سەردەم بە تەفسیری تازەی قورئان گرێکەی ناکرێتەوەو ئەم تەفسیرە تازانە زیاترمرۆڤەکان بەرەو دوورکەوتنەوە لە قورئان و ماناو تەفسیرەکانی ئەم پەیامە پیرۆزە ئەبات. ئەڵێن قورئان شیفایە بۆیە منیش ئەڵێم ئەو کاتە شیفایە کە وەکوو خۆی سوودی لێوەر بگرین و ئەمە هەرگیز بەو مانایە نییە ئەگەر نەخۆش بووین سەردانی پزیشك نەکەین و تەنیا قورئان بخوێنینەوە.

مەبەست لە خستنە روو و پێداگری لەسەر پرسی تەفسیرکردن و لێکدانەوەی قورئان دۆزینەوەی هۆکارەکانی یەك لە گەورەترین پرسیار و گرفتەکانی بەردەم بزاڤی ئیسلامی سەلەفییە. وەك بۆ خۆیشت دەزانیت هەم ئیسلامییە میانڕەوەکان و هەم لایەنە نائیسلامییەکان ئەو رەخنەیە لە سەلەفییەکان دەگرن کە لە تەکفیرکردندا زۆر خێراکەر و ئاسانگیرن و بە شێوەی رووکەشیانەو بە گۆترە حوکمی تەکفیر دەردەکەن. بۆیە پێویستە هۆکارەکانی بەربڵاوبوونەوەی لە رادەبەدەری بازنەی تەکفیر بناسین و بزانین بۆچی ئاوا رەوتێك دروست بووە. بەڵام بەرلەوەی راستەوخۆو بە چڕوپڕی بچینە سەر ئەو باسە با سەرەتا لە خودی دەستەواژەی «تەکفیر» بکۆڵینەوە. لە بنەڕەتدا تەکفیر چییەو کافر بەکێ دەوترێ؟

لە زمانی عەرەبیدا وشەی «کُفر» بە چاوگی وشەی «تەکفیر» دائەنرێت کە لە باری لوغەوییەوە مانای داپۆشینی شتێك ئەدات و ئەوەندەی من لێی بزانم بەو کردەوەیە ئەوترێ تەکفیر کە تیایدا بە شتێك شتێکی تر داپۆشرێت. بۆ تێگەیشتنی تەواو لە مانای ئەم وشەیە ئەتوانین لە (لسان العرب)ی (ابن منظور) یاخود (قاموس المحیط)، (منجد فی اللغة)، (معجم الوسیط) و (مختار الصحاح) و هەر قاموسێکی تر کەلك وەربگرین.

ئەڵبەت مەبەستی ئێمە مانا شەرعییەکەیە دەنا ئەتوانین لە کرۆکی وشەکەو حوکمەکەی لە شەرعدا تێبگەین. بە شێوەی جۆراوجۆر ٣٢٣ جار و لە دەوتوێی سەد وچەند ئایەتی قورئاندا وشەی (کُفر) هاتووە کە ئەمە ئاماژەیە بۆ بایەخی باسەکەو خوای گەورە مرۆڤەکانی بانگهێشتی بیرکردنەوەو رامان لەم بارەیەوە کردووە. هەرچەند وەکوو وشە

مێژووەکەی هاوتەریبە لەگەڵ مێژووی ١٤٠٠ ساڵەی دابەزینی قورئاندا کە باوەڕپێکراوترینی هەموو باوەڕپێکراوێکە، بەڵام ئەساسەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ هەمان سەرەتای درووستبوونی مرۆڤ. وەك چۆن خوای گەورە لە ئایەتی ٣٤ی سوورەتی بەقەرەدا ئەگێڕێتەوە چۆناوچۆن دوای دروستکردنی ئادەم فەرمانی بە مەلائیکەو جنۆکە داوە سوژدەی ڕێزی بۆ بەرن (بۆ ئادەم) بەڵام ئیبلیس لەبەر ئەوەی بەم فەرمانە رازی نەبوو، کەوتە ناو ریزی کافرانەوە. (واستکبر و کان من الکافرین) واتە خۆی بە گەورە گرت و ئەو دانەیەك لە کافرەکان بوو. ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە لە روانگەی ئیسلامەوە مێژووی کوفر هاوتەریبە لەگەڵ مێژووی (خیلقەتی) مرۆڤداو سەرەتای ئەو مشتومڕە ئەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای پەیدابوونی مرۆڤ لە سەر زەویدا. لە هەمان سەرەتاوە هەم ئیمان و هەم کوفر بۆ باوکمان ئادەم روون کراوەتەوەو داوای ئیمانی لێ کراوەو لەسەر ئەم ئەساسەش مژدەی پێدراوە، پێچەوانەی ئەمەشی بۆ باسکراوە کە کوفرەو بە نیسبەت ئەمەیشەوە تاقیکردنەوەی گەورەی تێپەڕاندووە. هەروەها هۆشداری دراوەتێ کە ئەگەر ڕێگای کوفر بگرێتە بەر و لەم ڕێگایەدا بمرێ چی بەسەر دێت و چۆناوچۆن تووشی عەزاب و سزا ئەبێتەوەو بە چ ئەنجامێك ئەگات.

کردەوەی کوفر بەوە پێناسە ئەکرێ کە کەسێك ئیسلامی پێ بگات یان بە جوانی تێبگەیەنرێ و بۆی باس بکرێ یان ئەگەر جوانیش بۆی باس نەکرێ خۆی زرنگ بێت و بزانێ ئیسلام چییە بەڵام سەرباری هەموو ئەمانەش نەکەوێتە شوێنی و نەیکاتە مەنهەج و بەرنامەی ژیانی خۆی، ئاوەها کردەوەیەك پێی ئەوترێ «کوفر». ئەتوانین وەك نموونەی مێژوویی ئاماژە بە هێراکلیتۆس بکەین کە لە رێی ئاسماننناس و زاناکانەوە لەوە گەیشتبوو کە ئیسلام دینی راستەقینەیەو دینەکانی تر مەحو ئەکاتەوەو موحەممەدیش دوایین پێغەمبەری دوایین سەردەمە (ئاخر زەمان) بەڵام سەرباری ئەوەش ئەو بە نوێنەرەکەی پێغەمبەری ئیسلامی وت:«من ئیمانی پێ ناهێنم بەڵام دژایەتیشی ناکەم».

هەروەها ئەبوو تالیب سەرەڕای ئەو هەموو یارمەتی و دۆستایەتی و پشتیوانییەی لە ئیسلام و موسوڵمانان و شەخسی پێغەمبەری ئیسلامی (سڵاو و دروودی خوای لێ بێ) کرد چونکوو بە تەواوی تەسلیمی ئیسلام نەبوو و ئیمانی نەهێنا، ناکەوێتە ناو بازنەی ئیمانەوەو بە کافر لەقەڵەم ئەدرێت. یان مونافیقەکان کە لە روواڵەتدا تەنانەت دۆستایەتییەکانیان گەیاندبووە سنووری یەکلاییبوونەوەو تەسلیمبوون بەڵام چونکوو لە ناخی دڵەوە پێڕەوییان لە بەرنامەی ئیسلامەوە نەکردووە بۆیە حیسابی ئەوەیان لەسەر ناکرێت کە بازنەی کوفریان بەجێ هێشتبێ و کەوتبێتنە ناو بازنەی ئیسلامەتییەوە. چ بگات بە ئەبوو جەهل و سەرانی کوفر کە ئەیانوت ئێمە گومانمان لە راستگۆیی موحەممەد و پێغەمبەرایەتییەکەیدا نییەو هەرچی ئەو بڵێت راستە بەڵام لەبەر ئەوە ئیمانی پێ نایەنین کە ئەو بە یەك چاو سەیری ئێمەی گەورەو سەرکردەی قورەیش و کۆیلەی وەك بیلال و سوهەیب ئەکات. کەواتە کێشەو مشتومڕی نێوان ئەوان و پێغەمبەر (سڵاو و درودی خوای لێ بێ) لە سەر بە گومانەوە سەیرکردن یان بە گومانەوە سەیرنەکردنی بەرنامەو پەیامەکە نەبووە بەڵکوو لەسەر پابەندنەبوون و کەوتنەشوێن یان نەکەوتنەشوێنی پەیامەکە بووە.

سەرباری باوەڕنەهێنان و موسوڵمان نەبوونیشیان؛ ئەوان واتە کەسانی وەك هیراکلیتۆس و ئەبوو تالیب و مونافیقەکان لە لایەن پێغەمبەرەوە دوژمنایەتی نەکران. هەرچەند مونافیقەکان ئەو هەمووە ئازاری رۆحی پێغەمبەر و هاوەڵانی ئەویان دا بەڵام پێغەمبەر ئامادە نەبوو تەنانەت بە شعوور برینداركردنێکیش ئەزیەتیان بکات. بۆ نموونە تا دوای مەرگی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کە سەرکردەو گەورەی مونافیقەکانی مەدینە بوو، کەس نەیئەزانی زۆربەی ئەو ئایەتانەی دژی

مونافیقەکان دانەبەزین یەکسەر شانی ئەویان ئەگرتەوە. ئەمە بە نیسبەت ئەو کەسانەوە بوو و ئەکرا کە ئیمانیان نەهێنابوو بەڵام دوژمنایەتی موسوڵمانانیشیان نەدەکرد. بەڵام بە نیسبەت کەسانی وەك ئەبوو سوفیان و ئەبوو لەهەب و ئومەییەی کوڕی خەلەف و عوقبەی کوڕی ئەبوو موعید و عوتبەی کوڕی رەبیعەو.....هتدەوە کە هەم پێداگرییان لەسەر کافربوونی خۆیان و هەمیش تەنکیدیان لە سەر شەڕ و دژایەتیکردنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئەکردەوە؛ بە رادەی پێویست دژایەتییان کراوە بەڵام زیاتر هەوڵی بانگهێشتکردن و راکێشانی ئەوان بۆلای ئیسلام دراوە. بە گشتی ئەوان بە نەرمی هەڵسووکەوتیان لەگەڵدا کراوە تاکوو کەسانێکیان لێ موسوڵمان بکرێت یان شەڕ و هەڕەشەیان لە سەر موسوڵمانان کەم بکرێتەوەو هەندێ جار موسوڵمانان لەم کارەدا سەرکەوتوو بوون.

جا با بزانین کافر کێیەو کێ تەکفیر دەکرێت و چ کەسێك تەکفیریان دەکات؟

هەموو ئەوانەی بە کردەوەی کوفر هەڵدەستن و لەسەری بەردەوام ئەبن، چ دۆست بن و دۆستایەتی بکەن چ دوژمن بن و دوژمنایەتی بکەن، وەك کافر دێنە ئەژمار. لە بەرانبەردا موسوڵمان ئەو کەسەیە بە تەواوی تەسلیمی ئیسلام بێت و خۆی لە ریزی کوفر دەربهێنێ. ئەو کەسانەش تەکفیر دەکرێن کە لە رێگای وردبوونەوەو تێڕامانی شەرعییەوە روون بێتەوە کە تەسلیمنەبوون و ملکەچ نەبوونیان پێوە دیارەو ئامادە نین پێڕەوی لە یاساو رێساکانی ئیسلامەوە بکەن. بەڵام ئەوەی کە کێ جورئەت ئەکات بەو ئاسانییە تەکفیری خەڵك بکات، ئەوە باسێکی زۆر گرنگەو گەلێ بەرهەم و بابەت و کتێبی بەرجەستەی لە بارەوە نووسراوە کە ئەتوانم وەك نموونە ئاماژە بە (الجامع فی طلب العلم الشریف) بکەم کە لە لایەن عەبدولقادر عەبدولعەزیزەوە نووسراوە. ئەو لەم کتێبەدا ئەڵێت: «کارەساتی تازە فتوای تازەی پێویستە چونکوو لە کۆنەوە وتراوە (الفتوا یُتغیر بتغیر الزمان و المکان) واتە بە پێی گۆڕانی کات و شوێن گۆڕانکاری بەسەر فتواو بڕیاریشدا دێت». هەروەها لەم بارەیەوە هەبوونی موفتی بە یەکێك لە مەرجەکانی تر دانراوە. ئەگەر لە شوێنێکیشدا مەرجە پێویستەکان نەهاتە دی و موفتی حوزووری نەبوو و کارەسات و رووداوەکان پێویستیان بە فتوا یان (قضـاء) بوو پێویستە (قاضی) یاخود دادوەرێك پەیدا بکرێت و کارەکەی پێ بسپێردرێ. مەرجی سەرەکی بۆ ئەم دادوەرەش ئەوەیە کە موجتەهید بێت واتە ئەوەندەی خوێندبێ کە بە پلەی ئیجتیهاد گەیشتبێ. بە پێی بۆچوونەکەی عەبدولقادر عەبدولعەزیز ئەگەر هیچکام لەمانەش نەبوون و پێویست بە فتوا بوو، کەسێك ئەتوانێ تەکفیر بکات کە ئاگادارییەکی تەواوی لەسەر ئیسلام و ئەحکامی تەکفیر هەبێ و لە رووی ناچارییەوە واتە مەجبوور بکرێت ئینجا بڕیار دەربکات. بە واتایەکی تر پێویستە ئەهلییەتی فتوا یان قەزا یان هەردووکیانی هەبێ ئینجا قسە لە تەکفیری خەڵك بکات، ئەویش لە کاتی زەروور و پێویستدا.

منیش ئەو راستییەم قبووڵە کە «تەکفیرکردن» گرفتێکی گەورەی بەردەم بزاڤی ئیسلامییە، بەڵام بێدەرمانیش نییە چونکوو هەر لە کۆنەوە ئەم کێشەیە لە ئارادا بووەو خەڵکی کێشەی لەمە گەورەتریشیان چارەسەر کردووە. بۆ دەرمانکردنیشی پێویستە بگەڕێنەوە سەر ئەو رەوشت و میتۆدەی کە ئیمامی عەلی بە نیسبەت خەواریجەکانی سەردەمی خۆیەوە پیادەی کرد. گلەییەکە لەوەدا دێتەوە سەر سەلەفییەکان کە ئەوان زیاتر باسیان لە تەکفیرکرن کردووەو ئەوانەش کە رێی راستەقینەیان نەگرتۆتە بەر و تەنانەت لە سەلەفییەکان جیابوونەتەوەو بە رێی چەواشەو چەوتدا رۆیشتوون هەر وەك سەلەفی حیسابیان بۆ کراوە. هەروەها رەنگە بە هۆی لێکنزیکبوونی تەسریحات و شێوازی

دەربڕین و گەیاندنی پەیامی دینیانەوە لە فەهمی سەلەف، ئەمانەش هەر بە سەلەفی هاتبێتنە ئەژمار. دەنا بە لاڕێداچوون و هەڵەو نەپێکانی کەس لەسەر کەسی تر ناکرێتە مالْ و سەلەفییەکانیش بەو ئاستە لە تەکفیرکردندا رووکەشیانە ناجووڵێنەوە.

بەوجۆرەی خوێندوومانەتەوەو بیستوومانە، لە بیری سەلەفیدا دە پازدە خالْ یان مەرجێك بۆ «کوفر» دیاری کراوەو ئەگەر کەسێك هەڵگری یەك لەو مەرجانە بێت بە «کافر» لەقەڵەم ئەدرێت. بۆ وێنە دەڵێن ئەگەر کەسێك شەریك بۆ خودا بەهەر جۆر و شێوەیەك دابنێ، بە کافر دێتە ئەژمار. تکایە کۆی ئەو خالأنەمان بۆ دەستنیشان بکە تا لەو سونگەیەوە زیاتر لە باسەکە وردبینەوە.

لە شێوازی پرسیارەکەتاندا وادیارە مەبەستتان ئەو خالأنەیە کە «موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب» لە کتێبی (نواقص الاسلام)دا باسی کردووە. ئەو خالأنە کە ژمارەیان ١٤ دانەیەو وەك پرەنسیپەکانی سەلەفییەت ناوبانگیان دەرکردووە، بەم شێوەی خوارەوەن:

١- الاستغاثە: واتە داوای کۆمەك و فریاگوزاری کردنی خێرا لە غەیری خوا وەك چۆن هەندێ کەسی کۆمەڵگای خۆمان لە کاتی سەختییەکاندا هاوار ئەکەن (یا شێخ عەبدولقادر گەیلانی).

٢-الاستعانە: هەمان مانای داواکردنی فریاگوزاری ئەدات بەلأم نەك بە شێوەی خێرا، وەك ئەوەی داوا لە شەخسە دارێك بکەیت کوڕت پێ بدات یان لە بەلأی خراپ لات بدات یاخود شیفات بدات.

٣-توکُل: پشت بەستن بە غەیری خوا، بۆ نموونە پەڕۆیەکی سەوز (میفرك) یان نووشتەیەك بکەیتە هۆکاری پاراستنی منالْێك یان خۆت یان مالْ و ملْکەکەت.

٤-خوف: ترس لە غەیری خوا، وەك ئەوەی وابزانی بایەقوشێك توانای ئەوەی هەیە زیانت پێ بگەیەنێ یان شوێنێك وێران بکات یاخود لەو باوەڕەدا بی کە خوێندنی ناوەختی کەڵەشێر نەهامەتییەو ئاماژەیە بۆ ناخۆشی و رووداوی خراپ.

٥-أمل: ئومێد بە غەیری خوا، بۆ نموونە وابزانی لە رێگەی بەختگرتنەوە یان دۆعای شێخ و مەشایەخەوە قازانجێکت پێ ئەگات بە تایبەت لە رێگای ئەو شێخانەوە کە مردوون.

٦-شرك القبور: بەو شرکە ئەوترێ شرکی قبوور کە بەهۆی قەبرپەرستی و بەناوی تەواف و زیارەتەوە تووشی مرۆڤ ئەبێ. هەر چەند هەموو مزگەوت و نیعمەتەکانی خوای گەورە پیرۆزن بەلأم لە ئیسلامدا تەنیا ئیجازەی سەردان و سەفەرکردنی سێ مزگەوت دراوە کە بریتین لە (کەعبە)و (مزگەوتی مەدینە)و (مزگەوتی بەیتولموقەدەس). هەروەها زیارەتی قەبرستانیش تەنیا بەو شێوەیە رەوایە کە لە سوننەتی پێغەمبەردا دیاری کراوەو لەوە بەدەر ناڕەوایەو مرۆڤ پێی تووشی لادان ئەبێت.

٧-نذر: خێرکردن و نەزردان بۆ غەیری خوا، ئەم نەزر کردنە بۆ هەر شتێك یان هەر کەسێك بێت فەرق ناکاو لە روانگەی شەرعەوە رەت کراوەیەو مرۆڤ لە دین دەرئەکات.

٨-یقین: دڵنیایی تەواو لە شتێك بە پێی گومان و بە پێچەوانەی حەق و راستییەکان، وەك ئەوەی بڵێی کێ لەو دونیاوە هاتۆتەوە یان لەو باوەڕەدا بی کە بەهەشت و جەهەننەم خەیاڵەو.....هتد.

٩-لفظ: یانی وتەو لەفزی مرۆڤ شتێکی تیا نەبێ کە لە دین دەری بکات، هەروەها پێویستە مرۆڤ بە زمان دان بە ئەسڵی ئیسلامدا بنێت و بە لەفز و وتە هیچ شتێك نەڵێت کە ئیمانەکەی بەتاڵ بکاتەوە.

١٠-عمل: واتە نابێ کەسی موسوڵمان بە کردەوە بچێتە ریزی ئەنساری تاغووت و پێچەوانەی ئیمانەکەی بجووڵێتەوە. بۆ نموونە تەنانەت نابێ ببێتە شورتە لەناو دەوڵەتێکدا کە بە یاسای خوا حوکم ناکات.

١١-تحاکم: مەبەست لە حوکمکردنە بە غەیری خوا بەو مانایە کە نابێ مرۆڤی موسوڵمان لە کاتی کێشەو گرفتدا حوکم بگێڕێتەوە بۆلای غەیری خواو بەرنامەی جیاواز لە بەرنامەی خوا. وەك ئەوەی ژنێك بۆ ڕێگرتن لە مێردەکەی کە ئەیەوێ ژنی بەسەردا بێنێ پەنا بۆ قانوون ببات و شکاتی پیاوەکەی بکاو بیەوێ ئەوەی کە شەرع بۆ پیاوەکەی داناوە، لە ڕێگەی قانوونەوە لێی مەنع بکات.

١٢-سحر: جادووکردن، مانای ئەوە ئەدات کە جۆرێك لە جۆرەکانی جادوو ئەنجام بدرێت یان کەسێکی موسوڵمان بۆ هەر کارێك و بە هەر مەبەستێك سەردانی لای جادووگەرێك بکات. یان هەوڵ بدەی لە ڕێگای جادووکردنەوە پیاوێك لەبەرچاوی ژنەکەی رەش بکەیت و بەینیان تێك بدەیت یاخود بە پێچەوانەوە. یان ئەنجامدانی هەرکام لەو هەزاران جۆرە جادووەی کە هەیە.

١٣-الایمان بالملائکە و الیوم الدین و الجنة و النار..... الخ فی الغیبیات: واتە باوەڕ و ئیمان بە مەلائیکەو ڕۆژی دوایی و بەهەشت و جەهەننەم و پێغەمبەران و ناوەکانی خوای گەورەو هەموو شتە ونەکان کە لە ئیسلامدا بە ئەسڵ گیراون.

١٤-الحب و الموالاة (الولاء و البراء): واتە خۆشەویستی و لایەنگریکردن یان رقلێبوون و دژایەتیکردن. وەلا و موالات مانای خۆشەویستی ئەدات بەو مانایە کە پێویستە مرۆڤی موسوڵمان خۆشەویستی خۆی بداتە ئیمانداران و لایەنگیریان لێ بکات و بەرائیش بەو مانایە کە مرۆڤی موسوڵمان حاشا لە دوژمنانی موسوڵمانان بکات و بەرائەت و نەفرەتی خۆی نیشان ئەوان بدات.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش کە دەتوانین دابەشی بکەین بەسەر چەند بەشێکدا، بە ئاستی یەکەم کوفر لە وشەدا بە مانای شاردنەوەیەو لە چەمکدا بە مانای داپۆشین و شاردنەوەی حەقیقەتە، بە واتایەکی سادەتر کەسێك بەکافر دەزانرێ کە لە حەقیقەتێك ئاگادار بێ بەڵام نکوڵی لێ بکات. جا ئەگەر موسوڵمانێك بۆ وێنە (الاستغاثە) بە کارێکی شەرعی و حەڵاڵ تێبگات و ئەنجامی بدات ئایا دەتوانین بە کافری بزانین؟ بیرمان ئەچێ کە ئەو (الاستغاثە) بە کارێکی ناڕەوا نازانێ و بە پێی لێکدانەوەی سەرەتای باسەکەمان بۆ چەمکی کوفر نابێ ئەم کەسە بە کافر لەقەڵەم بدەین (کافر کەسێکە کە بە زانیاری و ئاگادارییی تەواوەوە تووشی کردەی کوفر دەبێ) بە ئاستی دووهەم ئایا ئەم تێڕوانینە سەلەفییە زۆر

سەختگیرانە نییەو پێت وانییە هەندێ کاری زۆر ساکار کە هیچ زەبرێك بە بنەماکانی ئیسلام ناگەیەنن لە خۆڕا خراونەتە نێو پێڕستی تەکفیر کردنەوە؟ ئەگەر موسوڵمان بە ئەنجامدانی تاقە یەك دانە لەم کارانە ببێتە کافر ئەوسا ڕەنگە زیاد لە نیوەی موسوڵمانانی دونیا لە ئێستەدا کافر بن! بە ئاستی سێهەم ئەگەر کەسێك تووشی یەك لەم چواردە کارە حەرامکراوە بێت بەڵام بە دڵ هەر باوەڕی بە خواو حەقیقەتبوونی ئیسلام و بنەماکانی ئیسلام بێت ئایا دیسان هەر کافرە؟ بە واتایەکی تر ئایا مەرجێکیش بۆ چۆنیەتیی ئەنجامدانی ئەم کارە کوفرئامێزانە دیاری کراوە یاخود تەنیا بە ئەنجامدانیان مرۆڤ دەبێتە کافر؟

پرسیارەکە چڕوپڕەو منیش ناچارم وەڵامێکی چڕوپڕی پێ بدەمەوە هەرچەند ڕەنگە کەمێك درێژ بێتەوە بەڵام چارە نییە. سەرەتا پێویستە بڵێم کە پۆلێنبەندییەکەی شێخ موحەممەد تاقە سەرچاوەی تێگەیشتنی دینی لە پرسی تەکفیردا نییە هەروەها ئەو بە زانای «سەلەف» حیساب ناکرێ و زانای«خەلەف»ە. ئینجا لەگەڵ ئەوەدا کە ئەو زانایەکی خەلەفە بەڵام ئەو خاڵانەی لە ڕووی وەرعێکی دروستەوە نووسیوە تاکوو موسوڵمانان وشیار بن و خۆیان نەخەنە هەلومەرجێکەوە کە دینەکەیان بەتاڵ بێتەوە. من ناڵێم ئەو شتێکی بە دین زیاد کردووە بەڵکوو ئەڵێم مەنهەجێکی زۆر جوانی داهێناوە کە شایستەیە لە پەیمانگا جیهانییە ئیسلامییەکاندا بخوێنرێ. مەبەستی من ئەوە نییە ئەوانەی شێخ موحەممەد وتوویەتی ببێتە دژە وانەو موسوڵمانانی پێ بدرێ بەیەکدا، جا ئەمە چ لە ڕێی زەمینەسازییەوە بێت بۆ دەستێوەردانی بێگانە یاخود لە ڕێی نەزانی و بێئاگایی خۆمانەوە بێت لە پیادەکردنی دین لە ناو خەڵکیدا، نابێ ئاوا کاردانەوەیەکی لێ بکەوێتەوە.

حەزەکەم شتێکی دڵنیاو یەقینیتان پێ بڵێم ئەویش ئەوەیە کە شێخ موحەممەد بۆخۆی بە ئاسانی حوکمی تەکفیری خەڵکی دەرنەکردووە. لەو سەردەمەدا خەڵکانێك هەبوون کە بە ئاشکرا «قوبیە»یەکیان دەپەرست بەڵام شێخ تەکفیری نەدەکردن، بۆیە هەم لەو سەردەمەداو هەمیش دواتر ڕەخنەیەکی زۆری هاتەسەر کە بۆچی ئەم کوفرە ئاشکرایەی ڕانەگەیاندووەو ئەو خەڵکەی تەکفیر نەکردووە. بەڵام ئەو سەرباری ئەو ڕەخنانەی لە سەردەمی حەیاتیدا لێی گیراوە، سوور بووە لەسەر هەڵوێستەکەی خۆی و ئەڵێ: «لە بەر ئەوە تەکفیریان ناکەم چونکوو ڕەنگە ئەم کارەیان لەڕووی نەزانی و بێ ئاگاییەوە کردبێ».

لە چەندەها شوێنی قورئان و لە ناو حەدیسە سەحیحەکانیشدا باسی چەندەها کردەوە کراوە کە مرۆڤی پێ کافر ئەبێ بەڵام مەرج نییە هەر کەسێك بە ئەنجامدانی ئەمانە یەکسەر کافر بێت و تەکفیر بکرێت. (ابو بصیر طرطوسی) کتێبێکی دەربارەی ئەو ڕێڕەوانەی کە تەکفیریان لەسەر دەکرێ، نووسیوە. لەم کتێبەدا کە ناوی (القواعد فی التکفیر)ە ئەو شتانەی دیاری کردووە کە بەربەست و ڕێگرن لە بەردەم تەکفیرکردندا. هەروەها (ابو مُحمد مقدسی)یش لە کتێبێکی (الرسالە الثلاثینە فی الغلو فی التکفیر)دا کە سی خاڵی دەربارەی زیادەڕۆیی لە تەکفیردا لەخۆ گرتووە؛ سنوورەکانی تەکفیرکردنی دیاری کردووەو موسوڵمانانی لە زێدەڕۆییکردن لەم کارەدا مەنع کردووە. (شێخ عبدالقادر عبدالعزیز)یش لە کتێبی (الجامع فی الطلب العلم الشریف / کۆکراوەیەك لە بەدەستهێنانی زانستی پیرۆز)دا ئەوەی شی کردۆتەوە کە

کێ واتە چ کەسێك ئەتوانێ فتوا بدات، پرسیاری فتوا چۆن دەکرێت و ئەگەر کارێك پێویستی بە (قضاء) بوو چۆن قەزای بۆ بکرێت و .....هتد. دیارە ئەمانە هەرسێکیان لە زانایانی بەناوبانگی (طالب العلم المتقدم) سەلەفییەتن و بۆچوونەکانیان لەناو سەلەفییەکاندا جێی باوەڕ و متمانەیەکی فراوانە. هەروەها ئەمە نیشاندەری ئەوەیە کە سەلەفییەکانیش پێیان لە مەسەلەی تەکفیر و چوارچێوە پێویستەکانی تەکفیرکردن کردۆتەوەو ئەوە نییە هەر کەسێك بتوانێ خۆی فڕێ بداتە ناو ئەو باسەوەو لە خۆڕا حوکمی تەکفیر دەربکات.

جیا لەمانەش ئەتوانم بە خستنەرووی چەند ئایەت و حەدیسێك و تەفسیری ئەو ئایەت و حەدیسانە، زیاتر بابەتەکەتان بۆ روون بکەمەوە. بوخاری و موسلیم لە ئەبوو حەمزەی ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە خزمەتگوزاری پێغەمبەر (سڵاو و سوودی خوای لێ بێ) بووە، ئەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: «لایؤمن احدکم حتی یحب لأخیه ما یحب لنفسه» واتە: «هیچکام لە ئێوە ئیمانی نییە مەگەر ئەوەی هەرشتێك بۆخۆی پێی خۆشە بۆ براکەیشی پێی خۆش بێت». مانای ئەم حەدیسە بە شیکردنەوەی وشەی (لیؤمن) روون ئەبێتەوە کە لە زمانی عەرەبیدا ئەوە دەگەیەنێ یان بەو کەسە ئەوترێ کە هەرگیز ئیمانی نییە چونکوو بە (لا)ی (نافیە للجنس) دەستی پێکردووە. هەرچەند لە رووی زمانەوانییەوە لە روالەتدا بە تەواوی نەفی ئیمان دەکات بەڵام ئیمامی نەوەوی لە رووی شەرحی مەعناوە لێی کۆڵاوەتەوەو لە بارەیەوە دەفەرموێ: «مەبەست ئەوە نییە کە بە تەواوی لە ئیمان دەنەچێت بەڵکوو بە مانای ئەوەیە کە ئیمانی کامڵ و تەواو نییە». بە دڵنیاییەوە ئیمامی نەوەوی لە پێناو قازانج و سوودی تایبەتیی خۆیدا ئاوا تەفسیرێکی بۆ ئەو فەرموودەیە نەکردووە بەڵکوو لە ڕووی قەناعەت و باوەڕ پێ بوونەوە وای وتووە.

هەروەها لە دەیان نموونەی ئایەت و فەرموودەدا گەلێ مەرج و خاڵ بۆ ئیمانداربوونی موسوڵمانان دیاری کراوە، لەوانە ئایەی ٢٧ی سوورەتی ئەنفال کە تیایدا فەرمان بە موسوڵمانان دراوە مەبادا خیانەت لە خواو پێغەمبەرەکەی و ئەمانەتەکەیان واتە دینەکەیان بکەن، یان ئەو حەدیسە کە بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر دەفەرموێ: «بەو زاتەی کە وا گیانی منی بە دەستە، کەسێك لە ئێوە ئیمانی نییە مەگەر ئەوەی منی لە خۆی و ماڵ و منداڵ و کەسوکار و سەروەت و سامان و هەموو خەڵك بە گشتی خۆشتر بوێ». هەروەها چەندین و چەند نموونەی تریش هەیە کە لەبەر درێژنەبوونەوەی باسەکە ئاماژەیان پێ ناکەم. ئەگەر بە پێی ئەو مەرجانە بێت خۆ دیارە موسوڵمانان هەموو کاتێ لە وەها ئاستێکی بەرزدا نین کە خواو پێغەمبەر دیارییان کردووە. تەنانەت ئەو سێ جیلە بەرێزەش کە سەرمەشقی ئێمەن هەموو کاتێکی ئیمانداریان لە ئاوەها ئاستێکی بەرزدا نەژییاون، ئەی باشە ئایا ئەتوانین بڵێین لەو کاتانەیاندا کافر بوون؟؟ بێگومان نەخێر.

با ئاوڕێکیش لەو بەشەی پرسیارەکە بەینەوە کە وتووتانە ئەگەر موسوڵمانێك کارێکی وەکوو (استغاثە) بە شەرعی و حەڵاڵ بزانێ و ئەنجامی بدات ئایا ئەتوانین بە کافری بزانین؟ بەڕای من ئەگەر ئەم پرسیارە ڕووبەڕووی دەستەی زانایانی ئەزهەر یان (هیئة بکار العلماء)ی سعوودییە بکرێتەوە پێم وانییە هەروا بە سادەیی وەڵام بدەنەوەو بڵێن لەبەر ئەوەی نەزان و بێئاگایە کافر نابێ. بە دڵنیاییەوە روونی ئەکەنەوەو ئاگاداری ئەکەنەوە تاکوو واز لەو کارە بهێنێت و ئەگەر نەیزانیوە پێویستە بیزانێت و ئەگەر نایسەلمێنێ با بەجۆرێك بە یەك بگەین و تێی بگەیەنین و.....هتد. وا بزانم پێویستە لێرەدا ئاوڕێك لەو ئەسڵ و پرەنسیپانە بدەینەوە کە باسی (جهل) یان نەزانی دەکەن، باسی ئەوە کە چلۆن کەسێکی

نەزانکار و جاهیل بە مەسەلەیەکی دینی «مەعزوور» ئەبن یان بە پێچەوانەوە، هەروەها جەملەکەی بەچی لائەچێت و زانایان چۆنی تاوتوێ دەکەن. لە راستیدا مەرج نییە ئەگەر کەسێك خۆی لە گێلی بدات و بە دوای راستیدا نەچێت و نەیەوێت بزانێ بۆچی خەلق کراوە، موفتی بەستەزمانیش هەر عوزری بۆ بهێنێتەوەو قەیناکای بۆ بکات.

پێویستە داوای لێبوردن بکەم کە ئەگەر وەك موفتییەك وەڵام نادەمەوە لەبەر ئەوە نییە کە لە ئەسڵی پرسیارەکە رادەکەم بەڵکوو لەبەر ئەوەیە کە لە خودی فتوا رادەکەم، چونکوو خۆم بە شایان و ئەهلی ئەو بوارە نازانم. بۆیە بە نیسبەت باسی (العذر بالجهل)ەوە چەند کتێبێکتان پێ ئەناسێنم تاکوو ئەگەر کەسێك ئەیەوێ باشتر لەو مەسەلەیە بگات بیانخوێنێتەوە. شێخ ئەبوو بەسیر تەرتووسی کتێبێکی بچووکی بەناوی (العذر بالجهل) هەیە کە بە ئاسانیش دەست ئەکەوێت، کتێبێکی تریش هەیە بەناوی (العذر بالجهل تحت المجهر الشرعی) کە گومانم هەیە نووسینی (عبدالله بن جبرین) بێت یان (حمود العقلا ) هەروەها لە (الجامع فی الطلب العلم الشریف)یشدا بە تێروتەسەلی باسی (الجهل و العذریە) واتە عوزر بە جەهل کراوە.

سەبارەت بەوەش کە وتووتانە ئایا ئەم روانگەیەی سەلەفییەت سەختگیرانە نییە؟ پێویستە بڵێم لەوانەیە سەختگیرانە بە خەڵك ئاسرابێ یا لەبەر ئەوەی جۆرێك توندوتیژی لەگەڵدا تێکەڵە بە سەختگیرانە بزانرێت چونکوو هەر موسوڵمانێك ئەم شتانەی بکەوێتە بەردەست ئەگەر بەراستی خەمخۆری دین و قیامەتی خۆی بێت ئەوا بە زووترین کات بیر لە هەڵەکانی خۆی ئەکاتەوەو پیاچوونەوەیان پیادا ئەکات. پێم وانییە ئەگەر مرۆڤێك بزانێت رەچاوکردنی ١٤ خاڵەکەی موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب قازانجیەتی و بە سوودی ئەشکێتەوە، رەچاوی نەکاو خۆی لێ گێل بکا. هەروەها لەسەر ئەو باوەڕەیشم ئەگەر ئەم خاڵانە هەندێ جاریش خراپ بەکار هێنرابێتن ئەوا زووبەزوو ئەم خراپ بەکار هێنانە دەردەکەوێت. بۆ نموونە ئەگەر گەنجێك وتبێتی سەلاواتی دوای نوێژ نەبۆتە عادەتی ئوممەت، لە گێڕانەوەدا وتوویانە ئەم سەلەفییانە نە سەلاواتیان قبووڵەو نە پێغەمبەریان قبووڵەو نە هیچ دینێکیشیان قبووڵە. یان ئەگەر باسی ئەوە کرابێت کە فاتیحە ناردن بۆ مردوو لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لێ بێ) نەبیستراوە، ئەوا وتوویانە خۆ سەلەفییەکان فاتیحەشیان قبووڵ نییە. یاخود ئەگەر سەلەفییەکان وتبێتیان هەندێ ڕای شافیعییەکان پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە (دروودی خوای لێ بێ)، یەکسەر بەوە تاوانبار کراون کە نە مەزهەبیان قبووڵەو نە ڕێزی ئیمامی شافیعی و زانا گەورەکانی دین ئەگرن. زۆرجاریش سەلەفییەکان بەوە تاوانبار کراون کە گۆیا دینێکی تازەیان هێناوە کە فڕی بە دینی باو و باپیرانمانەوە واتە بە دینی ئیسلامەوە نییە، تەنیا لەبەر ئەوە کە سەلەفییەکان هەندێ عادەتی هەڵەو نائیسلامیانەیان رەت کردۆتەوە کە تێکەڵ بە رەفتار و عیبادەتی موسوڵمانان بووە. بە تایبەت لە کوردستاندا چەند سەدەیەکە هەلومەرجێکی گونجاو بۆ تەسەوف رەخساوەو سۆفیگەری لەناو خەڵکی کورددا بۆتە رەمزی دینداری و ئەمەش دۆخی تاوانبارکردنی سەلەفییەتی قووڵتر کردۆتەوە.

سەرباری هەموو ئەمانەش پێویستە بڵێم تەوژمی تەکفیرکردنی رەش و سپی و گوێ نەدان بە رێڕەو و بنەما زانستییە ئیسلامییەکان شتێکی چاوەڕوان نەکراو نییەو ئەم مەسەلەیە لە هەندێ وڵاتی ئیسلامیدا گەلێ کاردانەوەی خراپیشی لێ کەوتۆتەوە. بەڵام مەرج نییە ئەم کاردانەوەو بەلاڕێداچوونانە ئەسڵی مەرجەکان و خاڵە دیاریکراوەکانیش بخەنە ژێر

پرسیار و گومانەوە چونکوو دەکرێت شتێکی باش بەو هۆیەوە کە خراپ دائەبەزێنرێت، ئەنجام و ئاکامێکی خراپی لێ بکەوێتەوە. کەوابوو ئەو خاڵانە نەك سەختگیرانە نین بەڵکوو دەقاودەق ئەسڵی ئایینی ئیسلامن.

سەبارەت بە دوابەشی پرسیارەکەیش کە باس لەو موسوڵمانانە ئەکات کە تووشی یەك لەو چواردە خاڵە ئەبێت بەڵام بە دڵ باوەڕی بە ئیسلام و خوا هەیە، سەرەتا با ئەوە بڵێم لەبەر ئەوە کە ئەو ۱۴ خاڵە لە رووی وەرعێکی دروستەوە لە دەقی ئایەت و فەرموودە وەرگیراون، ئەگەر کەسێك دووچاری یەك یان چەند دانەیەکیان بێت بێویستە بەخۆیدا بچێتەوە بە تایبەت ئەگەر ئەو کەسە بە دڵ باوەڕی بە ئیسلام بێت پێویستە سوورتر بێ لە سەر لابردنی ئەو خاڵانە لە خۆیدا. ئەمە وەك ئامۆژگارییەك بۆ کەسانی خەتاکار، بەڵام دەربارەی ئەوەی کە ئایا بەو کارە کافر ئەبێ یان نە، خۆم لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئەبوێرم چونکوو کاری من نییە. لەم پێوەندییەدا تەنیا ئەتوانم چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز بە بەڵگە بهێنمەوە تاکوو خۆ لە حوکمدانی تەکفیری ئەو کەسانە بپارێزین. خوای گەورە لە ئایەتی ۶۴ی سوورەتی ئالی عیمراندا بە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێ) فەرمان دەکا تاکوو بە ئەهلی کیتاب واتە کافرەکان بڵێت: «ئەی ئەهلی کیتاب وەرن بۆلای ئەو وشەیە کە (وەك خاڵی هاوبەش) هەردووکمان لەسەری کۆکین و ئەیپەرستین کە ئەویش (الله)یە». هەرچەند خوای گەورە لە سوورەتی (البینە)دا ئەم کافرانەی ئەهلی کیتابی بە (شرالبدیە) واتە خراپترینی سەر زەوی ناو بردووە، بەڵام بەم شێوەیە فەرمان بە پێغەمبەر ئەدات تاکوو خاڵی هاوبەشیان لەگەڵدا باس بکات و هانیان بدات بۆ سووربوون لە سەر ئیمانە کۆن و راستەقینەکەی جارانیان. لێرەدا ئەوەمان بۆ روون ئەبێتەوە کە تاکوو ئەو جێیەی مەجالمان هەبێت و بۆمان بکرێت، هەوڵ ئەدەین بەقسەی ناخۆش و توندوتیژ ئەوان لە دینەکەمان دوورتر بخەینەوە.

**ئەی جیاوازیی (مُرتد) و (کافر) لە چیدایەو کێ بە مورتەد و کێ بە کافر دێتە ئەژمار؟ ئایا بە پێی بیری سەلەفی هەر هەموو مورتەدان شایستەی سزان و دەبێ حەدی ئیسلامییان لە سەر جاری بکرێ یان جیاوازییان تێدا ئەکرێ؟ بە واتایەکی تر وەك بە ناوبانگە هەندێ پۆلێنبەندی بۆ مورتەد ئەکرێ: وەك مورتەدی موغەلیزە و.....هتد.**

وشەی (ردة) لە رووی زمانەوانییەوە واتای پاشگەزبوونەوە ئەدات و بەو کەسیشە ئەوترێ مورتەد کە پاشگەز ئەبێتەوە، لە شەرعیشدا بەوانە ئەوترێ مورتەد کە بە تەواوی لە دین هەڵئەگەڕێنەوە یان بە پێڕەوانی دینێکی ترەوە پەیوەست ئەبن. هەموو مورتەدێك دەبێتە کافر بەڵام پێچەوانەی ئەمە دروست نییە واتە هەموو کافرێك مورتەد نییە. زەقترین نموونەی (ارتداد) لە مێژووی ئیسلامدا ئەگەڕێتەوە بۆ دوای فەوتی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێ) و سەردەمی خەلیفەی یەکەم کە لەو ساتەوەختەدا زۆربەی دانیشتوانی نیوە دوورگەی عەرەب بە بیستنی هەواڵی فەوتی پێغەمبەر(دروودی خوای لێ بێ) هەڵگەڕانەوەو دەستیان لە دینی ئیسلام هەڵگرت. خەلیفەی یەکەمیش سەرباری ئەو مشتومڕە گەورەیەی لە نێوان زانایان و تەنانەت عەشرەی موبەشرەو هاوەڵاندا لەسەر چۆنیەتی چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە هاتبووە ئاراوە، دەستی کرد بە سەرکوتکردنی هەڵگەڕاوەکان چونکوو بەو ئاکامە گەیشتبوو کە ئەم رەوتی پاشگەزبوونەوەیە مەترسییەکە بۆسەر کیان و ژیانی ئیسلام و موسوڵمان بە تەواوەتی.

دەربارەی حوکمی مورتەد گەلێ سەرچاوەمان لەبەردەستدایە، بۆ نموونە هەر لە مەزهەبی شافیعی خۆماندا ئیمامی ماوردی دوو کتێبی نووسیوە بە ناوەکانی (الاحکام السلطانیە و الولایات الدینیە) و (کتاب المُرتد) کە یەکێکە لە بەرگەکانی کتێبی گەورەی (الحاوی الکبیر). دەیان و سەدان سەرچاوەی تریش هەیە کە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کاری گەورە لەسەر مەسەلەی مورتەد و حوکمی ئێرتیداد کراوە کە ئەبوو یەعلای حەنبەلییش بە هەمان ناوی (الاحکام السلطانیە)وە کتێبێکی نووسیوە. هەروەها ئبن تەیمییەش لە کتێبی (السیاسة الشرعیە فی الاصلاح الراعی و الرعیە)دا باسی ئەم بابەتەی کردووە. بەشی زۆری حوکمەکانی مورتەد لەو رایەی ئەبووبەکری سدیقەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئەڵێت: (لو منعو من عقالاً لقاتلتهم علیه).

ئەو حوکمانەی کە بۆ مورتەد دانراوەو تاکوو ئەم ساتەوەختە لە بیرم ماون، ئەمانەی خوارەوەن:

١-لە کاتی شەڕدا ئەتوانیت دیلیان بکوژێت و بریندارییان ئازار بکەیت.

٢-ئەگەر لە شەڕدا پشتیان لێ کردیت ئەتوانی وازیان لێ نەهێنیت و بیانکوژیت.

٣-ئەوەی موسوڵمانیان ناتوانن پاش مردنیان ماڵ و سەروەتیان بە میرات بگرن.

٤-کەسی مورتەد ناتوانێ ببێتە میراتگری باوانی موسوڵمانی.

٥-پیاو و ئافرەتیان مارەییان لە موسوڵمانان نایەت.

٦-ناتوانن ببنە (ولیّ امر) بۆ مارەکردنی ئافرەتی موسوڵمان.

٧-مردوویان بە پێی رێوڕەسمی موسوڵمانان ناشۆردرێ.

٨-مردوویان لە گۆڕستانی موسوڵماناندا نانێژرێ.

٩-بە جزیە وەرگرتن سوڵحیان لەگەڵدا ناکرێ.

١٠-ئەگەر لە وڵاتی ئیسلام دەربکرێن یان بگوێزرێنەوە یان بۆخۆیان بەجێی بهێڵن، ئەوەی لێیان جێ ئەمێنێت ئەبێتە ماڵی (موقوف) و رائەگیرێت بەڵام ئەگەر پێش ئەوەی دەستی موسوڵمانانیان پێ بگات پەشیمان ببنەوە بێنەوە باوەشی ئیسلام، (بیت المال) هەموو ماڵەکەیان بە بێ کەموکورتی پێ ئەداتەوە.

١١-ئەبووبەکری سدیق (خوای لێ رازی بێ) سەبارەت بە سوڵحکردن لەگەڵ مورتەدەکاندا دوای ئەوەی خرانە ژێر دەسەڵاتی ئیسلامەوە، پێی وابوو پێویستە ئەوان بە پلەی یەکەم دان بەوەدا بنێن کە کوژراوەکانیان لە جەهەننەمدان بەڵام پێچەوانەوە کوژراوی موسوڵمانان لە بەهەشتدان. دووهەم، پێویستە ئەوان دوای تۆبەکردن بۆ ماوەی یەك ساڵ لە جێگاکانی خۆیان دوور بخرێنەوەو لەژێر چاودێریدا بن تاکوو روون بێتەوە کە وازیان لە کوفر هێناوە یان نە، ئینجا ئەگەر ئیسلاح بوون و وازیان لە کوفر هێنا ئەوا بیانگێڕنەوە جێگاو رێگای خۆیان. سێیەم، هەر دەستەیەکیان بە سوڵحی (مخزیە) واتە رێککەوتنی ریسوائامێز رازی نەبوو، پێویستە (قتل المخلیە) واتە کوشتاری لە دەسەڵات خاڵییان لەگەڵدا بکرێ. هەروەها ئەبووبەکر داوای دیەی خوێنی کوژراوانی موسوڵمانیشی کرد بەڵام تێکڕای هاوەڵان دژی ئەمە بوون چونکوو لەو باوەڕەدا بوون کە موسوڵمانەکان لە جیهادی (فی سبیل الله)دا کوژراون و پاداشتی ئەم کەسانەش لای خوایە. بۆیە ئیمامی ئەبووبەکریش (خوای لێ رازی بێ) لەم مەرجە پاشگەز بوویەوە.

١٢-سەربڕاوی (زبح) دەستیان ناخورێت.

١٣-هیچکام لەو ڕێوڕەسمانەی موسوڵمانان بۆ مردووان بەڕێوەی ئەبەن بۆ نموونە تەشییعی جەنازە، قەبری بە جیاو تاکەکەسی و.....هتد، بۆ مردووی ئەوان بەڕێوە نابرێت و پێویستە بە کۆمەڵ بخرێنە نێو چاڵێکەوەو داپۆشرێن.

ئەمانە سەرجەم ئەو خاڵانەن کە دەربارەی مورتەد هاتوون و ئەگەر خاڵی تریش مابێت ئەوا لە بیرم چووە بۆیە باسم نەکردووە. بە پێی شەریعەتی ئیسلام سزاو کوشتنی مورتەد لە هەموو دوژمنەکانی تری ئیسلام و تەنانەت لە کافری ئەسڵیش قورستر و جیدی ترە چونکوو شەڕ و مەترسی ئەم هەڵگەڕاوانە لە هەموو دوژمنانی تر زیاترەو زۆرترین زیان و هەڕەشە بۆسەر ئەهلی ئیسلام لە لایەن ئەمانەوەیە. دووجۆر مورتەدمان هەیە، (مجردة) و (مغلظة)، مورتەدی موجەڕەدە بەوە کەسە ئەوترێ کە لە سەر ویستی خۆی وازی لە ئیسلام هێنابێت و کاری بەسەر موسوڵمانانەوە نەبێ. بۆیە ئەم جۆرە مورتەدە تا کێشەو زیانێکی بۆ موسوڵمانان نەبێ بەدەر لە ئامۆژگاریکردن و هەڵسووکەوتی جوان بە مەبەستی گێڕانەوەی بۆ باوەشی ئیسلام، هیچی لەگەڵدا ناکرێ و هیچ ئازار و سزایەك نادرێت. بەڵام مورتەدی موغەلیزە بەوانە ئەوترێ کە سەرباری هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، کار بۆ لایەنێکی بێگانەی ناموسوڵمان دەکەن و خاکی موسوڵمانان بەجێ ئەهێڵن یان بار و بارخانەکەیان ئەگوازنەوەو ئەچنە لای لایەنی ناموسوڵمان. ئەم جۆرە مورتەدانەش دەبنە دوو بەشەوە، بەشێکیان ئەوانەن کە تەنیاماڵیان باری کردووەو کاریان بە دژایەتی و کوشتاری موسوڵمانانەوە نییە بەڵام بەشەکەی تریان ئەو کەسانەن کە پیلان دژی موسوڵمانان و ئەهلی ئیسلام و ناوچەکانیان دائەڕێژن. جا ئەگەر ئەم پیلانگێڕیەی ئەوان بە بەڵگەوە سەلمێنرا، کاتێك دەسەت موسوڵمانان ئەکەون سزا ئەدرێن مەگەر ئیمام یان خەلیفە یاخود ئەمیری موسوڵمانان شتێکی تر بە مەسڵەحەت بزانێت. لەم حاڵەتەدا ئەوان ئەکەونە بەر لێبوردن و پاش ئامۆژگاری کران و دڵنیا بوو لەوەی کە چیتر زیانێکیان بۆ موسوڵمانان نابێت و ناگەڕێنەوە سەر کوفر و دژایەتی ئیسلام ناکەن، ئازاد دەکرێن.

هەندێ لە زانایانی هاوچەرخ بە پشتبەستن بە بۆچوونەکانی ماوردی و ئەبوو یەعلاو ئبن تەیمییە، گەیشتوونەتە ئەو باوەڕە مادام کەسێك باو و باپیرانی موسوڵمان بووبن تەنانەت ئەگەر خۆیشی ڕۆژێ لە ڕۆژان بە تەواوی تەسلیمی ئیسلام نەبووبێ و پێڕەوی لە دەستوورەکانی ئیسلام نەکردبێ، ئەگەر دوای گەیشتن بە تەمەنی بلووغ بەرنامەکانی ئیسلام بەڕێوە نەبات ئەوا حیسابی مورتەدی بۆ ئەکرێت. کەواتە هەموو نەوەی موسوڵمانان بە موسوڵمان حیساب دەکرێن ئەگەرچی بە ویستی خۆیشیان ئیسلامیان قبووڵ نەکردبێت. بۆیە بەم پێیە وازهێنانیشیان لە ئیسلام مانای ئیرتیداد ئەدا.

**ئەی سەلەفییەت هەموو ئەهلی کیتاب (پێڕەوانی دینە ئاسمانییەکانی تر) بە کافر ئەزانێت؟ لە دەسەڵاتی سەلەفیدا چارەنووسی ئەو کەسانە چۆنەو چۆناوچۆن مامەڵەیان لەگەڵدا ئەکرێت؟**

بەڵێ سەلەفییەت و قورئانیش ئەو کەسانە بەکافر ئەزانن، خوای گەورە لە سوورەتی (البينة)دا کاتێ باسی کافرەکان ئەکات دەفەرموێ: «چ ئەهلی کیتاب بن چ موشریك بن» کەواتە سەلەفییەت ئەم ڕایەی ڕاستەوخۆ لە قورئانەوە گرتووە. بە درێژایی مێژوو و بە پێی سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێ) هەموو دەسەڵاتێکی ئیسلامی بە سەلەفی و ناسەلەفییەوە سێ ڕێگەیان بۆ ئەهلی کیتاب داناوەو سەرپشکی کردوون لە هەڵبژاردنی یەکێکیاندا.. ئەو سێ ڕێگایە

ئەمانەن: یەکەم، جزیەدان بە حکوومەتی ئیسلامی بە بێ خۆبەزلزانین لە بەرانبەر دەسەڵاتی ئیسلامیداو هەروەها بە مەرجی دروستنەکردنی پشێوی و ئاژاوە نەنانەوە. دووهەم، بەجێهێشتنی وڵاتی موسوڵمانان. سێهەم، ئەگەر هیچکام لەو دوو ڕێگەیان قبووڵ نەکرد ئەوا شەڕیان لەگەڵدا دەکرێت. ئەهلی کیتابی نیشتەجێی خاکی موسوڵمانان، لە بەڕێوەبردنی ڕێورەسمی دینی و بازرگانیکردن و باقی کارەکانی ژیانیانیاندا ئازادن و هیچ کات دەسەڵاتی ئیسلامی مەجبووری نەکردوون یان مەجبووریان ناکات بێنە سەر دینی ئیسلام. ئەڵبەت ئەوان ماڤی بانگەشە کردن بۆ دینەکەیان و ئەنجامدانی کارە حەرامکراوەکانی ئیسلامیان نییە. هەروەها مەجووسییە ئاگرپەرستەکان ناکەونە ناو ئەم خەڵکانەوە واتە ئەهلی کتێبەوە چونکوو خواپەرەست نین و لە باتی خوا ئاگر دەپەرەستن.
جا هەر دەسەڵاتێکی ئیسلامی بە پێی ئەم ڕێڕەوە جووڵایەوە ئەوا پەیڕەویی لە پێغەمبەر (سڵاو و درودی خوای لێ بێ) و سەلەفەکان و ئەهلی ئیسلامەوە کردووەو ئەگەر پێچەوانەی ئەمەش جووڵایەوە ئەوا بەرپرسیارە لە کرداری خۆی و هیچ پێوەندییەکی بە ئیسلامەوە نییە.

**ئەوەندەی دەیزانین دوو جۆر سەلەفییەتمان هەیە، سەلەفییەتی جیهادی و سەلەفییەتی لاجیهادی یان مورجیئە کە مورجیئەکان مەدخەلییشیان پێ دەوترێ، ئەم دوو جۆرە سەلەفییەتە چ جیاوازییەکیان بە یەکەوە هەیە؟ هەروەها ئایا ئاخێزگەو بنەمای فیکریی ئەم دوو بۆچوونە یەک شتە یاخود لە سەرچاوەو موقتیدا لێک دوور و جیاوازن؟ ئەگەر لە یەک سەرچاوە ئاو دەخۆنەوە چۆناوچۆن ئاوەها ئەنجامگیرییەکی جیاواز و دوور لە یەک بەدەستەوە ئەدەن؟**

ڕاستە سەلەفییەت دوو جۆرە بەڵام من ئەو وشانە بەکار ناهێنم کە ئەوان بەرانبەر یەکتر بەکاری ئەهێنن. جیهادییەکان بە لاجیهادییەکان دەڵێن مورجیئەو ئەوانیش ناوی خەوارجیان لە سەر جیهادییەکان داناوە، دیارە ئەم ناو لەسەر یەکتر دانانە لەبەر ئەوەیە کە ئەوان یەکتریان قبووڵ نییەو من خۆم لەگەڵ ئەم سووکایەتی کردنەدا نیم.
سەردەمی دروستبوونی کۆمەڵە گومڕاکان (الفرق الضـالە)، خەواریجەکان لەسەر بنەمای گوناهکردن خەڵکیان تەکفیر دەکرد و بەو مەبەستەش پشتیان بە هەندێ فەرموودەو ئایەت ئەبەست. بۆ نموونە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) دەفەرموێ: «بێئیمانە ئەو کەسەی زینا دەکات»، مەبەستی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) ئەو کاتەیە کە کەسە زیناکە دەکات بەڵام ئەوان ئەیانوت مادام فەرموودەکە لەفزی (بێئیمانی) تیایە ئەوا کەسی (زیناکەر) کافرەو پێویستە ئیمان تازە بکاتەوە. ئەم هەڵێنجانە هەڵانە بوونە مایەی مەترسی و گەلێ کارەساتی دڵتەزێن و خوێناوییان لێکەوتەوە، بۆیە هەندێ لە زانایان هەستان بە خستنە بەردەستی کۆمەڵە بابەت و قاعیدەیەکی میانەڕەوانە تاکوو بەر بە خەسارەکانی ئەم تێڕوانین و باوەڕە هەڵەیە بگرن. ئەبوو حەنیفە بە یەکێک لە بناغەدانەرانی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە دێتە ئەژمار. ئەوانەی کە هەڵگری ئەم فیکرەیە بوون، کەوتنە هەڵەی ئاسانگیرییەکی لەڕادەبەدەرەوە، ئەوان لەوباوەڕەدا بوون کە خەڵکی هەرچی بکەن مادام تۆسقاڵە زەڕەیەک ئیمانیان هەبێ تەنانەت ئەگەر نوێژیش نەکەن و زەکاتیش نەدەن و کاری خراپیش بکەن، ناتوانین بڵێین لەدین دەرچوون. هەندێ لە زانایان ئەوەندە لە میانەڕەویدا ئیفراتیان کردووە کە لە ڕوانگەی ئەوانەوە ئەتوانی تەنانەت کەسێکی وەکوو ئەبوو جەهلیش بە کافر نەزانیت!
ڕای ئەهلی سوننەو جەماعە ئەکەوێتە نێوان ئەم دوو ڕایەوە واتە ئەهلی سوننەو جەماعە نە باوەڕیان بەو میانەڕەوییە هەیەو نە بەو ڕادیکاڵبوون و توندڕەوییەی کە هەندێ کەس و لایەن باوەڕیان پێی هەیەو پێی هەڵدەستن. خوای گەورە لە ئایەتی ۱۴۳ی سوورەتی بەقەرەدا دەفەرموێ: (وکذالك جعلنکم امة وسطا لتکونوا شهداء علي النـاس..... الخ) واتە: «بەم جۆرە ئێوەمان کردۆتە ئۆمەتێکی مامناوەندیی تاکوو ببنە شایەت لەسەر خەڵکی.....» لە ڕوانگەی ئەهلی سوننەو

جەماعەوە ئەو دوو رایە تووشی (افراط و تفریط) هاتوون. سەلەفییە جیهادییەکان لەو باوەڕەدان کە تەنیا ڕێگای بەدەستهێنانەوەی سەروەرییەکانی سەلەف لە لایەن ئۆممەتی ئیسلامییەوە، جیهادکردنێکی ڕەسەن و تێکۆشان و خوێنڕشتنەو بەمجۆرە نەبێ دەسەلات و خیلافەتی ئیسلامی دانامەزرێتەوە. لە روانگەی سەلەفییەتی جیهادییەوە جگە لەم ڕێگایە (جیهاد کردن) هەموو ڕێگاکانی تر لە لایەن خاوەن هێزەکانەوە پووچەڵ ئەکرێتەوەو بە ئاراستەو ئاقارێکیدا ئەبەن کە قازانجی خۆیانی لێبکەوێتەوە. ئەوان وەك نموونە ئاماژە بە ئەزموونی (جماعة الجهاد)ی میسر دەکەن.

بەڵام سەلەفییە لاجیهادییەکان لەسەر ئەو باوەڕەن کە پێویستە تەنیا خەریکی پاڵفتەکردنی عەقیدەو بیروباوەڕی موسوڵمانان بن چونکوو لە روانگەی ئەوانەوە مادام شتی نارەسەن و خراپ تێکەڵ بە بیرەباوەڕی ئیسلامی بێت، تاکوو پاڵفتەو پاك نەکرێتەوە ناتوانرێ بە باشی پەیڕەویی لە نەهج و نەریتی سەلەفەوە بکرێت. لاجیهادییەکان ئەڵێن تا کاتێ عەقیدەی موسوڵمانان لە بیروباوەڕە پووچەڵ و گومڕاکان پاکژ نەکرێتەوە هێنانەوەی خەلیفەی راشد و دامەزراندنەوەی خیلافەتی ئیسلامی نامومکینە.

سەلەفییە لاجیهادییەکان بەو هۆیەوە کە باوەڕیان بە جیهاد نییەو بە کردەوە جیهاد ناکەن، لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی و نائیسلامیدا بە ئازادی تەبلیغی بیروباوەڕی خۆیان دەکەن و کتێب و چاپەمەنییەکانی تایبەت بە بیروباوەڕی سەلەفییەت بڵاو ئەکەنەوە. ئەم جۆرە سەلەفییەتە لە بنەماڵەی ئالی شێخی سعوودەوە سەرچاوەی گرتووەو ئەتوانین لە کەسایەتییە ناسراوەکانیان ئاماژە بە (شیخ البانی)، (ابن عثیمین)، (ابن باز)، (عبدالهادی الموحلی)، (علی حلبی) و زۆربەی زانایانی (هیئة کبار العلماء)ی سعوودیە بکەین.

**وەك ئاشکرایە لە مەزهەبی شیعەدا مەرجەعییەت و موجتەهیدی زیندوو و فتوای بەرۆژ و هەمیشەیی دەورێکی گەورەی هەیە، ئاوا شتێك لە مەزهەبی سوننەدا بەو ئاستە بەربڵاوە نابینرێ. هەندێ بیرمەندی ئیسلامی لەسەر ئەو باوەڕەن کە زیندووبوون و تازەبوونی فتوا دەکەوێتە خزمەت کارامەبوونی ئایینەوەو ناهێڵێ دین لە دونیا دوا بکەوێ و بەردەوام دەتوانێ وەڵامی پێویستییەکانی سەردەم بداتەوە. بۆچی لە سوننەدا بە هەموو مەزهەب و فقەکانییەوە ئەم ئیهتیما بە موجتەهیدی زیندوو و هاوچەرخ نادرێ و سەلەفییەت لەم بارەیەوە چۆن بیر ئەکاتەوە؟**

هۆکاری ئەوە کە ئێمەی ئەهلی سوننەو جەماعە بە هەر چوار مەزهەبەکەوە باوەڕمان بە مەرجەعییەت و موجتەهیدی زیندوو نییەو هەوڵیشی بۆ نادەین، ئەوەیە کە باوەڕمان بە مەعسوومبوونی ئیمامەکانمان نییە. ئێمە سوود لە کتێبی هەر زانایەکمان وەربگرین بەو ئەگەرەوە سەیری دەکەین کە رەنگە مەسەلە باسکراوەکانی نەیپێکابێت و ئەگەر بەڵگەو هۆی زانستیی بۆ باس و بابەتەکانی خۆی نەهێنابێتەوە ئەوا هیچی لێ قبووڵ ناکەین. هەرچەند ئەم رەوتە بە تایبەت لە کاتی نەمانی خەلیفەدا هەندێ سلبیاتی بۆ دروست کردووین بەڵام لە رووی چاوبەستنەکردنی میللەتان و بەندەکانی خواوە، لە دونیاو قیامەتدا ئێمە سەرکەوتووترین. ئەگەرچی لای ئێمەی سوننە بەدیهێنانی وەحدەتی وشەو ریزەکانمان (وحدة الکلمة و الصف) بە بەراورد لەگەڵ شیعەدا تۆزێ سەختترە بەڵام ئەوەی کە لە ناو سوننەکاندا هەموو کەس ناتوانێ بە ئاسانی بەرز بێتەوەو پلەو پایەی بەرز پەیدا بکات خاڵێکی پۆزەتیڤەو باشترە لەوەی شیعەکان. لە مەزهەبی ئێمەدا هەر کەس ناتوانێ ببێتە دەمڕاستی خەڵك مەگەر ئەوەی یەکلابوونەوە واتە (تجرُّد)ی تەواوی هەبێ و ئیخلاس و دڵسۆزی و پاکییەکەی زۆر دیار و بەڵگە نەویستی لەخۆ گرتبێت.

خۆ لە مەزھەبی شیعەشدا ھەروا ھەرەمەکی نییەو ھیرارشییەتێکی ئاڵۆزیان ھەیە تا کەسێك دەگاتە پلەی ئیجتیھاد و دەتوانێ بڕیار و فتوا دەربکات. ڕەنگە تەنانەت لای ئەوان لە ئێمەش دژوارتر و ئاڵۆزتر بێ و (حوزەی علمییە)ی ئەوان گەڵێ سەختگیرترن لە حوجرەو فێرگە دینییەکانی دونیای سوننە. باسەکە زیاتر لەسەر ئەوەیە کە سیستەمی مەرجەعی تەقلیدی زیندووی شیعە بۆ ئەم دونیا ئاڵۆز و مۆدێرنەی ئێستا کارامەتر و پڕپیتتر بووەو زیاتر توانیویەتی دینێکی سەردەمییانەو ئەوڕۆیی پێشکەش بە موسوڵمانانی شیعە بکات. ئایا ئەتوانین بڵێین سەلەفییەت لەبەر بیدعە بوون (یان چ شتێکی تر) ئەو سیستەمە ڕەت دەکاتەوە؟

کاتێ ئەڵێم سوننە لە ڕووی مەرجەعییەتەوە باوەڕی بە موجتەھیدی زیندوو نییە بە ھەڵە لێی تێمەگەن، مەبەستم ئەوەیە بەو شێوەیەی شیعە باوەڕی پێیەتی ئێمە باوەڕمان پێی نییە، دەنا وشەی موجتەھید لە ئێمەوە گەیشتووە بەوان بەڵام ئەوان بۆ شتی تر و بە مانایەکی تر بەکاری دەھێنن. دین لە لای سوننە وەك یاسایەکی واقیعییانە حیسابی بۆ کراوە کە بەڕێوەبەری جموجووڵی مرۆڤە لەناو کۆمەڵگادا، جا چونکوو کۆمەڵگا بەو ئاقارە تەقدیرییەدا ئەچەرخێ کە خوای گەورە دایڕشتووە، بۆیە پێویستی بە مەرجەعییەتێکی تری جیا لەوەی کە پێشووتر بوویەتی، نییە.
سەلەفییەت لەوەدا ئەم شتە بە بیدعە ئەزانێ کە مەرجەعییەت بە ڕاڤەکاری شتی (ھێشتا نەھاتوو) بزانرێت، ئەمە نەك بیدعەیە بەڵکوو شیرکەو حەرامیشەو ئەھلی سوننە قبووڵی نییە. ھەروەھا مەرجەعییەت لەسەر واقیع ھەرچی بڵێت شتێکی تازەی نەوتووەو لە ڕێڕەوی ئەھلی سوننەی خۆیشماندا شتی وامان ھەیە، کەواتە مەرجەعییەت لە ھەردوو حاڵەتەکەیدا لە لایەن ئەھلی سوننەوە ڕەتکراوەیەو بوونی بە پێویست نازانرێت. ئینجا ئەم بۆ کاتێکە کە خەلیفە ھەیە چونکوو لە نەبوونی خەلیفەدا مەرجەعییەت کۆنترۆڵ ناکرێ و خۆی بە موخەیر و سەرپشك ئەزانێ لە ھەڵبژاردنی بیروبۆچوونی جۆراوجۆ و نەبیستراو و تەنانەت ڕاو بۆچوونی دوور لە دەقە ڕەسمییەکاندا. کەوایە ھیچ ھێزێك ناتوانێ ئەم جۆرە مەرجەعییەتە کۆنترۆڵ و پابەندی ڕێساو بنەماکانی ئیسلام بکات، بۆیە ئەگەر لە مەزھەبی سوننەشدا مەرجەعی زیندووی وەك شیعەکان بۆخۆمان قایل بین بێگومان ئەم کارە بەلای کەمەوە ئەوەندەی تر لە دەقە سابیتەکان دوورمان ئەخاتەوەو لەبەر ئەوەیشە کە سەلەفییەت باوەڕی بەم جۆرە مەرجەعییەتە نییە.
ئەگەر تەنانەت ھەموو ئەم وردەکاری و مەرجە پێویست و مەحاڵانەش بێتەدی، بەڕای من بواری ئەم کارە ئەوەندە سەخت و دژوار دەبێ کە کەس ناتوانێ لە سەر ھێڵی ڕاستەقینەی ئیسلام بەرەوپێش بچێت و ھاوکات جڵەوی کۆمەڵگایشی گرتبێتە دەست و بە باشی بەڕێوەی ببات. ئەگەرنا خۆ من نکوڵی لەوە ناکەم کە لای شیعەکانیش ئاوا پلەیەك واتە پلەی مەرجەعییەت بە ئاسانی بە دەست بێت و پێویستە مەرجەع جگە لە خوێندنی وانەکانی (حوزەی علمیە)، لە ڕووی سیاسی و بەڕێوەبردنی کاروباریشەوە تایبەتمەندی و توانایەکی بەدەر لە خەڵکی ئاسایی تیابێت. لە ڕاستیدا نە لە سەردەمی پێغەمبەر و نە لە سەردەمی خەلیفەکانیشدا دیاردەیەکی وەك مەرجەعییەت بەرچاو نەکەوتووە تەنانەت خودی پێغەمبەریش (درودی خوای لێ بێ) کە تاقە سەرمەشقی موسوڵمانانە، ھیچ ھاوشێوەییەکی لەگەڵ مەرجەعی تەقلیدی شیعەکاندا نییە. بیرمان نەچێ ئەو پێغەمبەرە مەزنە کە ئەو ھەمووە خۆششەویستی خودایە، تەنیا لە گواستنەوەی پەیامە پیرۆزەکەدا مەعسووم بووە ئەگینا وەکوو ئێمە برسی و تینووی بووەو چۆتە بازاڕ و خەوتووەو بەڕۆژوو بووەو ڕۆژووی شکاندووەو نیگەرانی لە دەستدانی ھاوەڵە بەڕێزەکانی بووە کە شەھید کراون و ئەگەر غەیبیشی بزانیایە نەیدەھێشت بەڕێی وادا بڕۆن کە شەھیدیان بکەن. کەواتە تەنانەت موحەممەدی پێغەمبەریش غەیبی نەزانیوە چ بگات بە کەسانی تر و ئەوەی کە شیعە پێی ئەڵێ مەرجەعییەت.
بە گشتی من ھۆکاری دژایەتیکردنی پیرۆکەی مەرجەعییەتی شیعەکان لەو ڕوانگەیەوە ئەبینم کە باسم کرد واتە لە ڕوانگەی سەلەفییەکانەوە. سەلەفییەکان گوێ بە لۆمەی ئەو لایەنانە نادەن کە سەلەفییەت بەوە تۆمەتبار ئەکەن بۆچی

وەك شیعەكان و بە شێوەی مودێرن و ئەمڕۆیی دینداری ناكەن. ئەگەرچی لە روانگەی خەڵكێكی زۆرەوە شێوازی دینداری سەلەفییەكان كە پێچەوانەی شیعەكان و هەندێ لە سوننەكانیشە، بە ناتەبا لەگەڵ سەردەمی نوێ و دونیای مۆدێرن ئەزانرێت بەڵام خودی سەلەفییەكان ئەم شێوازە بە دینداریيەكی تەواو و سەحیح و بێ پێچ و پەنا ئەزانن. بە پێچەوانەی شیعەكان كە مەرجەعییەت بە پێشەوای سەردەم دەپۆلێنن و بڕیاری تازەی بۆ شتە كۆن و تازەكان لێوەردەگرن و لایان وایە لە غەیبەوە ئیلهامی پێ ئەكرێت و هەرچی ئەیڵێت راست و دروست و بێ شكە، چۆنیەتی دیاریكردنی پلەی موجتەهید لەناو ئێمەی سوننەدا بە خوێندنی دوا قۆناغەكانی زانستە ئیسلامییەكانەو پێبەندبوونی موجتەهید بە ئەسڵ و بنەماكانی دینی ئیسلامە.

ئەگەر بە شێوەیەكی مێژوویی ئاوڕ لە رێباز و بیرۆكە مەزهەبییەكانی ئایینی ئیسلام بدەینەوە، لە هەمان سەدەكانی سەرەتای ئیسلامدا دوو چاوگی سەرەكی ئەبینین كە بە جۆرێك لە جۆرەكان ئەتوانین بە دایكی زۆربەی بیرۆكەو ئەندێشە جۆراوجۆر و یەك لە دوای یەكەكانی ناو ئەم دینەیان بزانین. ئەم دوو نەریتە ئایینییە بریتیە لە موعتەزیلەو ئەشاعیرە (ئەشعەری گەری). گرنگترین خاڵی جیاوازیی ئەم دوو نەریتە هەڵئەگەڕێتەوە بۆ شێوازی بیركردنەوە یان لە ئەقڵ و ئیجازەدان بە ئەقڵی مرۆڤ لە ناسین و بەڕێوەبردنی دین و دونیادا. موعتەزیلە باوەڕێكی بەربڵاوی جەوهەرییان بە ئیمكان و ئیجازەی كەڵكوەرگرتن لە ئەقڵ هەیەو لە بەرانبەردا ئەشعەرییەكان ئاوەها باوەڕێكی رادیكاڵیان بە ئەقڵ نییەو تەنانەت هەندێكیان تێگەیشتنی ئەقڵانی و ئاوەزمەند بۆ دین بە كوفر و حەرام دەزانن. هەرچەند سەلەفییەت بە تەواوی دژی ئەقڵەو دژی ئەشاعیرەش وەستاوە بەڵام بێگومان ئەگەر بمانەوێ لەژێر یەك لەم دوو نەریتەدا پۆلێنبەندیی بكەین ئەبێ بیخەینە خانەی ئەشعەریگەرییەوە، چونكوو سەلەفییەكانیش ئیجازەی بەكارهێنانی ئەقڵ نادەن و لە هەر حاڵدا لەم رووەدا بە ئەشعەرییەكان نزیكترن. دیارە جیاوازییەكانی ئەشعەری و موعتەزیلە تەنیا لەم یەك خاڵەدا كورت نابێتەوەو گەڵ رووبەر و بابەتی دیكەش ئەگرێتەوەو بە بەراوردكردنی دەقە نووسراوەكانی ئەم دوو نەریتە ( بۆ وێنە بەراوردكردنی تەفسیری «الكشاف»ی زەمەخشەری كە بەرجەستەترین خوێندنەوەی كلاسیكی موعتەزیلەیە بۆ قورئان، لەگەڵ «الابانة عن اصول الدیانة»ی ئەبولحەسەنی ئەشعەری ) دەتوانین لە ئاست و قووڵیی ئەو جیاوازی و تەنانەت دژایەتییانە تێبگەین. بۆ وێنە موعتەزیلەكان قورئان بە مەخلووق ئەزانن و لەسەر ئەو باوەڕەن كە خودا بە چاو نابینرێ بەڵام ئەشعەرییەكان پێچەوانەی ئەمە بیر ئەكەنەوە. لێرەدا دوو پرسیار دێتە پێشەوە، یەكەم، ئایا جەنابت قەناعەتت بەوە هەیە كە سەلەفییەت لە خانەی ئەشعەریگەریدا خۆی ئەبینێتەوەو ئەگەر لەو باوەڕەدا نیت هۆكارەكەیمان بۆ روون بكەرەوە. دووهەم، روانینی تایبەتی سەلەفییەت بۆ موعتەزیلە و چەمكە باوەڕپێكراو و قبووڵكراوەكانیان وەك ئەقڵ و مەخلووقبوونی قورئان و رەتكردنەوەی خەسڵەتە ئیجابییەكانی خوداو.....چۆنەو بە گشتی چ جیاوازییەك لە نێوان دونیابینیی سەلەفییەت و موعتەزیلەدا ئەبینی؟

سەرەتا با فەرموودەیەكی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێ) بگێڕمەوە كە دەفەرموێ: «یەهوود و نەسارا دەبنە حەفتاویەك و حەفتاودوو بەش و ئۆممەتی ئیسلامیش ئەبێتە حەفتاوسێ بەش، ئەم حەفتاوسێ بەشەش جگە لە دانەیەكیان هەموویان ئەكەونە ناو ئاگری جەهەننەمەوە.» پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێ) دەربارەی ئەو گروپەی ناكەوێتە ناو ئاگری جەهەننەمەوە، دەفەرموێ:(ما انا علیه الیوم و اصحابی) واتە «ئەو بەشەیان ناچێتە ناو ئاگرەوە كە لەسەر ئەو رێبازەیە كە ئەمڕۆ من و هاوەڵەكانم لەسەرین.» زانایانی شیكردنەوەی حەدیس ئەڵێن: ئەگەر وشەی (الیوم/ئەمڕۆ)ی تیادا نەبوایە

ئەوا ئەمانتوانی جۆرێکی تر تەئویلی بکەین و مانای تری بۆ بدۆزینەوە بەڵام ئەم وشەیە هەموو شتێکی لەگەڵ خۆیدا هێناوەو مەبەستەکەی تەواو روون کردۆتەوە.

من حوکمی ئەو فەرموودەیە نادەم بەسەر موعتەزیلەو ئەشعەریدا بەڵکوو تێڕوانینەکانیان ئەخەمە ژێر لێکۆڵینەوەوەو لەگەڵ سەلەفییەتدا بەراوردیان دەکەم، با خوێنەر و دادوەریش بۆخۆی رای دروست هەڵبژێرێت. ئەقڵانییەکان پێیان وایە کەسێك کە رێی ئیسلام ئەدۆزێتەوەو هەڵی ئەبژێرێ، ئەم دۆزینەوەو هەڵبژاردنە ئاکامی بەکارهێنانی ئەقڵ و بیرکردنەوەیەو هەر ئەقڵیشە تێمان ئەگەیەنێ خالقی کەون و دونیا خوای تاك و تاقانەیەو ئیسلام راستترین بەرنامەی ژیانەو.....هتد. بەڵام ئوسوولییەکان و لە سەرەوەی هەموویانەوە سەلەفییەکان، کەوتنە سەر رێگەو رێبازی خولناسینی و ئیسلامەتی بە زادەی بیری مرۆڤ نازانن و وەك خەڵات و هیدایەتی خوای گەورە سەیری دەکەن.

ئێستا با بە هێنانەوەی نموونەیەك باسەکە روونتر بکەمەوە. ئەگەر مەڕێك کە گیاندارێکی بێ ئاوەز و بێ زمانە بەرخێکی ببێ و بەرخەکەی بخەنە ناو هەزار سەر مەڕو بەرخی ترەوە خوای گەورە هیدایەتی ئەداو هێزێکی بۆنکردنی وای پێئەدات کە لە ناو ئەو هەموو بەرخ و مەڕەدا بێچووەکەی خۆی بدۆزێتەوە بەڵام ئەگەر ئافرەتێك کە خاوەن زمان و ئاوەزە بە هەمان شێوەی مەڕەکەی بەسەر بێت نەك بەهۆی بۆنکردنەوە بەڵکوو لە رووی هەندێ نیشانەی ترەوە منداڵەکەی ئەدۆزێتەوە. ئەم جیاوازییانە هەمووی ساختەی خوای پەروەردگارەو خوای گەورە بەو شێوەیە هیدایەتەی مەڕەکەی داوە کە پێویستی پێیەتی بەڵام لە بەرانبەردا شتی دیکە واتە توانایی تری بە ئافرەتەکە داوە. هەرچەند ئەو گیاندارە (مەڕەکە) خاوەن ئەقڵ نییە بەڵام هیدایەتی بەخێوکردنی خۆی و بەچکەکانی هەیە، مرۆڤیش بە تەبیعەتی خۆی ئەو حاڵەت و فیترەتەی هەر لە سەرەتای لە دایکبوونەوە هەیەو ئامادەیی دینداربوونی تیایە مەگەر ئەوەی دایك و باوکی لەسەر رێی راست لای بدەن و چەواشەی بکەن یان خۆی پاش گەورەبوون بە هۆکاری تر بۆ نموونە بەهۆی تاوانەوە لەسەر رێ دەربچێت. کەوابوو مرۆڤ لە نەبوونی ئەقڵیشدا ئەتوانێ خواناس و خواپەرست بێ و حەقیقەت بدۆزێتەوە چونکوو خوای گەورە خۆی هیدایەتی ئەدات.

لە راستیدا موعتەزیلە بۆچوون و ئەندێشەی ئاوەزخوازییان لە فەلسەفەی یۆنانەوە گرتووە نەك لەناو دڵی خودی ئیسلامەوە دەریان هێنابێ، تەنانەت نووسەرێکی رۆژئاوایی بە ناوی پرۆفیسۆر «اسمیت» لە کتێبەکەیدا بە ناوی (ئیسلام لە روانگەی بیرمەندانی رۆژئاواییەوە) کە من بە فارسی خوێندوومەتەوەو گەلێ بێلایەنانەو بە ئینسافەوە نووسیویەتی، ئەم حەقیقەتەی پشتراست کردۆتەوەو وتوویەتی: «ئەئمەو شێخەکانی موعتەزیلە لە رێگەی وەرگێڕانی کتێبە فەلسەفییەکانی یۆنانەوە بوونە خاوەن ئەو بۆچوونانەو گەیشتنە ئەو قەناعەتەی هەر بیروبۆچوونێك پێچەوانەی ئەقڵ بوو وەرناگیرێت و رەت ئەکرێتەوە». اسمیت لە درێژەدا ئەڵێ: «موعتەزیلەکان ئالێرەوە بە شێوەیەکی رواڵەتی کەوتنە هەڵزنان بە عەدالەتی خواداو وتیان ئەوەی کە خوا هەرچی ویست بیکات و بە کەیفی خۆی خەڵك بخاتە جەهەننەم و بەهەشتەوە، لەگەڵ ئەقڵدا رێك نایەتەوە». هەرچەند ئەو پرۆفیسۆرە پشتگیرییەکی تەواو لە موعتەزیلە دەکات بەڵام هەر بە پێی قسەکانی ئەو ئەگەینە ئەو دەرەنجامە کە موعتەزیلە تەسلیم و موریدی فەلسەفەن و هەر شتێك پێچەوانەی ئاوەز و فەلسەفە بێت، ئەوان رەتی دەکەنەوە. ئەو موعتەزیلە بە یەکەم دەستەی ئەقڵانی و ئاوەزخوازی مێژووی ئیسلام ناو ئەبات و لەو باوەڕەدایە کە بناغەدانەرانی موعتەزیلە ئاشناییان لەگەڵ ئەندێشەی یۆنانی و مەسیحی و زەردەشتیدا بووەو ئاوەزخوازییان لەوانەوە گرتووەو تێکەڵاوی ئایینی ئیسلامیان کردووە.

جا ئەگەر ئەقڵ و فەلسەفە ببنە سەنگی مەحەکی دەقی دینی، ئەی باشە پیرۆزیی پەیامەکە چی بەسەر دێت و گرنگیی پەیامێك چی ئەبێ ئەگەر نەتوانێ بەسەر ئاوەز و ئەقڵی کۆمەڵێك خەڵکی بەناو فەیلەسووفدا زاڵبێت؟! پرۆفیسۆرە اسمیت دانی بەوەشدا ناوە کە کۆمەڵگای عەرەب لە رێگای دەقی دینییەوە توانی کیان و ئەخلاقی خۆی دروست بکاتەوەو وەك نموونەی رێکخستنەوەو چاکسازی کردن لە کۆمەڵگای عەرەبیشدا ناوی عومەری خەتتاب (رەزای خوای لێ بێ)

ئەبات. بێگومان قەت ناتوانین ئەقڵ بە سەر وەحی و پەیامی خوادا فەرز کەین و بیکەینە پێوەر بۆ پێواندنی پەیامی خوای گەورە. موعتەزیلە لە ڕێگای ڕەتکردنەوەی دەقە ئاسمانییەکان و بە هۆی ئەقڵەوە کەوتنە هەڵدێری لادان و ئەشعەرییەکانیش بە دژایەتیکردنی ئەوان و ڕەتکردنەوەی ڕایەکانیان کەوتنە ناو هەڵەی دانانی (چۆنیەتی) بۆ خوای گەورەو ئەوەی کە خوا لە هەموو جێیەکدا هەیەو.....هتد. ئەبولحەسەنی ئەشعەری کە سەرەتا لە سەر خوانی موعتەزیلەکان و لەبەر دەستی ئەواندا پەروەردە بوو و کەوتە پێڕەویکردنی موعتەزیلەوە، دواتر بە مەبەستی ڕەتکردنەوەی بیروباوەڕی موعتەزیلە هەر کەڵکی لە میتۆد و شێوازە ئەقڵییەکانی خودی موعتەزیلە وەرگرت. ئەشعەری یەکێك بوو لە زانایانی ئەهلی کەلام و تەنانەت وەك داهێنەری زانستی کەلامیش ناو دەبرێت. هەرچەند ئەو لە پێناو ڕەتکردنەوەی بیروباوەڕی موعتەزیلەدا هەوڵێکی زۆری دا بەڵام نە (الدبانە فی اصول الدیانە یان کتاب اللمع و.....) و کتێبەکانی تری ئەو و نە تەفسیرەکەی زۆرەخشەری ناکەونە خانەی ئیسلامی ئەهلی سوننەو جەماعەوە. دەلیلیشم ئەوەیە کە قەت هەڵە بە هەڵە ڕاست نابێتەوەو ئەگەریش هەڵەی یەکەم ڕاست بێتەوە هەڵەی دووهەم جێی ئەگرێتەوە؛ موعتەزیلە لە ئیسلامی ڕاستەقینە لای داوە بەڵام ئەشعەرییەکانیش بە جۆرێکی تر دووچاری ئەم لادانە بوونەتەوە. هۆکاری ئەوەش کە وەك وتووتانە ئیسلامی ئەهلی سوننەو جەماعە سەلەفییەت ئەخەنە خانەی ئەشعەری گەرییەوە یان بە پێچەوانەوە، ئەوەیە کە سەلەفییەت بەو ئاستەی بەرەنگاری موعتەزیلە بۆتەوە دژایەتی ئەشعەرییەکانی نەکردووە. بەڵام لە ئەساسدا سەلەفییەت نە موعتەزیلە قبووڵ دەکات و نە خۆیشی لە ئەشاعیرە بە نزیك ئەزانێت. هەروەها پێویستە ئەوەش بڵێم کە بە پێچەوانەی ئەوەی ئێوە وتووتانە، ئەشعەرییەکان دژی ئەقڵ نین و ئەوانیش بە مەبەستی بەرەنگاربوونەوەی موعتەزیلەو بە سوودوەرگرتن لە ڕای ئەهلی حەدیس، هەمان میتۆد و شێوازی ئەقڵانییان بەکار هێناوە. بۆیە سەلەفییەت نە تەنیا ناچێتە خانەی ئەشعەری گەرییەوە بەڵکوو بنکەی هەڵوەشاندنەوەی هەموو جۆرە ئاوەزخوازییەکە کە ئەشعەرییەتیش یەکێکە لەوان.

هەروەها بیرۆکەی مەخلووقبوونی قورئانیش لە مەسیحییەکانەوە وەرگیراوە کە کوفرێکی وا دەکەن و گۆیا مریەم بۆتە ژنی خواو عیسای لە خوا بووەو خوا سێ دانەیە واتە مریەم و عیساو خوا (العیاذ باللە) کە ئەمە کوفرێکی گەورەیەو هەڵوەشێنەری تەوحیدە بە تەواوەتی. بۆیە ئەهلی حەدیس بە تایبەت ئیمام ئەحمەدی حەنبەل وتوویانە هەر کەسێ لە دڵی خۆیشیدا باوەڕی وابێ کە قورئان مەخلووقەو کەلامی خوا نییە، کافرەو تەنانەت ئەگەر کەسێکیش بە نیسبەت مەخلووقبوونی قورئانەوە تووشی گومان و دوودڵی بێت پێی کافر ئەبێتەوە. خەسڵەتەکانی خوایش هەمووی ئیجابییەو ئەگەر پێچەوانەی ئەمە بیر بکەینەوە ئەوا زۆرێك لە سیفەتەکانی خوامان خستۆتە ژێر پرسیارەوەو تەنانەت هەندێکیشیمان بە تەواوی ڕەت کردۆتەوە، وەك خەسڵەتی عەدل یان سیفەتە بەرز و پیرۆزەکانی تر. کەوایە ئەم بۆچوونەش لای سەلەفییەت بە تەواوی مەردوودەو قبووڵ ناکرێت.

بەڵام موعتەزیلەکان سوور و پێداگرن لەسەر ئەوەی کە تێگەیشتنە ئەقڵانییەکەی ئەوان بۆ قورئان و ئایینی ئیسلام بە هیچ شێوەیەك ناکەوێتە دەرەوەی چوارچێوەی ئیسلامەوەو ئەوانیش ئەڵێن ئیسلامی ڕاستەقینە لای ئێمەیە. ئەوان پێیان وایە دادپەروەریی خوداوەند گرێدراوی ئازادی و ئیختیاری مرۆڤەو ئەگەر مرۆڤ لە بیرکردنەوەو هەڵسووکەوتدا ئازاد و موختار نەبێ و هەموو کردارێکی لە پێشترەوە بۆ دیاری کرابێ، ئەوا ئەو مرۆڤە شایانی لێپرسینەوە نییە. هەر بۆیە عەدالەتی خودا لەوەدا بەرجەستە دەبێتەوە کە ئازادیی بە مرۆڤ داوە لە ژیانکردندا. بەڵگەشیان بۆ ئەو بۆچوونە ئەم ئایەتەیە: (من عمل صالحاً فلنفسه و من اسمة فعلیها). ئەڵبەت کۆمەڵێ ئایەت و بەڵگەی دیکەیش دەهێننەوە کە مەجالی باسکردنیمان نییە. دەربارەی مەسەلەی قەدەری خوداوەند و لەوحی مەحفووزیشەوە ئەڵێن ئەمە نیشانەری

ئاگاداربوون و زانستی خوایە لەسەر هەموو بابەتێك نەك ئەوەی لە پێشترەوە ورد و گەورەی هەموو شتێکی بۆ مرۆڤ دیاری کردبێ. کەوایە وەك دەبینین موعتەزیلەش بەڵگەکانیان لەناو خودی دینەوە دەردەهێنن و تەنیا جیاوازییان ئەوەیە کە ئەقڵ ئەکەنە ناوبژیکار و دەرهێنەری ئەو بەڵگانە نەك ئەوەی لە دەرەوەی دین و بە فاکتەری دەرەکییەوە باسی پرسە دینی و کۆمەڵایەتییەکان بکەن. تەنانەت ئەگەر هەندێ لە میتۆدەکانیش لەگەڵ فیلسووف و مەسیحییەکاندا لێکچوو و بگرە هاوبەشیش بێ سەختە بتوانین لە بازنەی ئایینی ئیسلام بیانخەینە دەرەوە، چونکوو ئوسووڵ و بنەماکانیان لەگەڵ ئوسووڵ و بنەماکانی ئایینزاو مەزهەب و خوێندنەوە ئیسلامییەکانی تردا جیاواز نییەو هەر یەك شتەو جیاوازییەکە ئەگەڕێتەوە بۆ شێوازی لێکدانەوەو تەئویلکردنی ئەو بنەمایانە نەك باوەڕداربوون یان بێباوەڕبوون بەو بنەماو پرەنسیپانە. بەڵام سەلەفییەکان پێیان وایە موعتەزیلە وەك خەواریج ئەکەوێتە دەرەوەی ئیسلامەوەو ڕێبازێکی چەواشەو دەستکردە کە فڕی بەسەر ئیسلامەوە نییە، یان لانیکەم ئەوەی بە ئیسلامی ڕاستەقینەی ناوزەد دەکەن لە موعتەزیلەدا هیچی لێ نادۆزنەوە. سەرەتا پێمان بڵێ ئایا ئەتوانین بە چ پێوەرێك ئەم دووانە لێك جیا بکەینەوە؟ دواجار بە پێی ئەوەی باسمان کرد ئایا دیسان هەر لەسەر ئەو باوەڕەیت کە موعتەزیلە ڕێبازێکی چەواشەیە کە ناکەوێتە خانەی ئایینی ئیسلامەوە؟

پێش وەڵامدانەوەی خودی پرسیارەکە با نموونەیەکی زانستی دیکە بە پێوەری ئەقڵ و لێکدانەوەی ئەقڵی ئێوەو خۆیشم بخەمە بەردەست تاکوو مەسەلەکە ڕوونتر بێتەوە. دیارە مرۆڤ هەڵگری چەند هەستەوەرێکی جیاجیایە وەکوو چەشتن، بیستن، بینین، خۆشی و پێکەنین، ناخۆشی و گریان و تووڕەبوون و.....هتد. ئەمانە هەموویان پابەندن بە بیر و هۆشەوە یان ئاوەزەوە. هەرچەند هەندێ شارەزای ئەو بوارە ئەڵێن ئەقڵ و هۆش وا لەناو سەر و مێشکدا بەڵام هەندێکی تریش لەو باوەڕەدان لەناو سینە یاخود دڵدایەو ئەوە دڵە کە فەرمان بە مێشك ئەدات. بەڵام لێرەدا گرنگ ئەوە نییە شوێنەکەی لە کوێدایە، ئەگەر چاو نەتوانێ شتێك ببینێ قەت مانای ئەوە نییە ئەو شتە بوونی نییەو بە بەڵگەی باوەڕپێکراو سەلمێنراوە کە چاو توانای بینینی سنووردارە. ئەقڵیش وەکوو چاو وایەو توانای بینین و تێگەیشتنی سنووردارەو گەلێ شتی ناو ئەم جیهانە هەن کە ئەقڵ نەیتوانیوە لێیان بگات و بۆ مرۆڤیان پێناسە بکات. ئیتر چۆن ئەتوانین ئەم ئەقڵە بکەینە پێوەر بۆ لێکدانەوەی سیفەتەکانی خوا؟ خوایەك کە گەورەترە لە هەموو ئەو شتانەی دروستی کردووە. ئاشکرایە ئێمە توانای ناسینی خوامان لە ڕێی ئەقڵی خۆمانەوە نییەو ئەوەشی کە لێی دەگەین هەر ئەوەندەیە کە خوا بۆخۆی فێری کردووین و بۆی ڕوون کردووینەتەوەو ئەمەش لەوە تێناپەڕێ کە لە ڕێی وەحی ئاسمانییەوە بەدەست هاتووە بە مەرجێك دەستکاری وەحییەکەش نەکرابێ.

ڕاستە موعتەزیلە ئیدیعا ئەکەن نەچوونەتە دەرەوەی بازنەی ئیسلامەوە بەڵام خۆ پێداگری و خۆ بەڕاستزانینی هەر کۆمەڵێك بەڵگەی ڕاستبوونی بیروباوەڕەیان نییەو بە بێ بەڵگەی زانستی ڕاستبوونی ناسەلمێت و ئەوەی ئەوان واتە موعتەزیلە ئیدیعای ئەکەن، بە بەڵگەی زانستیی ڕەت کراوەتەوە. هەروەها موختاربوونی مرۆڤ هیچ دژایەتییەکی نییە لەگەڵ قەدەری دیاریکراوی خوای گەورەداو بەڵگەش بۆ ئەم قسەیە لەناو دەقدا فراوانەو ئەوەش بڵێم کە ئێمە بە تەواوی خواحافیزیمان لە بەکاربردنی ئەقڵ نەکردووە بەڵکوو لە سنووری خۆیداو بەوجۆرەی لە دەقەکاندا دیاری کراوە بەکاری ئەهێنین. زانستی دەروونناسی ئەتوانێ نموونەیەکی باش بێ بۆ سەلماندنی نەبوونی ئەو دژایەتییەو مامۆستایەك ئەتوانێ بە پێی یاساو ڕێساکانی زانستی دەروونناسی لە سەرەتای ساڵی خوێندندا زیرەکبوون و تەمبەڵبوونی قوتابییەکانی دیاری بکات و بڵێت کامەیان دوای تاقیکارییەکان دەرئەچن و کامەیان دەرناچن. بەڵام ئەم پێشبینییە بەو مانایە نییە کە مامۆستا لە نێوانیان قوتابییەکانیدا بێ عەداڵەتی ئەکا، بەڵکوو ئەو لەڕووی زانستی دەروونناسییەوە ئەوەی بۆ سەلماوە. ئیتر ئەمێنێتەوە سەر هەوڵ و تێکۆشانی خودی قوتابییەکان کە بە زیرەك دەرچن یاخود دوابکەون و

دەرنەچن ئەگینا مامۆستاکە وەکوو یەك وانەیان پێ ئەڵێتەوە. جا بە پێی ئەم نموونەیە ئەسەلمێت کە ڕای ئەقڵانییە موعتەزیلەکان هەڵەیەو هۆکارەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتنیان لە ئیمان بە خواو ڕۆژی دوایی و قەدەری خوای گەورە کە هەموویان مەرجی ئیمانن و ئەوان تیایدا هەڵخلیسکاون.

سەبارەت بەو بەشی پرسیارەکە کە باسی مەسەلەی ناوبژیکاربوونی ئەقڵ لای موعتەزیلەکان و دەرهێنانی بەڵگەکانیان لەناو خودی دینەوە ئەکات، ئەتوانم بڵێم مەرج نییە هەر کەس لە کارێکدا بەڵگەی دینیی هێنایەوە ئیتر کارەکەی دیندارانەیەو توانیویەتی بە باشی تایبەتمەندییەکانی دین بپێکێت. بۆیە ڕاشکاوانە پێتان ئەڵێم کە جیا لە خودی دەقی ئاسمانی هیچ شتێکی ترمان نییە بیکەینە بەڵگەو پێوەر بۆ هەڵسەنگاندنی ڕاستییەکان و ئاستی دوور و نزیکی هەر بیروبۆچوون و ڕایەك بە حەقیقەتی دینەوە. ئەمەش پێچەوانەی پێشکەوتنی مرۆڤ نییە بەڵکوو مرۆڤ لەوپەڕی نەزانییەوە هەڵئەگەڕێتەوە بۆ ئەمپەڕی زانست و زانایی و شارستانییەت و پێشکەوتن. هەروەها واش نییە کە ئەقڵ بە تەواوی خرابێتە لاوە بەڵکوو وەك وتم تا ئەو جێگەیەی لە دەقدا ڕێگەی پێدراوە پێویستە بەکار بهێنرێت و (ئەقڵ و نەقڵ)یش ئالەم خاڵەدا یەك ئەگرنەوە. لە ژیانی ڕۆژانەی پێغەمبەریشدا (درودی خوای لێ بێ) نموونەی زۆرمان لە ڕاوێژکردنی ئەو لەگەڵ دەورووبەریدا بینیوەو تەنانەت لەو شتانەش کە لە دینی یەهوود و مەسیحیەتدا باو بووە، دوای پرسیارلێکردن و توێژینەوە کەڵکی وەرگرتووەو ئیتر ئەمە بۆتە دین بۆ ئەهلی ئیسلامیش مەگەر ئەوەی کە بۆخۆی لە ڕووی دەقەوە قەدەغەی کردبێت. ئەمە بۆتە هۆکاری ئەوە کە گەلێ خاڵی هاوبەش لە نێوان ڕەوتی هەڵسووکەوتی ئێمەو یەهوودی و مەسیحیەکاندا دروست بێت و ئەمەش بیروڕای فیلسووفە یۆنانی و مەسیحییەکانە کە بوونەتە خاڵی هاودژبوونی تێڕوانینی ئێمە لەگەڵ ئەواندا. جا ئەگەر دەسکاری لە دینەکەیاندا نەکرایەو لەسەر دینە ئەسڵییەکەی عیساو مووسا بمانایەتەوە ئێستە ئەوانیش وەکوو ئێمەی موسوڵمان و ئەهلی سوننەو جەماعە دژی بۆچوونە فەلسەفییەکانی ئەو فەیلەسووفانە ئەوەستانەوەو ڕەتیان ئەکردنەوە.

سەبارەت بە قایلبوون بە دوو چەمکی ئیسلامی ڕاستەقینەو ناڕاستەقینەش هەرچەند لە ناوەرۆکی وەڵامەکانەوە دیارە کە قایل بەو شتە هەم بەڵام دیسان ئەڵێم بەڵێ ئیسلامی ڕاست و ناڕاستمان هەیە. هەر لە سەردەمی خودی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) و مەسەلەی دەرکەوتنی «موسەیلەمە»ی کەزابەوە بگرە تا ئەگاتە ئەم سەردەمەی خۆمان، سوننەتی کەونی خوای گەورە وا دانراوە کە هەمیشە دژایەتی لە نێوان ڕاست و ناڕاستدا بووەو هەیەو ناڕاستەکان لە هەر سەردەمێکدا بەناوێکەوە ئەکەونە جموجووڵ و بەرەنگاربوونەوەی حەقیقەتی پەیامی خوای گەورە.

زانایانی ئێمە موعتەزیلەو هەموو دەستەو فیرقە هاوشێوەکانی موعتەزیلەیان بە فیرقە گومڕاکان (فرق الضالە) ناوزەد کردووە. ئەڵبەت هەموشیان بە لە دین دەرچوو دانانێن و بە نیسبەت تەکفیر کردنیشیانەوە لە نێوان زانایاندا جیاوازی هەیەو جیاوازییەکەش لەوەوە سەرچاوە ئەگرێ کە هەریەکەو بە جۆرێك و لە چەمکێکەوە ئیسلامی قبووڵ بووەو کاری بە هەندێ چەمکی ئیسلامی کردووە بەڵام پێویستە مرۆڤ هەموو چەمکەکانی ئیسلام بە تێکرا وەربگرێت و وا نەبێ کە نیوەی فڕێ بدات و بە نیوەکەی تری کار بکات.

**سەلەفییەکان ئیهتیمامێکی سەیر ئەدەن بە هەندێ ڕواڵەتی سادە کە ڕەنگە بە جۆرئەتەوە بتوانین بڵێن کاریگەرییەکی جیدییان لە سەر ڕەوشت و بنەماکانی دینی ئیسلام نییە. بۆ نموونە جووڵاندنی پەنجەی شەهادە لە کاتی (التحیاە)ی نوێژدا، یان شێوەی دەستگرتن و قاچدانان لە نوێژدا، یان کەڵکوەرگرتنی فراوان لە دەستی ڕاست بۆ هەموو کارێك کە تەنانەت سەعاتیش هەر دەکرێتە دەستی ڕاست. یاخود هێشتنەوەی تایبەتی ڕیش و کورتبوونی پانتۆڵ و.....هتد. جاروبار سەلەفییەمان هێندەی خۆ بەم شتە بچووك و بێکاریگەرییانەوە خەریك دەکەن ئەوەندە بیر لە پرسە قووڵ و**

جیدییەکانی ناو ئیسلام و کۆمەڵگای موسوڵمانان ناکەنەوە. ڕەنگە ئەتانەت بتوانین بڵێین تەنیا بەرهەمی ئەم «ڕواڵەتخوازی»یە ڕادیکاڵە پارچەپارچەبوونی هەرچی زیاتری موسوڵمانان بووەو لەوەش بەدەر بۆتە هۆی دوورکەوتنەوەی سەلەفییەکان – وەك تاك – لە بیرکردنەوەی قووڵ لە شتە بنەماییەکان. چونکوو بێگومان خۆ خەریککردن بە شتی سادەوە ئەبێتە هۆی فەرامۆشکردنی شتە جیدی و ئاڵۆزەکان. بۆچی سەلەفییەت هێندە جەخت لە سەر ئەم ڕواڵەتخوازی و کارە ڕواڵەتییە ناپێویستانە دەکات؟

سەرچاوەی ئەم ڕواڵەتخوازییە لەوەدایە کە سەلەفییەت دین بە هۆکاری گۆڕانکاری هەمەلایەنەی مرۆڤ ئەزانێ، وەك چۆن لە مرۆڤی دینداردا هەموو لایەنە ڕۆحییەکانی وەك متمانەداری و دادپەروەری و بەزەییهاتن و وەفاداری و ڕاستگۆیی و.....هتد بەرەو پەیدا ئەکات، پێویستە لە هەیمەنەی ڕواڵەتی و دەرەکی ئەویشدا هەندێ ئاڵوگۆڕ بێتە ئاراوە. لەبەرچاوگرتنی پاك و خاوێنی، لەبەرکردنی جلوبەرگی سپی بۆ پیاوان و جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگ بۆ ژنان لای مەحرەمی خۆیان و هەموو ئەو شتە ڕواڵەتیانەی ناو عیبادەت بەوجۆرەی لە سەحیحەکانەوە وەرگیراوە، نموونەی ئەو ئاڵوگۆڕە ڕواڵەتیانەن. هەندێ لە سەلەفییەکان ئەم شتانە زۆر زەق دەکەنەوەو ئەمەش بۆتە هۆی بەسادەزانراني سەلەفییەکان لە لایەن خەڵکەوە، بۆیە بەڕای من باشتر وایە سەلەفییەکان خۆیان ئاستی ڕۆشنبیری ئەو خەڵکە دەرك بکەن و ئەوەندە شتە ڕواڵەتییەکان زەق نەکەنەوە کە سەرسووڕمانی ئەوانی لێبکەوێتەوە. هەروەها پێویستە لە ڕێی ئەمەر بە چاکەو نەهی لە خراپەوە ئاستی ڕۆشنبیری ئیسلامیی خەڵکەکەمان بەرزتر بکەینەوە تاکوو پەنجە جووڵاندنێك کە بە شێوەی سەحیح بەکار ئەبرێت نەبێتە جێی سەرسووڕمانی ئەوان.
بەنیسبەت کەڵکوەرگرتن لە دەستی ڕاستیش بۆ ئەنجامدانی هەموو کارە باشەکان، پێویستە بڵێم ئەمە سوننەتی سەحیحەو ئاڵوگۆڕی تیادا ناکرێ تاکوو سەلەفییەکانیش لەبەر تێڕوانین و قسەی خەڵك بیگۆڕن. هەروەها بە نیسبەت سەعاتیشەوە بەهۆی هەڕەشەی خۆلێکچواندنی یەهوود و نەساراوە، بە هیچ شێوەیەك نابێ بکرێتە دەستی چەپەوە. هەروەها پێویستە بڵێم بەردانەوەی ڕیشیش سوننەتی هەمیشەیی پێغەمبەری ئیسلام (سڵاو و دروودی خوای لێ بێ) بووە. بۆیە لە سەردەمی کۆندا ڕیشداربوون لای موسوڵمانان نیشانەی پیاوەتی پیاو بووەو بەم بۆنەوە ڕیشیان هێشتۆتەوە نەك لەبەر نەبوونی گوێزان (تیغ) و وەسیلەی تاشین! ڕیش هێشتنەوە لە سوننەتە (موٴکدە)کان واتە لەو سوننەتانەیە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێ) پێداگری لەسەر کردووە. سەرباری هەموو ئەمانەش ئبن تەیمییە لە وەسفی تایفەی مەنسوورەو فیرقەی ناجیەدا ئەڵێ: «کاتێ بکەونە حاڵەتی بێ دەسەڵاتییەوە –کاتێك بکەونە (دارالکُفر) واتە ئەو جێیانەی لە باتی موسوڵمانان کافر و مورتەدەکان حوکمیان تیا ئەکەن– ڕواڵەتی خۆیان ئەگۆڕن و ئەمەش نەك ئەنگ و عەیب نییە بەڵکوو جێی شانازییە.» ئەگەر بە باشی لە فتواکەی ئبن تەیمییە ورد بینەوە ئەبینین زەروورەتی خۆگونجاندنی موسوڵمانانی لەگەڵ دەوروبەردا تیادا لەبەرچاو گیراوە کە ئەمە لە تایبەتمەندییەکانی فیرقەی ناجیە یان تایفەی مونسووردا ڕەنگی داوەتەوە. ئەم خۆگۆڕینە ڕواڵەتییە واتە خۆگۆڕینی بە ئەنقەست و لەڕووی ناچارییەوە، زۆر شتی تریش لەخۆی ئەگرێت، وەك لەپێکردنی شەرواڵی درێژ و سمێڵ گەورە کردن و تاشینی ڕیش و سمێڵ و لەبەرکردنی جلوبەرگی هەر شوێنێك و.....هتد.
ئەم حوکم و یاسا ئیسلامییانە هەرکامەو حیکمەتی خۆی هەیە کە لێرەدا دەرفەتی شیکردنەوەیانم نییە بەڵام بەو مانایە نییە کە شتی بچووك و کەمبایەخ یاخود بێبایەخن چونکوو بۆ وێنە شێوازی لەبەرکردنی جل لە لایەن ژن و پیاوەوە جیاوازەو پێوەندیی بە کەسایەتی و کەرامەتی ئەم دوو جۆرە مرۆڤەوە هەیەو پێویستە وەکوو خۆی بەڕێوە ببرێت. ئەڵبەت بە تەواوی لەگەڵ ئەوەشدا هەم کە خۆخەریککردنی ڕووت بە شتە سادەکانەوە ئەبێتە هۆی فەرامۆشکردنی شتە جیدی و ئاڵۆزەکان و پێویستە ئێمەی موسوڵمان تەنیا خۆ بەم جۆرە شتانەوە خەریك نەکەین و لە قووڵایی

دینەکەیشمان تێبگەین. سەرباری ئەمەش هەر ناڵێم شتە وردەکان بێبایەخن چونکوو هەرکامیان لە جێی خۆیاندا بە شتی دینی و موبارەك ئەزانم و داکۆکیکردن و لەسەرچوونیان بە سادە سەیر ناکەم. با ئەوەش بڵێم لە شەرعدا گرنگ و گرنگتر و گرنگترین هەمیشە جێی لێوردبوونەوەو تێرامانەو ئەبێ هەرکامیان لە جێی خۆیداو بە قەدەر خۆی سەیر بکرێت و بایەخی پێ بدرێ. نابێ هیچ شتێ لە مستەوای خۆی زیاتر گەورە بکرێتەوەو هیچ شتێکیش بە بێبایەخ لە قەڵەم بدرێ و ئەمەش ئەرکی هەموو تاکێکی موسوڵمانە.

**مەسەلەیەکی تر لە عەقیدەی سەلەفییەتدا قایلبوونی پەیکەر و جیسمە بۆ خودا کە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خودی ئبن تەیمییە، ئەڵێن ئەو لە وتارێکدا لە مزگەوتی شاری «حمص»ی شام و لە تەفسیری ئایەتی ٥ی سوورەتی (طه)دا وتبووی خوای گەورە خاوەن دەست و پەیکەرەو لە عەرشدا دانیشتووەو وەك چۆن من لە سەر پلەکانی ئەم مینبەرەوە دائەبەزم ئەویش ئاوا ئەجووڵێت و دائەبەزێت و.....هتد. ئەم بۆچوونە هەر ئەودەمیش هەرایەکی گەورەی نابوویەوەو خاوەنەکەی سەرەتا دوور خرایەوە بۆ میسر و ئینجا لەوێ توندی زیندان کرا. زۆربەی زانایانی ئیسلامی دژی ئەوەن خوا جیسم و پەیکەری هەیە یان بەشێك لە پەیکەرەکەی لە ڕۆژی قیامەتدا ئەبینرێ، ئەمە پێچەوانەی ئەو بۆچوونە زاڵەیە کە خوا بە زاتێکی نەبینراو و نەبیستراو ئەزانێ. ئاشکرایە ئەم بۆچوونە لە ئبن تەیمییەدا کۆتایی نەهاتووەو تا ئێستاش سەلەفییەکان هەر لەسەر ئەو ڕایەی ئەو ماونەتەوە. ئەمەمان چۆن بۆ شی دەکەیتەوە؟**

نەخێر، هەرگیز لە عەقیدەی سەلەفییەتدا پەیکەر و جیسم بۆ خوا دانەنراوەو ئەوەش کە باستان کردووە هیچ پەیوەندییەکی بە ئبن تەیمییەوە نییە، بەڵکوو ئەوە قسەی ئەو کتێبە فارسییانەیە کە لەسەر سەلەفییەت نووسراون و کەس نازانێ لە کوێوە هێناویانە. ڕای ئەهلی سوننەو جەماعە تەنانەت ڕای پێڕەوانی مەزهەبی (ظاهری)یش کە (ابن حُزم)ی ئەندەلوسی سەرمەزهەبیان بووەو ئێستە وەك دەستەیەکی دیار و ناسراو نەماون، لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا یەك ناگرێتەوە کە (خوا وەك مرۆڤ جیسمی هەبێ). ڕای ئەهلی سوننەو جەماعەو (ظاهری)یەکان بە نیسبەت ئەم مەسەلەیەوە لێك نزیکەو ئەوان بە پشتبەستن بە هەندێ ئایەت بۆچوونی خۆیان دەربارەی خوا ڕوون کردۆتەوە. بۆ نموونە کاتێ کە خوای گەورە لە ئایەتی ٧٥ی سوورەتی(ص)دا باسی ئیبلیس ئەکات، پرسیاری لێ ئەکات چ شتێك پێشی پێ گرتی و نەیهێشت سوجدەی ڕێز بۆ ئەو مەخلووقە ببەی کە بە دوو دەستی خۆم دروستم کردووە؟ ئەبینن خوای گەورە لەم ئایەتەدا باسی «دوو دەست» ئەکات و زۆر نموونەی تریش هەن کە سەلمێنەری ئەوەن خوا دوو دەستی هەیە. ئەڵبەت ناتوانین بڵێین دوو دەستەکەی خوا یەکیان چەپە چونکوو دەستی چەپ لایەقی خوا نییە بۆیە هەردوو دەستی خوای گەورە بە (ڕاست) حیساب ئەکەین و ئەڵێین خوا دوو دەستی ڕاستی هەیە. جا مادام خوا خۆی لە قورئاندا فەرموویەتی و باسی کردووە ئیتر کەس ناتوانێ ئینکاری ئەم شتە بکات. ئەهلی سوننە لەوەدا لە زاهیرییەکان جیا ئەبێتەوە کە ئەوان واتە پێڕەوانی مەزهەبی زاهیری لەو باوەڕەدان کە (مادام لە ڕواڵەت و زاهیری ئایەتەکەدا وشەی دەست هاتووە ئیتر دەست هەر دەستە) بەڵام ئەهلی سوننەو جەماعە بۆچوونێکی جیاوازیان هەیەو ئەڵێن: «ئەگەرچی لە زاهیری ئایەتەکەدا ناوی (دەست) هاتووە بەڵام ئێمە ئاگاداری چۆنیەتی و حاڵەتی دەستەکانی خوای گەورە نین بۆیە پێویستە تەنیا باوەڕمان بە ئایەتەکە هەبێ و هیچی لەبارەوە نەڵێین چونکوو ئەوە لە توانای ئەقڵی ئێمەدا نییە». تەنانەت ئەهلی سوننەو جەماعە لەو باوەڕەدان کە (هەر کەسێك وانەی سیفەتەکانی خوای گەورە بڵێتەوە نابێ لە کاتی وانە وتنەوەدا دەست بجووڵێنێ نەوەك تەشبیهی خوای گەورەی تیابێ)، کەوابوو ئەهلی سوننەو جەماعە بەرانبەر فەرزکردنی پەیکەر بۆ خوای گەورە زۆر توند ڕەفتار و سەختگیرن.

هەروەها لە تەفسیری ئایەتی ٥ی سوورەتی (طه)یشدا هاتووە: «(رحمان) واتە (خوای گەورە) لەسەر عەرش وەستاوە».
ئەهلی سوننەو جەماعە لەو باوەڕەدان لە لێکدانەوەی ئەو (وەستانە)دا، نابێ تووشی ئەو شیکردنەوەیە بین و وابزانین خوای گەورە قاچی هەیەو لەسەر قاچی وەستاوە واتە هەرگیز نابێ وەستانەکەی خوا بە لازمی قاچ بزانین. لە راستیدا چۆنیەتی وەستانی خوا لە ئەقڵی ئێمەدا ناگونجێ و تەنیا ئەتوانین بڵێین بەوجۆرە وەستاوە کە شایستەی خۆیەتی و زیاتر لەوە هیچی لێ نازانین.
منیش لە یەك دوو کتێبی فارسیدا کە بە مەبەستی رەتی بیروباوەڕی وەهابییەت نووسراوە، ئەو چیرۆکەم دەربارەی ئبن تەیمییە خوێندۆتەوە کە باستان کردووە، بەلام ناراستبوونی ئەم درۆیە ئەوەندە روون و ئاشکرایە کە تەنانەت منالێکیش پێی ئەزانێت. هەرچەند ئاوا لێکدانەوەیەك بۆ خوا واتە ئەوەی کە خوا جیسمی هەیەو وەك ئەفەرێك وایە، زۆر دوورە لە بیروباوەڕی ئبن تەیمییەوەو هیچ بەڵگەیەك بۆ بەستنەوەی ئەو ریوایەتە بە ناوبراوەوە لە بەردەستدا نییە بەلام ئەگەر تەنانەت ئەویش ئەمەی وتبێت بێگومان زۆر دوورە لەو تەرازوو و میزانەی کە ئەهلی سوننەو جەماعە بە مەبەستی وەرگرتنی راستییەکان بۆ ئێمەیان داناوە. ئێمە وەکوو شیعەکان نین کە باوەڕمان بە مەعسوومبوونی کەسێکی وەك ئبن تەیمییە (رحمەتی خوای لێ بێ) بێت و ئەگەر ئەو پیاوە گەورەیە تووشی هەڵەیەکی وا بووبێ رەتی ئەکەینەوەو دژی ئەوەستین. ئەگەریش رووداوەکەی مزگەوتی (حەمە )ی شام بە هەڵە گێڕدرابێتەوە بێگومان ئەو گێڕانەوەیە هەر بە کەڵکی زبڵدانی مێژوو دێت و ئەوە نییە هەر کەسەو بە کەیفی خۆی رووداوەکان بگۆڕێ و چۆنی پێ خۆش بوو وای بگێڕێتەوە.
پاشان مەسەلەی بینینی خوای گەورە لە فەرموودەی راستەوە وەرگیراوە کە لە چەندین سەرچاوەی باوەڕپێکراو و لەسەر گێڕانەوەو زمانی چەندین هاوەڵەوە بەدەست هاتووە، بەو شێوەیە کە لە رۆژی قیامەتدا پاش بەخشینی هەموو نیعمەتەکان بە ئەهلی بەهەشت ئینجا وەکوو چۆن مانگ ئەبینین ئاوایش زاتی پاکی خوا ئەبینین. ئەڵبەت ئەم بابەتە بەوجۆرە نییە کە ئێوە لە پرسیارەکەتاندا ئەیڵێن کە گوایە خوا پەیکەری هەیە، بەڵکوو لە فەرموودەکاندا مژدەی بینینی خوا بە ئەهلی بەهەشت دراوە بەلام ئیتر هیچ شتێك دەربارەی شێواز و شکڵی خوای گەورە نەوتراوە.
من وای ئەبینم لەبەر ئەم بەڵگەو نیشانە دینییانەیە کە سەلەفییەکان بەجۆرێك لە جۆرەکان باسی خوای گەورەو بینینی دەکەن و تا ئێستاش هەر نەیانبڕیوەتەوەو کۆتاییان بەو باسە نەهێناوە. ئەڵبەت رەنگە هەندێ لە سەلەفییەکان لەسەر حوکمی ئبن تەیمییە یاخود لە تێگەیشتنە دینییەکاندا تووشی هەڵە بووبن و کۆمەڵە قسەیەکیان کردبێ کە وا نیشان بدات سەلەفییەت جیسم و پەیکەر بۆ خوای گەورە فەرز ئەکات. ئەمەش شتێکی سەیر نییەو لە هەموو سەردەمێك و لە ئاستی هەموو ئەندێشەیەکدا ئەگەری روودانی هەڵەی لەم چەشنە هەیە، بەلام نابێ وەك تۆمەتێك بسەپێنرێ بەسەر سەلەفییەتدا.

تا ئێرەی باسەکە ئاوڕێکمان لە چۆنیەتیی گەشەکردن و زەمینەکانی سەرهەڵدانی بیری سەلەفییەت و بنەما عەقیدەتییەکانی ئەم نەریتە ئیسلامییە دایەوە. لێرەوە دەمانەوێ رەوتی باسەکە بگۆڕین و بێینەوە بۆ دونیای هاوچەرخ و کۆمەڵە چەمکێکی نوێتر و رووداو و دیاردەی نزیکتر بخەینە بەر شیکاری و لەوێوەش هەوڵی تێگەیشتن لە ئێستای جیهانی ئیسلام بدەین.

لەم بەشەدا ئەمانەوێ بەدواداچوونێك بکەین بۆ دیاردەی «بەڕێکخراوەبوونی ئیسلام»و دەرکەوتنی چەمکی «ئیسلامی سیاسی» لە دونیای هاوچەرخدا. هەرچەند لە سەدەی نۆزدەدا هەندێ جووڵانەوەی وەك راپەڕینەکەی ئەمیر عەبدولقادری گیلانی (١٢٢٢-١٣٠١ ك.م) لە ئەلجەزایر یان شۆڕشەکەی مێهدی سۆرانی (١٨٨٣-١٨٨٥ن) لە سوودان و شۆڕشی سەید ئەحمەد هیندی ناسراو بە سەید ئەحمەدی شەهید و راپەڕینە جەماوەرییەکەی خەڵکی هیندستان لە ساڵی ١٨٥٧ی زایینیدا روویان داوەو بەجۆرێك لە جۆرەکان ئەتوانین ئەم بزاڤە دژە کۆلۆنیانیستییانە بە سەرەتای دەرکەوتنی سیاسی و شۆڕشگێڕانەی ئیسلام لە سەردەمی هاوچەرخدا لە قەڵەم بدەین، بەڵام لە راستیداو بە مانا راستەقینە کۆمەڵناسانەکەی، یەکەم رێکخراوی مۆدێڕنی ئیسلامی رێکخراوی کاریگەر و بەناوبانگی «ئیخوانولموسلیمین»ە کە ساڵی ١٩٢٨ لە میسر دامەزراوەو تا ئێستایش هەر درێژەی پەیدا کردووە. ئەڵبەت ئەتوانین بە جۆرێکی دیکەیش سەرەتایەك بۆ ئەم باسە دیاری بکەین و«سەید جەمالەدینی ئەفغانی» یان بە واتای ئێرانییەکان «سەید جەمالەدینی ئەسەد ئابادی» بە دەسپێشخەری ئەندێشەی «بزاڤی هاوچەرخی ئیسلامی سیاسی» ناوزەد بکەین. بێگومان سەید جەمال دەورێکی زۆر کاریگەری لە دروستکردنی زەمینە فیکرییەکانی بەڕێکخراوەبوونی مۆدێڕنی ئیسلامدا گێڕاوەو رەنگە کەس نەدۆزینەوە خاوەن ئاوەها پێگەو کاریگەرییەك بووبێ. تەنانەت ئەتوانین بڵێین کۆی بزاڤ و رێکخراوە ئیسلامییەکانی دواتر لە چاوگی بیر و ئەندێشەی سەید جەمال و قوتابییەکانی – وەك موحەممەد رەشید رەزا و موحەممەد عەبدەو ...– تێرئاو دەبوون. بەهەرحاڵ ئێمە نامانەوێ تێکەڵی شیکردنەوەی ئەو رەوتە دوور و درێژە بین

كە لە دایكبوونی یەكەم رێكخراوی دونیای ئیسلام واتە ئیخوانولموسلیمینی لێكەوتەوە، بەڵكوو دەخوازین راستەوخۆ لە ئیخوان خۆیەوە دەست پێ بكەین. چ هۆكار یان هۆكارگەلێك شێخ حەسەنلبەنای گەیاندە ئەو قەناعەتە كە ئەبێ رێكخراوێكی مۆدێرن و لە هەمان كاتدا ئیسلامییانە دروست بكات؟ هەندێ لێكۆڵەر ئەو هۆكارە ئەگەڕێننەوە بۆ زاڵبوونی ئیستیعمار (كۆلۆنیالیزم)ی رۆژئاوایی كە وڵاتانی ئیسلامی و عەرەبییان گرتبووە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوەو ببوونە حاكمی بێ چەندوچوونی دونیای ئیسلام و بەم پێیە زاناو دەستەبژێرانی موسوڵمانیش كەوتنە هەوڵی بەرەنگاربوونەوەی كۆلۆنیالیزم. هەندێكی تر ئەیگێڕنەوە بۆ مەودای دووروودرێژی دواكەوتوویی جیهانی ئیسلام لە بەرانبەر گەشەسەندنی دونیای رۆژئاوادا كە ببووە هۆی دروستبوونی هەستی خۆبەكەمزانین لای موسوڵمانان و دامەزراندنی ئیخوان هەوڵێك بووە بە ئاراستەی قەرەبووكردنەوەی ئەم درز و مەودایەدا. كەسانێكی تر سترۆكتۆر و پێكهاتەی تایبەتیی كۆمەڵگای میسر بە هۆكاری ئەم لەدایكبوونە ئەزانن و.....هتد. بە باوەڕی جەنابت ئەم هۆكارانە چی بوون؟

پێش ئەوەی بچمە سەر ئەسڵی وەڵامەكە با تێبینییەك لەبارەی سەید جەمالەوە بڵێم، ئەویش ئەوەیە كە دەنگۆی ئەوە هەیە گوایە ئەو پیاوە سەر بە رێكخراوی ماسۆنی بووە كە رێكخراوێكی جیهانیی تایبەت بە مەسیحییەتە، هەر بۆیە لە دونیای ئیسلامیدا نەخۆی و نە كتێبەكەی -(عروة الوثقی)- ئەوەندە بە گرنگ وەرنەگیراوە. رێكخراوی ماسۆنی كە كاتی خۆی لە فەرەنساوە بەڕێوە ئەبرا دژەی كردبووە ناو دەوڵەتی عوسمانییەوە كە ئەودەم هەڕەشەیەك بوو بۆسەر كۆی دەوڵەتانی ئەورووپاو ئەوان واتە ئەورووپاییەكان ئەیانویست ئەم دەوڵەتە ئیسلامییە لە رەسەنایەتی بنەما ئیسلامییەكان و شارستانییەتی ئیسلامی خاڵی بكەنەوەو بەهاو شارستانییەتی رۆژئاوای بەسەردا زاڵ بكەن. هەرچەند سەید جەمال لە نووسینەكانیدا بە باشی كەڵكی لە ئایەتەكانی قورئان بۆ بەگژاچوونەوەی ئیستیعماری ئینگلیز وەرگرتووە بەڵام تۆمەتباركردنی ئەو بە بەشداربوون لە رێكخراوی ماسۆنیدا بۆتە هۆی دابەزینی پێگەو جێگەی خۆی و ئەندێشەو بەرهەمەكانی لەناو موسوڵماناندا. ئەڵبەت من خۆم دادوەری لەسەر راست و درۆبوونی ئەو تۆمەتە ناكەم تەنیا ئەوەندە ئەڵێم كە ئەمدیوەو ئەمبیستووە سەید جەمال ئەو جێگە بەرزەی پێ براوێ كە ئێوە باسی دەكەن.

با بێینە سەر هۆكارەكانی دروستبوونی ئیخوانولموسلیمین و پێشەكی با ئەو راستییە بدركێنم كە میسر بەهۆی ژیۆستراتیژیك بوون و نزیكبوون بە رۆژئاواو هەروەها بە هۆی زانكۆی ئەلئەزهەرەوە، وەك بنكەی دژایەتیكردنی دەوڵەتی عوسمانی ناوی دەركردبوو. دوابەدوای ئەوەی تاوانبارێكی وەك كەمال ئەتاتۆرك توانی بە پشتیوانیی رۆژئاوا لە ساڵی ١٩٢٤ی زاییینیدا یاسای خیلافەتی ئیسلامی لە توركیا دابماڵێ، وەك موحەممەد قوتب لە كتێبی (ماذا خسرالعالم فی انحطاط الدولة العثمانە)دا ئەیگێڕێتەوە، ئەزهەرییەكان زۆر پەشیمان بوون لەو دژایەتییانەی بەرانبەر دەسەڵاتی عوسمانی ئەنجامیان دابوو. بۆیە نامە بۆ ئەتاتۆرك ئەنێرن و زۆر جیدی داوای لێ ئەكەن لە بڕیارەكەی پاشگەز بێتەوە، بەڵام هەوڵەكەیان بێسوود ئەبێ و ئەتاتۆرك هیچ حیسێبێكیان بۆ ناكات. ئەم بارودۆخە زەمینەیەكی لەباری بۆ دروستكردنی كۆمەڵێكی وەك ئیخوان فەراهەم كردبوو و بگرە ئەگەر حەسەنەلبەنایش ئەم كارەی نەیكردایە كەسانێكی تر هەر دروستیان دەكرد. نابێ ئەوەشمان بیربچێ كە میسر هەر لە كۆنەوەو تەنانەت پێش هەڵهاتنی نووری ئیسلامیش

خاوەن کەلتوور و رۆشنبیرییەکی مەزن و گەشاوە بووەو دوای فەتح کردنیشی لە لایەن عەمری کوڕی عاسەوە (خوای لێ رازی بێ)، سەد هێندەی تر لە رووی فیکری و کەلتوورییەوە گەشایەوەو تا ئەم سەردەمەی خۆشمان هەر بەردەوام بووەو دیارە ئەمەش ئەتوانێ و دەشێت کاریگەری لە دروستبوونی یەکەم رێکخراوی ئیسلامی لە ولاتێکی وەك میسردا بووبێ و دەوری بەرچاوی تیادا گێڕابێ.

من مەسەلەی دواکەوتوویی ولاتانی ئیسلامی بە بەراورد لەگەڵ رۆژئاوادا بە خاڵێکی زۆر گرنگ نازانم، هەرچەند نکۆڵی لەوە ناکەم کە ئەگەر لە رووی سۆز و عاتیفەیشەوە بووبێ کاریگەری لەسەر موسوڵمانان داناوە، بەلام سەرباری ئەوەش ئەمە وەك هۆکارێکی زەمینەساز لە دروستبوون و سەرهەڵدانی ئیخواندا دەوری نەگێڕاوە. هەروەها ئامادەبوونی هێزە ئیستیعمارییەکانی رۆژئاوا بە خاڵێکی بەهێزی فەراهەمکردنی زەمینەکانی پێکهاتنی ئیخوان ئەزانم بەلام پێویست ناکا لێرەدا زۆری لێبکۆڵمەوە. ئەگەرچی خزمەتکردن بە ئیسلام و هەوڵی جێبەجێکردنی فەرمانە ئەسڵییەکانی ئەمر بە چاکەو بەرگری لە خراپە ئەرکی سەرشانی هەر موسوڵمانێکەو شایانی سەرسووڕمان یاخود سپاس و پێزانین نییە، بەلام ئیمام حەسەنەلبەنا بە ڕاستی لەو کاتە ناسکەی موسوڵمانان پیایدا ئەپەڕانەوە، فەخر و شانازییەکی گەورەو مێژوویی تۆمار کرد کە پێویستە هەموو موسوڵمانێك پەنجەی رێزی بۆ درێژ بکات. حەسەنەلبەنا (رحمه الله) گیانی لەسەر ئەو ئامانجە بەخت کرد و هیوادارم خوای گەورە بیکاتە توێشووی قیامەتی.

«ئیخوان»ی سەردەمی حەسەنەلبەنا هەندێ جیاوازیی هەیە لەگەڵ «ئیخوان»ی سەردەمی سەید قوتبدا. لە سەردەمی بەنادا هەرچەند کۆمەڵە رێکخستن و دەستەگەلێکی جیاجیای وەك دەستەی تۆڵەسەندنەوە، دەستەی دەعوەت و دەستەکانی تر هەبوون، بەلام چالاکی و کردەوەکانی ئیخوان بە زۆری لەسەر بانگەشەو تەبلیغکردن چڕ دەبوویەوە. کەچی لە سەردەمی سەید قوتبدا ئیخوان رەوتێکی جیهادی و تەکفیرگەرانەی گرتەبەر و تەنانەت بە کردەوەیش کاری تیرۆر و کوشتنی کەسانی تەکفیرکراو و بەکافر راگەیەندراوی بەڕێوە ئەبرد. ئالێرەوە ئیخوانولموسلیمین لە رێکخراوێکی سیاسی و بانگەشەکەر و سیاسییەوە دەگۆڕدرێ بۆ رێکخراوێکی رادیکاڵی جیهادی کە باوەڕی بە کاروکرداری ئیزامییش هەیە. لەم قۆناغە مێژووییەدا رێکخراوی «ئەلجیهاد» لە ناو دڵی ئیخوانولموسلیمینەوە لە دایك دەبێ و ئەمە یەکەم رێکخراوی رادیکاڵ و توندڕەوە کە لە نەریتی ئیخوانییەوە سەرچاوە دەگرێ و لە هەمان ئەو سەرچاوەیەش ئاو دەخواتەوە. وەك دەشزانین ئەیمەن ئەلزەواهیری کە ئێستا دوای ئۆسامە بن لادەن کاراترین و گرنگترین سەرکردەی رێکخراوی ئەلقاعیدەیە یەکێك بوو لە سەرۆکەکانی هەمان ئەو ئەلجیهادەو ئەمەش بەڵگەیەکە بۆ تێگەیشتن لەوەی کە ئیخوان دایکی هەموو بزاڤ و رێکخراوە ئیسلامییەکانی پاش خۆیەتی. (ئەم بەشە چەند مانگێك پێش کوژرانی بن لادەن ئامادە کرا، خەریکی بەشی سێهەمی وتووێژەکە بووین کە بیستمان ئارتەشی ئامریکا لە ئەبیت ئابادی پاکستان توانیویەتی بن لادەن بکوژێ و دوای ماوەیەك زەواهیری وەك کەسی یەکەمی ئەلقاعیدە دیاری کرا.)

سەرەتا ئەوەمان بۆ شی بکەرەوە کە رەوتی گۆڕدرانی ئیخوان بۆ رێکخراوێکی جیهادی چۆناوچۆن بوو و هۆکاری ئەم گۆڕانە لە چ شتێکدا ئەبینی. پاشان ئایا ئەوەت قبووڵە کە ئیخوانولموسلیمین دایکی هەموو ئەو رێکخراو و بزووتنەوە ئیسلامییانەیە کە دوای ١٩٢٨ لە هەموو ولاتانی ئیسلامیدا دروست بوون؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئەتوانین لە دوو ڕێڕەو و ڕێگا کەڵک وەربگرین. یەکەم، ڕێگای ئەقڵ (ناوەز) و وردبوونەوە لە ڕەوڕەوەی ژیان و دووهەمیش، ڕێگای نەقڵ و بەڵگەهێنانەوە لە دەقەکان. لەبەر ئەوە ئەقڵ ئەخەمە پێشەوە چونکوو ئەگەر لە ڕێگەی وردبوونەوە لە راستییەکانی ژیانەوە بەدوای مەسەلەیەکدا بچیت بە پشتبەستن بە دەقە ئاسمانییەکان زووتر ئەگەیتە ئەنجام. ئینجا ئەگەر کاری ئیخوان لە بانگەشەو تەبلیغی رووت بەولاوە هیچی تر نەبێ دیسان لە ئەرزی واقیعدا هەر ئامادە بووەو وەك دەستەیەك خۆی دەرخستووەو هەموو کۆمەڵەو دەستەیەکیش مادام خاوەن کیانێك بێت بۆ خۆی، بێگومان ئەمە هەندێ ئەرك و (فەرزیات) لەسەر خاوەنەکەی دروست دەکات. دیارە ئیخوان بانگەشەی شتێکی ئەکرد بە ناوی «ئیسلام» و دیارە ئەم ئیسلامەیش خاوەن چەندەها تایبەتمەندییە.

وەك خۆیشتان ئاماژەتان پێکردووە حەسەنەلبەننا (رحمه الله) ڕێکخستن و جوانکارییەکی ڕێکوپێکی بۆ کۆمەڵەکەی دروست کردبوو، وەك لیژنەیەك بۆ پەیداکردن و بەدواداچوونی ماڵ و لیژنەیەك بۆ لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی کێشە کۆمەڵایەتییەکان و لیژنەیەك بۆ کاری بانگەواز و بانگەشەو.....هتد. جا شتێکی سەیر نییە ئەگەر دەستەیەکیشیان دانابێ بۆ پاراستن و بەرگری کردن لە خۆیان تەنانەت ئەگەر کاری ناوا دەستەیەك بگاتە کوشتنیش دیسان شتێکی زۆر ئاساییە. کەوابوو هەر ئیخوان هەر لە سەرەتاوە نیشانەکانی ئەم دیاردەیە واتە دیاردەی کوشتن و جیهادی تیادا ئەبینرا، ئینجا لە درێژەی تەمەنی ئیخواندا گەلێ ڕووداوی ناوخۆیی و جیهانی ڕوویان داوە کە کاریان کردۆتە سەر ئەم ڕێکخراوەیە تاکوو خۆی بگۆڕێ، بە جۆرێك کە بتوانێ وەڵامی ئەو دۆخە تازانە بداتەوە. وەك کاریگەرییەکانی ڕووخانی دەسەڵاتی عوسمانی، جەنگی دووهەمی جیهانی، سەرهەڵدانی هیتلەر و ئەڵمانیای نازی، بارودۆخی زاڵ بەسەر وڵاتانی ئیسلامیداو..... هتد. سەرتۆپکی ئەم ڕووداوانەش هەڵئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دەسەڵاتداریی جەمال عەبدولناسری تاوانبار و ئەو دۆخەی دروستی کرد و سەپاندی بەسەر میسردا. وەك وتم هەندێ تێڕوانین و ڕوانگە هەیە کە ڕەنگە بۆ هەموو کۆمەڵەو دەستەیەك لە قۆناغە جیاوازەکانی ژیانیدا بێتە پێشەوەو مەحاڵە بتوانێ لێی دەرباز بێت.

ئەوەی ڕاستی بێ لە دونیای هاوچەرخدا هەرکات ویستوویانە جووڵانەوەی ئیسلامی لەبار بەرن و ناشیرینی بکەن، یەکسەر تاوانباریان کردووە بەوەی تەکفیر ئەکاو تیرۆر ئەکاو مرۆڤ ئەکوژێ، ئەگینا جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان حەسەنەلبەنناو سەید قوتبدا نییە. تەنیا جیاوازییان لەوەدا بوو کە سەید قوتب بە نووسینەکانی و بە بەهێزکردنی ڕۆحیاتی جیلی نوێ خزمەتێکی کەموێنەی بە ئیسلام دەکرد و ئیمام بەناش بە دامەزراندنی ئیخوانولموسلیمین لە خزمەت دینی خوادا بووە. قسەیەکی ئیمام بەنا هەیە کە زۆر بەناوبانگەو بریتییە لە (كونوا للناس كالشجر اذا رماكم بالحجر غير ميهم بالثمر) واتە (بۆ خەڵکی وەك دار وابن کە ئەگەر بەردی تێ بگرن ئەو بەروبووم و میوەیان تێ ئەگرێ). ئەمە نیشاندەری سینە فراوانی و بەرەحمبوونی لە رادەبەدەری ئەو پیاوە مەزنەیە کەچی سەرباری ئەوەش، لە لایەن نەیارانی ئیسلام و خاوەن هێز و میدیاکانەوە بە ڕەفتار توندی و توندوتیژی نواندن تاوانبار دەکرا. بەڕای من ئەمە وەکوو بیانووی گورگە کە بە بەرخی ئەگرێ! پێم وایە هەرکەس و لایەنێك بۆی هەیە بەرگری لە خۆی بکات و بۆ ئیخوانیش زۆر ئاساییە لە قۆناغە جیاوازەکانداو بە نیسبەت سەردەمەوە ستراتیژی جیاواز و گونجاویان پەیڕەو کردبێت.

سەبارەت بە دوابەشی پرسیارەکەیش کە ئایا ئیخوان بە دایکی بزاڤە ئیسلامییەکان ئەژمێردرێ یان نا، هەم ئەڵێم بەڵێ و هەم ئەڵێم نەخێر! بەڵێ بەو مانایە کە دوای نەمانی خیلافەتی عوسمانی ئیخوان یەکەم کۆمەڵەیەك بوو کە دوور لە هەموو نەتەوەگەرییەك دامەزراو دواتر پەلوپۆی هاوێشتە دەورووبەر و بە عالەمی ئیسلامیدا بڵاو بووەوە. نەخێریش بەو مانایە کە ئەوان دارێژەری هەموو چەمکە رامیارییە ئیسلامییەکان یان بەو واتایەی کە ئێستا باوە «ئیسلامی سیاسی» نەبوون. تەنانەت مەرج نییە هەموو سیما دیارەکانی ناو جووڵانەوەی ئیسلامی رۆژێ لە رۆژان ئیخوان بووبێتن یان بە مۆدێلی ئیخوان کاریان کردبێت، جا ئەو سیمایە دوکتۆر ئەیمەن زەواهیری بێت یان هەر سەرکردەو کەسێکی ناسراوی تری ناو رەوتی کۆن و نوێی جیهادی ئەم سەدەیە بێت. بەڵام با راستییەکی تریشمان بیرنەچێ ئەوەیش ئەوەیە کە ئەگەر بزووتنەوە ئیسلامییەکان لەبەر رەچاوکردنی دۆخی سەردەم یاخود هەر هۆکارێکی تر لایەنی توندوتیژی و جیهادییانەی خۆیان کەمرەنگ ئەکەنەوەو کەمتر باسی لێوە دەکەن، ئەوە بەو مانایە نییە کە بە تەواوی جیهاد رەت دەکەنەوە. ئەوان شەو و رۆژ بۆ موبارەکییش بێت ئایەتە جیهادییەکانی قورئان ئەخوێننەوەو تەفسیریان دەکەن و مێژوو و هۆی دابەزینیان راڤە دەکەن و ئەوە نییە وازیان لێ هێنابێ. وەك (یوسف عمیس) لە کتێبی (سقوط ثلاثین دولة الاسلامیه)دا کە لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر دروستبوونی ٣٠ی دەوڵەتی ئیسلامی لە کاتی هاتن و دابەزینی پەیامەکەوە (ئیسلام) تا ئێستا، روونی کردۆتەوە هیچکامیان نە بەبێ جەنگ و کوشتار هاتوونەتە سەر کار و نە بەبێ جەنگ و کوشتاریش لەسەر کار لابراون: ئێمە ناتوانین لە بەر زرووفی سەردەم و دونیای عەولەمە چاو لە راستییە مێژووییەکان بپۆشین، پێمان خۆش بێ یان پێمان خۆش نەبێ جیهاد و توندوتیژی بەشێك بووە لە ئیسلام و کەس ناتوانێ نکۆڵی لەم راستییە بکات.

ئەڵبەت وەك روونکردنەوەیەك ئەبێ بڵێین ئێمە تەنیا مەبەستمان پرسیارکردن و لێکۆڵینەوەیەو داوەری لەسەر هیچ بابەتێك ناکەین، لە مەسەلەی جیهاد و تەکفیریشدا نە بە قبووڵکردن و نە بە رەتکردنەوە هیچ شتێکمان نەوتووە و هەوڵ ئەدەین بێلایەنیمان بپارێزین کە یەکێکە لە مەرجە سەرەکییەکانی توێژینەوەی زانستی. با بچینەوە سەر درێژەی باسەکەمان،

بزووتنەوەی ئیخوانولموسلیمین دوای ئەوەی لە وڵاتی میسر لە دایك بوو بەرەو زۆربەی هەرەزۆری وڵاتانی ئیسلامی تەشەنەی سەند و ئەتوانین بڵێین لە هەر هەمووی ئەو وڵاتانەدا لقێکی ئیخوان دامەزراو کەوتە کارکردن. بە شێوەیەکی مێژوویی سەرەتا کام وڵاتانە بوونە یەکەم مەکۆ و میواندارى ئیخوان؟ هەروەها لە هەر وڵاتێکدا بە چ ناوێکەوە دەرکەوتن و خۆیان رێك خست؟ بە گشتی رەوتی تەشەنەکردن و بڵاوبوونەوەی ئیخوانمان لە دونیای ئیسلامدا بۆ بگێرەوە.

شتێکی چاوەروان نەکراو نییە ئەگەر رێکخراوی ئیخوانولموسلیمین تەنیا لە وڵاتێکی وەکوو میسردا ئۆقرە نەگرتبێ و بە هەموو وڵاتان و میللەتانی موسوڵماندا بڵاو بووبێتەوە، چونکوو رێکخراوێك بوو کە بە ئەندێشەو بانگەشەی ئیسلامییەوە سەری هەڵدابوو و بەدوور بوو لە دەمارگیری نەتەوەیی. ئیخوان پێش هەموو شوێنێ پەلوپۆی بەرەو شام بە هەر چوار وڵاتەکەیەوە (سووریا، ئەردەن، لوبنان و فەڵەستین) هاوێشت و هۆکاری ئەمەش لەوەدا بوو کە ناوچەی شام لە

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئەتوانین لە دوو رێڕەو و رێگا کەڵك وەربگرین. یەکەم، رێگای ئەقڵ (ناوەن) و وردبوونەوە لە رەورەوەی ژیان و دووهەمیش، رێگای نەقڵ و بەڵگەهێنانەوە لە دەقەکان. لەبەر ئەوە ئەقڵ نەخەمە پێشەوە چونکوو ئەگەر لە رێگەی وردبوونەوە لە راستییەکانی ژیانەوە بەدوای مەسەلەیەکدا بچیت بە پشتبەستن بە دەقە ئاسمانییەکان زووتر ئەگەیتە ئەنجام. ئینجا ئەگەر کاری ئیخوان لە بانگەشەو تەبلیغی رووت بەولاوە هیچی تر نەبێ دیسان لە ئەرزی واقیعدا هەر ئامادە بووەو وەك دەستەیەك خۆی دەرخستووەو هەموو کۆمەڵەو دەستەیەکیش مادام خاوەن کیانێك بێت بۆ خۆی، بێگومان ئەمە هەندێ ئەرك و (فەرزیات) لەسەر خاوەنەکەی دروست دەکات. دیارە ئیخوان بانگەشەی شتێکی ئەکرد بە ناوی «ئیسلام» و دیارە ئەم ئیسلامەیش خاوەن چەندەها تایبەتمەندییە.

وەك خۆیشتان ئاماژەتان پێکردووە حەسەنەلبەننا (رحمه الله) رێکخستن و جوانکارییەکی رێکوپێکی بۆ کۆمەڵەکەی دروست کردبوو، وەك لیژنەیەك بۆ پەیداکردن و بەدواداچوونی ماڵ و لیژنەیەك بۆ لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی کێشە کۆمەڵایەتییەکان و لیژنەیەك بۆ کاری بانگەواز و بانگەشەو.....هتد. جا شتێکی سەیر نییە ئەگەر دەستەیەکیشیان دانابێ بۆ پاراستن و بەرگری کردن لە خۆیان تەنانەت ئەگەر کاری ئاوا دەستەیەك بگاتە کوشتنیش دیسان شتێکی زۆر ئاساییە. کەوابوو هەر ئیخوان هەر لە سەرەتاوە نیشانەکانی ئەم دیاردەیە واتە دیاردەی کوشتن و جیهادی تیادا ئەبینرا، ئینجا لە درێژەی تەمەنی ئیخواندا گەلێ رووداوی ناوخۆیی و جیهانی روویان داوە کە کاریان کردۆتە سەر ئەم رێکخراوەیە تاکوو خۆی بگۆڕێ، بە جۆرێك کە بتوانێ وەڵامی ئەو دۆخە تازانە بداتەوە. وەك کاریگەرییەکانی رووخانی دەسەڵاتی عوسمانی، جەنگی دووهەمی جیهانی، سەرهەڵدانی هیتلەر و ئەڵمانیای نازی، بارودۆخی زاڵ بەسەر وڵاتانی ئیسلامیداو..... هتد. سەرتۆپکی ئەم رووداوانەش هەڵئەگەرێتەوە بۆ سەردەمی دەسەڵاتداریی جەمال عەبدولناسری تاوانبار و ئەو دۆخەی دروستی کرد و سەپاندی بەسەر میسردا. وەك وتم هەندێ تێڕوانین و روانگە هەیە کە رەنگە بۆ هەموو کۆمەڵەو دەستەیەك لە قۆناغە جیاوازەکانی ژیانیدا بێتە پێشەوەو مەحاڵە بتوانێ لێی دەرباز بێت.

ئەوەی راستی بێ لە دونیای هاوچەرخدا هەرکات ویستوویانە جووڵانەوەی ئیسلامی لەباز بەرن و ناشیرینی بکەن، یەکسەر تاوانباریان کردووە بەوەی تەکفیر ئەکاو تیرۆر ئەکاو مرۆڤ ئەکوژێ، ئەگینا جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان حەسەنەلبەنناو سەید قوتبدا نییە. تەنیا جیاوازییان لەوەدا بوو کە سەید قوتب بە نووسینەکانی و بە بەهێزکردنی رۆحیاتی جیلی نوێ خزمەتێکی کەموێنەی بە ئیسلام دەکرد و ئیمام بەناش بە دامەزراندنی ئیخوانولموسلیمین لە خزمەت دینی خوادا بووە. قسەیەکی ئیمام بەنا هەیە کە زۆر بەناوبانگەو بریتییە لە (کونوا للناس کالشجر اذا رماکم بالحجر غير ميهم بالثمر) واتە (بۆ خەڵکی وەك دار وابن کە ئەگەر بەردی تێ بگرن ئەو بەروبووم و میوەیان تێ ئەگرێ). ئەمە نیشاندەری سینە فراوانی و بەرەحمبوونی لە رادەبەدەری ئەو پیاوە مەزنەیە کەچی سەرباری ئەوەش، لە لایەن نەیارانی ئیسلام و خاوەن هێز و میدیاکانەوە بە رەفتار توندی و توندوتیژی نواندن تاوانبار دەکرا. بەرای من ئەمە وەکوو بیانووی گورگە کە بە بەرخی ئەگرێ! پێم وایە هەرکەس و لایەنێك بۆی هەیە بەرگری لە خۆی بکات و بۆ ئیخوانیش زۆر ئاساییە لە قۆناغە جیاوازەکانداو بە نیسبەت سەردەمەوە ستراتیژی جیاواز و گونجاویان پەیڕەو کردبێت.

سەبارەت بە دوابەشی پرسیارەکەیش کە ئایا ئیخوان بە دایکی بزاڤە ئیسلامییەکان ئەژمێردرێ یان نا، هەم ئەڵێم بەڵێ و هەم ئەڵێم نەخێر! بەڵێ بەو مانایە کە دوای نەمانی خیلافەتی عوسمانی ئیخوان یەکەم کۆمەڵەیەك بوو کە دوور لە هەموو نەتەوەگەرییەك دامەزراو دواتر پەلوپۆی هاوێشتە دەوروبەر و بە عالەمی ئیسلامیدا بڵاو بووەوە. نەخێریش بەو مانایە کە ئەوان دارێژەری هەموو چەمکە رامیارییە ئیسلامییەکان یان بەو واتایەی کە ئێستا باوە «ئیسلامی سیاسی» نەبوون. تەنانەت مەرج نییە هەموو سیما دیارەکانی ناو جووڵانەوەی ئیسلامی رۆژێ لە رۆژان ئیخوان بووبێتن یان بە مۆدێلی ئیخوان کاریان کردبێت، جا ئەو سیمایە دوکتۆر ئەیمەن زەواهێری بێت یان هەر سەرکردەو کەسێکی ناسراوی تری ناو رەوتی کۆن و نوێی جیهادی ئەم سەدەیە بێت. بەڵام با راستییەکی تریشمان بیرنەچێ ئەوەیش ئەوەیە کە ئەگەر بزووتنەوە ئیسلامییەکان لەبەر رەچاوکردنی دۆخی سەردەم یاخود هەر هۆکارێکی تر لایەنی توندوتیژی و جیهادییانەی خۆیان کەمڕەنگ ئەکەنەوەو کەمتر باسی لێوە دەکەن، قەت بەو مانایە نییە کە بە تەواوی جیهاد رەت دەکەنەوە. ئەوان شەو و رۆژ بۆ موبارەکییش بێت ئایەتە جیهادییەکانی قورئان ئەخوێننەوەو تەفسیریان دەکەن و مێژوو و هۆی دابەزینیان راڤە دەکەن و ئەوە نییە وازیان لێ هێنابێ. وەك (یوسف عمیس) لە کتێبی (سقوط ثلاثین دولة الاسلامیه)دا کە لێکۆڵینەوەیەکە لەسەر دروستبوونی ٣٠ی دەوڵەتی ئیسلامی لە کاتی هاتن و دابەزینی پەیامەکەوە (ئیسلام) تا ئێستا، روونی کردۆتەوە هیچکامیان نە بەبێ جەنگ و کوشتار هاتوونەتە سەر کار و نە بەبێ جەنگ و کوشتاریش لەسەر کار لابراون. ئێمە ناتوانین لە بەر زرووفی سەردەم و دونیای عەولەمە چاو لە راستییە مێژووییەکان بپۆشین، پێمان خۆش بێ یان پێمان خۆش نەبێ جیهاد و توندوتیژی بەشێك بووە لە ئیسلام و کەس ناتوانێ نکۆڵی لەم راستییە بکات.

ئەڵبەت وەك روونکردنەوەیەك ئەبێ بڵێین ئێمە تەنیا مەبەستمان پرسیارکردن و لێکۆڵینەوەیەو داوەری لەسەر هیچ بابەتێك ناکەین، لە مەسەلەی جیهاد و تەکفیریشدا نە بە قبووڵکردن و نە بە رەتکردنەوە هیچ شتێکمان نەوتووە و هەوڵ ئەدەین بێلایەنیمان بپارێزین کە یەکێکە لە مەرجە سەرەکییەکانی توێژینەوەی زانستی. با بچینەوە سەر درێژەی باسەکەمان،

بزووتنەوەی ئیخوانولموسلیمین دوای ئەوەی لە وڵاتی میسر لە دایك بوو بەرەو زۆربەی هەرمزۆری وڵاتانی ئیسلامی تەشەنەی سەند و ئەتوانین بڵێین لە هەر هەمووی ئەو وڵاتانەدا لقێکی ئیخوان دامەزراو کەوتە کارکردن. بە شێوەیەکی مێژوویی سەرەتا کام وڵاتانە بوونە یەکەم مەکۆ و میوانداری ئیخوان؟ هەروەها لە هەر وڵاتێکدا بە چ ناوێکەوە دەرکەوتن و خۆیان رێك خست؟ بە گشتی رەوتی تەشەنەکردن و بڵاوبوونەوەی ئیخوانمان لە دونیای ئیسلامدا بۆ بگێڕەوە.

شتێکی چاوەڕوان نەکراو نییە ئەگەر رێکخراوی ئیخوانولموسلیمین تەنیا لە وڵاتێکی وەکوو میسردا ئۆقرە نەگرتبێ و بە هەموو وڵاتان و میللەتانی موسوڵماندا بڵاو بووبێتەوە، چونکوو رێکخراوێك بوو کە بە ئەندێشەو بانگەشەی ئیسلامییەوە سەری هەڵدابوو و بەدوور بوو لە دەمارگیری نەتەوەیی. ئیخوان پێش هەموو شوێنێ پەلوپۆی بەرەو شام بە هەر چوار وڵاتەکەیەوە (سووریا، ئەردەن، لوبنان و فەلەستین) هاوێشت و هۆکاری ئەمەش لەوەدا بوو کە ناوچەی شام لە

ساڵی ۱۹۴۷ەوە گیرۆدەی کێشەی فەلەستین و ئیسراییل بوو. دوای بڵاوبوونەوەی بە شامدا، ئیخوانولموسلیمین بەرەو ناوچەکانی تریش کشاو زۆربەی وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی گرتەوە. ئیخوان لەو قۆناغەدا رەوتێکی نەرم و نیان و دوور لە توندوتیژی گرتبووەبەر بەڵام لە ناوچەی شام بە تایبەت لە سووریادا پەرەسەندنێکی خێرای بەخۆیەوە بینی و هەر ئەمەش حیزبی بەعسی سووریای ترساند و ئەم رژێمە بە شێوەی عەمەلی کەوتە رووبەڕووبوونەوەی ئیخوانەکان. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە لەو هەلومەرجەدا دووپارچەیی کەوتبووە ناو ئیخوانی سووریاوەوەو دەستەیەکیان بە سەرۆکایەتی «مەروان حەدید» بەرەو خەباتی چەکداری رۆیشتبوون. حافز ئەسەدی گۆڕبەگۆڕ زۆر بە توندی ئەوانی سەرکوت کرد و بە شێوازی قەڵاچۆکردن کۆتایی بە تێکۆشان و چالاکییان هێنا. تەنیا لە شارەکانی «حەمە » و «حەلەب» نزیکەی ۳۰ هەزار موسوڵمان کوژران و بە هۆی ئەمەشەوە بوو کە لە ساڵی ۱۹۸۴دا گرووپی «الطلیعە المقاتلە» لە ناو برا.

ئەم کارەساتەو کۆمەڵە رووداوێکی تر بوونە هۆی دروستبوونی شێوازی کار و ستراتیژی جیاواز لە ناو رەوتی ئیخوان بە تایبەت موسوڵمانە جیهادییەکاندا. لەم پەیوەندییەدا ئەتوانین ئاماژە بەمانەی خوارەوە بکەین: سەرهەڵدانی «جماعة الجهاد» بە سەرۆکایەتی ئەیمەن زەواهیری و «عەبدولقادر عەزیز» لە میسر، دروستبوونی «جماعة الاسلامیە» لە میسر بە سەرۆکایەتی «شێخ عومەر عەبدولڕەحمان»، کوشتنی ئەنوەر سادات لە ساڵی ۱۹۸۱ی زاییندا بە دەستی «خالید ئیسلامبولی» ئەندامی جەماعەتی ئیسلامی، خۆسازدانی ئیسلامییەکانی عێراق لە سەرەتای هاتنە سەر حوکمی بەعسییەکان لە سەردەمی «عەبدولکەریم زەیدان»دا. سەرەڕای ئەم رووداوانەو بە پێچەوانەی رەوتە جیهادییەکانەوە رێکخراوی ئیخوانولموسلیمین سووربوو لە سەر بەرەوپێشبردنی بەرنامەکانی خۆی بەو شێوازەی دەستی پێ کردبوو. لە زۆربەی هەرە زۆری وڵاتانی ئیسلامییدا ئەم رێکخراوەیە هەر بە هەمان ناوی «ئیخوانولموسلیمین»ەوە خۆی رێکدەخست، بەڵام لە چەند وڵاتێکیشدا ناوی دیکەیان بۆ خۆیان هەڵئەبژارد. بۆ وێنە لە کوردستانی عێراقی خۆماندا دوای سەرهەڵدانی چەندین تەوژم و گروپ و کۆمەڵێك یەکگرتن و تێکەڵبوون، دواجار لە ساڵی ۱۹۹۴ی زاییندا حیزبێکی سیاسی سەر بە ئیخوان بە ناوی «یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان» دروستبوونی خۆی راگەیاند، یان ئیخوانەکانی سووریا ناوی «الطلیعە المقاتلە»یان بۆخۆیان هەڵبژارد.

بە تەواوبوونی جەنگی دووهەمی جیهانی، قۆناغێکی تازە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا دەستی پێ کرد، بە گشتی رووداوە دەرەکی و نێوخۆییەکان بەرپرسان و زانایانی ئیخوانولموسلیمینیان گەیاندە ئەو قەناعەتە کە دوای ئەو شەڕەماڵوێرانکەرە، جیهان بە ئاراستەیەکدا دەچێ کە جیهاد و شەڕخوازی هەڵناگرێ و مەسەلەحەتی موسوڵمانانیش لە میانەڕەویدایە نەك شەڕ و کوشتار. بەڵام نابێ ئەو حەقیقەتەیش لە بیر بکەین کە ئیخوان هەر لە بنەڕەتەوە رەوتێکی رادیکاڵی جیهادی نەبووەو نییە، لە سەرەتاوە تاکوو ئێستا میانەڕەوی یەکێك بووە لە سەرەکی ترین هۆکارەکانی سەرکەوتنی ئیخوانولموسلیمین لە پەرەپێدان و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕ و بەرنامەکەی بە وڵاتە ئیسلامییەکانداو تەنانەت هۆکاری خۆشەویستبوونی ئەم رێکخراوەش بووە لە لای خەڵکان و میللەتانی ناموسوڵمان.

لێرەدا پرسیارێکی تر دێتە ئاراوە، وەك خۆیشت ئاماژەت پێداوە ئیخوان لە هەموو وڵاتانی ئیسلامی و تەنانەت ئائیسلامیشدا وەك هێزێکی عەقیدەیی یان سیاسی سەری هەڵداو خۆی ناساند و لە میسرەوە بەرەو دونیا تەشەنەی سەند. ئایا لە بەڕێوەبردنیشدا رێکخراوەکانی سەر بە بیری ئیخوانی هەر لە میسرەوە بەڕێوە ئەبرێن یاخود بەڕێوەبەرایەتییان لێك جیاواز و سەربەخۆیە؟ بەگشتی ئایا لە بنەڕەتدا میکانیزمێك بۆ پێکەوەگرێدان و پێوەندیگرتنی ئیخوانییەکانی دونیا هەیەو ئەگەر هەیە چۆنەو بە چ شێوەیەکە؟

رەنگە باشتر وابێ ئەم پرسیارە رووبەرووی کەسێك بکرێتەوە کە بۆ خۆی لەگەڵ ئیخوان کاری کردبێ و لەو بابەتە ئاگادارییەکی تەواوی هەبێ. بەڵام ئەوەی ئێمە لە دوورەوە بۆ وێنە لە یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستاندا ئەیبینین، ئەوەیە کە ئەوان تا رادەیەك بە شێوەی سەربەخۆ کاروباری خۆیان بەڕێوە ئەبەن. هەرچەند رەنگە وەك راوێژکردن نەك وەك فەرمانبەرداری، پێوەندییەك لە نێوانیاندا هەبێ بەڵام وا دەزانم لە ناو ئیخواندا جۆرە سەربەخۆبوونی سیاسی بە پێی بارودۆخی جیاوازی وڵاتەکان بە لقەکانی ئەم رێکخراوە دراوە. بە گشتی بەڕای من ئیخوان هەیکەلێکی تەنزیمیی دیاریکراوی نییە بۆ بەڕێوەبردنی رێکخراوەکانی خۆی لە جیهانداو دەکرێ زیاتر لە شێوەی تەوژمێکی فیکریدا پێناسەی بکەین. زۆرمان دیوە کەسێك بۆچوونی ئیخوانی بووە بەڵام هیچ پێوەندییەکی تەنزیماتی و رێکخراوەیی پێیانەوە نەبووە.

بەڵام رێکخراوی «یەکیەتی زانایانی ئیسلامی» کە «یووسف قەرزاوی» سەرپەرشتیاری گشتیەتی، وەك باڵی عەقیدەییی ئیخوانولموسلیمین لێك ئەدرێتەوەو لە کۆبوونەوەکانیاندا کە بە بەشداریی زانایانی هەموو وڵاتانی ئیسلامی بەڕێوە دەچێ، ستراتیژ و بەرنامە گشتییەکان بۆ شێوازی کارکردنی ئیخوانییەکانی سەرانسەری دونیا دائەڕێژن، ئەڵبەت دیارە بەرنامە وردتر و لۆکاڵەکان لە ناوخۆی خودی ئەو وڵاتانەوە لە کۆنگرەو لیژنەی سەرۆکایەتیی رێکخراوەکان خۆیاندا نەخشەکێش دەکرێت، بەڵام سیاسەت و ستراتیژە گشتییەکان بە هەماهەنگیی هەموویان ئەنووسرێتەوە. ئایا ئەتوانین ئەو یەکیەتییە بە میکانیزمی پێکەوەگرێدانی ئیخوانەکان بزانین؟

ئەڵبەت کەسایەتی خودی قەرزاوی بۆتە پێناسەکەری ئەو رێکخراوەیە. قەرزاوی هەمیشە ئەحکامە شەرعی و فیقهییە ئاسانگیرەکان هەڵئەبژێرێ و کەمتر روو لە حوکمە سەخت و توندەکان ئەکات، ئەو دیارترین و ناسراوترینی ناو ئیخوانەکانە بۆیە گومانی ئەوەیشی دێتە سەر کە رەنگە بەرپرسیشیان بێت لە ئاستی عالەمیدا. هەروەها قەرزاوی یەك لەو کەسانەیە کە دوایین پلەکانی خوێندنی بڕیوەو توانیویەتی پلەی «موفتی» بە دەست بهێنێ و جگە لەوەش خاوەن شارەزاییەکی زۆرە لە هەموو بوارە فیقهی و ئیسلامییەکاندا، بۆیە فتواکانی لەناو ئیخوانەکاندا قبووڵ ئەکرێت و پەیڕەویی لێوە ئەکرێ.

هەروەك ئێوە وتووتانە، بە دڵنیاییەوە خودی ڕێکخراوەکەش واتە ڕێکخراوی ئیخوانولموسلیمینی جیهانی، میکانیزمێکە بۆ پێکەوە گرێدانی ئیخوانەکان و من ئەو قسەیەی ئێوە پشتڕاست نەکەمەوەو لە گەڵیدام. ئیخوانولموسلیمین وەك ڕێکخراوێکی ئیسلامیی میانەڕەو ئەگەر خاوەن سەرچاوەو سەرجێکی زانستی نەبێ، نە ئەتوانێ جووڵانەوە سیاسییەکانی ڕێکبخات و نە ئەشتوانێ لەسەر هەر مەسەلەیەك ڕا دەربڕێت و پشتیوانی جەماوەریی بۆخۆی کۆ بکاتەوە. کەوابوو ئەم ڕێکخراوە پێویستی بە کۆمەڵە خەڵکانێکی زاناو دیارە لە بواری شەرعداو ئەم خەڵکانەی لە چوارچێوەی یەکییەتی زانایانی ئیسلامیدا (الاتحاد العلمة الاسلامی) کە شێخ یووسف قەرزاوی سەرۆکایەتی ئەکات ڕێکخستووەو پێیکەیاندوون.

**لێرەدا ئەبێ دیسان بگەڕێینەوە دواوەو لە هۆکاری جیابوونەوەی «جماعة الجهاد» لە ڕێکخراوێکی دایك بکۆڵینەوە. دیارە «جماعة الجهاد» ڕێکخراوێك بوو جیهادی عەینی و ئاشکرای ئەکرد بەڵام ئیخوان بەو ئاشکراییە لە پێویستیی جیهاد نەئەدوا. هۆکاری جیابوونەوەی ئەلجیهاد چی بوو؟**

لە ڕاستیدا ئەو ڕێگەو سیاسەتە ئاسانگیر و تەساهولئامێزەی کە ئیخوان بۆ گەڕاندنەوەی خەڵك بۆ باوەشی دین گرتبوویە بەر وەڵامدەری ئەو هەموو زەلیلبوونە نەبوو کە موسوڵمانانی تێکەوتبوو، بۆیە لای زۆرێك لە موسوڵمانانی دەرەوەی ئیخوان و تەنانەت هەندێ لە ئەندامانی خودی ئیخوانیش ئەم دۆخە قبووڵ نەدەکراو پێیان وابوو ئەمجۆرە سیاسەتە ناگاتە ئەنجام. هەزار و ئەوەندە ساڵ دەبوو خەڵکیی بە هەموو چین و توێژە جیاجیاکان و لە هەموو جێگا جیاجیاکانی سەر زەویدا خۆیان لەگەڵ موسوڵمانان و پەیامی ئیسلامدا ئەسازاند و ملیان بۆ دەسەڵاتی ئیسلامی کەچ دەکرد کەچی سەردەمێك هاتبووە پێش نەك ملکەچی دەسەڵاتی ئیسلامی نەدەبوون بەڵکوو لە بنەڕەتدا خودی دەسەڵاتی ئیسلامییش نەمابوو و ئەبوایە موسوڵمانان ملکەچی دەوروبەر بووایەن. لەناو دڵی ئیسلامدا جوولەکە قودسی پیرۆزی داگیر کردبوو و سەروەت و سامان و نەوت و پیشەسازی و هەموو سەرمایەی موسوڵمانان کەوتبووە ژێر چەپۆکی بێگانە بە تایبەت جوولەکەوە. ئەو جوولەکەیەی بە ترسەنۆکی مێژوو ناسرابوو، خۆی کردبووە کوێخاو دەمڕاستی موسوڵمانان. ئەڵقەی گوێی حاکمانی ڕیش تاشراوی وڵاتانی ئیسلامییش وەکوو وڵاخی باریی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەدەست گاور و جوولەکەکانەوە بوو و ئەوان عالەمی ئیسلامییان کردبووە کۆیلەو بە نانەسکییەك بێدەنگیان کردبوو و گاور و جوولەکەیان لێکردبوون بە سەروەر و سەرۆك. بێگانەو حاکمە نۆکەرەکانی وڵاتانی ئیسلامی هەموو هەوڵ و توانای خۆیان خستبووە گەڕ و هەر کەسێك لە لایەکی جیهانی ئیسلامدا جووڵەیەکی بکردایە جووڵەیان لێ ئەبڕی و ئاگر و ئاسنیان بەسەردا ئەتواندەوەو لە ڕێی ڕادیۆ و میدیاو چاپەمەنییەکانەوە ناشیرینیان دەکرد و بە دژی وڵات و ئاوەدانی و شارستانییەتیان دەناساند. ئینجا لۆتییەکانی خۆیان ئەهێنایە سەر تەلەفزیۆنەکان و ئەوانیش وەك مەیموون سەماو ناشیرینترین حاڵەتی هەوەسبازییان پیشانی موسوڵمانان ئەدا بەڵکوو مەملەکەت و ناوچەکانیان پێ هێوربکەنەوە.

ئەم شتانەو هەزاران شتی تری وەك ئەمانە بوونە گرێکوێرەیەك لە بەردەم ئیخوانولموسلیمیندا کە ئەگەر رەوشتە بەرز و شیرینەکانیشیان چەند بەرابەر کردایەتەوە هێشتا هەر دەرمانی ئەو برین و نەخۆشیانەی نەدەکرد کە عالەمی ئیسلامییان تەنیبوو وەك پەتایەك کەوتبوونە گیانی موسوڵمانانەوە. بە کورتی رێبازەکەی ئیخوان نەیدەتوانی وەڵامدەری ئەو دۆخە پڕ ئازارە بێت کە موسوڵمانانی تێ کەوتبوو. بۆیە موسوڵمانان سەرەتا لە میسر و پاشان لە هەموو وڵاتانی ئیسلامی، هەریەکەو بە پێی باروودۆخی خۆیان روویان لەو ئایەتە جیهادی و حوکمە فیقهییە جیهادییانە کردەوە کە بە درێژایی هەزار و چەند سەد ساڵ لە هەموو هەلومەرجێکدا سەری ئوممەتی ئیسلامییان بەرز و سەرفراز راگرتبوو. هەر بەم مەبەستە بوو کە لە وڵاتی میسر (جماعة الجهاد) راگەیەندراو وردەوردە خەڵکی پێوە لکاو سیاسەتی جیهاد و (قتال) و کوشتاریان گرتە بەر. هەر لەوێشەوەو لەو کاتەوە رەوتی جیهادی بەرەو هەموو وڵاتانی ئیسلامی تەشەنەی کرد و بڵاو بوویەوە.

کەوایە ئەتوانین بڵێین ئیخوانەکان توندڕەو نەبوون یان باشترە بڵێین میانەڕەو و ئاسانگیربوون. (تساهل)ی ئیخوان هۆکاری سەرەکی بووە لە رادیکاڵبوونەوەی بەشێك لە پەیکەر و پێکهاتی تەنزیماتیی ئەواندا و لەوێوەش دروستبوونی چەندەها رێکخراوی ئیسلامیی جیهادخواز لە وڵاتە جۆراوجۆرەکاندا. وەك خۆیشت ئاماژەت پێداوە چەندەهاجۆری دەرکەوتنی ئیسلامی جیهادی لە دوای ١٩٢٨ەوە رووی داوە کە هەوراز و نشێوی زۆریان بەخۆوە دیتووە. تەنانەت لە هەندێ نموونەی وەك ئەلجەزایردا بزووتنەوەی شۆڕشگێڕانەی ئیسلام کەوتە ناو گەمەیەکی سەیری خۆکوژانەوەو بەو کوشتوبڕە بەربڵاوانەی ئەنجامی دا، وەها سیمایەکی ناشیرین و تۆقێنەری بۆ ئیسلام و هەڵگرانی پەیامی جیهاد دروست کرد کە تا ئێستاش نەیتوانیوە بە تەواوی پشت راست بکاتەوەو خۆی لە دزێویی ئەو رووداوانە پاك بکاتەوە. ئاوڕدانەوە لە دانە بە دانەی ئەو جووڵانەوەو بزاڤانە و شیکردنەوەی هەموویان کارێکی زۆر گەورەو دژوارەو لە مەجالی وتووێژەکەی ئێمەدا جێی نابێتەوە. هەر بۆیە ناچارین لە سەر گرنگترین قۆناغەکان و خاڵەکانی ئەم مێژووە چڕ ببینەوە، کەوایە بچینە سەر یەکێك لەو خاڵ و قۆناغە مێژووسازانە کە جێ پەنجەی بەسەر هەنووکەی ئێستاشمانەوە پڕ رەنگەو هیچ لە بایەخی کەم نەبۆتەوە.دوای شەڕی جیهانی دووهەم جوولەکەی هەموو دونیا بەرەو «ئەرزی مەوعوود» بوونەوەو لە «خاکی پیرۆزی فەلەستین»دا دەوڵەتی ئیسرائیلیان دامەزراند. ئەم مەملەکەتە سیحراوییە هەم شوێنی یەکەم قیبلەی موسوڵمانان واتە قودس بوو و هەم رەمزێکی زۆر گرنگی مێژووی هەرسێ ئایینە ئاسمانییەکە. دوای شەڕی دووهەم و جینۆسایدکردنی جوولەکە بە دەستی ئەڵمانیای نازی لە دووتوێی پرۆسەی دژە مرۆڤانەی هۆلۆکاستدا، وەك وەڵامدانەوەو قەرەبوو کردنەوەیەك بۆ ئەو هەموو جینایەتەی دەرهەق بە جوولەکە کرابوو، پڕۆژەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی جوولەکە لە سەرزەمینی وەعدە پێدراودا کە لە مێژ بوو لە دایك ببوو، پەرەی پێدرا و بوو بە گەڵاڵەیەکی کرداری. بەڵام قەرەبووکردنەوەی جوولەکە هاوکات مانای زەوتکردنی ماڧ موسوڵمانانی فەلەستینی و داگیرکردنی خاکی مێژوویی موسوڵمانان بوو، لەوێوەش برینداربوونی کەسایەتی و سۆزی پێڕەوانی ئەم دینە. بە واتای هەندێ لە شارەزایان ئەم بابەتە یەکێك بوو لە هۆکارە گرنگەکانی رادیکاڵبوونەوەی رەوتە ئیسلامییەکان بە تایبەت لە

ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بە تایبەتی تریش لە وڵاتانی عەرەبی دەوروبەری فەلەستیندا. جەنابت ڕۆڵی دروستبوونی دەوڵەتی ئیسراییل لە پەرەسەندنی ئیسلامی جیهادخوازدا تا چەند بە گرنگ ئەزانیت؟

منیش رام وایە کە دروستبوونی ئیسراییل لە پەرەسەندنی بزاڤی جیهادیدا دەوری گرنگی گێڕاوە بەڵام ناتوانین بڵێین تاقەماڵپەڕی جووڵاندنی جیهاد بووە لە ناوچەکەدا. من ئەتوانم چەندین شۆڕش و جووڵانەوەتان بۆ ناو ببەم کە پێش پێکهاتنی ئەم دەوڵەتە روویان داوە، بۆ نموونە شۆڕشەکەی عومەر موختار لە لیبیا کە بە ئێعدامکرانی ئەو کۆتایی پێ هات، شۆڕشی ١٩٢٠ی عێراق، شۆڕشەکانی ئەفغانستان و هیندستان دژ بە ئیستیعماری ئینگلیز، شۆڕشەکانی شێخ مەحموود و شێخ سەعیدی پیران لە کوردستان و...... هتد، ئەمانە هەموویان نموونەی جیهادی ئیسلامی بوون کە پێش ئەو قۆناغە واتە پێش دروستبوونی دەوڵەتی ئیسراییل روویان داوە. بەڵام با بێینەوە سەر باسی یەهوودییەکان، نە تەنیا لە شەڕی دووهەم و بە هۆی نازییەکانەوە بەڵکوو لە زۆربەی قۆناغەکانی مێژوو و لە زۆربەی شوێن و وڵاتانی دونیادا بەشی جوولەکە هەر شەق و تێهەڵدان بووەو لە تەنیا شوێنێکدا هەناسەیەکی هەڵکێشابێ تەنیاو تەنیا وڵاتانی ئیسلامی و لەژێر دەسەڵاتی موسوڵمانانەدا بووە کە بە جزیەیەکی کەم و مامناوەندیی سەر و ماڵ و مڵك و شەرەفیان پارێزگاری لێ دەکرا. بەڵام بینیومانە یان بیستوومانە کاتێك ئەوان دەستی چەپەڵیان بەسەر قودسی پیرۆزدا گرت، چییان بە موسوڵمانان نەکرد؟! ئەوەی بە درێژایی مێژوو بەسەریاندا هاتبوو، تۆڵەکەیان لە موسوڵمانان بە تایبەت گەلی چەوساوەی فەلەستین کردەوە. بۆیە زۆر سروشتییە ئەگەر موسوڵمانان دژی ئەو چەوسێنەرانە جیهاد بکەن و داوای وەرگرتنەوەی خاکی پیرۆزی خۆیان بکەن. جیهاد (فرض الكفاية)یە بەڵام لە حاڵەتی تایبەتدا کە شەرع دیاریی کردووە نەبێتە (فرض العين) و ئا لەم نموونە زەقەدا تەنانەت ئەگەر جیهاد سوننەتیش بوایە، بێگومان موسوڵمانان هەر لە ناچاریدا پەنایان بۆ دەبرد.

دوای شەڕی بەناوبانگی «شەش ڕۆژە» لە ١٩٧٢ی زایینی و شکستخواردنی وڵاتانی عەرەب و سەرکەوتنی ئیسراییل و دواتریش ئیمزاکردنی پەیماننامەی کەمپ دەیڤید، زۆربەی وڵاتە عەرەبییەکان پێوەندیی سیاسی و ئابووری و تەنانەت لە هەندێ نموونەدا ئیزامیشیان لەگەڵ ئیسرایلدا دروست کرد. ئەم مەسەلەیە کاردانەوەیەکی گەورەی لای بزووتنەوە لایەنە ئیسلامییەکان دروست کرد و دەنگێکی ناڕەزایی گەورەی لێ کەوتەوەو تەنانەت وەك بەڵگەی خیانەتی حاکمانی عەرەب لە قەڵەم ئەدرا. کەچی سەرەڕای هەموو ئەم هەراو زەنایە، لە مەیدانی کردەوەدا جیا لە خودی لایەنە فەلەستینییەکان هیچ لایەنێکی دیکە ئامادە نەبوو «جیهاد»ێکی ڕاستەقینە لەگەڵ ئیسرایلدا بکات. ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە لە خودی فەلەستینیشدا زیاتر لایەنە عیلمانی و نەتەوەییەکانی وەك بزووتنەوەی فەتح و کەسایەتییەکی وەك یاسر عەرەفات لە ریزی پێشەوەدا بوون و قورسایی سەرەکیی خەباتەکە کەوتبووە سەرشانی ئەوان. جەنابت هۆکاری ئەم پارادۆکسەی نێوان دەربڕین و کردەوەی ئیسلامییە عەرەبەکان لە چیدا ئەبینی؟

نابێ ئەو راستییەمان بیر بچێ کە جوولەکە بە تەنیا خۆی و بە هێزی شان و باڵی خۆی بە سەر فەلەستیندا زاڵ نەبووە بەڵکوو پشتیوانیٚ هەموو رۆژئاوای لەگەڵ بووەو لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکانیشەوە شەرعییەت بە دامەزراندنی و بە کار و کردەوەکانیشی دراوە. جیا لەمە بە پێکهاتنی دەوڵەتی ئیسراییل دونیای رۆژئاوا لە شەڕ و شۆڕی جوولەکە رزگاری بوو و ئەوانیان بە بارێکی تردا واتە بۆ سەرکوتکردنی موسوڵمانان بەکاریان هێنا. کەوابوو دەوڵەتی ئیسراییل هەروا لە خۆڕاو بە ئاسانی دروست نەبوو و گەلاڵەو بەرنامەیەکی تۆکمەی لە پشتەوە بوو. حاکمێکی بەناو موسوڵمانی وەك عەبدولعەزیزی پاشای پێشووی عەرەبستان کاتی خۆی بەڵێنی بە نەتەوە یەکگرتووەکان داوەو بۆی ئیمزا کردووە هەرگیز کاریان بە کێشەی نێوان فەلەستین و ئیسراییلەوە نابێ بە مەرجێك عەرەبستانیان لەسەر تاپۆ بکەن و ئالی سعوود بۆ هەمیشە حاکمی ئەو وڵاتە بن. بە گشتی هەوساری هەموو دەوڵەتە عەرەبییەکان لە دەستی رۆژئاواو نەتەوە یەکگرتووەکاندایەو ئەگەر لە پاراستنی ئیسراییلدا یارمەتییان نەدەن ئەوا یەکسەر هەوسارەکانیان دەکێشن و دەسەلاتەکانیان هەڵدەوەشێننەوە.

ئەگەر وڵاتێکی وەك ئێرانی پاش رووخانی حکوومەتی پاشایەتیش ئەم هێڵەی بەزاندبێ و لە ژێرچەپۆکی رۆژئاوا هاتبێتە دەرەوە ئەوا بە شێوازی تری وەك سەپاندنی شەڕی هەشت ساڵە یان گەمارۆی نێودەوڵەتی هەوڵی کۆنترۆڵکردنیان داوە. یان عێراق و سووریا کە سەردەمانێك هەراو زەنایەکی گەورەیان نابووەوە کە گۆیا سوپاکانیان دەنێرنە جیهادی ئیسراییل و تەنانەت سەربازەکانیشیان بەرەو سنوورەکانی ئیسراییل جوولاند بەلام سەرانی ئەم دوو وڵاتە بەعسییە ترسنۆکە دواتر لەم کارەیان پەشیمان بوونەوە. جا ئەگەر حوکمڕانەکانمان ئەمە حاڵیان بووبێ ئەی رێکخراوێکی قاچاخ لەم حوکمڕانانە ئەبێ چ حاڵێکی بووبێ و چەندە مەودای جووڵەکردنی پەیدا کردبێ؟ خەڵکی وڵاتانی ئیسلامی بە دەست حاکمە ملهوڕەکانی خۆیانەوە گیرۆدەن ئیتر چۆناوچۆن ئەتوانن بە هانای برا فەلەستینیەکانیانەوە بچن؟ عەرەب دەڵێن: (فاقد شيء لايعطى) واتە (کەسێك هیچی نییە ناتوانێ هیچ ببەخشێ)!

سەبارەت بە فەتح و عەرەفاتیش ئەبێ بڵێم عەرەفات نە تەنیا قورسایی خەباتی فەلەستینی لەسەرشان نەبوو بەڵکوو فرۆشەری فەلەستین و خەباتەکەی بوو. لایەنانەکانی وەك فەتح و گرووپە فەلەستینییەکانی تر کە ئەیانەوێ بە نەتەوەگەرایی عەرەبی بە سەر ئیسراییل و کیانی جوولەکەدا زاڵ بن. تووشی خەیاڵ پڵاو بوون. وەك چۆن کورد ئەڵێ (گوریس بە لایەك نەئەگەیشتەوە کردیانە دوو لا)! ئەگەر ئۆممەتی ئیسلامی بەو شانازی و مەزنایەتییەوە زەلیلی دەستی جوولەکە بووەو لەبەر دوورکەوتنەوە لە دینەکەی ناتوانێ بەسەر ئیسراییلدا زاڵ بێت، بێگومان میللەتگەرایی و عەرەبیگەرایی هەر هیچی پێ ناکرێت، ئەگینا عەرەبایەتی چی و وڵاتپەرستی چی و عیلمانییەتی چی؟ لە راستیدا هەرکەس بە مەلەی باوکی لە ئاو بپەڕێتەوە ئەخنکێ، بۆیە ئەبێ خۆی فێری مەلەکردن بێت و خۆی لە خنکان رزگار بکات و ئەگەر موسوڵمانانیش بیانەوێ لە خنکان رزگاریان بێ پێویستە بگەڕێنەوە بۆلای خواو دینی پیرۆزی ئیسلام.

بەلام لە نموونەیەکی بەرجەستەو قۆناغسازی دیکەدا پێچەوانەی رووداوەکانی فەلەستین ئەبینین. با ئاوڕێکیش لە سەردەمی «جیهادی ئەفغانستان» یان هەمان (ايام الروس) بدەینەوە. ئارتەشی سووری سۆڤییەت ساڵی ١٩٨٧ و بە

مەبەستی پشتیوانیکردن لەو دەوڵەتە کۆمۆنیستییەی حاکمی ئەفغانستان بوو، ئەو وڵاتەی داگیرکرد. ئەم رووداوە بە دوو باردا بەرو بەهۆی بریندارببوونی هەستی موسوڵمانان، بە بارێکدا دەوڵەتێکی عەجەمی ناموسوڵمان کە خاوەن هێزێکی لە ناخی خۆیدا هەڵگری کۆمەڵە تۆخم و ئەندێشەیەکی دژە ئایینییەو بە تایبەت لە مەسەلەی ماتریالیزمی دیالێکتیك و رەتکردنەوەی مێتافیزیکدا بە تەواوی دژی بەهاو بۆچوونەکانی ئیسلام و هەموو دینە ئاسمانییەکانە. ئالێرەوە رەوتێکی جیهادیی زۆر گەورە دژ بە دەسەڵاتی کۆمۆنیستیی سەر بە سۆڤییەت و خودی ئارتەشی سوور خۆی ئاشکرا کرد کە بکەر و موجاهیدەکانی تەنیا بە خەڵکی ئەفغانەوە نەوەستاو بە جورئەتەوە ئەتوانین بڵێین لە هەموو نەتەوە موسوڵمانەکانەوە کەسانێك روویان کردە ئەفغانستان کە تا ئێستاش درێژەی پەیدا کردووە.
رەنگە بۆ گەران بە دوای دۆزینەوەی هۆکارەکانی ئەم جیاوازییەی نێوان خەباتی ئیسلامی لە فەلەستین و ئەفغانستان بە دەیان رێگامان لە بەردەمدا بێت، بۆ نموونە ئایا ئەتوانین بڵێین لە هەرحاڵدا دەوڵەتی ئیسرایل دەوڵەتێکی جوولەکەو پێرەوی یەکێك لە ئایینە ئاسمانییەکان بوو بەڵام سۆڤییەت کۆمۆنیست و بێباوەر بوو بە هەر جۆرە بیرێکی ئایینی؟ یاخود ئەبێ هۆکارەکەی بگەرێنینەوە بۆ ژیۆپۆلۆتیکی (جۆگرافیای سیاسی) جیاوازی ئەو دوو وڵاتە؟ ئەڵبەت هەندێ بۆچوونیش هەیە ئەڵێت ئەبێ لە مەسەلەی دونیای دووجەمسەریدا راڤەی ئەم بابەتە بکەین، واتە ئامریکای دژی سۆڤییەت پشتگیریی موجاهیدینی ئەو سەردەمی ئەفغانستانی ئەکرد بەڵام چونکوو هاوپەیمانی ئیسرایل بوو ئیجازەی بە تەشەنەسەندنی جیهادی ئیسلامی لە ناو خاکی فەلەستیندا نە ئەدا. رەنگە بتوانین بە دەیان ئەگەر و هۆکاری دیکەش بۆ ئەم بابەتە دەستنیشان بکەین، تۆ چۆناوچۆن لەم مەسەلەیە ئەگەیت و چ شیکارییەکی بۆ ئەکەیت؟

بەر لەوەی بچمە سەر ئەسڵی پرسیارەکە پێویستە ئاماژە بەو راستییە بکەم کە جیهادی ئەفغانستان –بە پێی گێرانەوەکەی عەبدوڵڵا عەزام– لە ساڵی ١٩٦٧ەوە بە شێوەی سیاسی کاری بۆ کراوە، لە ١٩٧٣دا بۆتە رێکخراو و لە ١٩٧٩دا دەستی بە (قتال) کردووە. بناغەی ئەم بزووتنەوەیە لە لایەن «بورهانەدین رەبانی» و «گولبەدین حیکمەتیار»ەوە دانراو بیرۆکەی جیهادکردن و خەباتکردن بۆ یەکەمجار لە لایەن ئەوانەوە گەڵاڵە کرا کە لەو سەردەمەدا لە زانکۆی کابوڵ ئەیانخوێند و بەردەوام لە حاڵی مشتومڕدا بوون لەگەڵ خوێندکارانی کۆمۆنیست و لایەنگرانی حکوومەتی کۆمۆنیستی. جیهاد لە ساڵی ١٩٧٩دا رەنگی چەکداریی و عەمەلی وەرگرت و دە ساڵی رەبەقی خایاند کە دواجار بە سەرکەوتنی موسوڵمانان کۆتایی پێ هات. ژمارەی شەهیدە غەیرە ئەفغانییەکانی ئەو جیهادە دە ساڵەیە لە پێنج هەزار کەس تێدەپەڕی و ئەمە جگە لەو ژمارە زۆرە ئەفغانییەی کە لە مەیدانی جیهاددا گیانیان لە دەست داو شەهید بوون.
بەڵام با بچینە سەر هۆکارەکانی جیاوازیی خەباتی فەڵەستین و جیهادی ئەفغانستان. ئەودەم وتارەکانی عەبدوڵڵا عەزام کە بە مەبەستی هاندانی خەڵك دژی کۆمۆنیستەکان و رووسیای سۆڤییەت دەری دەکرد، بە ئاشکرا لە لایەن حکوومەتی ئالی سعوودەوە لە تەلەفزیۆنە دەوڵەتییەکانەوە بڵاو ئەکرایەوەو رێگەی بە هەرکەس ئەدا بۆ جیهادکردن روو لە ئەفغانستان بکات، دواتریش ئەگەر موجاهیدێك شەهید نەبوایەو بیویستایە بگەرێتەوە وڵاتەکەی، ئاسانکاری تەواوی بۆ ئەکراو خەڵکیش چۆن سەردانی حاجییەکیان ئەکرد کە لە حەج ئەگەرایەوە ئاواش بە دەم ئەو موجاهیدانەوە ئەچوون.

بۆیە بەراوردکردنی ئەم دۆخە لەگەڵ راکەراکەو بێ دەرەتانیی (جماعة الجهاد) لە میسر یان هەر گروپ و لایەنێکی جیهادی لە وڵاتانی تری ئیسلامیدا رێك نایەتەوە. بارودۆخی جیهادی ئەفغانستان و خەباتی فەلەستین بە قەد ئاسمان و زەوی لە یەك دوورەو منیش ئەو قسەیەی ئێوە قبوول ناکەم. بەلام هەروەك ئێوە باستان کردووە، بۆ دۆزینەوەی هۆکارەکانی ئەم جیاوازییە دەیان رێگەمان لە بەردەمدایەو منیش هەوڵ ئەدەم دانەدانە باسی ئەو ئەگەر و هۆکارانە بکەم کە ئێوە دەسنیشانتان کردووە.

من ئەوە بە هۆکاری سەرەکی ئەم جیاوازییە نازانم کە رەنگە ئەهلی کیتابیوونی جوولەکە سۆزێکی لای موسوڵمانان بە نیسبەت ئەوانەوە دروست کردبێت، چونکوو جوولەکە نە لە کوشتوبڕدا لە سۆڤییەت کەمتریان پێ کردووین نە لە بەرنامەشیاندا کەمتر لە کۆمۆنیستەکان دژایەتی ئەهلی ئیسلامیان کردووەو دەکەن. بەڕای من ئێستاکەش رزگارکردنی (بیت المقدس) لە هەر شتێکی تر بۆ موسوڵمانان گرنگترە بەلام سەرباری دوورتربوونی جوگرافیای ئەفغانستان بە بەراورد لەگەڵ فەلەستین، هێشتا هەر رێگای گەیشتن بە ئەفغانستان ئاسانتر و مومکین ترە. ئەگەر باسی یارمەتیدانی ئەمریکایش بکەین خۆ ئەم یارمەتیدانە لەبەر ئەوە نەبوو کە حەرەکەتی جیهادی یان تالیبان بە ئاراستەی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکادا بووە بەلکوو ئەمریکا تەنیا لەبەر دژایەتیکردنی رووسیا ئامادە بوو یارمەتی ئەوان بدات. بە درێژایی چەندین ساڵ هاتوچۆکردن و سەردانی موسوڵمانان بۆ ئەفغانستان زەرەر و زیانێکی وەهای بۆ رۆژئاوا نەبووە بەلام لە بەرانبەردا کۆبوونەوەیەکی بچووکی موسوڵمانانی فەلەستین وەك مەترسییەکی گەورە حیسابی بۆ کراوە. دەربارەی دونیای دوو جەمسەرییش ئەتوانین رێك بەو گوریسەی بشوبهێنین کە لە دوولاوە ئەیکێشن و هەرلایەك توزێ دەستی شلتر بکاتەوە ئەوی تر فرسەت وەردەگرێ و هەلەکەی لێ دەقۆزێتەوەو کایەکەی لێدەباتەوە. شاراوەش نییە ئەمریکاو سۆڤییەت لە راکێشراکێشی نێوانیاندا کەمترین دەرفەتیان بەفیڕۆ نەئەدا، بە تایبەت لەو کاتەدا کە ئەمریکا بۆ شکستدانی بەرانبەرەکەی سوودی لە هێزی موسوڵمانان وەرگرت و ئەمەش دوایی بە زیانی خۆی تەواو بوو.

جگە لەمانە وەك خۆیشتان وتووتانە ئەتوانین ئاماژە بە گەڵێ هۆکاری تریش بکەین، بۆ نموونە بچووکبوونی فەلەستین و گەمارۆدرانی لە لایەن دەوڵەتە ئەلقە لە گوێکانەوە، زۆربوونی چەك و تەقەمەنی لە ئەفغانستان، رۆیشتنی ژمارەیەکی زۆری موجاهیدی عەرەب و موسوڵمان بۆ ئەفغانستان بە مەبەستی جیهادکردن و رێزگرتن لەو موجاهیدانە بە تایبەت عەرەبەکان چونکوو خەڵکی ئەفغانستان ئەوانیان وەك ئەوەی سەحابەو تابیعییەکان ئەژمار دەکرد، بەربڵاوبوون و شاخاوی بوونی جوگرافیای ئەفغانستان و جێبوونەوەی هەموو چین و گروپە جیهادییەکان تیایدا، بەرجەستەبوونی دیاردەی نەتەوەگەری و عیلمانییەت لە فەلەستین و لاواز بوونی ئەم دیاردانە لە ئەفغانستان و....هتد. ئەمانە بوونە هۆی بووژانەوەو برەوسەندنی جیهاد لە ئەفغانستان بە پێچەوانەشەوە بوونە هۆی کپبوون و بێبرەوی خەبات لە فەلەستین.

وەك روونکردنەوەیەك ئەبێ بڵێین ئەچێ بەرەی جیهادیی ئەوکاتی ئەفغانستان زۆر بەربڵاو و فرەچەشن بوو و جیا لە حیکمەتیار و رەببانی گەڵێ کەسایەتی بەرجەستەو ناسراوی دیکەش دەوریان تێدا گێڕاوە. بۆ وێنە «ئەحمەد شا مەسعوود» کە لەبەر قارەمانەتییە فراوان و بێوێنەکانی بە شێری دەربەندی پەنجشێر ناوبانگی دەرکردووەو لە کاراترین

فەرماندە موجاهیدەکانی سەرجەم مێژووی ئەو وڵاتە بوو، یاخود «عەبدوڵڵا عەزام» کە بە دانانی (بیت الانصار) و حەواندنەوەی موجاهیدانی سەرانسەری دونیای ئیسلام و کۆکردنەوەی یارمەتیی ماڵی دەورێکی کەموێنەی لە پەرەسەندنی جیهاددا گێڕا. ئەڵبەت نامانەوێ بچینە سەر جیاوازی و دژایەتییەکانی دواتری نێوان موجاهیدان. ئەوەی جێی پرسیارە، تێگەیشتنە لە ئاست و شێواز و چۆنیەتیی یارمەتییەکانی ئامریکا، چەنکوو تا ئێستاش کەسانێك هەن بە چاوی گومانەوە باسی ئەو سەردەمەو پێوەندیی توندوتۆڵی موجاهیدینی ئەفغانستان و دەوڵەتی ئامریکا ئەکەن.

دیارە من نەمویستووە بە ئەنقەست ناوی کەس یان کەسانێك لە مێژووی جیهادی ئەفغانستان پاك بکەمەوە چونکوو باسەکەی ئێمە چاوخشاندنە بە مێژووداو فریای هەموو وردەکارییەکان ناکەوین بۆیە بەو دوو ناوە قەناعەتم کرد. دەنا گەورە پیاوانێکی بێشومار هەن کە خاوەن دەور و کاریگەری بەرچاو بوون لە جیهادی ئەفغانستاندا، بۆ نموونە ئەتوانم ئاماژە بەم ناوانە بکەم کە چەند کەسیشیان کورد بوون و لە کوردستانەوە بۆ جیهادکردن چوونەتە ئەفغانستان و لەوێوە بوونەت کەسایەتی دیار و کاریگەری ناو موجاهیدین: یۆنس خاڵس، جەمیل ڕەحمان، عەبدولڕەشید دووستۆم، ئەنوەر شەعبان، جەلالەدین حەقانی، ئەحمەد شا مەسعوود، عەبدوڵڵا عەزام، ئەبوو جەعفەری کوردی، نەجمەدین فەرەج (مەلا کرێکار)، کاك وەلید (ئەبوو خوبەیب)، کاك عەلی وەلی (ئەبوو دەرداء ) و.....هتد.

ئێستا با بچمە سەر وەڵامدانەوەی خودی پرسیارەکە، ئەمریکا یەکەم جار لە ڕێی پاکستانەوەو بە بیانووی یارمەتیدانی ئاوارەکانی ئەفغانەوە کە لە ئۆردووگاکانی ئەو وڵاتەدا جێگیر بووبوون، هاتە ناوچەکەو پاشان کەم کەم خۆی لە موجاهیدینی ئەفغان نزیك کردەوە. بە نیسبەت ئەوەوە کە ئەمریکا لە سەردەمی (ایام الروس)دا یارمەتی موجاهیدینی ئەفغانی داوە، بەڕای من هۆکارەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ کێشەکانی نێوان ئەمریکاو یەکیەتی سۆڤییەت لە دونیای دوو جەمسەریی ئەوکاتدا. دیارە ئەفغانستان و پاکستان لە رووی کۆمەڵایەتییەوە نزیکایەتییەکی زۆریان پێکەوە هەیە بە تایبەت لە ناوچە سنوورییەکاندا کە لە هەردوولاوە قەومەکانی پەشتوو و ئۆردو و بەلووچ نیشتەجێن ئەم نزیکایەتییە بەرچاوترەو هەم لە رووی خزمایەتییەوەو هەمیش لە رووی بازەرگانییەوە بە تەواوی تێکەڵی یەکتر بوون و بەم هۆیەشەوە خەڵکی ئەم ناوچانە لە شەڕی بێگانەدا بە هانای یەکترەوە ئەچن. ئەگەر تەنانەت سەرکردەو سەرۆکی وڵاتەکانیشیان بە جۆرێك لە جۆرەکان ملکەچی لایەنێکی بێگان بووبن (وەك حامید کەرزای یان پەرویز موشەڕەف ناموشەڕەف) ئەوا ئەمان ئامادە نەبوون بچنە ژێر رکێفی هیچ لایەن و وڵاتێکی بێگانەوە. ئەگەر سەرباری هەموو ئەمانەش ژمارەیەکی کەم لە دانیشتوانی ئەم دوو وڵاتە ملکەچی دەسەڵات بووبن ئەمە ئەگەڕێتەوە بۆ بارودۆخی نالەباری ئابووری و نەخوێندەواری و هەژاری ئەم خەڵکە. ئاشکرایە تاکە داهاتی بەرچاوی ئەفغانستان لە ڕێی بەرهەمهێنانی تریاکەوە دەستەبەر ئەبێ و بێگومان ئەم بێدەرامەتییەش یەکێکی ترە لەو هۆکارانەی ئەفغانییەکانی ناچار کردووە تاکوو یارمەتی لە ئەمریکا وەربگرن. پاکستانیش هەر دۆخێکی هاوشێوەی هەیەو ئەگەر لە ڕێی یارمەتی و دۆلارەکانی ئەمریکاوە نەبێ نەیتوانیوە و ناتوانێ ئەو خەڵکە ڕەش و ڕووت و هەژارە بەخێو بکات. ئەڵبەت شتێکی حاشا هەڵنەگرە کە ئەمریکا تەنیا لەبەر مەسڵەحەت و بەرژەوەندیی خۆی ئامادەیە ئەم یارمەتییانەیان پێ بداو بێگومان لە بەرانبەر دانەیەك پرتەقاڵدا کە بیان داتێ دوو ئەوەندە خێریان لێوەر ئەگرێتەوە.

جا کۆی ئەم بەرژەوەندییانەو مەسەلەی شکستپێدانی سۆڤییەت بە دەستی موجاهیدین، بوونەتە هۆی ئەوە کە یارمەتیدانی موجاهیدین لە لایەن ئەمریکاوە وەك شتێکی ئاسایی سەیر بکرێت و ئاساییشە هەموو خاوەن مەسلەحەتێك لەم سەرزەوییەدا بۆ مانەوەو بەڕێوەبردنی خۆی ئەبێ بە دەوروبەرەکەی بگەیەنێ یان سوود لە دەوروبەر وەربگرێ.

**هاوکات لەگەڵ دەسپێکرانی جیهادی ئەفغانستان کابرایەك بەناوی «جوهەیمان عوتەیبی» لە وڵاتی عەرەبستانی سعوودی هەستا بە دانانی گروپێکی چەکداری جیهادی دژ بە دەوڵەتی سعوود و لە دوو مزگەوتی گەورەی ئەو وڵاتەدا کە بنەماڵەی بن لادەن سەرقاڵی ئاوەدانکردنەوەو نوێکردنەوەیان بوون، خەڵکێکی زۆری بە بارمتە گرت کە دەنگدانەوەی بێوێنەی بەدواوە بوو و وەك دەوترێ بە یارمەتیی کۆماندۆی ئەوروپی کێشەکە چارەسەر کرا. ئەم رووداوە لە مێژووی هاوچەرخی سعوودیەدا بێوێنە بوو و بگرە تا ئێستاش دووبارە نەبۆتەوە. هەندێ سەرچاوە ئەڵێن یەك لە براکانی ئۆسامە بن لادەن لە گواستنەوەی چەك و چۆڵدا بۆ ئەو مزگەوتانە دەوری یەکەمی گێڕاوەو بە جۆرێك لە جۆرەکان بن لادەنەکان بە بەرپرسیاری ئەو رووداوە لە قەڵەم ئەدەن. دیارە جیهادکردن لە مەملەکەتی «حەرەمەینی شەریفەین» و لە تەنیشت کەعبەو مەزاری پێغەمبەردا مانایەکی جیاواز دەبەخشێ. هەرچەند ئەم جووڵانەوەیە زۆرخێرا سەرکوت و تەفروتوونا کرا بەڵام کۆمەڵێ لە لێکۆڵەران لە سەر ئەو باوەڕەن کە سەرەتاو ئاخێزگەی گەڵێ رووداو و بزاڤی دواتر بوو. راو شیکردنەوەی تۆ بۆ ئەم رووداوە و کاریگەرییەکانی چۆنە؟**

هەرچەند شارەزای وردەکارییەکانی ئەو رووداوە نیم بەڵام هیچ بەڵگەیەکم نەدیوە کە بڵێت بنەماڵەی بن لادەن دەستیان لەو رووداوەدا هەبووە. هەروەها ئەوەندەی کە من ئەزانم سەرەڕای زۆربوونی کوڕانی بن لادەن و براکانی ئۆسامە بەڵام هیچ کامیان پشتیوانییان لە هەڵوێستی ئەو نەکردووە. خودی ئۆسامەش تا ساڵی ١٩٩٨ سوپای سعوودییەی بە کافر نەدەزانی و بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە رووداوەکەی جوهەیمان لە ساڵی ١٩٨٠دا رووی داوە دیارە ئەگەری دەستێدابوونی ئەو و بنەماڵەکەی لەم رووداوەدا زۆر لاوازە. هەروەها پێش یەکگرتنی (القاعدە)و (جماعة الجهاد)ی میسر، ئۆسامە تەنیا جیهادکردنی لە دژی بێگانەو رۆژئاواییەکان یان هەندێ لایەنی رۆژهەڵاتیی پێ رەوا بووە بەڵام دوای یەکگرتن و هاوپەیمانیەتیی لەگەڵ دوکتۆر ئەیمەن زەواهیریدا، رای گۆڕاو ئامادە بوو لەگەڵ حاکمانی وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا بکەوێتە جیهادەوە. تەنانەت نەزانراوە کە تەکفیری سوپای پاکستانیشی کردووە یان نە چونکوو سەرباری ئەوەی تەکفیری سەرکردەکان و دەوڵەتی ئەو وڵاتەی کردووە بەڵام ئەڵێن سەردەمی خۆی سوپای پاکستان لەسەر بناغەیەکی ئیسلامییانە دامەزراوەو ئێستاش بەشی زۆری ئەندامانی ئەم سوپایە پێڕەویی لە دەستووراتی ئیسلامەوە ئەکەن و ئەگەر دەوڵەتی ئەو وڵاتە بڕیاراتی دژە ئیسلامی دەربکات ئەوا ئارتەش و سوپای پاکستان رەتی ئەکاتەوەو پشتگوێی ئەخات. رەنگە ئەمەش هۆکار بووبێت بۆ ئەوەی شێخ ئۆسامەو زۆر کەسی تر تەکفیری ئەوان نەکەن. بە پێی ئەو شتانەی باسم کردن، ئەتوانم بڵێم بن لادەنەکان دەستیان لەگەڵ جوهەیمان عوتەیبیدا تێکەڵ نەبووبێ، هەروەها دەربارەی ئەو رووداوە ریوایەتێکی ترم بیستووە کە باشم لە بیر نەماوەو گوایە بە پشتبەستن

به فەرمایشتێکی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) ئەوەیان وەك نیشانەیەکی کۆتاییهاتنی دونیا تەعبیر کردووەو هیچ شتێکی ترم نەبیستووە کە نزیك بێ لەوەی ئێوە وتووتانە.

**گەورەترین و بەهێزترین رێکخراوی جیهادی واتە رێکخراوی ئەلقاعیدە، لەناو دڵی جیهادی ئەفغانستانەوە لە دایك بوو. دەیگێرنەوە عەبدوڵڵا عەزام و شێخ ئوسامە بن لادەن پێوەندییەکی نزیکیان پێکەوە هەبووە و لە (ایام الروس)دا هاوسەنگەری یەکتری بوون، عەزام لە هەشتاکاندا (١٩٨٠) پێشنیاری دامەزراندنی رێکخراوی ئەلقاعیدەی خستۆتە بەردەست بن لادەن و بە واتایەك ئەتوانین بڵێین بیرۆکەی سەرەکیی دامەزرانی ئەلقاعیدە لە لایەن عەزامەوە دارێژراوەو خراوەتە بەردەست. سەرەتا با بزانین بزوێنەر و پاڵنەری عەبدوڵڵا عەزام بۆ ئەم پێشنیارە چی بوو و چ هۆکارێك لە ئارادا بوو کە بە پێویستی زانیبوو رێکخراوێکی وەك قاعیدە دروست بکەن کە گەلێ جیاوازتر و پتەوتر بوو لە هەموو رێکخراوە ئیسلامی و جیهادییەکانی تر؟**

(قاعدة الانصار) ناوی میوانخانەکەی ئوسانە بن لادەن بوو و وەك دەڵێن دوای لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنێکی زۆر، وشەی (تنظیم) خرایە پێشی کە بە مانای رێکخراوەیە، واتە (رێکخراوی بنکەی پشتیوانان)و دواتر وشەی ئەنساریش لابرا. بەرواری دامەزرانی ئەم میوانخانەیە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوکاتەی شێخ ئوسامە بن لادەن بە یەکجاری لە سوودانەوە کۆچی کردەوە بۆ ئەفغانستان و بە پێچەوانەی جارەکانی تر ئەمجار بۆ هەمیشە لەوێ مایەوە. ئەو لە میوانخانەکەیدا پێشوازییەکی گەرمی لە میوانە موجاهیدەکان ئەکرد و تا کاتی گواستنەوەو دامەزراندنیان لە جێگەی دیاریکراودا، خزمەتی ئەکردن. بە هۆی ئەم خزمەتکردنەو هەروەها ئەوەی کە میوانخانەکەی ئەو خێراتر لە میوانخانەکانی تر کاروباری موجاهیدینی هەڵئەسووڕاند ناوبانگێکی زۆری دەرکردبوو. بەڵام ئەوەندەی من ئاگاداری ژیان و بەسەرهاتی شێخ ئوسامە بم پێشتر هیچ نەخشەو پلانێکی چڕوپڕی بۆ دروستکردنی ئەلقاعیدە لە شێوەی رێکخراوێکی ئاوا ئاڵۆز و گەورەدا نەبووەو ئەوەی لێکۆڵەران و رۆژنامەنووسان وەك چیرۆك ئەیگێرنەوە گوایە بە گەڵاڵەیەکی نەخشە بۆکێشراو ئەلقاعیدەی دامەزراندووە راست نییە چونکوو لە ئاکامی گۆڕانکاری و پێشهاتەکانی دواتر بوو کە ئەلقاعیدە لە هەیمەنەی رێکخراوێکی گەورەو بەربڵاوی جیهانیدا دەرکەوت. رێکخراوی ئەلقاعیدەیش بە هەمان شێوەی ئیخوانولموسلیمین لە قاڵبێکی سنووورداری بچووك و دیاریکراوەوە دەستی پێکرد و پاشان قەبارەیەکی گەورەتری بەخۆیەوە گرت و بەرەبەرە بوو بەو رێکخراوە عالەمییەی کە ئێستاکە ئەیبینین. بۆیە من وانازانم ئەم رێکخراوە بە نەخشەیەکی تۆکمەو لەپێشدا دارێژراو دروست بووبێ یاخود عەبدوڵڵا عەزام دەستی هەبووبێ لە دروستکردنیدا. جا هەرچەند پێوەندیی ئوسامەو عەزام لە (ایام الروس)دا قووڵ بووبێ بەڵام ئەمە نابێتە بەڵگە بۆ ئەوەی کە بیرۆکەی دامەزراندنی ئەلقاعیدە لە لایەن ئەوەوە گەڵاڵەو پێشنیار کرابێ و خرابێتە بەردەست ئوسامە بن لادەنەوە. تەنیا ئەتوانم ئەوە تەئیید بکەم کە ئەم دووانە واتە شێخ عەبدوڵلە عەزام و شێخ ئوسامە بن لادەن کار و خزمەتەکەیان و جۆری بیرکردنەوەیان لە یەك چووەو ئەمەش شتێکی ئاساییە.

**ساڵی ١٩٧٩ شۆڕشێکی ئیسلامی لە ئێراندا رووی داو بە جۆرێك لە جۆرەکان رەوتی خەباتی ئیسلامییانەی گۆڕی و هەنگاوێکی جیاواز و گەورەی بەرەوپێشەوە هەڵگرت. هەڵگرانی بیری ئیسلامی سیاسی بۆ یەکەم جار توانییان لە رێگەی شۆڕشێکی جەماوەرییەوە دەوڵەتێکی ئیسلامی دابمەزرێنن. پێگەی ستراتیژیکی ئێران هەم لە رووی ژیۆپۆلەتیك و هەم لە رووی مێژوویی و کەلتوورییەوە ئاستی کاریگەریی شۆڕشەکەی چەندەها جار قووڵتر کردەوە. بۆ یەکەم جار لە مێژووی هاوچەرخدا شۆڕشگێڕانی موسوڵمان شەریعەت و قورئانیان کردە بنەمای داڕشتنی یاساو سیستەمێکیان بەناوی (کۆماری ئیسلامی) دامەزراند کە تا ئەودەم هاوشێوەیەکی بۆ دروست نەبووبوو. بەم چەشنە توانیبوویان سیستەمێکی حکوومەتی رۆ بنێن کە هەم ئیسلامی بوو و هەم لەگەڵ بەهاو دابونەریتە مۆدێرنەکانی وەك دیمۆکراسی و دەوڵەتی سێ دەزگایی و پەرلەمانتاریزمدا تەبا دەهاتەوە. بە واتایەکی سادەتر شۆڕشی ١٩٧٩ی ئێران رێگایەکی تازەی لە بەردەم سەرجەم خەباتکاران و ئیسلامگەرایاندا واڵا کرد. کەچی ئەم هەموو دەستکەوت و کاریگەرییە لەناو سۆزشێکەوە پەیدا دەبوو کە ناوەرۆکێکی شیعی هەبوو، وەك دەشزانین دژایەتییەکی لەمێژینەو کۆن لە نێوان شیعەو سوننەدا هەیە و رەوتە رادیکاڵەکانی هەردوولا یەکتریان بە موشریك و مورتەد زانیوەو دەیزانن.**

**ئایا ئەوەت قبووڵە کە شۆڕشی ئێران خاڵێکی وەرچەرخان بوو لە پرۆسەی جیهاد و خەباتی ئیسلامیدا؟ ئەگەر قبووڵتە ئەی چۆن چۆنییە کە شۆڕشێکی شیعی ئاوا ئاسەوارێکی قووڵ و مێژوویی دائەنێت و زۆربەی هەرەزۆری سوننەکانیش ئەکەونە ژێر کاریگەرییەوە؟**

ئەگەر بەمەوێ ورد و درشتی شۆڕشی ئێران و جیاوازییەکانی دەسەڵاتی ئێرانی لەگەڵ حکوومەتی پێشووی ئەم وڵاتە واتە حکوومەتی پاشایەتیدا شی بکەمەوە بێگومان لە مەجالی ئەم کارەدا نییەو ناتوانم بە خێرایی باسی ئەم جیاوازییانە بکەم. هەروەها ناتوانم لەم دەرفەتەدا باسی تەواوی ئەو جیاوازییانە بکەم کە سیاسەت و دەسەڵاتدارێتی لە مەزهەبی شیعەی جەعفەری واتە شیعەی دوازدە ئیمامی لەگەڵ تێڕوانینی ئێمەی سوننەدا هەیەتی. بەڵام هۆکاری خۆگونجاندنیان لەگەڵ دابونەریتە مۆدێرنەکاندا -وەك ئاماژەتان پێداوە- لەوەدایە کە شیعەکان هەر لە کۆنەوە تامەزرۆی گەیشتن بە ئاوەها دەسەڵاتێك بوون و هەر کە ئەم دەرفەتەیان بۆ رەخساو هاتنە سەر حوکم، زۆر بە قەدرزانینییەوە کەڵکیان لەم دەرفەتە وەرگرت کە لە تیۆری «ویلایەتی فەقیە»دا بەرجەستە بوویەوە. لە لایەکی ترەوە ئەوەشمان بیرنەچێ کە ئەم خۆگونجاندنە بە شێوەیەکی موتڵەق و رەها نەبوو، بەڵکوو ئەوان زیاتر لە هەندێ بواردا ئەم کارەیان کرد ئەویش پاش تەواوبوونی شەڕی ئێران/ عێراق. سەرباری ئەو تێڕوانینەیان بۆ یەکتری، وا نەبووە کە شیعەو سوننە بەردەوام خەریکی دوژمنایەتیکردنی یەکتر بووبن. ئەوەتا عەبدولقادر عەبدولعەزیز لە کتێبی (جامع فی طلب العلم الشریف)دا ئەڵێ: «تا ساڵی ١٩٧٩ و بەدەسەلات گەیشتنی شیعە لە ئێران هیچ عالم و زانایەك شیعەکانی بە (کافر) نەزانیوە.» ئەو لەو باوەڕەدایە کە توندترین زانا لە بەرانبەر شیعەدا ئبن تەیمییە بووە کە لە کتێبی (منهاج السنة)دا شیعە بە دژی سوننەو یارمەتیدەری یەهوود و نەسارا و درۆزن ناو دەبات و بە (ترسناکترین کۆمەڵ لە کۆمەڵە

گومڕاکان)یان دەزانێ بەڵام سەرەڕای ئەوەش هێشتا هەر قاییل بەوە نەبووە وشەی کافریان بۆ بەکار بهێنێ. هەروەها هەرچەند هەندێ زانا بە گشتی (غولاة)ی گومڕاکان تەکفیر نەکەن بەڵام باسی کافربوونی شیعەیان نەکردووە.

بەشێکی شیعەکانیش بە نیسبەت سوننەکانەوە توند ڕەفتارن بەڵام ئەم توند ڕەفتارییە لەگەڵ سوننەکاندا بەو مانایە نییە کە سوننە بە کافر بزانن و بە مورتەد و موشریك حیسابیان بکەن. هەروەها ئەو شیعانەش کە توند ڕەفتارن ئەوانەن کە لایەنێکی ئایدۆلۆژی و دەمارگیرییەکی وایان بەسەردا زاڵە کە تەنانەت دەوڵەتی ئێرانیش تەکفیر نەکەن. هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە بۆچی ئەم حکوومەتە سوننەکانی ژێردەسەڵاتی خۆی لەناو نابات! بە پێچەوانەی هەموو ئەم حاڵەتانەوە، لە هەندێ قۆناغی مێژوویدا شیعەو سوننە پێکەوەو بە هاوبەشی لە بەرانبەر ئەوانەدا وەستاونەتەوە کە دژی ئیسلام بوون و گەلێ دەرەنجامی باشیشیان دەستەبەر کردووە. بەڕای من وردبوونەوە لە خاڵە هاوبەشەکانمان و قەناعەتهێنان بە یەکتر ڕێگایەکی سەرکەوتووانەتر و بێ زیان تریشەو نموونەکەیشمان لە سەردەمی شاە سەلاحەدینی ئەیوبیدا بینیوە. منیش وەك ئێوە شۆڕشی ئێران بە زەنگێکی ئاگادارکردنەوە بۆ هەموو موسوڵمانانی دونیا ئەزانم و ئەم خاڵانەی خوارەوە لەم شۆڕشەدا بە گرنگ ئەزانم:

١-ئێرانییەکان بەو بەرگرییەی لە کیانی خۆیانیان کرد سەلماندیان کە دەسەڵاتی ئیسلامی ئەگەرچی شیعەش بێ، توانای سەلماندنی خۆی لە دونیای تازەدا هەیە. سەرباری ئەو هەموو یارمەتییەی لە کاتی شەڕی ئێران/عێراقدا لە ڕۆژئاواییەکانی وەردەگرت، ڕژێمی بەعس نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت و بە ئامانج و مەبەستەکانی بگات. هەرچەند دواجار ئەوە ئێران بوو کە لەڕووی نیزامییەوە شەڕەکەی دۆڕاند بەڵام بە ڕوویەکی تردا سەرکەوتنی بەدەست هێنا چونکوو دوابەدوای سەرکەوتنی شۆڕش و لە مانگی ٩ی ١٩٨٠ی زایینیدا ئاوا شەڕێکی گەورەی بەسەردا سەپێنراو سەرەڕای ئامادە نەبوونی بۆشەڕ بەڵام توانی هەشت ساڵ بەرگری لەخۆی بکات و پێش بە سەرکەتنی سوپای عێراق بگرێت. ئەمە سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ هەموو ئۆممەتی ئیسلامی و نیشانەی ئەوە بوو کە موسوڵمانان ئەتوانن لە هەموو ڕۆژوناواو زوڵم و داگیرکەرییەکی ئەوان و دەست و پێوەندەکانیان خۆیان بپارێزن و تەنانەت بەسەر پیلانەکانیاندا زاڵ بن.

٢-ئەم سەرکەوتنەی ئێران هاوکات بوو لەگەڵ سەرکەوتنی موجاهیدینی ئەفغانستان بەسەر سوپای سۆڤیەتدا کە ئەم خوێن لەبەر ڕۆیشتنە (الاستهزاف) دواجار بووە هۆی ڕووخانی یەك لە دوو جەمسەری زلهێزی دونیا کە دەیان ساڵ بوو میللەتانی موسوڵمانی ژێردەسەڵاتی خۆی ئەچەوساندەوە. ئەم دوو سەرکەوتنە هاوکاتە بوونە هێمای سەرکەوتنی موسوڵمانانی ناوچەکە کە لە دوو شەڕی گەورەدا ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ هەردوو زلهێزەکەی دونیایان واتە ئەمریکایان بە ناڕاستەوخۆو سۆڤییەتیشیان بە شێوەی ڕاستەوخۆ شکست پێهێنا.

٣-شۆڕشی ئێران حکوومەتی پاشایەتی ڕووخاند کە ئەڵقە لە گوێی ئامریکا بوو و حکوومەتی تازە بە دەسەلات گەیشتوو کەوتە پشتیوانیکردنی موسوڵمانان و لە هەموو شوێن و قوژبنێکی ئەم دونیایەدا ئەوانی لە دژی دەسەڵاتدارانی وڵاتان و ڕۆژئاواییەکان هان دا. بە شێوەی کرداری و بە ڕادەیەکی باش یارمەتی جیهادی عێراق و لوبنان و فەڵەستین و تەنانەت ئەفغانستانی دا. یارمەتییەکانی ئێران بە نهێنی و ئاشکرا، ڕاستەوخۆو ناڕاستەخۆ، وەك چەك و چۆڵ یان پارەو ئازووقەو زۆر شتی تر ئەگەیەندرایە ئەو گروپ و ڕێکخراوانەی لە وڵاتان و شوێنە جۆراوجۆرەکان دژی

نەیارانی ئیسلام ئەجووڵانەوەو وڵاتی موسوڵمانانیان داگیر کردبوو یان بە حوکمی زۆر و زەبروزەنگ بەسەریاندا حکوومەتیان دەکرد. ئیتر وای لێهاتبوو لە هەر شوێنێك موسوڵمانان بە کارێکی نارەزایەتی هەڵبسانایە ئەوترا دەستی کۆماری ئیسلامی تێدایەو ئێران هانی ئەوان ئەدات.

٤-سەربارى ئەوەی دەسەڵاتی ئێرانی هەستا بە دامەزراندنی سیستەمی کۆماریی و کارکردن بە یاساو دابونەریتی هەڵبژاردن و پارلمان، بەڵام لە لایەکی ترەوە ئیدیعای کرد کە ئەم یاسایانە بە زۆری لە مەزهەبی شیعەی جەعفەرییەوە وەرگیراون یان لەگەڵ بنەماکانی ئەم مەزهەبەدا گونجێندراون. بەڕای من هۆکاری دانەمەزراندنی ئاوەها دەسەڵاتێك و خۆ گونجاندنی رۆڵەتیی لەگەڵ جیهانی سەردەمدا ئەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە لە لایەك هەم بیروڕای دەرەوەی دونیای ئیسلام لە خۆیان رازی بکەن و هەمیش جۆرێك لە دەسەڵاتداری نوێی ئیسلامییان هێنابێتە ئاراوە کە هەم پێبەندی ئیسلامی شیعی دوازدە ئیمامی بێت و هەمیش خۆی لەگەڵ دەسکەوتەکانی دونیای مۆدێرندا بگونجێنێ.

ئەمانە گرنگترین دەسکەوت و بەرهەمەکانی شۆڕشی ئێران بوون، بەڵام دەربارەی کاریگەریی ئەم شۆڕشە شیعییە لەسەر ئەهلی سوننەو جەماعە ئەبێ بڵێم وا نەبووە کە ئەوان لە ئاستێکی زۆردا کەوتبنە ژێر کاریگەری ئەم شۆڕشەوەو هاتنە سەرکاری حکوومەتی ئیسلامی لە ئێراندا ئەوانی خستبێتە سەر هێڵی ئیسلامەتی و چالاکبوونەوە. ئینجا ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە شیعەکان بۆخۆیان هەمیشە لەژێر ئاسەوار و کاریگەری سوننەدا بوون و هەن و ئەم کاریگەری دانان و کاریگەری وەرگرتنە دوولایەنە بووەو هەردوولا کاریگەرییان لەسەر یەکتر بووەو لە قازانجی هەردوولاشدایە هاوکاری یەکتر بکەن. من لە گۆشەی ئەم بەندیخانەیەوە وەك وەسیەت بە موسوڵمانانی رائەگەیەنم کە واز لە شەڕکردن لەگەڵ شیعە لە هەموو جێیەکی جیهاندا بێنن، چونکوو بە زەرەری ئەزانم، تەنانەت لەو جێیانەشدا وا شیعە شەڕتان پێ‌دەگێڕێ تا بۆتان ئەکرێ خۆتان لە شەڕیان لابدەن و دڵنیابن ئەمە نە ترسنۆکی و بەزینەو نە لادانە لە بیروباوەڕی رەسەنی خۆمان بەڵکوو نیشانەی عاقڵی و نەفەس درێژییە. ئەم داواکارییەشم بۆ ئەوەیە چونکوو دوژمنی گەورەترمان هەیەو ئەگەر ئێمەو شیعە شەڕی یەکتر بکەین تەنیا ئەو دوژمنانە سوودی لێ ئەبینن و کارەساتەکەی بۆ موسوڵمانان ئەمێنێتەوە. ناکامی شەڕکردنی ئێمە رووداوی دڵتەزێنی وەك داگیرکرانی بەغداد لە لایەن هۆلاکۆی لێ ئەکەوێتەوە بەڵام ئەگەر رێگەی مەنتیق و گفتوگۆو قەناعەت بە یەککردن بگرینە بەر ئەوا شتی دڵخۆشکەری وەك سەردەمی شاە سەلاحەدینی لێ ئەکەوێتەوە کە کاتێ متمانەی شیعەکانی ئافریقای وەرگرت بەهۆی ئەوە شیعەکان پێیان وابوو ئەو باشتر لە خۆیان بەرگری لە خاکی موسوڵمانان ئەکات، دەوڵەتەکەی خۆیان دوودەستیی تەسلیمی سەلاحەدین کرد. من کە ئەم قسانە دەکەم تاکوو ئێستا بە بۆنەی ئەمجۆرە قسەو داوەری کردنانەوە باجی زۆرم داوەو کەمترینی ئەم باجەش ئەوەیە کە بە ناحەق و بێتاوان و خۆڕایی بەندیان کردووم و حوکمێکی قورسیان بەسەردا داوم.

ئەڵبەت رەنگە لە مەسەلەی تەکفیری شیعەدا جەنابت تووشی هەڵە بوویی، لە چەندین قۆناغدا وەك سەردەمی موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب بە تەکفیرکردنی شیعەکان هێرشێکی گەورە کرایە سەر نەجەف و کەربەلا و هەزارانیان لێ کوژرا. یاخود لە مێژووی هاوچەرخیشدا دوابەدوای دامەزراندنی دەوڵەتی تاڵەبان چەند هەزار شیعە لە مەزارشەریف

کوژران و.....هتد. کەوابوو بە درێژایی مێژووی ئیسلام دوژمنایەتییەکی پتەو لە نێوان شیعە و سوننەدا بینراوە. بەڵام وەك جەنابیشت ئەو رایەت پەسند کرد هەمان ئەو شیعە بە کافر لە قەڵەمدراوانە یەکەم شۆڕشی جەماوەریی ئیسلامییان سەرخست و بوونە خاڵی وەرچەرخان لە مێژووی هاوچەرخی ئیسلامدا. ئەڵبەت دیارە ئەگەر بزووتنەوە ئیسلامگەرا سوننەکان وازیان لە تەکفیری شیعە هێنابێ، کە بە لە بەرچاوگرتنی رووداوەکانی ئەم چەند ساڵە دواییەی عێراق و سوپای سەحابە لە پاکستان و تەنانەت بەلووچستانی ئێران پێمان وانییە ئەم گۆڕانە رووی دابێ، بێگومان ئەتوانین وەك خاڵێکی پۆزەتیڤ و بەرەوپێشەوەی لە قەڵەم بدەین کە بۆخۆیشت پێت لەسەر پێویستبوونی ئەم گۆڕانکارییە داگرتووەو بە راشکاوی داوای دەکەیت. هەر ئالێرەوە ئەتوانین دەلاقەیەکی تر بکەینەوەو ئاوڕ لە بزووتنەوەیەکی کاریگەر و بەرجەستەی تری شیعە بدەینەوە. وەك پێشتریش باسمان کرد دروستبوونی دەوڵەتی جوولەکەی ئیسراییل چرکەساتێکی وەرچەرخان بوو لە رۆژهەڵاتی ناوین و سەرجەم دونیای ئیسلامداو هەر لە ساڵی ١٩٤٨ەوە موسوڵمانان هەوڵی خەباتکردنیان دژ بەو دەوڵەتە داوە. شیعە سەرەڕای ئەوەی لە کەمایەتیدان کەچی هەمیشە یەك لە کۆڵەکە سەرەکییەکانی رووبەڕووبوونەوەی ئیسراییل بوون، بە تایبەت دوای دامەزراندنی «حیزبوڵڵای لوبنان» شیعەکان توانیویانە وەك ئاڵاهەڵگری ئەم مەیدانە خۆیان نیشان بدەن. شۆڕشی ئیسلامیی ئێران لە یەکەم ساتەوە رایگەیاند دەبێ ئیسراییل لەسەر زەوی بسڕدرێتەوەو بێگومان حیزبوڵڵایش منداڵی ئەم شۆڕشەو ئەم ستراتیژ و سیاسەتەیە. بەدەر لە داگیرکردنی بەشێك لە خاکی لوبنان لە لایەن ئیسراییلەوە، رەنگە بتوانین بڵێین دروستکردنی موقاوەمەی حیزبوڵڵا میکانیزمی ئێران بوو بۆ گرتنەدەستی ئاڵای شەڕکردن دژی ئیسراییل و لەوێشەوە بەربڵاوکردنەوەی مەیدانی نفووزی تەشەیوع لە جیهانی ئیسلامیدا کە تەنانەت ناوی «هیلالی شیعی»شیان لەسەر ئەو پرۆژەیە داناوە. کۆماری ئیسلامیی ئێران بە دژایەتیکردنی رەهاو بێئەملاولای ئیسراییل و ئامریکاو راگەیاندنی دروشمی ستراتیژیکی «نە رۆژهەڵات نە رۆژئاوا» ساڵانێکی زۆر جڵەوی گۆڕەپانی ئیسلامگەرایی کۆنترۆڵ کردبوو. ئایا ئەم رۆڵە گەورەیەی ئێران نەبوو بە هۆی دروستبوونی قەیرانی شەرعییەت بۆ بزاڤ و رێکخراوە سوننەکان؟ یاخود بە واتایەکی تر یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی دابەزینی رێژەی متمانەی جەماوەری سوننە بەو بزاڤانە ئەوە نەبوو کە بەراوردیان دەکردن بە شۆڕشی ئێران و حیزبوڵڵای لوبنان، چونکوو ئێستاشی لەگەڵدا بێ سەرەڕای ئامادەبوونی ئەو هەموو رێکخراوە ئیسلامییانە لە وڵاتانی سوننەنشیندا -جگە لە تاڵەبان و موجاهیدینی ئەفغان ئەویش بۆ ماوەیەکی کورت- هیچ کامیان نەیانتوانیوە دەوڵەتێکی ئیسلامی دابمەزرێنن. بە گشتی ئایا ئەوەت قبووڵە کە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران بالانس و هاوسەنگیی ئیسلامگەرایی تێك چوو و بە باری شیعەکاندا شکایەوە؟

با هەر لە روونکردنەوەکەی سەرەتای پرسیارەکەوە دەست پێ بکەم. پێویستە بڵێم کە من خۆم لێ نەبۆتە زاناو موفتی تاکوو بڵێم شیعە کافرن یان کافر نین و خۆم لەو ئاستەشدا نابینم بڕیار لەسەر ئاوا مەسەلەیەك بدەم. تەنیا وتەی شێخ عەبدولقادر عەبدولعەزیزم گێڕاوەتەوە کە یەکێکە لە بەناوبانگترین و لە هەمانکاتدا خەباتکارترین شارەزایان و موجاهیدین لە دونیای ئیسلامدا. ئەگەر هەڵەیەکیش رووی دابێ هەڵەی من نییە بەڵکوو هەڵەی شێخ عەبدولقادرەو ئەگەر ئێوە ئەو بۆچوونەی ئەو رەت ئەکەنەوە بێشك پێویستی بە بەڵگەی زانستی و لانیکەم فتوایەکی ئاشکراو دیار هەیە.

ئەگەریش ئەتانەوێ لای موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب ئەو فتواو بەڵگەیە بدۆزنەوە پێتان ئەڵێم بۆی مەگەڕێن چونکوو قەت تەکفیری شیعەی نەکردووەو بە پێچەوانەشەوە یەخەیان پێ گرتووە کە بۆچی تەکفیری قوببە پەرستەکانی نەکردووە چ بگاتە تەکفیری شیعە! کۆی بەرهەم و فتواکانی شێخ موحەممەد لە کتێبێکدا بە ناوی «مجموعة رسائل التوحید» کۆ کراوەتەوەو لە هیچ فتوایەکدا شیعەی بەکافر نەزانیوە. مەرجیش نییە ئەگەر کوشتارێك کەوتبێتە نێوان دوولای موسوڵمانان ئیتر یەکیان ئەوی تری تەکفیر کردبێت و بە ڕای من شەڕی ناوخۆیی موسوڵمانان قەت ئاوا مانایەك نادات. بە هیچ شێوەیەك نامەوێ تەنانەت لە پێناو مەسڵەحەتی شەرعیشدا مێژوو بشێوێنم و درۆی تیا بکەم چونکوو درۆ حەرامەو لە حەرامیشدا مەسڵەحەتی شەرعیی بەدەست نایەت. هەروەها من نەموتووە کەس وشەی تەکفیری بەکار نەهێناوە بەڵکوو وتوومە شێخ عەبدولقادر ئەڵێ، هیچ کەس لە ئەهلی عیلم تەکفیری شیعەی نەکردووە. ئەوەش کە وتووتانە «هەزاران کەسیان لێ کوژرا» مەگەر لە ڕووی (صیغە)ی (المبالغە)وە لێتانی قبووڵ ئەکەم چونکوو دڵنیام هەردوولا زێدەڕۆییان لە ڕاگەیاندنی ژمارەی کوژراوەکاندا کردووە یاخود بێگانەو دوژمن زۆریان پێوە لکاندووە. لە ڕاستیدا خوێنڕشتن و تەکفیرکردن هێندە سادەو ساکار نییە کە بە هەر قیڕەقاڵێك ڕووی دابێت و پەنایان بۆ بردبێت. چاوتان لەوە نەبێ ئێستا تەکفیر و کوشتاری بەگۆترە بۆتە بنێشتە خۆشەی دەمی هەندێ کەسی گەنج و کەم ئەزموون. لە باسکردنی ڕووداوەکەی مەزارشەریفیشدا بەداوای لێبوردنەوە ئێوە تووشی هەڵە بوون چونکوو شێخ عەبدولقادر ئەڵێ تا پێش ساڵی ١٩٧٩ واتە تا کاتی هاتنەسەرکاری (جمهووری ئیسلامی)، کەچی ئێوە نموونە لە تاڵەبان ئەهێننەوە کە ساڵی ١٩٩٦ سەری هەڵداوە!

سوپاسیشتان ئەکەم کە لەم بارەیەوە ڕای منتان بە گرنگ زانیوە بۆ بەرژەوەندیی گشتی بەڵام لە ڕاستیدا مەبەستم پیاهەڵدان بە باڵای شیعەدا نەبووەو نەیشمویستووە ببمە بەربەست و لەمپەر لە بەردەم ئەو سوننانەدا کە تەکفیر دەکەن یان نایکەن. هەرکەس کە تەکفیری کەسێ یان کۆمەڵێ ئەکات لە قیامەتدا خۆی جوابگۆی کارەکەی خۆیەتی و ئەوەش کە نایکات بە هەمان شێوەیە بەرپرسیاری کارەکەی خۆیەتی. مەبەستمی من ئەوە بووە ڕاستیەکان وەك خۆیان بڵێمەوەو بەرژەوەندیی ئوممەتی ئیسلامی لەبەرچاو بگرم و هیچی تر.

بە نیسبەت بۆچوونەکەی شێخ عەبدولقادریشەوە تەنیا یەك وەڵام بینیوە ئەویش نامیلکەیەکی «شێخ ئەبوو موحەممەدی مەقدەسی»یە بە ناوی (نکت اللامع فی المحوظات علی الجامع) کە لە بەندیخانەی (سواقەیس)ی ئەردەندا نووسیویەتی و وادیارە لە دوو بەرگەکەی (الجامع الطلب العلم الشریف)ی شێخ عەبدولقادر تەنیا دانەیەکیانی پێ گەیشتووە. شێخ موحەممەد لە جێگەیەکی کتێبەکەیدا بە بێ ئەوەی ئەسڵی مەسەلەکە ڕەت بکاتەوە باسی ئەم بۆچوونە دەکاو تەنیا چەند مەرج و تێبینییەکی لە سەر نووسیوەو شێخ عەبدولقادریش قبووڵی کردووە.

بەڵام با بابەتێکی دیکەش ڕوون بکەمەوە، ئەگەر باسی باشەی شۆڕشی ئێران ئەکەم بەو مانایە نییە ئەوان واتە شیعەکان لە سوننە بە باشتر بزانم و قبووڵی بکەم کە ئەوان بوونەتە سوارچاکی مەیدانی وەرگرتنەوەی فەلەستین و قودسی داگیرکراو. هەرچەند دان بە کۆشش و خەباتیاندا ئەنێم بەڵام پێم وایە بەراوردکردنی هەوڵ و خەباتی سوننەو شیعە بە یەکتر وەك بەراوردکردنی مانگی چواردەو ئەستێرەیەك وایەو لام وایە ئەستێرەکەی ئەوان بە نووری مانگە پرشنگدارەکەی ئێمە دائەپۆشرێت.

هەرچەند لە وەڵامدانەوەی پرسیاری پێشوودا وەکوو پێویست وەڵامت نەدایەوە بەڵام داوەری دەخەینە ئەستۆی خوێنەر و چیتر جەخت لە سەر ئەو بابەتانە ناکەینەوە کە لە پرسیارەکەدا هووروژاندنمان.
کشانەوەی ئارتەشی سووری سۆڤییەت لە ئەفغانستان مانای سەرکەوتنی جیهادی ئیسلامی بوو لەم وڵاتەدا، ئەم سەرکەوتنە دوو دەسکەوتی گەورەی لێ کەوتەوە. یەکەم دروستبوونی دەوڵەتی ئیسلامی لە ساڵی ۱۹۹۲دا و دووهەم چەکەرەسەندنی یەکەم بنەمای ئەو ڕێکخراوە عالەمگیرەی سەرەتا بە (قاعدە الانصار) ناوبانگی دەرکرد و دواتر بە تێکەڵبوون لەگەڵ ئەلجیهادی میسردا ڕێکخراوی ئەلقاعیدەی لێ هاتە بەرهەم. دابەزاندنی شەریعەتی ئیسلامی بە پێی تەفسیری حەنەفییەت بەرجەستەترین دەرکەوتەی ئاشکرای دەوڵەتی ئیسلامیی ئەفغانستان بوو و لە دووتوێی ئەم زەمینە کۆمەڵایەتی و فیکرییەشدا ئەندێشەی پەرەپێدانی ئەم ئەزموونە بەرەو وڵاتانی دیکەی دونیای ئیسلام و تەنانەت سەرانسەری جیهان چرۆی کرد و بە مەبەستی جێبەجێکردنی ئەم خواستە، ڕێکخراوی ئەلقاعیدە دروست کرا. کەوابوو دەوڵەتی ئیسلامی و ئەلقاعیدە دووانەی یەک دایکن و هەردووکیان لە چاوگی جیهادی ئەفغانستان یان هەمان (ایام الروس) ئاو دەخۆنەوە. ئایا تۆیش ئەو ڕۆڵە گرنگ و بنەماییەی جیهادی ئەفغانستان لە گەشەسەندنی ئیسلامی جیهادیی ڕێکخراوەییدا قبووڵ دەکەیت؟

بەڵێ بە شێوەیەکی گشتی هەڵسەنگاندنەکەتان قبووڵ دەکەم بەم چەند تێبینییەوە:
۱-ئەگەر وەک ئێوە وتووتانە، ئەلقاعیدە بە یەکێ لە دووانەکەی ئەو جیهادە بزانین ئەبێ ئەوە لەبەرچاو بگیرێ کە ئەلقاعیدە زادەی بیری کۆمەڵێ بیرمەند یاخود خەڵکی رامیاریی نەبووە. وەک پێشتریش باسمان کرد نە عەزام و نە ئۆسامەو نە هیچ کەسێکی تر بە نەخشەیەکی دارێژراوی تۆکمەوە ئەلقاعیدەیان دانەمەزراند و بە پێچەوانەوە ئەم ڕێکخراوە لەناو رەوتی کار و جیهاددا پێگەیی و گەورە بوو. هەرچەند جیهادی ئەفغانستان برەوی بە بیری جیهادی ئیسلامی دا بەڵام هیچ نەخشەو پلانێکی بۆ پێکهێنانی ڕێکخراوێکی وەکوو ئەلقاعیدە پێ نەبووە.
۲-سەرکەوتنی موسوڵمانان لە ئەفغانستان لەبری ئەوەی کیانێکی ئیسلامی بەهێز بۆ موسوڵمانان دروست بکات تاکوو هەمووان رووی تێبکەن، ئەنجامی پێچەوانەی لێ کەوتەوەو موجاهیدە غەیرە ئەفغانەکان بە لێشاو بەرەو وڵاتانی تر بوونەوەو دیاردەی سەیر و چاوەڕواننەکراوی کۆڕەوی موجاهیدین و پەرتەوازەبوونیان لە دونیادا هاتە بەرهەم. تەنانەت هەندێکیان نەیانەتوانی بگەڕێنەوە وڵاتەکەی خۆیشیان و دەبوایە هەرکەس لەو وڵاتە بچووک و دەستکردانەی بۆیان دروست کردووین هەوڵی درێژەپێدانی ئەو ئەزموونە واتە ئەزموونی جیهادی بدایە. تەنانەت ئەو کەسانەش کە هێشتا لەوێ مابوونەوە، دوای شەڕە خوێناوییەکانی نێوان حیکمەتیار و ڕەبانی کە دوو هێز و سەرکردەی سەرەکی جیهاد بوون بەناچار ئەفغانستانیان بەجێ هێشت. ڕەنگە یەک لە هۆکارەکانی دروستبوونی ئەم شەڕەیش هەمان چۆڵکردنی ساحەی ئەفغانستان بووبێت لە لایەن خەڵکانی بە ئەزموون و خەم خۆرەوە. هەروەها هەموو دونیای ئیسلامیش کەوتنە لۆمەی ئەفغانییەکان و ئەمەش بوو بەهۆی ناشیرینبوونی موجاهیدین و دڵتەنگبوون و بێزاربوونی موسوڵمانان. ئەمە بۆ ئەو قۆناغەی ئەفغانستان خەسارێکی جیدی بوو کە لە پەیکەری ئیسلام و جیهادی ئیسلامی کەوتبوو.
۳-ئەگەر ئەلقاعیدە بێچووی ایام الروس بێ بێگومان تاڵەبانی حەنەفی مەزهەبیش هەر بێچووی ئەو ئەیام و سەردەمەیە چوونکوو تاڵەبان کاردانەوەیەک بوو لە بەرانبەر چەواشەبوون و لە ڕێدەرچوونی دەوڵەتی ئیسلامیی ئەفغانستان و

لادانیان لە بنەماکانی شەرعی ئیسلام. کەوایە ئەتوانین بڵێین هەرچەند تاڵەبان وەك خۆرە کەوتە گیان (دایکەی) خۆی و هەڵیوەشاندەوە بەڵام ئەویش هەر لەناو ئەو سیستەمەوە سەری دەرهێنابوو و هاتبووە دەرەوە.

٤-یەکێکی تر لە دەسکەوتەکانی جیهادی ئەفغانستان لە هەر سێ سەردەمی «رووسەکان و دەوڵەتی ئیسلامی و تاڵەبان»دا ئەوە بوو کە ئەو هەموو موسوڵمانە عەجەم و عەرەبە بە مەزهەبی جیاجیاوە لەژێر سێبەرێکی هاوبەشدا کۆبووبوونەوەو کردار و فەرزی ئیسلامی جیهادییان بەجێ ئەهێنا. ئەمە لە حاڵێکدا بوو کە ئەفغانەکان حەنەفی مەزهەبێکی تا رادەیەك توند رەفتاریش بوون و یەکگرتنی موسوڵمانانی چەند مەزهەب و چەند رەگەز لە ناوەها شوێنێکدا گەلێ سەخت و دژوار بوو بەڵام موسوڵمانان بە سەر هەموو تەنگ و چەڵەمەکاندا سەرکەوتن و دیاردەیەکی کەم وێنەیان لە مێژووی ئیسلامدا تۆمار کرد.

ئەزموونی دەوڵەتی ئیسلامیی ئەفغانستان ئەزموونێکی ناسەرکەوتوو بوو و وەك ئاماژەی پێدرا دوابەدوای زنجیرە شەڕێکی خوێناویی ناوخۆیی دەرئەنجام ساڵی ١٩٩۶ ئەم حکوومەتە چوار ساڵەیە رووخاو تاڵەبان حکوومەتێکی تری لە ئەفغانستان دامەزراند. حکوومەتی تازە زۆر خەست و خۆڵتر و بنەمایی تر هەستا بە دامەزراندنی یاساکانی شەریعەت و تەنانەت لە ساڵە یەکەمەکانی دەسەڵاتداریدا ئامادەنەبوو لەگەڵ وڵاتانی (بەرەی کوفر)دا هیچ جۆرە پێوەندییەکی هەبێت کە ئەڵبەت دواتر گۆڕانکاری لەم بابەتەو گەلێ بابەتی دیکەشدا کرد. تاڵەبان لەژێر کاریگەریی جۆرە ئایدیالیزمێکی رۆمانسییانەی لادێییدا بوون و چونکوو لە لادێیەکانی ناوچە پەشتوونەکانەوە هاتبوون و زۆربەیان جیا لە خوێندنی حوجرەو مەکتەبخانە دینییەکان لە قوتابخانەو سیستەمی فێرکاریی مۆدێرندا نەچووبوونە بەر خوێندن، هەر بۆیە بە بارودۆخ و ژیانی سەردەم ئاشنا نەبوون. یاساو دەستووری توندڕەوانەی وەك قەدەغەکردنی تێلەفیزیۆن یان فەرزکردنی ریش بۆ پیاوان و بەرکورتکردنەوەی رووبەری ژیانی ژنان لە چوارچێوەی بنەماڵەدا سیمای ئیسلامی سیاسی لای خەڵکی دونیا ناشیرین کردبوو و تەنانەت بە پێی گێڕانەوەیەك ئەڵێن وەفدی موجاهیدینی چیچان دوای گەڕانەوەی لە سەردانی ئەفغانستان، بە توندترین شێوە رەخنەیان لە حکوومەتی تاڵەبان گرت و ئامادە نەبوون هیچ پێوەندییەکیان لەگەڵ ببەستن. ئایا ئەتوانین شێوازی حکوومەتکردنی تاڵەبان بە خاڵێکی نیگەتیڤ لە مێژووی حوکمڕانیی ئیسلامیدا لە قەڵەم بدەین؟

ناتوانین بە یەك دوو خاڵی نیگەتیڤ یان پۆزەتیڤ شەش ساڵ حکوومەتی تاڵەبان تاوتوێ بکەین چونکوو رەنگە مەسەلەیەك هەبێ کە لە رووی هونەرییەوە سلبی بنوێنێت بەڵام لە رووی شەرعییەوە ئیجابی بێت. ئەتوانم ئەوەش بسەلمێنم کە شەریعەتی رەسەنی ئیسلام دژایەتییەکی لەگەڵ هونەر و شارستانییەتدا نییە بەڵام ئەبێ لەوە بکۆڵینەوە کە بۆچی هەواڵەکان تاڵەبانیان وەك لایەنێکی خەست و خۆڵی کۆنەپەرەست نیشان ئەدا. ئەبێ بزانین قەدەغەکردنی خوێندنی سەردەمیانەو مۆدێرن، تەلەفزیۆن، فەرزکردنی ریش، گۆشەگیرکردنی ژنان و داپۆشینیان لەناو (منقبات)دا و.....هتد، چ کاریگەرییەکیان لە سەر خەڵکی ئەم وڵاتە هەبوو و ئایا ئەمە کاردانەوەی سلبی هەبووە؟ ئایا هەموو ئەمانە بەشێك نەبوون لەو شتانەی کە دونیای دەرەوە لێی بێزار بوو و.....؟ ئایا رەتکردنەوەی نوێنەری وڵاتە جیاجیاکانی دونیاو ناوبردنیان بە بەرەی کوفر -بەوجۆرەی ئێوە نووسیوتانە- هۆکارێکی تری ئەو روانگە نیگەتیڤە نەبوو کە لە بەرانبەر تاڵەباندا دروست بووبوو. ئەم پرسیارانە پێویستیان بە شیکارییەکی تا رادەیەك چڕوپڕ هەیە. بێگومان هەرکەس لە هەر جێگایەکی جیهاندا بیەوێ شەریعەتی ئیسلام بکاتە یاسای وڵاتەکەی ئەگەر زۆر لەبلەبان و فەیلەسووفیش بێ بەتایبەت لە سەردەمێکی وەکوو ئێستادا، رووبەڕووی هەندێ کێشەی ئاڵۆز ئەبێتەوە. چونکوو

هەندێ لەو حوکمانە کە لە دەقە ئەسڵییەکاندا هاتووە لە ڕواڵەتدا لەگەڵ هەلومەرجی سەردەمدا دژایەتی هەیە. وەك نموونە ئەتوانم ئاماژە بدەم بە بڕینی دەستی دز، ڕەجمکردنی زیناکاری خێزاندار یان کڕین و فرۆشتنی کۆیلەو بەندە (ئەگەرچی ئیسلام هانی خەڵك ئەدا بۆ ئەهێشتن و کەڵکوەرنەگرتن لەو دیاردەیە بەڵام وەك پووچەڵکردنەوە پووچەڵ نەکراوەتەوەو حوکمەکەی لە ئیسلامدا هەر ماوەتەوە). من پێم وایە هێشتنەوەی ئەم حوکمە بە تەواوی بێ حیکمەت نییە چونکوو قورئان پەیامێکە لە ئاسمانەوە هاتووەو خوای گەورەیش لە خۆڕا نەیهێشتۆتەوە. هەر بۆیە خۆم و موسوڵمانان لە ئاست ئەو مەسەلەیەدا بە سەرشۆڕ نازانم چونکوو حوکمێك لە دیوانگەی ئەسڵیی پەیامە خواییەکەوە هێنرابێتەوە باسکردن و شیکردنەوەی نەك ئەنگ نییە بەڵکوو جێی شانازیشە. یاخود ڕەچاوکردنی تێکەڵنەبوونی ئافرەت و پیاو لە بۆنەو شوێنە گشتییەکانداو قەدەغەکردنی دڵداری و ڕێگرتن لە هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی فەساد وەك گۆرانی و شانۆ و تەمسیل و فلیمی زنجیرەیی و چەندەها شتی تر کە ئەگەر لە ڕووکەشیشدا بە شێوەی داپۆشراو و شاردنەوەی ئەندامەکانی لەش پێشکەشی بکەن بەڵام دەرەنجامی مەبەستەکەی ڕاکێشانی کۆمەڵگایە بەرەو فەساد و دوورکەوتنەوە لە دینداری. ئەم شتانە حکوومەتی ئیسلامی ناچار ئەکات سنووری شەرعی و واقیعی بۆ پێوەندییەکانی ناو کۆمەڵگا دیاری بکات. ئەگەر ئەوەی هەڵدەستێ بە ڕەخنەگرتن لەم حوکمە شەرعییانە، لە ڕۆچنەی ئیمان بە ئیسلام و دەستوورەکانی ئیسلامەوە ڕەخنە بگرێت، قەناعەتپێکردن و چارەسەرکردنی ڕەخنەکانی زۆر ئاسانترە لە ڕەخنەی ئەوانەی هەر باوەڕیان بە دەسەڵاتی ئیسلامی نییە.

تاڵەبان وەعدەیان بە خەڵکی وڵاتەکە دابوو لەسەر بنەمای ئەسڵی ئیسلام حکوومەتداری بکەن و تەنانەت هیچ جۆرە هەڵاواردنێك بە سوودی مەزهەبی خۆیشیان واتە مەزهەبی حەنەفی بە کار ناهێنن. جا ئەگەر وەعدەکەی پێشتری خۆیان بەڕێوە نەبردایە بێگومان متمانەیان لای خەڵك لە دەست ئەدا. ئەوان هەر لە هەمان سەرەتاوە بە نیسبەت جێبەجێکردنی ئەحکامی پیرۆزی ئیسلامەوە ڕووبەڕووی هەزاران کێشە بوونەوە بەڵام خۆ هەردەبوایە ئەم ئەحکامەیان دابەزاندایەو نەدەکرا چاوپۆشی لێ بکەن. ئەو هەموو خوێنە لە سەر ئەوە ڕژابوو کە حکوومەت ئیسلامی بێت و ئەگەر قەرار بوایە ئیسلامی نەبێ ئیتر چ پێویست بەو هەموو خوێندان و خەسارەتە بوو؟ ئەمە یەکانگیر بوو لەگەڵ دژایەتییەکانی دونیای دەرەوەو دژکردەوەیەکی زۆری لای خەڵکان و دەوڵەتانی دەرەوە دروست کردبوو. بۆ نموونە هەرچەند بەشێك لە دونیا پەیڕەوی دینی بوودا بوون بەڵام چونکوو بوونی پەیکەر و بوت لەگەڵ ئایینی ئیسلامدا نایەتەوەو حیسابی شیرکی بۆ ئەکرێ، تاڵەبان بڕیاری لەناوبردنی پەیکەرەکانی بوودای دەرکرد. یاخود مەسەلەی تەسلیم نەکردنی بن لادەن چ پێش ١١ی سێپتامبر و چ پاش ئەو ڕووداوە کە ئەمەیان دواقۆناغی گوێڕایەڵ نەبوونی تاڵەبان بوو بۆ دونیای دەرەوە بە تایبەت زلهێز و ملهوڕێکی وەکوو ئەمریکا. بۆیە ڕەنگە ناوزەدکردنیان بەوەی لە ژێر کاریگەری (ئایدیالیزمی ڕۆمانسییانەی لادێییدا) بوون، لەو ڕووەوە بێت کە لە تەوەرەو ستاندارد و عادەتەکانی دونیای سەردەم لایان دابوو. ئینجا هەرچەند ئاگام لە سەردانەکەی وەفدی چیچان نییە بەڵام ئەگەر ئەو وەفدە بە دڵشکاوی گەڕابنەوە یاخود ئەوەی کە تاڵەبان داواکەی نوێنەری ئیخوانیان بۆ ئەشکاندنی پەیکەری بوودا ڕەت کردبێتەوە، ئەمانە هەمووی ئاکامی جۆری حوکمڕانی و هاتنەسەر دەسەڵاتیان بوو کە باسم کرد، لە ڕاستیدا ئەو شێوازی دەسەڵاتدارییە ئەم شتانەشی لێ دەکەوتەوە.

بەڵام هەندێ ڕا هەیە کە تاڵەبان بە بزووتنەوەیەکی خۆڕسکی ئەفغانستان نازانێ و وەك بەڵگەیش ئاماژە ئەکەن بە ڕۆڵی ئامریکا و ISIی پاکستان لە دامەزراندنی تاڵەباندا. ئامریکا پێی خۆش بوو لە دراوسێیەتی ئێرانی شیعی کۆنە نەیاریدا

**دەوڵەتێکی سوننەی حەنەفی و دژە شیعە دابمەزرێنێ و لەوێوە کۆنترۆڵی دەسەڵاتی ئێرانی بکات و لە هێژمۆنی ئێران کەم بکاتەوە. دیارە دەوڵەتی ئیسلامی لەبەر لاوازێتی و شەڕە بەردەوامە ناوخۆییەکان نەیئەتوانی ئەم ڕۆڵە بگێڕێ و هەربۆیەش ئامریکا پێشوازی لە تاڵەبان کرد. ئاشکرایە ISI ی پاکستانیش هەر لە کۆنەوە دەیانویست ئەفغانستان وەك ناوچەی ژێر نفووزی وڵاتەکەیان وابێت. سەرکردەکانی دەوڵەتی ئیسلامی باوەڕیان بە سەربەخۆ مانەوەی ئەفغانستان هەبوو بەڵام تاڵەبان ڕاستەوخۆ کەوتنە ژێر کاریگەری پاکستانەوەو تەنانەت ئەڵێن ئیستخباراتی ئارتەشی پاکستان کۆنترۆڵی سەرجەم سەرکردایەتی و ڕەوتی جیهادی تاڵەبانی دەکرد. گرێکوێرەی هاوکێشەکانی ئەفغانستان بە سەرهەڵدانی تاڵەبان ئەوەندەی تر ئاڵۆز بوو و ئەمەش بەرهەمێکی پڕخەساری ئامریکاو پاکستان بوو. ئەوە بوو دوای ڕاگەیاندنی دەوڵەت و گرتنی زۆربەی شارەکانی ئەفغانستان تەنیا پاکستان و عەرەبستان و ئیمارات ئەو دەوڵەتەیان بە ڕەسمی ناسی و تاڵەبانیش لە یەکەم چالاکییە کردارییەکانیدا دیپلۆماتە ئێرانییەکانی کۆنسوڵخانەی ئێرانیان لە مەزارشەریف کوشت. هەموو ئەم بەڵگانە ئەوەمان پێ دەڵێن کە تاڵەبان بەرهەمی ڕاستەوخۆی ناو هەناوی کۆمەڵگای ئەفغانستان نەبوو و لە لایەن ئامریکاو ئای ئیس ئای پاکستانەوە بەرهەم هێنراو هەرکامەیان مەبەستێکی جیاوازیان لەم کارە هەبوو کە ڕەنگە لە هەندێ جێگاشدا مەبەستێکی چونیەك و هاوبەشیان بووبێ. ڕای جەنابت لەم بارەیەوە چییە؟**

وەك دەڵێن سەرەتا بیست سی فەقێ بوون کە ڕێکخراوی تاڵەبانیان دروست کرد. ئەوان لە مزگەوتی یەکێ لە شارەکانی وڵاتەکەیاندا بڕیاریاندا بکەونە هەوڵی گۆڕانکاری و پاکسازی و چاکسازیکردن لە ئەفغانستانداو گوایە «مەلا عومەر موحەممەد» یاخود « مەلا موحەممەد عومەر» کە ئێستاش ئەمیری تاڵەبانە یەکێك لەو فەقێیانە بووە. لە ئەفغانستان وەك زۆر شوێنی تر بە فەقێ دەڵێن (طلبە) و (طالبان)یش زاراوەی کۆ یان ناوی (جمع)ی تەلەبەیە بە واتای فەقێکان و ناوی تاڵەبان لەم چاوگەوە سەرچاوەی گرتووە. جا ئەوان لە ماوەیەکی زۆر کورتدا بوونە خۆشەویستی جەماوەری ئەو وڵاتەو بوون بە مەترسیەکی جیدی بۆسەر دەسەلاتی ئەودەمی ئەفغانستان. تاڵەبان بەر لەوەی کاری چەکداری دەست پێ بکەن، ڕووبەڕووی تەقینەوەیەك بوونەوەو نزیکەی ٣٠٠ کادێری زۆر هەڵبژاردەیان لێ کوژرا. هەرچەند ئەنجامدەر و پلاندانەری ئەم تەقینەوەیە قەت دەرنەکەوت بەڵام ئەمە بووە هۆی خۆشەویستبوونی هەرچی زیاتری تاڵەبان لەناو دڵی ئەفغانییەکاندا. ئەوان پاش ئەم ڕووداوە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە ڕێی پەشتوون و ئۆردوو زمانەکانی ناویانەوە یارمەتی ماڵی و سەربازییان لە دەوڵەتی پاکستان وەرگرت. من خۆم ئەوکاتە پێشمەرگەی بزووتنەوەی ئیسلامی بووم و بەردەوام بەدوای هەواڵەکانی تاڵەباندا دەچووم؛ تەنانەت لەو سەردەمەدا هەندێ لە هەواڵەکان باسی پردێکی یارمەتیدانی ئەمریکایان بۆ تاڵەبان دەکردو ئەیانوت گۆیا ئەم پردە لە ڕێی پاکستانەوە دروست کراوە، بۆیە من نەك نکۆڵی لێ ناکەم بەڵکوو بەوپەڕی قەناعەتەوە ئەڵێم ڕەنگە هەندێ لەو هەواڵانە ڕاست بووبێ بەڵام هەرگیز دان بەوەدا نانێم کە تاڵەبان دەسکردی ئەمریکا یان پاکستان بووە، بەڵکوو لە ڕوانگەی منەوە (حرکة الطالبان) بزووتنەوەیەکە لەناو دڵی ڕۆشنبیر و بیرمەند و خەباتکارە ئیسلامییەکانی ئەو وڵاتەوە هەڵقوڵاوەو بە هیچ جۆرێ بە بزووتنەوەیەکی ناخۆڕسکی ئەفغانستانی نازانم.

لە لایەکی ترەوە ئەگەر سەیرێکی سەردەمی دەسەڵاتداری بزووتنەوەی حیکمەتیار بکەین کە یەکێك لە دوو کوچکەی دەوڵەتی ئیسلامیی ئەفغانستان بوو، هەندێ بەڵگەمان دەست ئەکەوێ کە ئەو لێکدانەوەیە ڕەت ئەکاتەوە گۆیا تاڵەبان بە مەبەستی بەگژاچوونەوەی ئێران لە لایەن ئەمریکاوە دروست کرابێ. حیکمەتیار لە لێدوانێکی بە ناوبانگدا دەڵێ: «چەند ئەهلی سوننە لە ئێراندا ئازار درابن بە زیادیشەوە لە ئەفغانستاندا تۆڵەی ئەکەینەوە»، ئەم قسەیە لە سەردەمانێکدا ئەوەندە برەوی پەیدا کردبوو کە وەك دروشمێکی لێ هاتبوو. ئەڵێن لە شارێکی ئەفغانستاندا دۆڵێکیان بۆ تەرمی شیعە کوژراوەکان تەرخان کردبوو و ناویان نابوو «دۆڵی شیعەکان» هەر شیعەیەك لە شەڕی سوننەکاندا بکوژرایە

تەرمەکەی فڕێ ئەدرایە ناو ئەم دۆڵەوە کە تەنیا لە یەك جاردا ٥٠٠ تەرمی تێ فڕێ درابوو. ئەگەر مەسەلە شکستدانی شیعەو ئێران بوایە خۆ حیکمەتیار بەبێ هیچ یارمەتییەکیش خەریکبوو ئەم کارەی ئەکرد و ئیتر چ پێویست بوو ئەمریکا ڕێکخراوێکی وەك تاڵەبانی بۆ دروست بکا؟! بێگومان لاوازکردنی حیکمەتیار لەلایەن تاڵەبانەوە مانای لاوازکردنی بەرەی دژە شیعە لە ئەفغانستان و ناوچەکەدا بوو ئیتر ئەمە کوێی لەگەڵ ئەقڵدا دێتەوە کە ئەمریکا بە مەبەستی دژایەتیکردنی دەسەڵاتی شیعەی ئێران لە ڕێگای تاڵەبانەوە دژایەتی حیکمەتیاری دژە شیعەی کردبێت؟ ئەڵبەت من ناڵێم ئەمریکاو پاکستان هەر لە خۆڕایی یارمەتی تاڵەبانیان داوەو بێگومان بۆ ئەم کارەیان پلان و بەرنامەیەکیان لە سەردا بووبێ بەڵام بێگومان هۆکارەکەی ئەوە نەبووە کە ئێوە ئەیڵێن. هەروەها ناشڵێم تاڵەبان دژی شیعە نەبوو چونکوو وابزانم ئەو ٥٠٠ کەسەی شیعەیەی کە باسم کرد، لە سەردەمی تاڵەباندا کوژران.

ئەڵبەت پێویستە هەم جەنابت و هەمیش خوێنەران ئاگادار بکەینەوە کە تاڵەبان هیچ کات دژایەتی حیکمەتیاری نەکردووە بە تایبەت لە سەرەتای دامەزران و دەستبەکاربوونیانەوە. بەڵگەشمان ئەوەیە کە حیکمەتیار و حیزبەکەی سەرباری بەشداری کردنیان لە دەوڵەتی ئیسلامی ئەفغانستانداو وەرگرتنی یەك لە پۆستە سیادییەکانی ئەم وڵاتە لە لایەن خودی حیکمەتیارەوە، پاش ماوەیەکی کەم کەوتنە دژایەتیکردنی دەوڵەتی ئیسلامی  بە تایبەت هەردوو سەرکردە ناودارەکەی ناو ئەم دەوڵەتە واتە بورهانەدین ڕەبانی و ئەحمەد شا مەسعوود و پاکستانیش لە کاتی ئەم شەڕ و تەنگەژانەدا یارمەتی لایەنی حیکمەتیاری ئەدا.

شێوازی وەڵامدانەوەکەت ئەوە ئەگەیەنێت کە جەنابت بە گشتی بەرگری لە تاڵەبان و شێوازی دەسەڵاتدارییان دەکەیت کە یەك لە سەرەکیترین تایبەتمەندییەکانی دژایەتیکردنی دیاردە تازەکان و بەهاکانی دونیای مودێرن بوو. ئایا لەسەر ئەو باوەڕەیت ئەوەی تاڵەبان دەیکرد و بەڕێوەی دەبرد حەقیقەتی شەریعەتی ئیسلام بوو؟ یان بە واتایەکی تر ئایا ئەتوانین شەریعەت و حکوومەتی تاڵەبان بە ئیسلامی ڕاستەقینە بزانین؟

بەرگریکردن لە دەقی قورئان پێوەندیی بە بەرگریکردن لە تاڵەبانەوە نییە بۆ وێنە هەر کەسێك فەرمانەکەی قورئان بە نیسبەت ڕەچاوکردنی حیجاب و خۆداپۆشینی ژنانەوە بەڕێوە ببات و بەرگری لێ بکات بێگومان پێڕەوی لە دەستووراتی خوای گەورە کردووە. ئینجا ئەو فەرمانە هێندە ڕوون و ڕازاوەو بێ پێچ وپەنایە کە ڕێگە بە هیچ تەئویلێکی ناڕاست و پێچەوانە نادات و ڕێگای قسە بۆ هیچ بەهانەگرێك ناهێڵێتەوە. لە هەموو تەفسیر و لێکدانەوەکاندا ئەوجۆرە خۆداپۆشینەی ژنان پشتڕاست کراوەتەوەو ئەگەر من بەرگری لە حوکمی خوای گەورە بکەم ئەوەی لێ نافامرێتەوە کە بەرگری لە بەڕێوەبەر یان وتاربێژەکەیشی دەکەم. بۆیە ئەمە وەك نموونە ئەهێنمەوە چونکوو خۆداپۆشینی ژنان دیاردەیەکی دیاری حکومەتکردنەکەی تاڵەبان بوو و سەرنج و دەنگدانەوەی زۆری بەدواوە بوو و هەموو دەوڵەتە بەناو ئیسلامی و نائیسلامییەکان و ڕێکخراو و دامەزراوە جۆراوجۆرەکانی ئەم سەردەمە هەرایەکیان لە سەری سازکردبوو و بە پێشێلکردنی مافی ئافرەتانیان وەسف ئەکرد. ئەگەر ئاوڕێکیش لە ڕیوایەتەکانی سەردەمی دەسەڵاتداری پێغەمبەری ئیسلام (سڵاوی خوای لێ بێ) لە مەدینە بدەینەوە تێدەگەین کە چۆناوچۆن دوای فەرزبوونی حیجاب کاتێ ئافرەتان بە کۆمەڵ لە مزگەوت ئەهاتنە دەرەوە سەراپا داپۆشراو و ڕەشپۆش بوون و بەم هۆیەشەوە بە (غُراب) واتە بە (قەلە ڕەش) ئەیان شوبهاندن. جا ئەگەر تاڵەبان ئەم دەستووورە جێبەجێ بکا یان نەیکا هیچ لە حەقیقەتی مەسەلەکە ناگۆڕێ و پێوەندیی بە قبووڵکردن یان نەکردنی منەوە نییە.

لەگەڵ ڕێزمدا بۆتان ئەو شێوە داوەری کردنەتان لە سەر دژایەتیکردنی شتە مۆدێرنەکان لە لایەن تاڵەبانەوە، بە داوەری کردنێکی ڕەهاو دوور لە ڕاستی ئەزانم. ئەگەر تاڵەبان ڕەچاوی پێوەر و دیاریکراوەکانی بانکی جیهانیی لە مەسەلەی ئابووریی و دراوی وڵاتدا نەدەکرد بەو مانایە نییە کە ئەوان کەللەڕەق و خاوەن بیر و بۆچوونێکی دواکەوتووانە بوون بەڵکوو ئەمە پێوەندیی بە ئایۆلۆژیاکەیانەوە بووە کە هەڵقوڵاوی بیروباوەڕی ئیسلامی بوو. لەبەر ئەوەش باسی ئابووریی دەکەم چونکوو ئابووریی کاریگەری لەسەر هەموو لایەنەکانی ژیان هەیە بەڵام بەوهۆیەوە کە تاڵەبان ئامادە نەبوو پابەندی سیستەمی نێودەوڵەتی بێت، بە تەواوی لە پێشکەوتنی ئابووریی بێبەش بوو یان باشتر وایە بڵێم بێبەش کرا. ڕەنگە وردبوونەوەیەکی سەرپێی لە قەیرانی ئابووریی ئێران و عێراق دوای کۆتایی شەڕی هەشت ساڵە، نارەوابوونی ئەو سیستەمەمان بۆ روون بکاتەوە. ئەو شەڕە پارەیەکی زۆری بۆ تەرخان کراو پڕ بوو لە ماڵوێرانی بۆ هەردوولا. پاش شەڕەکە وڵاتێکی وەك عێراق دەبوایە قەرز و قوڵەی وڵاتانی بیانی بدایەتەوەو بەو مەبەستەش دەبوایە پشتی بە داهاتی نەوت ببەستایە. عێراق هەم لە کاتی شەڕداو هەمیش دوای شەڕ بە تەواوی ملکەچی خواست و داواکاریی ڕۆژئاواییەکان بوو و هەر کە دەستی کرد بە نافەرمانی کرد کەوتە بەر ڕق و غەزەبی ئەوان و ئاوای بەسەرهات کە بینیمان. باشە ئەوەی بە بیانووی ڕووخاندنی سەدام حسەین لەگەڵ عێراقدا کرا ئاکامی چی بوو؟ بێگومان ئاکامی ملکەچ بوونی چەندین ساڵەی ڕژێمی بەعس بوو بۆ ڕۆژئاوا نەك ملکەچنەبوونی ساڵانی کۆتایی تەمەنی. کەوایە بۆچی ئێمەی خەڵکی عێراق و ئەفغانستان لەبری حەفتا ساڵ سەرشۆڕی و قەرزدانەوەو لەباتی ئەو هەموو شەڕ و شۆڕ و ئاژاوە یەك لەدوای یەکانەی ڕۆژئاوا پێشکەشی کردووین یەکی ئۆسامەیەك و زەرقاوییەك قەرز نەکەین؟! دڵنیام ئەگەر ئەم ڕێگایە هەڵبژێرین نە ئەو باجە سەیر و سەمەرە نەدەین و نەك ئاوا برسی و بێ کارەباو بێ خزمەتگوزاری نابین بەڵکوو سەربەرز و ڕووسووریش ئەبین و خۆمان ئەمیر و حاکمی خۆمان دەبین و هەر خۆیشمان وڵاتەکەمان بەرەو پێشکەوتن و پەرەسەندن ئەبەین. من ئەزانم ئەم قسانەم تیرۆریستانەترین جۆری هەڵوێستی لە بەرانبەردا ئەگیرێ و ئەبێ باجەکەیشی بە خوێنی خۆم و بنەماڵەکەم بدەم بەڵام ئەگەر ئێوە ڕێگەیەکی تر بۆ ڕوونکردنەوەی ڕاستییە مێژووییەکان شك دەبەن فێری منیشی بکەن تاکوو بەوجۆرە باسی بکەین و ڕێژەی باجەکەی کەمتر بکەینەوە.

بەڵام با بێمەوە سەر ناوەرۆکی پرسیارەکە، من بەرگری لە جێبەجێکردنی بەشێك لە ئەحکامی ئیسلامی لە سەردەمی تاڵەباندا دەکەم بەڵام ناتوانم بڵێم هەر هەموویم قبووڵە. من ئاگاداری ئەو واقیعە دوور و نزیکە هەم کە تاڵەبان کاری تیادا ئەکرد بۆیە وەك حەقویستێك داکۆکی لە خەسڵەتە باشەکانیان ئەکەم و خراپەکانیشیان ڕەت دەکەمەوەو تێبینیم لەسەریان هەیە. بەڵام ئەگەر ئێوە بە لەبەرچاوگرتنی بڕی بووجەو دەستمایەی دەستیان و هەلومەرجی هەڵسووکەوتی دیپلۆماسیانەیان بەڵگەتان بۆ دژایەتیکردنیان لەگەڵ شتە تازەکاندا هەیە ئەوا منیش بەوپەڕی قەناعەتەوە قبووڵی دەکەم و بەرگری لێناکەم. من لەوباوەڕەدام کە پێویستە موسوڵمانان لە هەموو میللەت و کەسێك زیاتر سوود لە گۆڕانکاری و دیاردە تازەکانی سەردەم وەربگرن و بەها تازەکانیش لە چوارچێوەو شێوەی شەرعیدا بەکار بهێنن و ئەمەش بە سوود و قازانجی موسوڵمانان دەزانم.

**ئەوەی ئێمە لە ئەزموونی حکوومەتی تاڵەباندا بینیمان گرتنەپێشی ڕەوتێکی تەواو دژە گەشەکردن بوو. وەك پێشتریش باس کرا دژایەتیکردنی دیاردە تازەکان و پێشکەوتنە تەکنۆلۆژیکەکان یەکێك بوو لە کۆڵەکە فیکرییەکانی تاڵەبان. ئەوان تەنانەت لە ڕێگەوبانیشدا نەیانتوانی گەشەیەك بە ئەفغانستان بدەن چ بگات بە لایەن و ڕەهەندە جۆراوجۆرەکان و ژێرخانەکانی ژیانی سیاسی و ئابووریی و کۆمەڵایەتی. بیرمان نەچێ سەرباری ئەوەی تاڵەبان ئەو هەموو ماوەیە جڵەوی دەسەڵاتیان بەدەستەوە بوو هێشتا نەیانتوانی ڕێگە سەرەکییەکەی ئەو وڵاتە بۆ نموونە جادەی کابوڵ بۆ قەندەهار**

قیتاو بکەن، قەندەهارێك کە شوێنی حەوانەوەی مەلا عومەر و پێتەختی مەعنەوییان بوو. یاخود کارەکانی ( وەزارەتی ئەمر بە چاکەو مەنعکردن لە خراپە ) کە شەوان لە حەوشەی خەڵکەوە هەڵدەزنان بزانن ئەوان لە ماڵی خۆیاندا چی ئەکەن و ئایا کارێکی پێچەوانەی یاساو شەریعەتی دیاریکراوی ئەنجام نادەن! لە هەموو ئەفغانستاندا تەنیا یەك سەتەلایت هەبوو ئەویش لە وەزارەتی دەرەوەدا کەڵکی لێوەر ئەگیرا یان جلوبەرگی چەرمینی خەڵك کە لە لایەن تاڵەبانەوە دەستی بەسەردا ئەگیراو بە حەرام لە قەڵەم ئەدرا. کام یەك لەم کارانە دەچنە خانەی پێشکەوتنخوازی و روانگەی گەشەسەندنەوە؟ مەگەر ئەوەی لێکدانەوەمان بۆ چەمکەکانی گەشەو پێشکەوتن بگۆڕین و خەتێکی سوور بەسەر هەرهەموو ستاندارد و پێوانە قبووڵکراوەکاندا بهێنین، ئەگینا بە پێوەری زانستی کۆمەڵناسی تاڵەبان بزووتنەوەیەکە تاسەر ئێسقان دژی گەشەو پێشکەوتنخوازییەو هیچ هێمایەکی قبووڵکردن و تەبایی لەگەڵ گەشەی تێدا نابینین. ئا لێرەدا دژایەتییەکی تەواو هەیە لە نێوان هەندێ لە قسەکانی بەرێزت و واقیعی تاڵەبانی سەردەمی دەسەڵاتداری و سەردەمی دوای لە دەسەڵات کەوتندا.

با پێش هەموو شتێ سپاستان بکەم بۆ رەخنەکانتان، دڵنیابن ئەو رەخنانە بە وریایی و زیرەکی و هەستی راڤەکاریی ئێوە دەپۆلێنم و نە تەنیا لە رەخنەی زانستی و رێزدارانە نارەحەت نابم بەڵکوو بە هۆکاری قووڵبوونەوەی باسەکەی ئەزانم. ئەگەر کەسێکی تریش رەخنەی لێم هەبێ و تەنانەت وەك ئێوەش بێلایەنانە نەیخاتە بەردەست، بەمەرجێك بێرێزی تیا نەبێ ئامادەم گوێی لێ بگرم و بە پێی پێویست وەڵامی بدەمەوە. جیا لەمە با ئەوەش بڵێم ئەگەر شتێکی هەڵە لە قسەکانی مندا هەبێ بێگومان لە رووی نەزانکاری و تێنەگەیشتنی خۆمەوەیەو هیچ پێوەندییەکی بە ئیسلامی پاك و بێگەردەوە نییە، خوای گەورەش بە شاهید دەگرم کە نامەوێ لە راستی و حەقیقەت راکەم بەڵکوو تەنیا بە پێی تێگەیشتنی خۆم قسە ئەکەم. ئەگەر قسەکانیشم راست و دروست بێ بێگومان ئەوە خوای گەورە لە رووی رەحم و بەزەیی خۆیەوە هێناویەتە سەر دڵم و ئازایەتی و بلیمەتیی منی تیا نییە.
لە سەرەتای پرسیارەکەوە وتووتانە ئەو هەموو ماوەیەی تاڵەبان لەسەر حوکم بوون، بەڵام خۆ ئەوان تەنیا شەش ساڵ دەسەڵاتدار بوون، هەروەها لە تێکرای ٢٩ پارێزگاکەش کۆنترۆڵی چەند ویلایەتیان بە دەستەوە نەبوو. لە لایەکی ترەوە ئەفغانستان کانزاو سەرچاوەیەکی سروشتیی نەبووە و نییە تاکوو تاڵەبان بیکردایەتە سەرچاوەی داهاتی خۆی. تەنیا سەرچاوەی گەورەی داهاتی ئەو وڵاتە چاندنی خەشخاش و بەرهەمهێنانی تریاکە کە تاڵەبان دوای هاتنە سەر حوکم بە رەسمی قەدەغەیان کرد و لە شوێنە دوورە دەست و نا دیارەکاندا نەبێ کە دەستیان بە سەریاندا نەدەچوو ئیجازەیان بە وەرزێریی خەشخاش لە هیچ شوێنێکی ژێر دەسەڵاتیاندا نە ئەدا. هەروەها وەك خۆیشتان ئەزانن ئاستی خوێندەواری لە ئەفغانستاندا زۆر لە خوارەو تەنانەت ئێستایش کە بەناو دەوڵەتەکەی کەرزای بە یارمەتی ئەمەریکای سەرۆك و سەرکردەی بە حیساب سەرقاڵی بەرەوپێشبردنی ئەم وڵاتەن، گۆڕانکارییەکی بەرچاو لە ئاست و رێژەی خوێندەواریی خەڵکی ئەم وڵاتەدا رووی نەداوەو ئەمەش شتێکی روون و بەڵگە نەویستە. لە سەردەمی کەوتنە سەر حوکمی تاڵەباندا بەرزترین و گەورەترین باڵەخانەی ئەفغانستان بینایەکی کۆنی هەشت نهۆمی بوو لە کابۆلی پێتەختدا، ئەمەش لە رووی خانووبەرەو بیناسازییەوە نیشانەی پێشنەکەوتوویی ئەفغانستان بوو. لە رووی تەندروستیشەوە دوای ئەو هەموو ساڵەش کە بەسەر لاچوونی تاڵەباندا تێپەڕیوە هێشتا فریای رەواندنەوەی وەباو نەخۆشییە هاوشێوەکانی ناکەون، ئینجا ئەبێ لەو سەردەمەدا واتە لە سەردەمی تاڵەباندا وەزعەکە چۆن بووبێ! نابێ ئەوەشمان بیرچێ کە تاڵەبان لەماوەی دەسەڵاتداریدا، لەژێر ئابلۆقەی هەمەلایەنەی ئابووریدا بوون و بڕی بوودجەو پارەیان هێند کەم بوو بەشی جێبەجێکردنی پێداویستیە سەرەتاییەکانی ژیانی خەڵکی خۆیانی نەدەکرد. ئەگەر پارەیشیان بووبێ و کەمتەرخەمییان لە گەشەپێدانی وڵاتەکەیاندا نواندبێ ئەوا من زیاتر لە ئێوە رەخنەیان لێ دەگرم کە پێم وا نییە ئاوەها بوو بێ. لەگەڵ

هەموو ئەمانەشدا با چاو لەو حەقیقەتە نەپۆشین کە بە درێژایی ئەو شەش ساڵەی تاڵەبان حوکمی دەکرد، ئەوان بەردەوام لەناو شەڕی ئەملاو ئەولادا بوون. سەرباری هەموو ئەمانەش ئەگەر بە وردی سەرنج بدەین ئەبینین لە ماوەی یەك دەیەی پاش تاڵەبانداو سەرەڕای ئەو هەموو یارمەتییە نێودەوڵەتییەو ئەو پارە زۆرەی بە ئەفغانستان دراوە هێشتا شاهیدی پێشکەوتنێکی ئەوتۆ لەم ولاتەدا نین و بە پێچەوانەوە ئێستاکە ئەفغانستان بە گەندەڵترین ولاتی جیهان دێتە ئەژمار!!

هەروەها ئەگەر بەراوردێك بکەین لە نێوان حکومەتی تاڵەبان و حکومەتی هەرێمی کوردستانداو هەلومەرج و باروودۆخی هەردوولا بخەینە تای تەرازوو و هەڵیبسەنگێنین، تێدەگەین کە ئەم دووانە جیاوازییەکی ئەوتۆیان لە پەرەپێدان و بووژانەوەی ولاتەکانی ژێردەسەلاتیاندا نییە. ئەمە لە حاڵێکدایە کە کوردستانەکەی خۆمان پاڵی بە زلهێزانی رۆژئاواوە داوەو هەرچی ویستووە پێیان داوەو بۆیان دابین کردووەو ئیتر داهاتی نەوت و گومرکیش با بێسێ کە خوانەزانی چەندەیە. هەروەها تەمەنی دەسەلاتی کوردی چەند بەرابەری تەمەنی حکومەتەکەی تاڵەبانەو بەراوەردکردنەکەشمان سەرباری ئەم جیاوازییە کردووە. لە بەرانبەردا تاڵەبان لە ماوەی تەمەنی کورتی دەسەڵاتداریدا بەردەوام لە ژێر زەخت و گەمارۆی ئابووریی هەموو دونیادا بوو و هیچ سەرچاوەیەکی داهاتی بە دەستەوە نەبوو. باشە ئا بەم وەسف و حاڵەوە ئایا گەشەو نەشەی ئەم دووانە جیاوازە لە یەك؟! ئایا ئەو دوو حکومەتە کوردییە بەو هەموو یارمەتی و پشتگیریانەی رۆژئاواوە توانیویانە ولاتێکی پێشکەوتووتر لە ئەفغانستان دروست بکەن؟ لە حاڵێکدا کە هەم لە رووی جوگرافی و هەم لە رووی حەشیمەتەوە کوردستانی عێراق زۆر زۆر بچووکترە لە ئەفغانستان. تەنیا مەشرووبخواردنەوەو فەساد و رووت و قووتی نەبێ چ شتێکیان بەو ولاتە زیاد کردووەو چ گەشەو پێشکەوتنێکیان پێ داوە؟ مامەو کاکە بەو هەموو هاتوهاوارەوە کە دەیکەن، لە بیست ساڵدا نەیانتوانیوە بە قەدەر شەش ساڵی تاڵەبان خزمەت بە خەڵك بکەن ئیتر چۆناوچۆن ئەتوانین تاڵەبان بدەینە بەر تەشەر و توانج و بڵێین دژی خەڵك و پێشکەوتن و شارستانییەت بوون؟

ئەگەر دابەزاندنی شەریعەتی ئیسلام دژی پێشکەوتنە ئایا رووت و قووتی و باق و بریقی و فەساد و مەشرووبخواردنەوە پێشکەوتن و شارستانییەتە؟ خۆزگە لەباتی ئەو بەناو گەشەپێدانەی کە مامەو کاکە لە پەنای باق و بریقی دیمۆکراسییەوە میللەتیان پێ خەڵەتاندووە، وەك تاڵەبان دژی گەشەو پێشکەوتن و دژی شتە مۆدێرنەکانی سەردەم بونایە بەڵام بەم شێوەیە کوردیان بێ ئابڕوو نەکردایەت و سەربەرزی و شانازیی میللەتەکەمانیان لەق و تەق و دەمارگیر و خۆویستانە نیشانی دونیا نەدایەت. با ئەوەیشتان پێ بڵێم هەم لە کوردستان و هەمیش لە ئەفغانستان ئەوە دەخەنە دوای ئێمەی ئیسلامی کە دژی دونیای مۆدێرن و سەرجەم شتە تازەکانین یان دواکەوتووین و ئاگاداری کەلتووری میللەتان نین، رقمان لە خۆشحاڵییەو ناهێڵین خەڵك خۆشحاڵ بن و هەڵپەڕکێ و سەما بکەن، وشك و دەمارگیرین، کەم فامین، هەستی نەتەوایەتیمان نییە، دژی هونەرین، دژی مۆسیقاو گۆرانین و.....هتد. بەڵام خۆ مەرج نییە هەرچی دوژمنانی بیروباوەڕی ئێمە ئەیڵێن راست و دروست بێت. ئێمەو دوژمنانمان بە شێوازێکی جیاواز ژیان دەکەین و ولات بەڕێوە ئەبەین، بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە ئێمە دژی زانست و پێشکەوتنین. ئەوەی کە تاڵەبان وەك عیلمانییەکانی ولاتانی ئیسلامی ملکەچی دەسەلات و کەلتوور و هێزی رۆژئاوا نەبوون و هەمیشە رووی میللەتی خۆیان بەرەو شارستانییەتی ئیسلامی و دژی رەوتی رامیاری و کۆمەڵایەتیی رۆژئاوا دەچەرخاند و بەهاو دەسکەوتە ئیسلامییە پیرۆزەکانیان بەرزتر و گرنگتر لە هەموو پێشکەوتنە تەکنیکی و خۆشگوزەرانییەکانی رۆژئاوا ئەنرخاند، ناتوانێ مانای دواکەوتوویی ئەوان بدات.

بە نیسبەت کاروباری وەزارەتی ئەمر بە چاکەو مەنعکردن لە خراپەی تاڵەبانیشەوە، ئەوەتان لێ دەپرسم باشە بە پێی چ بەڵگەیەك ئەڵێن بە حەوشەی ماڵی خەڵکدا هەڵزناون تاکوو بزانن خەڵکی لە ماڵی خۆیاندا چی دەکەن؟ خۆ ئەگەر لە

ولاتێکی وەك ئەفغانستانی سەردەمی تاڵەبانندا نموونەیەك یاخود چەند نموونەیەکی ئاواش رووی دابێ بەو مانایە نایەتەوە کە ئەمرێکی حکوومەتی لە پشتەوە بووە چونکوو ئەم کارە لە ئیسلامدا ناوی (تەجەسووس)ەو لە ئایەتی ١٢ی سوورەی حوجەراتدا خوای گەورە حەرامی کردووە. لەو ئایەتەدا وشەی (لا تجسّسو) هاتووە واتە بە «لا»ی (نافیە) (تجسّس) مەنع کراوەو حەرامکردنی راستەوخۆو تەواوە. بێگومان ئەگەر ئاوا شتێك لە ئەفغانستاندا رووی بدایە لانیکەم عەرەبە موجاهیدەکان دەنگیان هەڵدەبڕی و ئاگاداریان نەکردنەوە کە ئەوە کردارێکی بە تەواوی حەرام کراوە بۆیە بە گشتی من ئەم هەواڵە بە راست نازانم.

باسی کوردستان و حکوومەتی هەرێم ئەهێڵینەوە بۆ دواتر و لە سێهەم بەشی وتووێژەکەدا دێینە سەری و باشتر وایە لە تەوەرەی باسەکە لانەدەین. ئەوەی دەربارەی وەزارەتی ئەمر بە چاکەو مەنعکردن لە خراپەی تاڵەبان باسمان کرد وەحید موژدەی کۆنە بەرپرسی تاڵەبان لە کتێبی «ئەفغانستان و پێنج ساڵ دەسەڵاتداری تاڵەبان»دا بە وردی باسی لێوە دەکات. بەڵام دیاردەیەکی دیکەی سەردەمی دەسەڵاتداری تاڵەبان بریتییە لەو گۆڕانکارییانەی لە میانەو بە تایبەت لە دوایین ساڵەکانی دەسەڵاتداریدا ئەنجامیان دا. بۆ نموونە سەرەتا هەموو پێوەندییەکیان لەگەڵ وڵاتانی دەرەوە بە تایبەت وڵاتانی رۆژئاوایی و نائیسلامیدا پچڕاند، بەڵام دواتر ئامادە بوون پێوەندیی ئابووری و بازرگانی لەگەڵ هەندێ لە وڵاتان ساز بکەن. تەنانەت یەك لەو وڵاتانە «چین»ی کۆمۆنیست بوو کە وەفدێکیان رەوانەی ئەفغانستان کرد و ئەڵێن لەگەڵ خودی مەلا عومەریشدا دیداریان کردبوو و تەنانەت پەیکەری گایەکیشیان پێشکەش کردبوو.....یان ئیجازەدان بە وەفدی پزیشکانی بێسنوور بۆ سەردانی ئەفغانستان کە لە ناویاندا ژنیش هەبوو، لە حاڵێکدا کە هەم مامەڵە کردن لەگەڵ رێکخراوێکی جیهانیی لەو چەشنە و هەم دیدارکردن لەگەڵ ئافرەتی نا مەحرەمی رۆژئاواییدا تابۆیەکی زۆر حەرام بوو. چۆن لەم گۆڕانە ئەگەیت و ئایا ئەتوانین بڵێین تاڵەبان لە بیروڕای سەرەتای خۆیان پاشگەزبوونەوە یاخود ئەم کارانەیان هۆکارێکی تری لە پشتەوە بووە؟

قەزیەی ئەو پەیکەرەیە لە راست ناچێ، لانیکەم ئەوەیە ئەگەر بردبێتیشیان ئەوا لێیان وەرنەگیراوە. هەروەها چینییەکان کۆمۆنیستن نەك گاپەرست، ئینجا دیاریکردنی پەیکەری گا ئەگەر تەنانەت لە ئاڵتوونیش بێ چ حیکمەت و مانایەکی هەیە؟ بەو باریشدا ئایا لەگەڵ ئەقڵدا ئەگونجێ پەیکەری گا بە دیاری بدەنە تاڵەبانێك ئەویش کەسێکی وەك مەلا عومەر کە تا سەر ئێسقان دژی پەیکەر و بوتە؟! لە کاتی کێشەی پەیکەرەکەی بوودادا نوێنەری دەوڵەتی یابان چووەلای مەلا عومەر و پێشنیاری پێکرد هەموو جادەی نێوان شارە گەورەکانیان بۆ قیرتاو دەکەن و کارەبا بۆ سەرانسەری ئەفغانستان دابین ئەکەن بە مەرجێك پەیکەرەکان نەشکێنن و ئیجازە بدەن لە ئەفغانستان بیانبەنە دەرەوە. لە بەرانبەر ئەم پێشنیارە پڕخێر و سوودمەندەدا کە بەشێکی زۆری کێشە سەرەکییەکانی وڵاتێکی رەش و رووت و هەژاری وەك ئەفغانستانی چارەسەر دەکرد، مەلا عومەر وتی من ئەمەوێ کاتێك لە قیامەت و ساحەی مەحشەردا بانگیان کردم بۆ لێپرسینەوە، پێم نەڵێن مەلا عومەری بوت فرۆش بەڵکوو پێم بڵێن مەلا عومەری بوت شکێن و ئەمەوێ درێژەدەری ئیبراهیمی بوت شکێن بم.

رەنگە هۆکاری رەتکردنەوەی سەفەری وەفدی وڵاتان بۆ ئەفغانستان، لە سەرەتادا لەوەوە سەرچاوەی گرتبێ کە گومانی ئەوەیان لەسەر بووە گوایە پیاوی ئەمەریکاو پاکستانن، بۆیە بە مەبەستی رەواندنەوەی ئەو گومان و تۆمەتانەی لەسەریان بوو و بە مەبەستی سەلماندنی نییەت پاکییان بە عالەمی ئیسلامی. پێوەندییەکانیان پچڕاندووەو بە راستییش سەلماندیان کە تەنیا پشت بە خوا ئەبەستن و پیاوی هیچ لایەك نین پیاوی خوای گەورە نەبێ. بەڵام ئەوەی کە دواتر

ئیزنی هەندێ وەفد و لایەنیان دا تاکوو سەردانی ئەفغانستان بکەن و ئامادەبوون پێوەندیی ئابووریی و بازرگانی لەگەڵ ژمارەیەك وڵاتدا ببەستن، تەنانەت ئەگەر ناوی پاشگەزبوونەوەیشی لێ بنێن بەلای منەوە کارێکی باش و ئیجابییان کردووەو ئەمەش نەك پێچەوانەی بیروباوەڕی ئیسلامیی ئەوان نەبوو بەڵکوو لە پێناو خزمەتکردنی خەڵکی ئەفغانستاندا بوو. سەردانی وەفدی پزیشکانی بێسنووریش هەر بە هەمان ئاراستەو لە هەمان چوارچێوەدا بووە. بە نیسبەت ئەوەیشەوە کە لەناو ئەو پزیشکانەدا ژنیش بووە شتێکی ئاساییە چونکوو نە لە ئیسلامداو نە لە یاسای تاڵەباندا دیدار کردن لەگەڵ ژنی ڕۆژئاواییدا بە تەواوی و بە شێوەی رەها حەرام نەکراوە. ساڵی ٢٠٠٠ کاتێك لە بەندیخانەی یەکییەتیدا سجن بووم، کچێکی فەرەنسی نوێنەری خاچی سووور سەردانی سجنەکەی کرد و پێی وتین ئێمە نامەی زیندانییان ئەبەین بۆ هەموو شوێنێکی جیهان تەنانەت ئەگەر ئەفغانستانیش بێت هەرچەند سەفەرکردن بۆ ئەو وڵاتە بەلامانەوە سەختە چونکوو ئەگەر خۆمان دانەپۆشین ڕێگەمان نادەن سەردانی ئەوێ بکەین. کەوابوو رەچاوکردنی دابونەریتی ئیسلامی بۆ ئەو ژنانەش فەرز بووەو هەر ژنێکی ڕۆژئاوایی ئەیتوانی بە داپۆشراوی سەردانی ئەفغانستان بکات. بە گشتی من بەم جۆرە لە مەسەلەکە ئەگەم و ئەگەر هۆکاری تری بووبێ ئاگاداری نیم.

**با بێینەوە سەر ئەلقاعیدە. ساڵی ١٩٩٠ سەدام حسەین پەلاماری کوەیتی داو داگیری کرد، ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەم پەلامارەی عێراقی بە دەستدرێژییەکی ڕێگە پێنەدراو لە قەڵەم داو دەستووری دەستێوەردانی نیزامی و لێدانی ئیراقی دەکرد و بەم شێوەیە شەڕی یەکەمی کەنداو بە بەشداری هێزەکانی ناتۆ و هاوپەیمانانیان لە ناوچەکەدا دەستی پێکرد. لەم نێوانەدا سعوودیەش کەوتە بەر هەڕەشەی سەدام و دەنگۆی هێرشی عێراق بۆسەر ئەو وڵاتە بڵاو بوویەوە. ئۆسامە بن لادەن وەك یەکێك لە سەرەکیترین فەرماندەو ڕێبەرانی جیهادیی ئەفغانستان پێشنیاری یارمەتیدانی بە دەوڵەتی ئالی سعوود داو پێی وتن بە هەزاران موجاهیدی شەڕکەری بە ئەزموون لە هەموو وڵاتانی ئیسلامییەوە ئامادەن بەرەو عەرەبستان بکەونە ڕێ و لە هەمبەر عێراقدا بەرگری لە (ام القرا )ی دونیای ئیسلام بکەن. لە بەرانبەردا داوای ئەوەشی کرد کە ئیجازە بە دابەزینی هێزی بیانی بە تایبەت هێزی ئامریکایی لە خاکی عەرەبستاندا نەدرێ. بەڵام نە تەنیا پێشنیارەکەی قبووڵ نەکرا بەڵکوو ڕێگەش بە هاتن و دابەزینی هێزی ئامریکایی دراو بارەگاو کەمپی نیزامیی گەورەیان بۆ کرایەوە. ئۆسامە بن لادەن ئەڵێ: «ناخۆشترین هەواڵی ژیانم دابەزینی هێزەکانی ئامەریکا بوو لە خاکی عەرەبستانی سعوودیدا». رەنگە بتوانین بە دڵنیاییەوە شەڕی کەنداو و هاتنی ئامریکا بۆ ناوچەکە بە گەورەترین کاتالیزۆر (خێراکەر) بۆ ئەندێشەکانی بن لادەن و ئەلقاعیدە بزانین و ئەگەر ئەم شەڕە ڕووی نەدابا پێدەچوو جیهادی جیهانیی ئەلقاعیدە بەو خێراییە پەرەی نەسەندایە. تۆ چ لێکدانەوەیەکت بۆ ئەم باسوخواسە هەیە؟**

منیش ئەو شتەم بەجۆرێك بیستووەو ئاشکرایە هێنانی هێزی ئەمریکا بەو هەموو هەیمەنەو لەشکرکێشییەوە بەهەر بیانوویەك بووایە دەبووە مایەی نیگەرانی هەموو موسوڵمانان. هیچ نەبێ ئەم کارە لەگەڵ ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەردا دژایەتی هەبوو کە دەفەرموێ: (اُخرجو المشرکین من جزیرة العرب) واتە (موشریکان لە دورگەی عەرەبیی دەربکەن). منیش ئەو بۆچوونەم قبووڵە کە هاتنی هێزەکانی ئەمریکا هۆکارێکی سەرەکی ناشیرینکردنی دەسەلاتی ئالی سعوود بوو. هەروەها هۆکاری زەقبوونەوەی دیواری دژایەتی نێوان ئەهلی ئیسلام و ڕۆژئاواش بوو و هەر لەم ڕووەیشەوە ئەلقاعیدە بوو بە نیشانەو ئامانجی دژایەتییەکانی هەردوولا. بۆیە سەرباری ئەوەی شێخ ئۆسامەو ئەلقاعیدە خۆیان بە کەتیبەیەکی بەردەستی مەلا عومەری تاڵەبان ئەزانن و بەیعەتیان بە خەلیفەی موسوڵمانان داوە بەڵام سەرەڕای ئەوەش کەناڵ و میدیاکانی ڕاگەیاندن ئەلقاعیدەو ئۆسامە بە دۆستێکی زۆر نزیکی بزووتنەوەی تاڵەبان و مەلا عومەر ئازانن چ

بکا بەوەی باسی بەیعەتدانی ئەلقاعیدە بکەن بە تالیبان. پێوەندیی نێوان ئەلقاعیدەو تالیبان ئەوەندە قووڵ بۆتەوە کە سەرەڕای گوڕدرانی هەڵوێست و هەڵسووکەوتی هێزە نێودەوڵەتییەکان لەگەڵ تالیبان، مەلا عومەر ئامادە نییە پشت لە ئەلقاعیدەو بن لادەن بکات و ئەوان بە بەشێك لە جیهادەکەی خۆیان و شەریکی خەباتەکەیان ئەزانێت. ئەڵبەت مەلا عومەر پاش ڕووداوی ١١ی سێپتامبری ئەمریکا هەمان ئەم هەڵوێستەی لەخۆی نیشان داو تەسلیمکردن یان دەرکردنی ئۆسامەی بە سووکایەتی کردن بە موقەدەساتی ئیسلام دەزانی و مەشهوورە کە لەم بارەیەوە ئەیوت: ئۆسامە دوایین کەسێك دەبێ لە وڵاتەکەم بچێتە دەرەوەو ئەو هیچکات تەسلیم بە دوژمنانمان ناکرێت!

**ئۆسامە دوای ئەو ڕووداوانە کەوتە ژێر چاودێریی هێزەکانی ئاسایشی سعوودییەوەو دوای یەك دوو ساڵ نەیتوانی درێژە بەو هەلومەرجە بداو ناچار بەرەو دەرەوەی ئەو وڵاتە ڕای کرد. بن لادەن لەوێوە بۆکوێ چوو و چی بەسەر هات و چ کارێکی کرد؟**

هەرچەند وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستی بە ئاوڕدانەوەیەکی کورتە لە ژیانی بن لادەن بەڵام چونکوو ئەوەتان لێ داوا نەکردووم و منیش لەم شوێنەدا سەرچاوەیەکی وەهام لە بەردەستدا نییە، بۆیە ئەم باسە ئەهێڵینەوە بۆ خودی خوێنەران. جیا لەوەی نێوە باستان کردووە، ڕووداوێکی تریش لە بەجێهێشتنی سعوودییەدا لە لایەن بن لادنەوە دەوری هەبوو ئەویش ئەوەبوو کە لەو سەردەمەدا چوار هاوڵاتی سعوودی باڵەخانەیەکی هەشت نهۆمییان لەشاری ڕیاز تەقاندەوەو کە تیایدا نۆزدە کادێری پلە بەرزی ئارتەشی ئەمریکا کوژران. پاشان ئەو چوار کەسە دەستگیر کران و لە لایەن دەسەڵاتی ئالی سعوودەوە لە سێدارە دران. بۆیە لەو بەروارە بەدواوە ئۆسامە بە تەواوی لە سەرانی سعوود نائومێد ئەبێ و دواتریش جاروبار لە وتار و شریتە دەنگی و ڕەنگییەکانیدا باسی ئازاری ئێعدامکرانی ئەو چوارنەفەرە دەکات. کۆی ئەم ڕووداوانە بوونە هۆی ئەوە بن لادەن واز لە بنەماڵە گەورەو دەسەڵاتدارەکەی بێنێ و بڕیاری بەجێهێشتنی وڵات بدات. بنەماڵەی بن لادەن نێوانیان لەگەڵ ئالی سعووددا گەرم و گوڕ بوو بەڵام سەرباری ئەوەش ئۆسامە بەخۆی و بەشێك لە ماڵ و سەروەتەکەیەوە ڕووی لە وڵاتە هەژارنشینەکانی باکووری ئەفریقا کرد و لە سوودانی دراوسێی سۆماڵ گیرسایەوە. سۆماڵێك کە ساڵی ١٩٩١ لە لایەن ئەمریکاوە داگیر کرابوو. ئیتر لەو کاتەوەو لەوێوە هەموو هەوڵی خۆی خستەگەڕ بە مەبەستی جێخۆشکردن بۆ خۆی و بیروباوەڕەکەی بەڵام بارووودۆخی ناوچەکەو ئەو کارانەی کە ئەو دژی دوژمنانی ئیسلام بە تایبەت ئەمریکاییەکان ئەنجامی دان، ئیجازەی مانەوەی زیاتری لە سوودان پێنەدا. بۆیە گۆڕانکارییەکانی دواتری ئەفغانستان و هاتنەسەرحوکمی تالیبان و ڕەوینەوەی گومانی (پیاوی ئەمریکا بوون) لە سەریان و لە هەمووی گرنگتر بەڵێنی هاوکاریکردنی ئەو و پەنادانی لە لایەن موجاهیدینی ئەفغانەوە، بوونە هۆی ئەوە ئۆسامە دووبارە ئەفغانستان بکاتەوە بە مەڵبەندی دەستەبەرکردنی ئامانج و مەبەستەکانی خۆی. هەرچەند ئەو بە تەواوی لە حکوومەتی ئالی سعوود هیوابڕ بووبوو بەڵام تەنیا ئەوکاتە ئامادە بوو وڵاتەکەی بەجێ بهێڵێ کە ئاگاداری ئەوە بوو حکوومەت ئەیەوێ دەستگیر و موحاکەمەی بکات. کاتێك ئەیەویست بۆ دووهەم جار بگەڕێتەوە وڵاتەکەی، داواکەی ڕەت کرایەوەو تەنانەت هەڕەشەی ئەوەیشی هاتە سەر کە ئەگەر بگەڕێتەوە تووشی موحاکەمەو لێپرسینەوە دەبێتەوە، بۆیە پاش بە تەواوی وازی لە گەڕانەوە بۆ وڵاتی سعوودییە هێنا.

**ئایا پێدەچێ دەستێوەردانی ئامریکا لە شەڕی ناوخۆیی سۆماڵ لە ١٩٩١دا کارتێکردنی لەسەر تێڕوانینی ئۆسامە بوو بێ و ئایا ئەتوانین ئەمە بە سەرەتای ڕووبەڕووبوونەوەی جیدی ئۆسامەو ئامریکا دوای کۆچکردنی بۆ سوودان دابنێین؟**

به ڕای من شەڕی ساڵی١٩٩١ی کەنداو کە تیایدا کوێت لە سەدام سنرایەوە، بەهانەیەك بوو بۆ هەڵمژینی بەرهەم و ژێرخانە ئابوورییەکانی وڵاتە ئیسلامییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. بۆیە ئەگەر جەمسەرێکی بە عێراق و عەرەبستانی خواردبێت ئەوا جەمسەرەکانی تری وڵاتانی تری لەخۆ گرتووە. وەك پێشتر باسم کرد یەك لەو جەمسەرانە یارمەتیدانی تاڵەبان بوو لە ڕێگای پاکستانەوە چ وەك دەوڵەت و چ وەك جوگرافیاو بێگومان ئەم یارمەتییە مەبەستی تایبەتی خۆی لە پشتەوە بوو، جەمسەرێکی تریش بریتی بوو لە شکستدانی (جبهة الانقاذ)ی جەزایر بە هەموو لایەنە ئیسلامییەکانیەوە کە سەرەتا لە ڕێگای دەستێوەردانی دەنگدان و پاشان لە ڕێگای دانیشتنی سیاسییەوە موسوڵمانانیان شکست داو هەمووی ئەمانەش هاوکات بوو لەگەڵ داگیرکرانی وڵاتە هەژارەکەی سۆماڵ لە لایەن ئەمریکاوە. بۆیە شێخ ئۆسامەیش لێدانی قۆنسوولخانە ئەمریکییەکانی لە وڵاتە جیاجیاکانی دونیای ئیسلام کردە هێمای هێرشکردنە سەر ئەمریکاو بە تەقاندنەوەی سەفارەتەکانی ئەمریکا لە کنیاو تانزانیا –ساڵی ١٩٩٨– هێرش و هەڕەشەکانی خۆی گەیاندە لووتکە. ئیتر ئا لێرەوە ئەمریکا کەوتە شەڕی تاکە کەسێکەوە بە ناوی ئۆسامە بن لادەن و دەنگۆی مەترسیداربوونی ئەو پیاوەی بۆسەر مرۆڤایەتی بە دونیادا بڵاو کردەوە. هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا لە لایەك هەوڵی تیرۆرکردنی ئۆسامەیان داو لە لایەکی تریشەوە گوشاریان خستە سەر دەوڵەتی سوودان تاکوو دەری بکات. بۆیە گەیشتە ئەو قەناعەتە کە پێویستە سوودان بەجێ بهێڵێت و بگەڕێتەوە ئەفغانستان و ئەو وڵاتە بکاتەوە بە خاڵی دەستپێکردنی دژایەتی ئاشکراو ڕیشەیی ئەهلی ئیسلام لەگەڵ ڕۆژئاواییەکان.

**وەك بیرهێنانەوەو کۆکردنەوە دەبێ بڵێین بن لادەن دوای ئەوەی لە شەڕی کەنداودا وەك نەیارێکی دەوڵەتی عەرەبستان کەوتە ژێر زەخت و گوشارەوەو تەنانەت دەست گیرا بەسەر بەشێك لە ماڵ و موڵکیدا، بە ناچار بەرەو وڵاتی سوودان هەڵات و لەوێوە سەرپەرشتی چەند چالاکییەکی دژ بە ئامریکای کرد. بۆ وێنە تەقاندنەوەی بارەگای نیزامیی ئامریکاییەکان لە زەهرانی عەرەبستان یان داخستنی کۆپتەرێکی ئەمریکی لە سۆماڵ و ڕاکێشانی تەرمی فڕۆکەوانەکان بە مۆگادیشۆداو هەروەها هێرشکردنە سەر ناوی فڕۆکە هەڵگری ئیس ئیس کۆڵ لە کەنداوی عەدەن. بن لادەن هەر لەو کاتەوە جیهادێکی کردەوەیی لە سوودانەوە دژ بە ئامریکا ڕاگەیاند و دوابەدوای بۆردمانکردنەکەی سوودان لە لایەن ئامریکاوە، ناچار بوو ئەو وڵاتە بەجێ بێڵێ و بگەڕێتەوە بۆ ئەفغانستان کە ئەمە هاوکات بوو لەگەڵ سەرکەوتنە یەك لە دوای یەکەکانی تاڵەبان لە شەڕە ناوخۆییەکانی ئەفغانستاندا.**

**لەم قۆناغەوە دیاردەیەکی تازەو کەم وێنە لە نێو موجاهیدینی موسوڵماندا پەیدا بوو کە هەمان چالاکیی خۆبەختکارانە یان بە واتا ئیسلامییەکەی چالاکیی (استشهادی)یە. بەڵام هەندێ زاناو بیرمەندی ئیسلامی ئەم جۆرە کارانە بە حەرام ئەزانن و بەڵگەشیان ئەوەیە کە لە ئیسلامدا خۆکوشتن لە هەموو شێوازێکدا قەدەغە کراوە. کەچی سەرەڕای هەموو ئەو کاردانەوانەو وێڕای کەڵکوەرگرتنی نەیاران بە تایبەت ڕۆژئاواییەکان لەم مەسەلەیە بە ئاراستەی ناشیرینکردنی سیمای بزاڤی ئیسلامی و پێناسەکردنی وەك تیرۆریزمێکی پەتی و ڕادیکاڵ، ڕێکخراوی ئەلقاعیدەو هەموو ڕێکخراوە ئیسلامییەکانی سەر بە ئەلقاعیدە هەر سوورن لەسەر درێژەپێدانی چالاکیی خۆبەختکەرانە. ئەوان بۆ ئەم هەموو پێداگربوونە چ هۆکارێکی ئایینی و شەرعییان بە دەستەوەیەو بە گشتیی بۆچی ئەوەندە لەسەر درێژەپێدانی سوور و جیدین؟**

شەڕی دونیای کۆن بە شمشێر و ڕم و قەڵغان دەکراو چەکی قورسیشیان مەنجەنیق بوو کە بە عەڕادە بەردیان هاوێشتۆتە ناودەستەی دوژمن و بە مەنجەنیقیش ئاگریان فڕێ داوەتە ناویان. لەو سەردەمەشدا دیاردەی خۆبەختکردن هەبووەو (إنغماس)ی پێ وتراوە کە بە واتای نقومبوونە لەناو ریزی دوژمنداو شەڕکردن تا کاتی کوژران یاخود مردن، ئەم دیاردەیە چەندجار لە سەردەمی پێغەمبەر (سلاوی خوای لێ بێ) و خولەفای راشیدیندا دووبارە بۆتەوە. بە واتایەکی سادەتر خۆبەختکردن لەناو جەنگدا باو بووەو لە دەقی فەرموودەیشدا نە تەنیا نەهی نەکراوە بەڵکوو لە جێی خۆیدا موسوڵمانانیشی بۆ هان دراوەو مژدەی بەهەشتی لەسەر وەرگیراوەو ئەو فەرموودانە لە ریزی فەرمووده سەحیحەکاندان.
گۆڕدرانی جۆری خۆبەختکردن لە جەنگی نوێدا بۆ شێوازی خۆ تەقاندنەوە، بۆتە جێگای مشتومڕی شارەزایانی بواری فتواو زانایانی هاوچەرخ. لە شەڕی شەش رۆژەی نێوان وڵاتانی عەرەب و ئیسرائیلدا هەر کەس شتێکی لە دین بزانیایە چ زانا بوایە چ نیمچە زانا، ئەیوت: «هەر شتێك كاریگەری لەسەر شکستدانی ئیسرائیل هەبێ حەڵاڵ و ئازادە». تەنانەت ئەگەر کەمێکیش نەك فەرز و سوننەت بەڵکوو حەڵاڵ بوایە کاری جیدییان بۆ ئەکرد و لە سەریان ئەنووسی و بەڵگەی شەرعییان بۆ ئەدۆزییەوە. ئەم بابەتە لەو کاتەوە زیاتر پەرەی سەند و وەك زەروورەتی لێهات کە موسوڵمانان لە فەڵەستینی داگیرکراودا بواری هەموو جۆرە ڕووبەڕووبوونەوەیەکیان لێ زەوت کرا، ئەوان نە شەڕی بەرەیی و بەرانبەریان پێ دەکراو نە ئەیانتوانی شەڕی پارتیزانیش بکەن. لەم قۆناغەدا هیچ کەس چالاکیی خۆبەختکارانەی بە حەرام نەدەزانی و بە پێچەوانەوە هەموو زاناو بیرمەندانی ئیسلامی و تەنانەت سەرکردەی وڵاتە عەرەبییەکان و کەناڵە بە حیساب ئیسلامییەکان بە شانازییەوە بانگەشەیان بۆ دەکرد و هیچ گومان و دڵەڕاوکێیەکیان لە ناشەرعیبوونیدا نەبوو. کۆنترین کتێبێك لەمبارەوە دیتبێتم کتێبێکە بە ناوی (العملیات الاستشهادیە فی المیزان الفقهی) کە دوو گەنجی نووسەر ئامادەیان کردووە. لەو کتێبەدا لە بەشی زانا هاوچەرخەکاندا باسی فتواکانی قەرزاوی و ئەلبانی کراوە. قەرزاوی لە گۆشەنیگایەکی رەهاوەو بەبێ چەند و چوون هەم کاری خۆبەختکارانە بە ئازاد و رەوا دەزانێ و هەم هانی موسوڵمانان ئەدا بۆ ئەنجامدانی ئەم جۆرە کارە دژ بە جوولەکە. بەڵام ئەلبانی چەند هەلومەرجێکی بۆ لەبەرچاو گرتووەو ئینجا رێی پێ داوە کە وردەکارییەکانیم بیر نەماوە. نامیلکەیەکی سێزدە بەشیش بە ناوی (ألفتاوی العنیة فی ألعملیات الأستشهادیە)م بینیوە کە تیایدا پرسیاری رەوابوون یان ناڕەوابوونی چالاکیی (استشهادی) لە یازدە زانای موسوڵمان کراوە، جگە لە دانەیەکیان ئەوانی تر بە ڕەواو تەنانەت بە پێویستی ئەزانن. شێخ (عثیمین) ئەو کەسەیە کە فتوای ناشەرعیبوونی دەربارەوە ئەدات چونکوو بەکاری خۆکوژیی پێناسە ئەکات و لەو باوەڕەدایە لە ئیسلامدا خۆکوشتن بە تەواوی حەرام کراوە. هەروەها لەمبارەیەوە کتێب و نامیلکەی تریش نووسراوە کە هەندێکیان بریتین لە:
–جواز العملیات الاستشهادیە، تالیف محمود ابن ابی حاتم
–الجهاد السیاسة الشرعیە فی السیاسة الشرعیە، نووسینی (محمد خیر هیکل) کە بابەتێکی بۆ تەرخان کردووە بە ناونیشانی (العملیات الانتحاریە أو الاستشهادیە)و تیایدا هەموو مەرجە پێویستەکانی بۆ ئەم جۆرە چالاکییە دەسنیشان کردووە.
ئەگەر هەندێ جاریش لە رووی شەرعییەوەو لە مەسەلەی فتوای ئەم جۆرە چالاکییانەدا ئێمەی موسوڵمان تووشی تێکەیشتنێکی هەڵە بووین، پێویستە ئەو کات و شوێن و هەلومەرجەی فتوای تیا دەرئەکرێت لەبەرچاو بگرین و ئاگاداری ئەو واقیعەش بین کە موفتییەکە فتوای تیا دەرکردووە. بۆ نموونە لە سەردەمی شەڕی ئێران و عێراقدا کەسێکی وەك شێخ ئەلبانی سەدام حسەینی بە سوارچاکی بەرگریکردن لە عەرەب و ئیسلام لە بەرانبەر دەسەڵاتی شیعەی رافزیدا ناو دەبرد چونکوو ئەو و زۆر کەسی تر لەو باوەڕەدابوون کە سەدام ئەتوانێ رەمزی دژایەتیکردن و ترساندنی ئیسرائیل و یەهوود لە فەڵەستیندا بێ. بەڵام دوای داگیرکرانی کوێت لە لایەن سەدامەوە دەرکەوت ئەو هەموو

پیاهەڵدان و هیوا پێبوونە بە فیرۆ چووەو ئەو قاعیدە بەفرینە لەباتی بەرگری لە عەرەب و موسوڵمانان کەوتۆتە تاڵانکردن و کوشت و بڕی ئەوان و لەبری ترساندنی یەهوود ترسی لە دڵی عەرەبە دراوسێکانیدا وەك کوێت، سعوودیەو ئەردەن و سووریاو.....هتد دروست کردووە. بۆیە ئەلبانی یەکێك لەو کەسانە بوو لە هەڵوێستە پێشووەکانی پاشگەز بۆوەو کەوتە سەرزەنشتی سەدام و ئەمجارەیان ئەوی بە کافر و بێ دین ناو برد، هەروەها ئەو دەربارەی حزبی بەعسیش وتی: «ئەم حزبە حزبێکی ئیشتراکییەو دوورە لە رێرەوی راستەقینەی ئیسلام و میشل عەفلەق درووستی کردووەو..... هتد». هەر کەسێکی بە ئینساف ئەم دوو هەڵوێستەی شێخ ئەلبانی بە یەکەوە بەراورد بکات بێگومان پرسیارێکی گەورەی لا دروست ئەبێ و ئەڵێ مەگەر ئەم بەعسە هەمان بەعسەکەی پێشوو نییە کاتێ لەگەڵ ئێران و هاووڵاتیانی کورد و شیعەی خۆیدا شەڕی دەکرد سوارچاکی ئیسلامەتی بوو بەڵام کاتێ پەلاماری کوێتی داو بوو بە هەڕەشە بۆسەر وڵاتانی تری عەرەبی، ئیتر سیفەتی کافر و بێ دینی پێ درا؟ بۆیە نەدەبوو موفتیەکی گەورەی وەکوو ئەلبانی هەر لە سەرەتاوە سەدامی بە پاڵەوانی عەرەب و ئیسلام بزانیبایەو پاشان لە هەلومەرج و قۆناغێکی تردا لەم هەڵوێستەی خۆی پاشگەز بووایەتەوە. هەر ئەمەش وایکردووە کە مرۆڤی موسوڵمان هەندێ جار نەتوانێت متمانە بەم جۆرە موفتییانەو بەم جۆرە فتوایانە بکات. بۆیە ئەڵێم پێویستە لە مستەوای موفتییەکەو ئەو واقیعەی تیایدا ژیاوە ئاگادار بین و لەخۆڕا فتوایەك قبووڵ نەکەین یا رەتی نەکەینەوە.

واقیعی لە دایکبوونی هەندێ لەو فتوایانە خۆیان وەڵامی خۆیان ئەدەنەوە بۆ نموونە ئەگەر بەراوردێکی دەوڵەتی چوار خەلیفەکە لەگەڵ دەوڵەتە بەناو ئیسلامییەکانی ئێستادا بکەین تێدەگەین ئاسمان و زەوی لە یەك دوورن کەچی موفتییەکانمان سەرانی ئەو حکوومەتانە وەك خەلیفەو ئیمام بە خەڵك ئەناسێنن و هەرجۆرە یاخیبوونێك لە بەرانبەر ئەواندا بە حەرام و کوفر لە قەڵەم ئەدەن. ئەمە لە حاڵێکدایە کە هەرچی دەوڵەتێکی کافر بیکات ئەمانیش دەقاودەق ئەیکەن و دوویاتی دەکەنەوە. ئا لێرەدایە موسوڵمانان بە تایبەت گەنجەکان ئەکەونە ناو مشتومڕێکی پڕ لە دژایەتییەوەو دواجاریش ئەکەونە ژێر کاریگەریی ئەو فتواو هاندانەی بە مەبەستی فیداکاریکردن لەپێناو دینی ئیسلامدا دەردەکرێت.

موسوڵمانان کاتێك بۆ فیداکاری بانگهێشت دەکرێن و مژدەی بەهەشتیان پێ ئەدرێت، ئەگەر بە (نیکایە)وە خەریك بن واتە زەبری لەناکاو و کوشندە لە دوژمن بدەن یان بە گشتی بەکاری جیهادەوە خەریك بن، ئەوا لە باتی سەرشۆڕی دونیایی ژیانی ئەبەدی و ئەبڕاوەی ئەودونیاو بەهەشت و مژدەکانی تری خوای گەورە بۆخۆیان هەڵەبژێرن. جا ئەگەر هەمان ئەو موفتییەی کە یەکەم جار دەربارەی چالاکیی خۆبەختکارانە فتوای دەرکردە لە هەڵوێستەکەی خۆی پاشگەز بێتەوە و بە حەرامی بزانێت خەڵکی ئەمەی لێ قبووڵ ناکەن چونکوو وای لێ تێدەگەن کە کارەکە خۆی لە خۆیدا جایز و رەوایە بەڵام کەسی فتوادەر لەژێر کاریگەری هەندێ شتی دونیاییدا لێی پاشگەز بۆتەوەو فتوای حەرامبوونی دەرکردووە. یاخود رەوڕەوەی بەرەوپێشچوون و گۆڕانکارییەکانی دونیای سەردەم کاری تێکردووەو هێناویەتییە سەر ئەو باوەڕە بڕیاری حەرامبوونی فتواکەی خۆی دەربکا.

گریمان – وەك جیهادییەکان ئەڵێن– یەك لە ئامانجەکانی چالاکیی خۆبەختکارانە ترس خستنە دڵی دوژمن بێت، ئەمە بۆ کاتێکە کە بە چەکەوە هەڵکوتێتە سەر بارەگایەکی دوژمنان و بە فیداکاری و رۆحی خۆبەختکارانەوە لێیان بکوژێت و دواجار خۆیشت بکوژرێ یان رزگار بێت. بەڵام لەم خۆتەقاندنەوە تازانەدا ئاوا مەرجێك نایەتە دی، کەسی خۆبەختکار پشتێنێکی پڕ لە تەقەمەنی ئەبەستێتە پشتی و لە ناکاو لە شوێنێکدا خۆی ئەتەقێنێتەوەو هیچی تر. کەوابوو لە راستیدا هیچ ترسێك ناخاتە دڵی دوژمنانەوە. لە لایەکی ترەوە ئەم جۆرە چالاکییانە بە شێوەی (شەلم کوێرم ناپارێزم) بەڕێوە ئەچن و وەك لە سەدان نموونەدا دیومانە گەڵێ مرۆڤی بێتاوان و ئاساییش بوونەتە قوربانی یاخود زیانێکی

**گەورە بەر کەرەستەو سامانە گشتییەکان کەوتووە. ئەی چ پاساو و وەڵامێك هەیە بۆ کوشتنی خەڵکانی بێتاوان و وێرانکردنی سەروەت و سامانە جەماوەرییەکان؟**
**دەنگۆیەکی تریش هەیە کە لەم ساڵانەی دواییدا ئاژەڵ و گیانلەبەری وەك سەگ و پەز و کەر یان مرۆڤی ئەقڵ سووك و شێت بۆمبڕێژ دەکرێن و لە شوێنی دیاریکراودا ئەتەقێنرێنەوە. ئایا جەنابت ئەم هەواڵانە پشتڕاست ئەکەیتەوەو ئەگەر رووی داوە کامە ئیجازەو بەڵگەی شەرعی ئیجازەی ئاوا کارێك ئەدات؟ بە گشتی پێت وانییە ئەریتی خۆتەقاندنەوە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا کە بەردەوام باسی رەحمەت و جوامێری دەکا یەك ناگرێتەوە؟**

من لەگەڵ ئەوەدا نیم کە ئەم جۆرە چالاکییانە ترس ناخاتە دڵی دوژمنەوە، بە پێچەوانەوە لە سەر ئەو باوەڕەم زیاترین رێژەی ترس بەرهەم دەهێنێ، چونکوو دوژمن هەموو سات و کاتێك هەست بە نائارامی و نەبوونی ئاسایش ئەکات و ئەڵێت ئێستە نا کەمێکی تر لەوانەیە یەکێك بێت و خۆیم پیا بتەقێنێتەوە. هەموو گیانلەبەر و خاوەن رۆحێك گیانی خۆی لا خۆشەویستەو نایەوێ بمرێ، دیارە ترسی بەردەوام لە مردن کە چالاکیی خۆبەختکارانە بەرهەمی دەهێنێ، یەکێکە لە گەورەترین ترسەکان. هەروەها لەسەر ئەو قەناعەتە نیم هەموو چالاکییە (استشهادی)یەکان بە شێوەی (شەلم کوێرم ناپارێزم) بەڕێوە ئەچێ، بەڵام منیش وەك ئێوەو زیاتر لە ئێوەش ناڕازیم بەو شێوازە کوێرانەیەو بە هەموو قەناعەتەوە ئەڵێم مەرجی سەرەکی چالاکیی (استشهادی) ئەوەیە کە بەر لە ئەنجامدانی کارەکە بزانرێت بەرانبەر بە کێ و بە چی ئەنجام ئەدرێت و بە هیچ جۆری نابێ مرۆڤی بێتاوان قوربانی بکرێت. لە سەردەمی پێغەمبەری ئیسلامدا خالیدی کوڕی وەلید (خوای لێ رازی بێ) تووشی هەڵەیەکی هونەری گەورە بوو، هەڵەکەش بەم جۆرە بوو کە قەومێکی بێتاوان بە مەبەستی خۆتەسلیمکردن بەرەو لەشکری ئیسلام دەهاتن بەڵام لە کاتی هاتنیاندا لەباتی وشەی (اسلمنا) وشەی (صبئنا)یان دەوتەوە کە وشەیەکی کۆنەو بەر لە هاتنی ئیسلام ئەگەر (صابئی)یەکان هێرشیان بکردایەتە سەر شوێنێك، خەڵکی ئەو شوێنە بۆ تەسلیمبوون بەکاریان ئەهێناو بەمانای ئەوەیە کە بوویتە سابئی. بەڵام خالیدی کوڕی وەلید بە هەڵە تێگەیبوو و وای ئەزانی ئەوان بە هاوار و نەعرەتەوە پەلاماری لەشکری ئیسلام ئەدەن، بۆیە فەرمانی لێدان و کوشتنیانی دەرکرد. ئەم کارەی خالید ناڕەزایەتی توندی پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێ بێ) و هاوەڵانی لێکەوتەوە. بۆیە منیش لێرەدا وەك سوزدەربڕینێك بۆ رێڕەوێکی پێغەمبەری ئیسلام دژایەتی خۆم بۆ هەرجۆرە کار و کردەوەیەك دەرئەبڕم کە تیایدا خەڵکی بێتاون و سامان گشتییەکان بکرێنە ئامانج و زەرەرمەند بن.
بە نیسبەت بۆمبڕێژکردنی ئاژەڵ و مرۆڤی ئەقڵ سووکیشەوە ئەمە بە پیلانێکی میدیایی دوژمنانی ئیسلام دەزانم کە بە مەبەستی ناشیرینکردنی موجاهیدین و موسوڵمانان بڵاو ئەکرێتەوەو تەنانەت وەك گریمانەیش شتی واو هەواڵی وام قبووڵ نییەو رەتی ئەکەمەوە. ئەوەی بیستوومەو رەنگە کەمێك پێوەندیی بە پرسیارەکەی ئێوەوە بێت ئەوەیە کە تەنیا یەك جار لە مووسڵ بزنێکی مرداروبوویان تەقاندبۆوە بە سەیارەیەکی ئەمریکاییدا. ئەڵبەت ئەگەر وەك ئەبوو موحەممەدی مەقدەسی (زۆر رۆچوون) لە کاری تەقینەوەداو بە کارهێنانی ئەم شێوازە رەت بکەمەوە بەو مانایە نییە کە ئەو ئەریتە بە پێچەوانەی جوانمێری و شەریعەتی بەڕەحمی ئیسلام دەزانم. بیرمان نەچێ چەندەها زاناو عالمی ئیسلامی کە من لە هیچ شتێکدا بە تۆزی پێیان ناگەم، بە چەندین جۆر و شێواز وەسفی چالاکیی (استشهادی)یان کردووەو بە کارێکی رەواو ئیسلامییان لە قەڵەم داوەو من ناتوانم رەتی بۆچوونی ئەوان بدەمەوەو هەر لە ئەساسیشدا مەبەستم رەتکردنەوەی نییەو زۆریش بە پێویست و گونجاوی ئەزانم بەڵام بەو تێبینییەوە کە باش ئامانج بپێکیت و زۆرترین زەرەر و زیان بە دوژمن بگەیەنی نەك خەڵکی بێ تاوان بکاتە ئامانج. لە راستیدا موسوڵمانان لە زۆر کات و شوێندا ناچارن بە شێوەی خوبەختکارانە لە دوژمن بدەن و پێش بە ملهوڕی و زوڵم و زۆری ئەو بگرن.

بن لادەن دوای گەڕانەوە بۆ ئەفغانستان جیهادێکی هەمەلایەنەی دژی ڕۆژئاواییەکان و لە سەرووی هەموویانەوە ئامریکا ڕاگەیاند و داوای لە موسوڵمانان کرد بۆ ئەم مەبەستە ڕوو لە ئەفغانستان بکەن و لە کامپ و بارەگاکانی ئەلقاعیدەو تاڵەباندا -کە ببوونە هاوپەیمانی یەکتر- بەشداری لە فێرکاری و ڕاهێنانە نیزامی و عەقیدەتییەکاندا بکەن. گەورەترین چالاکیی ئەم قۆناغە هەمان چالاکییە بەناوبانگەکەی کێنیاو تانزانیاو تەقاندنەوەی سەفارەتخانەکانی ئامریکا لەو وڵاتانەدا بوو کە بوو بە هۆی مووشەکبارانی بەرکورتی ئەفغانستان. لەم قۆناغەدا ئەلقاعیدە و ڕەوتی ئیسلامی جیهادی هەموو هەوڵەکانیان بە ئاراستەی لێدانی بەرژەوەندییەکانی وڵاتانی ڕۆژئاوادا -کە بە بەرەی کوفریان ناوزەد کردبوون- خستبووە گەڕ. هەربۆیە ئەلقاعیدە کەوتە پەرەپێدانی ڕووبەری جیهاد و لە هەموو وڵاتانی ئیسلامیدا ڕێکخراوی گەورەو بچووکی جیهادیی دروست کرد. بە کورتی ئەو ڕێکخراوانە ناویان چی بوو و لە کام وڵاتدا پێك هاتن و چ ستراتیژێکیان گرتبووە بەر؟

وادەزانم ئەلقاعیدەو تاڵەبان لە والابوونەوەی جیهاد و بەربڵاوکردنەوەی ساحەی جیهادکردندا بزوێنەری سەرەکی نەبوون بەڵکوو بزوێنەری ڕاستەقینە بریتی بوو لەو هەلومەرجەی بەسەر موسوڵماناندا سەپێنرابوو. ئەوان واتە ئەلقاعیدەو تاڵەبان و بزووتنەوەی جیهادیی بە گشتی دژکردەوەیەك بوون نیسبەت بەم هەلوومەرجە نالەبار و داسەپاوە. لە گۆشە جیاجیاکانی دونیادا موسوڵمانان سنووردار کرابوون، یاساو ڕێساکانی ئازادیی بیروڕادەربڕین بۆ ئەوان بە ڕەوا نەئەزانرا، لە زۆربەی لایەنەکانی ژیاندا ئیجازەی جێبەجێکردنی حوکمە پیرۆزەکانی ئیسلامیان پێ نەئەدراو.....هتد. لە حاڵێکدا دونیای تازە بە ڕواڵەت بە قۆناغی ئازادیی بیروباوەڕ و ڕەچاوکردنی ماڧ مرۆڤدا تێ دەپەڕی بەڵام موسوڵمانان لە هەموو ئەم شتانە بێبەش کرابوون کە نموونەی ئەمەش نێجگار زۆرەو ئەمانەی خوارەوە چەند دانەیەکیانن:

-لە هەڵبژاردنەکانی ئەلجەزایەردا -سەرەتای نەوەدەکان- لە سەدا هەشتاوپێنجی دەنگدەران دەنگیان بە ئیسلامییەکان دا بەڵام بە هیچ جۆرێ نەیانهێشت حکوومەتێکی تەنانەت نیمچە ئیسلامییش دابمەزرێنن، بۆیە ئەوانیش بە مەبەستی بەرگریکردن لە خۆیان و بیروباوەڕەکەیان دەستیان دایە چەك و جیهادکردن.

-ئەگەر لە میسردا هەڵبژاردنی ئازاد بەڕێوە بچوایە بێگومان هەمیشە زۆرینەی دەنگی جەماوەر بەلای ئیخوانولموسلیمین و موسوڵماناندا ئەشکایەوە بەڵام حکوومەتی حوسنی موبارەکی نا موبارەك کە لە ئەنوەر ساداتیش ملهوڕتر و ملۆزمتر بوو، بە هیچ شێوەیەك ئیجازەی بەڕێوەچوونی ئازادانەی هەڵبژاردنی نەئەدا. هەروەها جگە لەوەو بە درێژایی ساڵانی دەسەڵاتداریی موبارەك زیندانەکەی (القلعە) هیچکات کەمتر لە پێنج هەزار موسوڵمانی تیانەبوو.

-لە تورکیا نەجمەدین ئەربەکان و حزبی ڕیفاهی ئیسلامی لە ڕێی دەنگدان و بە شێوەی یاسایی هاتنەسەر حوکم بەڵام هەر کە زانییان یەك تۆز بەلای بنەما ئیسلامییەکاندا مەیلیان هەیەو ئەیانەوێ کاری پێ بکەن، یەکسەر کودیتایان لێ کردن. خودی نەجمەدین ئەربەکانیان گرت و ناوی حزبەکەشیان پێ کردە (حیزبی فەزیلەت) و پاشگری ئیسلامیشیان لێ سڕییەوە. دواتر و بە هەزار حاڵ ئیخوانەکان لە ڕێگای ئەردووغانەوەو پاش پێکهێنانی ئاڵوگۆڕ لە خۆیاندا؛ سەرەداوێکی دەسەلاتیان کەوتە دەست ئەویش بەو مەرجەی مەسعوود یەڵماز و عیلمانییەکان پارێزەری یاسای بنچینەیی وڵات بن و بەوپەڕی دڵسۆزییەوە ئەرکەکانیان ڕاپەڕێنن. ئەڵبەت دواتر بە بەهێزتربوونی ئیخوانەکان و پشتگیری جەماوەر ئەوان توانییان دەسەڵاتی خۆیان بەرفراوانتر بکەن و ئەو تابۆیانە بشکێنن کە ساڵەهای ساڵ بوو گەلی تورکیا بەدەستیانەوە دەیناڵاند.

-لە بۆسنەو هێرزەگۆڤیندا مێژوویەکی نوێی کۆمەڵکوژی و کوشتنی موسوڵمانان تۆمار کرا. خەڵکی ئەم وڵاتە سەرباری هەموو زانستخوازی و تەبابوونیان لەگەڵ شارستانییەتی نوێدا، لەبەر پابەندبوونیان بە بیروباوەڕی ئیسلامییەوە، لە

لایەن (سرب)ە رەگەزپەرەستەکان و هەموو ولآتانی رۆژئاواوە سەرکوت کران و جیهادەکەیان کە بە سەرکردایەتی عەلی عیزەت بێگۆڤیچ بەرپایان کردبوو کپ کرایەوە.

–لە ئەلبانیایش موسولْمانان بە جۆرێك کپ کرانەوەو ملکەچی یاساو شارستانییەتی رۆژئاوا کران کە تەنانەت بیستنی ناویشیان بۆ موسولْمانانی دونیا بۆتە شتێکی سەیر و سەمەر.

–لە سوودان حەسەن تورابی و عومەر حەسەنەلبەشیر بەو هەموو خۆگونجاندنەیانەوە لەگەلْ دونیای تازەدا، هێشتا لە لایەن رۆژئاواییەکانەوە گەمارۆیان دەخرێتە سەر و سزای جۆراوجۆریان بۆ دیاری دەکراو بڕیاری گرتنیان ئەدرا.

ئەمانەو دەیان و سەدان نموونەی تری ئاوەها ئەو هۆکارانە بوون کە بوونە هۆی برەوسەندنی بیرۆکەی جیهادی کردەوەیی لە دوایین سالآنی سەدەی بیستەم و سەرەتای هەزارەی سێهەمدا کە لە دەسپێکیداو دوابەدوای لێدانی پێنتاگۆن و بینای بازرگانیی جیهانی بە دەستی تالْەبان و ئەلقاعیدە، رۆژئاوا بیانوویەکی تری دۆزییەوەو ئەمەی کردە هێمای نوێترین قۆناغی کوشت و بڕو شەڕفرۆشتن بە موسولْمانان. هەرچەند زۆرێك لە بیرمەندان و پسپۆڕان ئۆسامەو ئەلقاعیدە بە هۆکاری بەربلآوبوونەوەی رووبەری جیهاد دەزانن بەلآم من هۆکارەکەی ئەگەڕێنمەوە بۆ ئەو شتانەی کە بە کورتی باسم کردن.

**هەرچەند دوابەشی پرسیارەکە بێ وەلآم مایەوەو ناو و ستراتیژی رێکخراوە فراوانەکانی سەر بە ئەلقاعیدەمان بۆ ئاشکرا نەکرا، لەبەر دۆخی بەندیخانەو نەبوونی سەرچاوەی پێویست واز لەو بەشە دێنین و دەچینە سەر گرنگترین قۆناغ و رووداوی مێژووی جیهادیی هاوچەرخ و بە تایبەت جیهادی ئەلقاعیدە واتە ١١ی سپتامبری ٢٠٠١. ئەم رووداوە لە چەندین لایەنەوە جێگەی سەرنج و تێڕامانەو سەرەڕای تێپەڕبوونی دەسالْ هێشتا هەر لێکۆلْینەوەی لەسەر ئەکرێ و کۆن نەکەوتووە.**

**ئۆسامە بن لادن ئەیوت ئەگەر بتوانین ئەم زنجیرە چالاکییە ئەنجام بدەین، توانیومانە زەبرێکی گەورە لە ئامریکا بدەین. ئەگەر ئامریکاش بیهەوێ دژکردەوەیەك بنوێنێ ئەوپەڕی وەك چۆن دوای تەقاندنەوەی سەفارەتخانەکانی لە کێنیاو تانزانیا چەند مووشەکێکی نابە ئەفغانستانەوە ئەمجارە چەند مووشەکێ زیاترمان پێوە دەنێ و ئەمەش هیچ زەبرێکی جیدیمان لێ نادات واتە قەت لە سەر ئەو قەناعەتە نەبوو ئامریکا هێرشێکی سەربازیی هەمەلایەنە بکاتە سەریان و دەولْەتی تالْەبان بڕووخێنێ. هەر ئەوکات ئەبوو حەفسی میسری کە بە کەسی سێهەمی ئەلقاعیدە ئەهاتە ئەژمار، دژ بەو پێشنیارە وەستابوو و لێکدانەوەکەی بن لادەنی رەت کردبۆوەو رایگەیاندبوو کە دژکردەوەی ئامریکا زۆر قورس دەبێ و نابێ چالاکییەك ئەنجام بدەین کە زیانی لە سوودی زیاتر بێت. بەلآم بن لادن چونکوو ئامریکاییەکانی بە ترسنۆك دەزانی هەر لە سەر بۆچوونەکەی خۆی پێی داگرتبوو و سەرەنجامیش چالاکییەکە گەیشتە ئەنجام و وەك دەزانین و دیتوومانە ئۆسامە لە هەلْەدا بوو و لێکدانەوەکەی ئەبوو حەفس دروست دەرچوو. ئایا یازدەی سێپتامبر بەوە دەژیا تەنیا حکوومەتی ئیسلامیی دامەزراو لەسەر ئەندێشەکانی تالْەبان بڕووخێ و ئەو هەموو هێزە نیزامییەی ئامریکاو ناتۆ و هاوپەیمانەکانیان لە ولآتانی ئیسلامیدا جێگیر بن و ئەو ژمارە زۆرە لە موسولْمانان بکوژرێن؟**

**دوابەدوای ١١ی سێپتامبر نەخشەی سیاسیی رۆژهەلآتی ناوەڕاست بە تایبەت ولآتانی ئیسلامی گۆڕانێکی زۆری بەسەردا هاتووە، حکوومەتی تالْەبان رووخاوە زۆربەی هەرەزۆری بنکەو بارەگاکانی تالْەبان و ئەلقاعیدە لە ئەفغانستان و پاکستاندا بۆتە ئامانجی هێرشی هێزە رۆژئاواییەکان. بە گشتی ١١ی سێپتامبر بە قازانجی بزووتنەوەی ئیسلامی جیهادی نەشکایەوەو ئامریکا سوودێکی زیاتری لێ دیوە. بۆچی ئۆسامەو ئەلقاعیدە تووشی ئەم هەلْەیە بوون؟**

پێش کارەساتی ١١ی سێپتامبر ئەگەر چالاکییەکی خۆتەقاندنەوە لە شوێنێکدا بکرایە تەنیا تا ئەو شوێنە بەدوایدا ئەڕۆیشتن کە بکەر یاخود ئەنجامدەرەکەی بدۆزرایەتەوەو دەستگیر بکرایە بەڵام دوای ئەو کارەساتە وڵاتانی رۆژئاوا ناچار بوون بە دوای هۆکاری بڵاوبوونەوەو هاندەرەکان و زەمینە خۆشکەرەکانیشیدا بگەڕێن و ئینجا دوای هەموویان ئەیانپەرژایە سەر شەخسی بکەرەکە ئەگەر زیندوو بوایە بۆ گرتنی دەستبەکار ئەبوون و ئەگەر زیندووش نەبوایە بەدوای شوناس و هویەتیدا ئەگەڕان. واتە پاش رووداوی ١١ی سێپتامبر یاسایەکی نوێیان بۆ بەرتەسککردنەوەی بواری هەڵسووڕانی موسوڵمانان و بەگژاچوونەوەی ئەهلی ئیسلام داڕشت کە لە هەموو سنووردارکردنەکانی تر توندوتۆڵتر بوو و دانە بە دانەی وڵاتانی ئیسلامی و تاك بە تاکی موسوڵمانانی پێ گیرۆدە بوو. هەندێ کەس ئەڵێن ئوسامە نەیئەزانی کوتانی ئەو فڕۆکانە بە بیناکانی نیویۆرکدا ئەبێتە هۆی رووخانی یەکجارەکیی بیناکان بەڵام من لەوباوەڕەدام شتەکە پێچەوانەی ئەمە بوو چونکوو ئوسامە ئەندازیاری بیناسازییەو باش ئەیزانی بیناکان ئەڕووخێن و ئەو و هاوکارەکانی لەمبارەیەوە حیسابی هەموو شتێکیان کردبوو و تەنانەت ئاگاداری ئەوەش بوون کە ژمارەی کارمەند و بەڕێوەبەرانی ناو ئەو بینایانە چەندەو چەندهەزار کەس دەکوژرێن. ئەم زانیارییە ورد و زانستییانەیەو ئەو گەڵاڵەو داڕشتنە رێکوپێکە بوو کە ئەوەندەی تر دونیای رۆژئاوا بە تایبەت ئەمریکای هورووژاند و لەم رووەشەوە گوشارەکانیان بۆ سەرکوتکردنی موسوڵمانان توندوتر کردەوە.

ئەبوو مەسعەبی سووری کە لە موجاهیدینی ناسراوی ساحەی جیهادی ئەفغانستان بوو و چەندها کتێبی لەسەر جیهادی وڵاتە ئیسلامییەکان نووسیوە، دوو ساڵ پێش رووداوەکەی ١١ی سێپتامبر لە دوو شریتی سەوتیدا باسی ئەوەی کردبوو کە بە بەڵگەوە ئاگادارە هێرشێکی زۆر گەورە ئەکرێتە سەر ئەفغانستان کە پێشبینی دەکەین بە نیسبەت شەڕەکانی چیچان و گرۆزنییەوە زۆر گەورەتر و بەربڵاوتر بێ. بە لە بەرچاوگرتنی جێگەو پێگەی ئەبوو مەسعەبی سووری لە جیهادی موسوڵماناناداو نزیکبوونی لە ئوسامە بن لادەنی رێبەری رێکخراوی قاعیدەوە، ئەم قسەیەی ئەو بە بۆچوونی قیادەی ئەلقاعیدە ئەزانم و ئەمەش ئاماژە بوو بۆ ئەوە کە ئەوان توانیبوویان پێشبینی هێرشی بەربڵاوی ئەمریکا بۆسەر ئەفغانستان بکەن و بەپێی ئەو زانیارییانەی کە بەدەستیان هێنابوو پێشدەستییان کرد و چالاکییەکانی ١١ی سێپتامبریان ئەنجام دا. واتە سەرکردەکانی ئەلقاعیدە کاتێك زانییان لێدانی ئەفغانستان مسۆگەرەو بڕیارە بە زوویی جێبەجێی بکەن، بۆیە پێشدەستییان کردو پێش هێرشەکەی ئەوان ئەو زەبرە کاریگەرەیان لێ وەشاندن. سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله و علیه وسلم) وابووە کە هەرکات زانیبێتی قەومێك خۆی بۆ لێدانی موسوڵمانان ئامادە کردووە، ئەوا پێش ئەوان ئامادەی هێرش بووەو چۆتە سەریان. بۆیە هێرشەکەی ئەلقاعیدەش بۆسەر ئەمریکا بەلای منەوە بەپێی ئەو بەڵگەو سەنەدانە بوو کە بە دەستیان هێنابوو و هێرشێکی دەستپێشخەرانە بوو.

ناشزانم ئەبوو حەفسی مۆریتانی وەك کەسی سێهەمی ئەلقاعیدە هاتۆتە ئەژمار یان ئەبوو حەفسی میسری و باشم لە بیر نییە کامیان لە شەڕەکەی تۆرابۆرادا کوژران. ئەگەر لۆمەو نارەزایەتیش لەناو شوراکانی ئەلقاعیدەوە بیستراببێ بە پێچەوانەی ئەوەی کە ئێوە وتووتانە، بە مەبەستی دژایەتیکردنی پلانەکە نەبووە بەڵکوو ئەوان گلەییان لە شێخ ئوسامە کردووە کە بۆچی کارەکەی ئاوا بە نهێنی ئەنجام داوەو بە نیسبەت ئەنجامدانی کارێکی ئاوەها گەورەوە پرسی بە کەسیان نەکردووە. وەك ئەڵێن لە شوێنێکدا پرسیارێك رووبەڕووی ئەبوو مەسعەبی سووری ئەکرێتەوە کە ئایا راستە کێشەت لەگەڵ ئوسامەدا هەیەو لۆمەت کردووە؟ ئەویش لە وەڵامدا ئەڵێ: (راستە، من رەخنەم لە شێخ ئوسامە هەبوو کە بۆچی راوێژی لەگەڵ نەکردووین بەڵام هۆکاری رەخنەکەم ئەوە نەبوو کە ئێوە باسی دەکەن و گۆیا گەیشتبێتە ئاستی ناکۆکی. بەڵکوو رەخنەکەم بۆ ئەوە بوو کە ئەگەر شێخ ئوسامە راوێژی بە من بکردایە پێشنیارم پێ ئەکرد مادەی کیمیاوی بکاتە ناو تەیارەکانەوە تاکوو کاتی تەقاندنەوەیان رێژەیەکی زیاتر و بەربڵاوتر لە خەڵکی ئەو وڵاتە بکوژرێن و بەمەش باشتر تۆڵەی ئەو هەموو ژن و منداڵانەمان ئەکردەوە کە بە دەستی رۆژئاواییەکان کوژراون). هەروەها شێخ

عەبدولقادر عەبدولعەزیزیش لە بەندیخانەی میسرەوە بە جۆرێکی تر رەخنەی لە ئۆسامەو ئەیمەن زەواهیری گرتووەو بە ئاشکرا وتوویەتی کارەکەیان بە راوێژ و مەشوەرەتی هاوڕێیان و گەرەو بەرپرسانی جیهادی نەکردووەو بێهوودە ئۆممەتەکەیان خستووینەتە ناو گێژاوی دژایەتییەکی گەورەوەو رووبەڕووی ئەو زەختە کوشەندەیەی رۆژئاواییەکانیان کردووینەتەوە. ئەو حەسەن نەسروڵڵای رێبەری حیزبوڵای لوبنان بە نموونە دێنێتەوە کە وەك نوێنەر و گەورە بەرپرسی شیعە لەوپەڕی فیداکاری و جوانمێریدا شەڕی ٣٣ رۆژەی دژی ئیسرائیل بەڕێوە برد بەڵام لە قسەو ئامۆژگارییەکانی گەورە بەرپرسانی شیعەش دەرنەچووەو نەبۆتە هۆی دروستبوونی کێشەو گرفتیش بۆ دەوڵەتی لوبنان و ئەهلی شیعەی ئەم وڵاتە تا رادەیەکی زۆر لە ئارامیدا بەسەر ئەبەن.

قسەی ئەم دوو کەسەو هەڵوێستەکانی ئەوکاتی مەلا عومەری رێبەری تاڵەبان ئاماژە بوو بۆ ئەوە کە زۆربەی بەرپرسانی ئەلقاعیدە ئاگاداری کارەکەو قەبارەکەی و ئەنجامەکانی نەبوون بەڵام دوای ئەنجامدانی کارەکە هەموویان بە ئاکامەکەی رازی بوون و پێکەوە باری پێشهات و رووداوەکانی دوای ئەم چالاکییەیان هەڵگرتووە. بەڵام ئەو رەخنەیە لەسەر ئۆسامە بن لادەن ئەمێنێتەوە کە بێ راوێژکردن لەگەڵ زۆربەی بەرپرسانی قاعیدەو تەنانەت مەلا عومەری ئەمیری تاڵەبانیشدا ئەوکارەی بە ئەنجام گەیاندووە.

من لە سەر ئەو باوەڕە نیم کە ئەمریکا سوودێکی زیاتری لەم رووداوە وەرگرتبێ، جا لەوانەیە بتوانین بڵێین لە ئەنجامی ئەو جەنگە کوشندەیەدا کە دوای ١١ی سێپتامبر هاتە ئاراوە، ئەمریکا زیانێکی کەمتری بەر کەوتووەو لە بەرانبەریشدا موسوڵمانان زیاتر زەرەرمەند بوون نەك ئەوەی هەلومەرجەکە بە گشتی بە سوودی ئەمریکا شکابێتەوە. مەلا عومەر دوای لە دەستدانی کابوڵ و قەندهار، وتی: (ئیتر شتێك نەما کە ئێمە لێی زەرەرمەند بین چونکوو تەنیا وڵاتێکی هەژار و بێخزمەتگوزاریمان لە دەست دەرچووەو ئێستە سەرەتای قۆناغێکی پڕ زیان و خەسارەتە بۆ دوژمنان کە لە رۆژهەڵاتەوە تاکوو رۆژئاوا ئەبنە ئامانجی هێرشەکانی ئێمەو هەرکات و لە هەر کوێیە پێمان خۆش بوو ئەتوانین ببینە هەڕەشە بۆسەر بەرژەوەندییەکانیان و نۆرەی تۆڵە سەندنەوەی ئێمەیە). ئەگەریش زەرەر و زیانەکانی هەردوولا بە یەکەوە بەراورد بکەین بەڕای من هێشتا هەر ئەمریکا زەرەری زیاتری کردووە. راستە رۆڵەکانی ئێمە شەهید بوون و چەندین و چەند جێگەو شوێنی رلزاوەو ئاوەدانمان تێك چووە بەڵام ئەمریکاش هەیمەنەی رامیاریی خۆی لەدەست داوەو پرۆژەی بەرژەوەندییەکانی پووکاوەتەوە. بە گشتی لەسەر ئەو قەناعەتەم ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی سەرباریی ئەو هەموو داگیرکارییە، دۆڕاوی شەڕەکەن و موسوڵمانان تا رادەیەکی زۆر بردوویانەتەوە.

بەڵام لە ئەرزی واقیعدا ئەلقاعیدە لە دوای ١١ی سێپتامبر دۆڕاوی شەڕەکە بووە. جیا لەوانەی پێشتر وتمان لای زۆرێك لە خەڵکی موسوڵمان سیمای ئیسلامی جیهادکار گۆڕدراوە بۆ بزاڤێکی تیرۆریستیی و بێڕەحم کە هیچ سنوورێك بۆ بەدیهێنانی بەرنامەکانی و دەستەبەرکردنی مەبەستەکانی ئاناسێ و لە هەموو شێوەو میتۆدێك کەڵك وەرئەگرێ، تەنانەت ئەگەر خەڵکێکی بێشوماریش ببنە قوربانیی ئەو هەر دوای رێچکەکەی خۆی دەکەوێ و هیچی لا گرنگ نییە. لە لایەکی ترەوە لە وڵاتێکی وەکوو ئێراقداو دوای دوو سێ ساڵ، ئەلقاعیدە –واتە دەوڵەتی ئیسلامیی ئێراق– هەم سەرکردە ئەسڵییەکانی خۆی (وەك زەرقاوی و ئەبوو عومەری بەغدادی و ئەبوو ئەیووبی میسری) لە دەست داوەو هەم بە کردەوە توانای شەڕ و چالاکیی نیزامیی نەماوە. لە سێ چوار ساڵ لەمەوپێشەوە تەنیا لەو کاتانەدا رووداوێکی نیزامیی یان تەقینەوە رووی داوە کە کێشەیەکی سیاسی کەوتۆتە نێوان کوتلەو بەرە سیاسییەکانی ئەو وڵاتەوەو ئاشکرایە لەم حاڵەتەدا ئەو چالاکییانە بە مەبەستی قۆستنەوەی کۆنترۆڵ و بالانسی مەیدانی سیاسەت لە لایەنێکەوە بۆ لایەنێکی تر بە ئەنجام دەگەیەت و دەستێکی جیا لە ئەلقاعیدەی تێدا ئەبینرێ. هەروەها ئەتوانین ئاماژە بکەین بە

پێکهاتنی شۆڕاکانی سەحوە لەناو سوننەکاندا کە دژ بە ئەلقاعیدە شەڕ دەکەن، یان بەشداریکردنی بەرچاوی خەڵك لە هەڵبژاردنەکاندا کە نیشاندەری رەتکردنەوەی بانگەوازەکانی ئەلقاعیدەیە بۆ بەشدارینەکردن لە پرۆسەی سیاسیدا لە لایەن جەماوەری ئەو وڵاتەوە.
بە گشتی هەم لە ئەفغانستان و هەم لە عێراقدا – وەك دوو بەرەی سەرەکیی شەڕ– هەمیش لە زۆربەی هەرە زۆری وڵاتانی ئیسلامیدا سەرەڕای دروستبوونی رێکخستن و تەنزیماتی ئیسلامیی سەر بە ئەلقاعیدە، ئەم رێکخراوەیە دۆڕانێکی جیددی بەخۆیەوە بینیوەو وەك وتیشمان دوژمنانی توانیویانە لەڕێی بەرجەستەکردنەوەی چالاکییە پڕ خەسارەت و کوێرەکانیەوە سیمایەکی ناشیرینی بۆ بنەخشێنن.

سەرەتا ئەمەیێ وەڵامی ئەو بەشەی پرسیارەکەتان بدەمەوە کە باسی شکستی جەماوەریی ئەلقاعیدەتان کردووەو هەڵبژاردنەکانتان بە بەڵگە بۆ هێناوەتەوە چونکوو شکستی جەماوەری لە شکستی سەربازی گرنگترە. ئەمریکا پاش داگیرکردنی عێراق، زۆر راشکاوانە باسی هەڵگیرساندنی شەڕی تائیفیی دەکرد شتێك کە پێشتر زۆر بە کەمی رووی دابوو بەڵام چەندین بەڵگە هەیە کە ئەمریکا باسی ئەوە دەکات. ئەوان پاش داگیرکردنی عێراق شەڕەی تائیفیان لە ناوەڕاست و خوارووی ئەم وڵاتەدا هەڵگیرساند و تەنانەت تا کەرکووکیش پەرەیان پێدا. لە عێراقدا جیا لە ئەلقاعیدە چەندین لایەنی تری سوننەیش جیهاد دەکەن بەڵام چونکوو ئەلقاعیدەو دەوڵەتی ئیسلامی دیارترین و بەرجەستەترین گرووپی ساحەکەن بەشی زۆری شتەکان بەسەر ئەواندا شکاوەتەوە. بە گشتی سوننەکانی عێراق و رێکخراوی ئەلقاعیدە لە رووبەڕووبوونەوەو پووچەڵکردنەوەی پیلانی شەڕی تائیفیدا لاواز جووڵانەوەو نەیانتوانی تێکەڵ بەم شەڕە نەبن. هەروەها سەرهەڵدانی کۆمەڵە خەڵکانێکی تەکفیریی بێسەروبەرەش کێشەکەی قووڵتر کردەوەو ئەم تەوژمە هەندێ لە ئەندامانی ئەلقاعیدەیشی لەگەڵ خۆی خست. سەرباری ئەو هەموو هەوڵ و کۆششە کە بۆ پێشگرتن بە دووبارەبوونەوەی ئەزموونی ئیسلامییەکانی ئەلجەزایر بە سەرکردایەتی (عنتر الزوابری) درا، بەداخەوە چەند جەمسەرێك لە پیلانەکە سەری گرت و ئەو ئەزموونە واتە ئەزموونی جەزایر لە چەند شوێنێکی عێراقدا دووپات بووەوە. بەم شێوەیە چەندین کاری تیرۆر و تەقینەوەی زۆر خراپ و دوور لە بەڵگەی راستەقینەی شەرعی ئەنجام دراو ئەوەندەی تر پیلانە چەپەڵەکەی رۆژئاوا لە عێراقی خوێناویدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا.
بەڵام ئەلقاعیدە بۆ پێشگرتن بەم تەوژمە و پێشگرتن لە هاودژبوونەوەی جەماوەر لەگەڵ ئیسلام و «دەوڵەتی ئیسلامی»دا کەوتە خۆی بە هەموو تواناکانییەوە دژ بە چالاکییە گوماناوییەکان وەستایەوەو هەوڵیدا تاکوو بە سنووردارکردنی چالاکییەکان، بە شێوەیەکی گشتی دڵی میللەتی عێراق بەجێ بێنێتەوە. ئەوان لە هەمان سەردەمی زەرقاویدا چەندین ئەندامی تەکفیریی خۆیانیان دەرکرد. کاتی خۆی رۆژنامەی (القُدس العربي) نامەیەکی ١۶ لاپەڕەیی ئەیمەن زەواهیری بڵاو کردەوە کە بۆ خودی ئەبوو مەسعەب زەرقاوی نووسیبووی. ئەم نامەیە ڕاو بۆچوونەکانی ئەلقاعیدەی دەربارەی جیهادی ئیسلامیی عێراق لەخۆ گرتبوو و تیایدا زەواهیری زۆر بە نەرمی و لێزانانە ئامۆژگاری زەرقاوی کردبوو و داوای لێ کردبوو تاکوو نەهێڵێت پیلانی دوورخستنەوەی خەڵکی عێراق لە یەکتر و دوژمنایەتیکردنی نێوانیان سەر بگرێ.
هەروەها زەواهیری وتوویەتی نابێ شەڕی شیعەو سوننە دەست پێ بکات بۆئەوەی نەبێتە هۆی لەبارچوونی هەوڵ و کۆششە جیهادییەکانی موسوڵمانان لە عێراقدا، هەر بەم مەبەستەش هانی ئەبوو مەسعەبی داوە بۆ دامەزراندنی «دەوڵەتی ئیسلامی» لەم وڵاتەدا. ئەوە بوو ماوەیەکی کەم دوای ئەو نامەیەو سەرباری نەمانی زەرقاویش، فەرمانەکە جێبەجێ کراو جگە لە ئەلقاعیدە چەند گرووپێکی تری جیهادیی سوننەش بەشدارییان لە دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامیدا کرد. ئەگەرچی ماوەیەکە کاری سەربازیی ئەلقاعیدەی عێراق دژی رۆژئاواو ئەمریکییەکان کەم بۆتەوەو سنووردار کراوە بەڵام دەوڵەتی ئیسلامی بە باشی دژی پیلانەکەی رۆژئاوا وەستاوەتەوەو ئەگەر تەنانەت ئەم کارەشی

نۆرانی سەربازیی ئەلقاعیدەی بەدواوە بوویێ بەڵام لە لایەکی ترەوە بە رادەیەکی زۆرباش بۆتە هۆی سەرنەگرتنی پیلانی بەدوژمنکردنی خەڵکی عێراق لەگەڵ ئیسلام و جیهادی ئیسلامیدا.

بەڵام هەلومەرجی ئەلقاعیدە لە عێراق و ئەفغانستان زۆر لێك دوورەو بە هیچ جۆر قابلی بەراوردکردن نییە لە ئەفغانستان تەنیا شتێك کە دەستەبەریان نەکردووە بەدەستهێنانەوەی دووبارەی دەسەڵاتە دەنا هەم لەوێ و هەم لە پاکستانیش -بە سەرنجدان بە جیهادی تاڵەبان لە وەزیرستان- خەباتی تاڵەبان و ئەلقاعیدە لەوپەڕی سەرکەوتوویدا بەڕێوە ئەچێ سەرباری بۆردمانی بەردەوام و ئەو چەك و تەکنۆلۆژیا مۆدێرن و پێشکەوتووانەی دوژمن بەکاری ئەهێنێت، رۆژ نییە لەم وڵاتانەدا چالاکیی عەسکەری بەڕێوە نەچێت بەجۆرێك کە پاکستان و بە تایبەتیش ئەفغانستان لە باری ئەمنییەوە تۆزقاڵێك ئاسایشیان پێوە دیار نییەو وەزعەکەش بەرەو ئەوە ئەچێ کە بۆجارێکی تر حوکمی شەریعەت نەك لە ئەفغانستان بەڵکوو لە پاکستانیشدا کە وڵاتێکی گەورەی ئیسلامییە دابەزێندرێت.

**بە هەر حاڵ زۆری لە سەر ناچین و داوەری ئەهێڵینەوە بۆ خوێنەران. ئێستا با بزانین، بە گشتی دوا ئامانجی ئەلقاعیدە چییە؟ ئایا دەیەوێ خیلافەتێکی جیهانیی ئیسلامی دابمەزرێنێ یان تەنیا مەبەستیەتی لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا خاوەن دەسەڵات بێ؟**

ئەگەر وتار و قسەکانی دوو سەرۆکەکەی ئەلقاعیدە واتە بن لادەن و زەواهیری بکەینە بەڵگەی دیاریکردنی ئەو ئامانجە، مەبەستی ئەلقاعیدە ژیاندنەوەی ئۆممەتی ئیسلام و گەڕاندنەوەی سەروەری و دەسەڵاتە بۆ موسوڵمانان. بن لادەن لە وتارێکی تۆمارکراوی دەنگ و رەنگدا کە دوای ١١ ی سێپتامبر بڵاوی کردەوە سوێندی خواردووە نەهێڵن رۆژئاوا بحەوێنەوەو تا ئەو کاتەی بە ئارەزووی خۆیان لە قودسی پیرۆزدا نوێژ نەکەن، واز لە جیهاد نەهێنن. واتە جگە لەوەی کار بۆ هێنانەوەی خیلافەتی ئیسلامی و دابەزاندنی شەریعەت لە شکلی دەسەڵاتێکی گەورەی سەر زەویدا دەکەن، سەندنەوەی قودسیش یەکێکی ترە لە ئامانجە سەرەکییەکانیان. دوای ئەوەی چەند ساڵ لەمەوپێش داخوازییەکەی بن لادەنیان بۆ ئاشتییەکی گشتی رەت کردەوە، ئەیمەن زەواهیریش ئەمەی کردە بەڵگە بۆ شەڕخوازیی دوژمنان ئەوانەی کە بە وتەی ئەو (بە بڕینی هەزارەها کیلۆمەتر، هێرش دێننە سەر وڵاتە ئیسلامییەکان تاکوو سەرکوتیان بکەن). زەواهیری میللەتانی رۆژئاوایش مەحکووم دەکات و دەڵێ: (ئەگەر دژی شەڕئەنگێزی سەرکردەو سەرکۆمارەکانتانن ئەی بۆ بەریان پێ ناگرن؟ ئەوان ئێوەیان کردۆتە داردەستی خۆیان لەپێناو دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی و ئارەزووە شەڕئەنگێزانەکانی خۆیان لە بەرانبەر وڵاتان و میللەتانی موسوڵماندا، ئەی بۆ ئێوە لە حەمنای ئەم کارانەیاندا بێ دەنگن؟) لە درێژەی پەیامەکەی زەواهێریدا هاتووە: (سوێندەکەی بن لادەنی ئەمیر و سەرکردەمان دووبارە دەکەمەوە کە مادام ئێوە سوور بن لەسەر وازنەهێنان لە شەڕ و دژایەتیکردنمان و نەتانەوێ سوڵح و ئاشتی بکەن، ئەوا ئێمەیش تا یەك کەسمان بمێنێ لەسەر ئەو سوێندە سوور دەبین و ناهێڵین بە ئیسراحەت لە دونیادا بژین و هەناسەی بێخەم هەڵبکێشن). هەموو ئەمانە هەروەها ئەو ئایدۆلۆژیایەی ئەلقاعیدەی لەسەر دامەزراوە، ئاماژەیە بۆ ئەوە کە ئەم رێکخراوە وەك بەهێزترین و بەربڵاوترین رێکخراوی سەلەفی جیهادی دونیا بە هەموو توانایەوە هەوڵی دابەزاندنی شەریعەتی ئیسلام ئەدات. جا رەنگە بە یەك کات و هاوکات لە هەموو شوێنێدا ئەم کارەی پێ نەکرێ بەڵام بێگومان تێپەڕینی زەمەن پێمان ئەڵێ ئەلقاعیدە تاچەند توانای گەیشتنی بەو پلان و بەرنامانە هەیە کە دایناون و کاری بۆ کردوون. راستییەکی حاشا هەڵنەگرە کە ئەم رێکخراوەو بزاڤی سەلەفییەتی جیهادی بە گشتی، پێش هەموو شتێك هەوڵی دابەزاندنی شەریعەت و دامەزراندنی دەسەڵاتی ئیسلامی لە وڵاتانی ئیسلامییدا ئەدەن و پشت بە خوای گەورە بەم ئامانجەش دەگەن.

**جوگرافیای ئایینی ئیسلام لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکووری ئافریقادا چەقی سەرەکیی بەستووەو ئەم ناوچەیە بە یەکەم ئاخێزگەو مەڵبەندی ئیسلام ئەژمێردرێ. یەکەم مانگەکانی ساڵی ٢٠١١ یەکانگیر بوو لەگەڵ سەرهەڵدانی بزووتنەوەیەکی جەماوەریی بەهێز و بێوێنەی مێژوویی لە وڵاتانی ئیسلامیی ناوچەکەدا کە تا ئێستاش کە سەرقاڵی ئەم وتووێژەین درێژەی هەیە. «موحەممەد بووعەزیزی» بەو ئاگرەی لە جەستەی خۆیی بەردا گڕی رقێکی مێژوویی هەڵگیرساند کە ساڵەها بوو لە لایەن دیکتاتۆرانی ورد و درشتی ولاتانی ئیسلامییەوە کپ کرابوویەوە.**

**لە رۆژانی سەرەتادا کە ئەم بزووتنەوەیە لە توونیسەوە دەستی پێکرد وا دەبینرا کە تەوژمێکی رادیکاڵی ئیسلامگەرایی لە دایك بووەو پێدەچێ لەو وڵاتانەدا دەوڵەتێکی ئیسلامیی (لانیکەم) هاوشێوەی ئێران بێتە سەرکار. بەڵام دوای ماوەیەکی زۆر کورت تێگەیشتین کە ئاوا شتێك لە ئارادا نییەو دەوڵەتان خەسڵەتی سێکۆلاری خۆیان ئەپارێزن. لە راستیدا هۆکاری سەرەکی راپەڕینی موسوڵمانانی توونیس و میسر و لیبیا و سووریا و بەحرەین و یەمەن و مەغرب و.....هتد داواکردنی ژیانێکی ئاسوودەتر و ئازادییەکی فرەتر بوو نەك داواکردنی دەوڵەتێکی تۆخ و پەتیی ئیسلامی. گومانی تێدا نییە کە کۆمەڵە داخوازییەکی دینییش لەم راپەڕینەدا ئەبینرێ بەڵام وەك شۆڕشی ١٩٧٩ی ئێران یاخود دەوڵەتی ئیسلامی و حکوومەتی تاڵەبان لە ئەفغانستان، ئیسلامگەرایی نەبۆتە هۆکاری سەرەکیی جووڵاندنی خەڵك بۆ رووخاندنی حاکمانی دەسەڵاتدار.**

**خودی بزاڤ و سەرکردە ئیسلامییە دیار و بەرجەستەکانیش – وەك ئیخوانولموسلیمینی میسر، بزاڤی ئیسلامیی توونیس بە رێبەرایەتی راشید ئەلغەنووشی و..... – راشکاوانە رایانگەیاندووە خوازیاری رۆنانی دەوڵەتێکی ئیسلامی نین و تەنیا ئەیانەوێ یاساکان بە پێی شەریعەتی ئیسلام بنووسرێنەوە. دیارە خوێندنەوەشیان بۆ ئیسلام و شەریعەتی ئیسلام خوێندنەوەیەکی میانەڕەوانەیەو ئێجگار جیاوازە لە خوێندنەوەی رێبەرانی سەرەتای شۆڕشی ئێران و تاڵەبانی ئەفغانستان. لێکۆڵەران لەسەر ئەو باوەڕەن مۆدێلی تاڵەبانی و ئەلقاعیدەیی و هەموو مۆدێلێکی رادیکاڵی ئیسلامی سیاسی شکستێکی قورسیان خواردووەو ئێستە مۆدێلی ئەردووغانی یان مۆدێلی حیزبی (عەداڵەت و گەشە)ی ئیسلامییەکانی تورکیا لە برەودایەو ئیسلامییەکانی ناوچەکە هەوڵ ئەدەن مۆدێلێکی هاوشێوەی تورکەکان لە وڵاتەکانیان دابمەزێنن.**

**ئیسلامی سەلەفییانەی ئەلقاعیدە نەیتوانی خۆی لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵگا ئیسلامییەکاندا رێك بخاو هەر بۆیە ئیتر کەس خوازیاری دامەزرانی دەوڵەتێك لەسەر بنەمای ئەندێشەی ئەلقاعیدەیی نییە، لە بەرانبەردا مۆدێلی تورکیایی زۆر بە باشی توانیویەتی لە دونیای تازە بگاو داخوازییە مۆدێڕنەکانی میللەتانی موسوڵمان لەناو خۆیدا چڕ بکاتەوە، هەر بۆیە خەریکە ئەبێتە مۆدێلێکی هێژمۆنیك کە وردەوردە هەموو وڵاتانی ئیسلامی ئەگرێتەوە. رای تۆ بەرانبەر بەم لێکدانەوەیە چییە؟**

لە پێشدا با ئەوە بڵێم کە لە ئیسلامدا «نەگۆڕ و بگۆڕ» یان (ثوابت و متغیرات)مان هەیە، نەگۆڕ بەو شتانە دەوترێ کە دەقیان لە سەرەو هیچ خەلیفەو ئیمامێك ناتوانێ لەبەر هەراو هوریای خەڵك بیانگۆڕێ. بەڵام شتە بگۆڕەکان ئەوەندە زۆر و بەرفراوانن کە وا نازانم بە هیچ جۆرێ هیچ خواستێکی خەڵك پشت گوێ بکەوێ، مەگەر ئەوەی خەڵکی بۆ وازهێنان لە ئیسلام دەستەکۆیی بکەن ئەگەرنا هەموو مافە رەواکانی تاك و کۆی کۆمەڵگای تیادا بەدی دێت. منیش ئەوەم قبووڵە کە خەڵکی راپەڕیوی ناوچەکە داوای مافە سەرەتاییەکانی خۆیان و ژیانێکی سادەی سەربەستانە دەکەن، ئەیانەوێ لە دەست حاکمە خوێنمژ و سەرکوتکەرەکان رزگاریان بێ کە جیا لە سەرکوتکاری هیچی تر نازانن و ئامادە نین

دەستبەرداری کورسییەکانیان بن، دەوڵەتداریی ئەوان لە سەر ئیسلام و بە پێی یاسا ئیسلامییەکان نییە کە نەتوانین دەستکاری بکەین و وازی لێ بهێنین. کەسێکی وەکوو قەزافی ئەگەر بە قەد سەگێك وەفای بۆ میللەتەکەی بووایە، نەدەبوو ئاوایان پێ بکات و بیانکوژێ و بەرهەمی ٤٢ساڵ داهاتی ئەو خەڵکە کۆ بکاتەوەو لە گیرفانی ژن و منداڵەکانی بکات.
هەموو ئەمانە بە جێی خۆی، بەڵام دیدی کۆماری ئیسلامیی ئێران و ئەلقاعیدە بۆ شیکردنەوەی ئەم رووداوانە لێك جیاوازە. ئێران لە هەمان سەرەتای دەسپێکردنی راپەرینەکەوە لە توونیس، مەسەلەکان بە شۆڕشەکەی خۆی دەشوبهێنێ و هەموو سەرهەڵدانەکان بە بەرهەمی شۆڕشی خۆی دەزانێ. ئەمە لە حاڵێکدایە کە لایەنی گەورەی ناو شۆڕشەکە واتە ئیخوانولموسلیمین ئەو تێڕوانینەی ئێرانی بە تەواوی رەت کردۆتەوەو دەستی دەرەکیی لە شۆڕشەکاندا نابینێ. ئەم راپەرینانە چەندین گۆشەی جۆراوجۆریان هەیە بەڵام ئێران لە میدیاو راگەیاندنەکانیدا خۆی لە قەرەیان نادات، بۆ نموونە ئامادە نییە باسی سەرهەڵدانی سوننەکان لە وڵاتانی عێراق و سووریا بکات کە شیعەیان تیادا دەسەڵاتدارە بەڵام لەولاوە ئەوەندە خۆی بە بەحرەینەوە خەریك کردووە ئەڵێی بەحرەین تەنها وڵاتی عەرەبیی ئیسلامییە کە دەسەڵات خەڵکەکەی سەرکوت دەکات. ئەڵبەت مەبەستم رازیبوون بەوە نییە کە ئالی خەلیفەو ئالی سعوود بەرانبەر شیعەکانی بەحرەین دەیکەن چونکوو ئەو کارانە بە کەمتر لە هەوڵەکانی قەزافی نازانم. من لەو باوەڕەدام کە پێویستە مافە زەوتکراوەکانی سوننەو شیعە وەکوو یەك لەبەرچاو بگیرێت.
ئێران بە هەموو شێوەیەك ئەیەوێ شۆڕشەکان بەناوی خۆیەوە تەواو بکات کەچی ئەلقاعیدە سەرەڕای ئەو هەموو باسەی لەسەری دەکرێ گوایە دەستی هەیە لە دروستکردنی رووداوەکاندا، ئەمان دیوەو ئەمان بیستووە خۆی بە خاوەنی شۆڕشەکان لە قەڵەم بدات و من ئاگام لە ئاوا شتێك نییە. هەروەك خۆشتان وتووتانە چونکوو خەڵکی ئەم وڵاتانە بە زۆری موسوڵمانن و هەیمەنەی دینییان پێوە دیارە زەمینەی خۆ بەخاوەنکردنی ئەلقاعیدە فەراهەمە کەچی تاکوو ئێستا شتی وامان بەرچاو نەکەوتووە. هەروەها نکۆڵی لەوەش ناکەم کە لەگەڵ بوونی تایبەتمەندییە دینی و ئیسلامییەکاندا هێشتا داواکارییەکان لە پێشێلکردنی مافە دینییەکانەوە سەرچاوەی نەگرتووە بەڵکوو وەك وتم خەڵك داوای مافە سەرەتاییەکان و ئازادی تاك و کۆی کۆمەڵگاو باشتربوونی لایەنی ئابووریی ژیانیان دەکەن و ئینجا لە پاڵ ئەوەشدا داوای مافە ئیسلامییەکانیان دەکەن. بە نیسبەت ئەوەشەوە کە وتووتانە شۆڕشەکان زیاتر بەرەو مۆدێلی تورکیا دەچێ نەك تاڵەبان و ئەلقاعیدەو ئەمەش لانیکەم ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە سەلەفییەت یاخود ئەلقاعیدە شکستی خواردووە، پێویستە بڵێم بەراوردکردنی ئاوەجۆرە بە باش نازانم چونکوو وڵاتان لە زۆر رووەوە جیاوازییان هەیە. بۆ نموونە لە رووی (عباد و بلاد) واتە ستراتیژی دانیشتوان و جوگرافیاوە هەروەها ئەوجۆری (مراوغە)یەی لە لایەن رۆژئاواوە بە نیسبەت وڵاتانەوە لە ئارادایە جیاوازییان هەیە. هەروەها داوەریکردن لەسەر ئەو بابەتە لە ئێستادا بە داوەریکردنێکی خێراو پەلە ئەزانم چونکوو هێشتا زۆر لایەنی ئەم شۆڕشانەمان بۆ دەرنەکەوتووەو بە تێپەڕینی زەمەن هەموو لایەنە شاراوەکان خۆیان دەردەخەن. وەك باسم کرد، ئەم وڵاتانە لە زۆر بوارەوە جیاوازییان پێکەوە هەیەو هەرکام خاوەن جۆرێك خەسڵەت و تایبەتمەندین. بۆ نموونە لە نێوان توونیس و لیبیادا کە دوو وڵاتی دراوسێن گەلێ جیاوازی دەبینرێ هەروەك چۆن شێوازی حوکمڕانیی دەسەڵاتداران واتە قەزافی زەینەلعابدین بن عەلی لەم دوو وڵاتەدا زۆر جیاواز بووەو هەرکام بەجۆرێ کاریگەرییان لەسەر خەڵکی وڵاتی خۆیان داناوە.
وەك پێکهاتەو بیروباوەڕیش، دانیشتوانی ئەم وڵاتانە بە زۆری موسوڵمانن و لە سەردەمی دیکتاتۆریەکانیشدا هەر بە موسوڵمان و وڵاتی ئیسلامی ناسراوبوون و لە ماوەی ساڵانی ژێردەستەییدا بەردەوام لە سۆنگەی ئیسلامەتییەوە دژایەتی دەسەڵاتدارانیان کردووەو باجی زۆریان داوە. هەرچەند ئەلقاعیدەو سەلەفییەتی جیهادی لە هەموو ئەم وڵاتانەدا خاوەن نفووز و پێگەیەکی باشن و لەناو هەموو چین و توێژەکانی خەڵکیدا ناسراون بەڵام بە زۆری فیکرەی ئیخوانولموسلیمین تیایاندا بەرجەستەیەو ئەمەش زۆر ئاساییە و هیچ پێوەندیی بە دۆڕانی قاعیدەو تاڵەبان و خۆنەگونجاندنیان لەگەڵ

دونیای مۆدێرندا نییە. ئەڵبەت لە وڵاتێکی وەك میسردا سەلەفییەکان زۆر بەهێزترن و هەم تەنزیمات و رێکخراویان هەیەو هەمیش جەماوەرێکی زۆریان لەگەڵەو توانای ئەوەیان هەیە بە وەزنێکی باشەوە بچنە ناو هاوکێشەکانەوە. یەك لە هۆکارەکانی خۆ دەرنەخستنی سەلەفییەت و ئەلقاعیدە ئەوەیە کە نایانەوێ ببنە بیانوو بۆ ئەو لایەنە ناوخۆیی و دەرەکیانەی رقیان لە سەلەفییەتە جا هەرچەند رۆڵی سەلەفییەکان بە تایبەت لە جیهادی لیبیادا زۆر بەرجەستەیە بەڵام دیسان زەمینەی هاتنەسەرکار و دابەزاندنی شەریعەتیان نەبوو. بە نیسبەت بەربڵاوبوونەوەی مۆدێلی ئیخوانی تورکیاشەوە پێویستە بڵێم کە خودی تورکەکان هەوڵ بۆ بڵاوبوونەوەی ئەم فیکرەو مۆدێلە ئیسلامییە ئەدەن و ئاساییە کە هەندێ کەس و لایەنی سەر بە رەوتی ئیخوانیان لەگەڵ بکەوێ بەڵام بەڕای من ئیخوانەکانی میسر کە ئەم وڵاتە لانکی سەرهەڵدانی ئیخوانولموسلیمینە، نابنە پاشکۆی هیچ کەس و لایەك چونکوو خۆیان بە خاوەنی هەموو رەوتی ئیخوانی عالەمی دەزانن. راشید ئەلغەنووشی و ئەلنەهزەی توونێسیش کە بۆخۆیان رێچکەیەکی تایبەتیان هەیە. بە هەرحاڵ پێم وایە ئەگەر لە سەرەتاوە زەمینە بۆ سەرهەڵدانی سەلەفییەکان نەبێ بێگومان لە داهاتوودا زەمینە بۆ سەرهەڵدانی ئەم فیکرەیە زیاتر فەراهەم ئەبێت.

# بەشی سێیەم

# ئیسلامی سیاسی لە کوردستان

له بەشی سێهەمی ئەم وتووێژەماندا ئەمانەوێ مێژووی هاوچەرخی جووڵانەوەی ئیسلامی لە کوردستاندا بخەینە بەرباس. یەکەم جار لەژێر کاریگەری ئیخوانولموسلیمیندا تەوژمێکی فیکریی ئیسلامیی رێکخراو و سیاسی لە باشووری کوردستان (کوردستانی عێراق) سەری هەڵداو ئەم تەوژمە فیکرییە بووە دەسپێکی دروستبوونی چەندەها گروپ و رێکخراوی جیاجیای ئیسلامی لە پارچە جیاوازەکانی کوردستاندا. ئەم تەوژمە لە چ ساڵ و قۆناغێکدا دەستی پێکرد و یەکەم رێکخراوی کوردیی ئیسلامی ناوی چی بوو و لە لایەن چ کەسانێک و بە چ جۆر بیرو بۆچوونێکەوە دروست کرا؟

یەکەم لقی ئیخوانولموسلیمین لە عێراق، دەیەی ١٩٤٠ی زایینی لە رێی باوکی سەلاحەدین بەهادینی ئەمینداری یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان و مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیز و مەلا عومەری برایەوە لە باشووری کوردستان دروست کرا. ئەوان و چەندین کەسی تر کە لەو سەردەمەدا لە کولیەی شەریعەی زانکۆی بەغداد ئەیانخوێند یەکەم کەسانێک بوون لەگەڵ بیروباوەڕی ئیخوانولموسلیمین ئاشنا بوون و پاشان بیروباوەڕی ئیخوانیان هێنایە کوردستان و دواتریش مامۆستا مەلا عەلی عەبدولعەزیز و مامۆستا شێخ سدیقی برای بوونە سەرکردەی بەرجەستەو دیاری ساحەی ئیسلامخوازی و رۆڵێکی کارایان گێڕا لە بووژاندنەوەی ئیسلامییدا لە کوردستان. ئەڵبەت پێش ئەوانیش تەنانەت پێش مامۆستا بەهادین و مەلا عوسمانیش، کەسێکی تری سەر بە رەوتی ئیخوان بەناوی مامۆستا مەلا حسەینی مارۆنسی کە خەڵکی باکووری کوردستان بوو و لە ناوچەی بارزانی کوردستانی عێراق نیشتەجێ بووبوو، رۆڵێکی کاریگەری بەرچاوی لە هێنانەگۆڕی بیرۆکەی دامەزراندنی لقی کوردستانی ئیخوانولموسلیمیندا گێڕا. دواتریش هەر لە ژێر کاریگەری بیروبۆچوونەکانی ئەودا، لە ساڵی ١٩٨٢ی زایینیدا رێکخراوێک بەناوی «لەشکری ئیسلامیی کوردستان» دامەزرا کە لە لایەن هەر سێ وڵاتی ئێران و لیبیاو سووریاوە یارمەتی ئەدرا.
بە داخەوە لەشکری ئیسلامی کە یەکەم رێکخراوی ئیسلامیی کوردستانی عێراق بوو، ماوەیەکی کەم پاش دامەزرانی بوو بە قوربانیی سیاسەتی شەڕشنەنگێزانەی یەکیەتی نیشتمانی و بە هۆی کودیتایەکی سەربازیی کوتوپڕ و لە ناکاوی ئەم حزبەوە کە لە گوندی (مالوومە)ی ناوچەی شارباژێڕ بەڕێوە چوو، سەرجەم هێزەکانی چەککران و بەدیل گیران و پاشان بە دانی بەڵێنی تێهەڵنەچوونەوەو وازهێنان، ئازاد کران. حاجی شێخ سمایلی خەمزەیی یەکێک لە بەرپرسانی ئەم رێکخراوە بوو. ئیتر بە هۆی ئەو کەسانەوە کە لە سەرەوە ناوم هێنان و هەروەها چەندین کەسی تری ناسراو و چالاکی بواری ئیسلامەتییەوە هەروەها بە تەنسیر وەرگرتن لە بیروباوەڕی ئیخوانولموسلیمین، یەکەم هەوڵەکان بۆ دامەزرانی رێکخراوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق دەستی پێکرد و پاشان بەرەبەرەو بە تێپەڕینی زەمەن ئەم هەوڵانە زیاتر پەرەی سەند و زەمینەی بۆ دروستکردنی گروپ و رێکخراوی جۆراوجۆری ئیسلامی فەراهەم کرد.

واتە جەنابت ئەڵێی یەکەم رێکخراوی ئیسلامیی کوردی لەشکری ئیسلامیی کوردستان بووە کە لە ساڵی ١٩٨٢دا دامەزرا؟ خۆ ئەگەر وابێ رێکخراوی «مەکتەب قورئان»ی ئەحمەدی موفتی زادە چەندین ساڵ پێشتر -واتە ساڵی ١٩٧٧- دامەزراوەو ئەبێ مەکتەب قورئان بە یەکەم رێکخراوی ئیسلامییەکانی کوردستان بزانین. بەم پێیە بە پێچەوانەی رەوتی گشتیی وڵاتانی ئیسلامی، لە کوردستاندا «ئیخوانولموسلیمین» نەیتوانی لە سەرەتاوە بە شێوەی راستەوخۆ بناغەدانەری یەکەم رێکخراو بێ و تەنانەت ئەوەش کە ساڵانێک پێش مەکتەب قورئان، لە باشووری کوردستان روویدا دامەزرانی رێکخراوێکی سەربەخۆی ئیسلامی لێنەکەوتەوە. بە گشتی هەرچەند پێدەچێ ئیخوانولموسلیمین لە

**رووی فیکرییەوە کاریگەریی لەسەر بەرێکخراوەبوونی ئیسلامی سیاسی لە کوردستاندا بووبێ بەڵام بە شێوەی رێکخستن و تەنزیماتی لە دامەزرانی یەکەم رێکخراودا رۆڵی نەگێڕاوە. لێکدانەوەکەی جەنابت ئاوا دەرەنجامێکمان دەخاتە بەردەست، تۆ ئەم لێکدانەوەیەت قبووڵە؟ هەروەها ئایا ئەتوانین شەرەفی یەکەم رێکخراوی ئیسلامیی کوردستان بە مەکتەب قورئان ببەخشین؟**

بە رای من هۆکاری ئەوەی کە ئەم سێ وڵاتە یارمەتی لەشکری ئیسلامییان ئەدا بە پلەی یەکەم پێوەندیی بە ناکۆکی و نێوان ناخۆشی ئەو وڵاتانەوە بوو لەگەڵ دەوڵەتی عێراقیدا. کۆماری ئیسلامی کە هێشتا ماوەیەکی کەم لە تەمەنی تێنەپەڕی بوو لە لایەن رژێمی سەدام حسەینەوە هێرشی کرابووە سەر و شەڕێکی نەخوازراوی بەسەردا سەپابوو بۆیە بە هەموو شێوەیەك هەوڵی ئەدا گوشارێکی زۆر بخاتە سەر دەسەڵاتی عێراقی بۆ ئەوەی بەرەو لاوازیی ببات و ببێتە لایەنی سەرکەوتوو و براوەی شەڕ. لە ماوەی شەڕی هەشت ساڵەی ئێران و عێراقدا یارمەتیدانی حزب و رێکخراوە نەیارەکانی سەدام یەکێك بوو لە سیاسەتەکانی کۆماری ئیسلامیی ئێران و سەرجەم لایەنە نەیارەکان بە کورد و عەرەب و عیلمانی و ئیسلامییەوە لەم یارمەتییانە بەهرەمەند بوون. رژێمی بەعسی سووریاش کە لە لایەن شیعەکانەوە بەڕێوە ئەبرا لە لایەك لە روانگەی مەزهەبییەوە دژی سەدام و دەسەڵاتەکەی بوو و لە لایەکی تریشەوە بەهۆی ئەو هاوپەیمانییەی لەگەڵ دەسەڵاتی ئێرانیدا هەیبوو پشتیوانی لەوانەوە واتە لە ئێرانییەکانەوە دەکرد. هەروەها بەعسییەکانی سووریا حزبی بەعسی عێراقیان بە رەسمی نەدەناسی و لەم رووەیشەوە دژایەتی سەدام حسەینیان دەکرد. موعەمەر قەزافیش کە خۆی بە جێگرەوەی جەمال عەبدولناسر و دیارترین و سەرترین کەسایەتی دونیای عەرەب ئەزانی، لەم رووەوە لەگەڵ سەدامدا رکابەرایەتی دەکرد کە خۆی لێبووبووە رێبەر و سەرۆکی ئۆممەی عەرەبی. شایانی ئاماژەیە لەناو لایەنە کوردییەکانیشدا یەکیەتی نیشتمانی پێوەندییەکی تایبەتی لەگەڵ قەزافیدا هەبوو و یارمەتی باشی لە دەوڵەتی لیبیا وەردەگرت، ئەم دۆستایەتی و یارمەتی وەرگرتنە بووبووە هۆی ئەوە کە موعەممەر قەزافی لای سەرکردەکانی یەکیەتی زۆر خۆشەویست بێ و بە رێبەرێکی ئازادیخواز بناسرێت.

پێوەندیی لەشکری ئیسلامی لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا بەوجۆرە بوو کە باسم کرد واتە لە ئاستی وەرگرتنی یارمەتیدا بوو و ئیتر ئەم رێکخراوە ئەوەندە نەژیا تاکوو بتوانین بڵێین تا چەند سەر بەو وڵاتانە بوو. بە نیسبەت مەنهەج و رێچکەی فیکریی ئەم رێکخراوەیشەوە ئەوەندەی من ئاگادارم و پێشتریش ئیشارەتم پێدا لەشکری ئیسلامی بەرادەیەکی زۆر لە ژێر کاریگەری فیکرەی ئیخواندا بوو. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە شیوعییەت لە برەودا بوو و شیوعییەکان نەك دینی پیرۆزی ئیسلامیان بە یاساو بەرنامەیەکی کۆن و دواکەوتووانە ناو ئەبرد بەڵکوو وجودی خوای گەورەیشیان خستبووە ژێر پرسیارەوەو مرۆڤی موسوڵمانیش لە لایەن ئەوانەوە بەوە تاوانبار دەکرا کە لە خۆڕا چارەنووسی خۆی بە خوایەکەوە گرێ داوە کە وەهمی و خەیاڵییەو ساختەی زەینی خودی مرۆڤە. بۆیە سەرهەڵدانی رێکخراوێکی چەکداری ئیسلامی لە ئاوەها هەلومەرجێکدا ئەتوانێ وەك رووداوێکی گرنگ بێتە ئەژمار و لێرەدایە کە سەلەفی بوون و ئیخوانی بوونی ئەم گرووپە زۆر گرنگ نییە چونکوو لەو سەردەمەدا بەرگریکردن لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام بایەخدار بوو نەك باسکردنی فلان مەنهەج و تێڕوانینی ئیسلامی.

لەشکری ئیسلامی وەك یەکەم رێکخراوی ئیسلامیی کوردستانی عێراق، بە مەبەستی داکۆکی کردن لە ئایینی ئیسلام دامەزراو بە دروشمی بەرگری کردن لە ئیسلام هاتە گۆڕپانەوە. هەر بەو هۆیەشەوە بوو کەوتە بەر رق و قینی حزبێکی نەتەوەیی عیلمانی وەك یەکیەتی نیشتمانی. یەکەم جار بوو خەڵکی کوردستان پێشمەرگەی چەکداری موسوڵمانیان ئەبینی و بەمەش زۆر خۆشحاڵ بوون. هەروەها هەڵسووکەوتی چەکدارانی لەشکری ئیسلامی کاریگەرییەکی زۆری لە سەر خۆشەویستبوونی ئەوان لەناو خەڵکیدا دانابوو. بۆ نموونە ئەوان بە هۆی ئەو یارمەتییانەی لە وڵاتانی لیبیاو ئێران

و سووریاوه پێیان نەگەیشت، بەشێکی زۆری کاروباری خۆیان رادەپەڕاند و هیچ کات ئەرك و زەحمەتی خۆیانیان نەئەخستە سەرشانی خەڵکی هەژار و گوندنشین و ئەمە پێچەوانەی هەڵسووکەوتی پێشمەرگەی لایەنە کوردییەکان بوو. بە گشتی هەڵسووکەوتی جوان و پاك و ئیسلامییانەی ئەندامانی لەشکری ئیسلامی لەگەڵ خەڵکدا بە تایبەت دەست و داوێن پاکی ئەوان، هۆکار بوو بۆ ئەوەی زۆر زوو جێگای خۆیان لە دڵی خەڵکیدا بکەنەوەو ببنە هەڕەشەو مەترسی بۆسەر لایەنە نەتەوەیی و عیلمانییەکان. ئەمە وای لە جەلالییەکان کرد تاکوو لە هەڵمەتێکی کوتوپڕ و کودیتا ئاسادا دەست بدەنە چەککردنی ئەندامانی لەشکری ئیسلامی و چەند کەسێکیشیان لێ کوشتن و بریندار کردن. بەم جۆرە ئەو جەلالیانەی بە درێژایی تەمەنی خۆیان و حزبەکەیان دژی ئیسلام و ئیسلامییەکان بوون چاویان بە گروپێکی تازە دامەزراوی ئیسلامی هەڵنەهات و ئاوا لە ناویان برد .

لە وەڵامی بەشێکی تری پرسیارەکەتاندا کە گوایە یەکگرتووی ئیسلامی یەکەم رێکخراوی سەر بە ئیخوانولموسلیمین بوو لە کوردستان، من ئەوە رەت دەکەمەوە. بە رای من مامۆستا شێخ سدیق عەبدولعەزیزی برای مەلا عەلی و مەلا عوسمان کە لە ساڵی ١٩٩١دا واتە چەند ساڵ پێش دامەزرانی یەکگرتوو، بە جیابوونەوەی خۆی و جەماعەتەکەی لە ئیخوانی عێراق حزبێکی سەربەخۆیان بە ناوی « بزووتنەوەی راپەڕینی ئیسلامیی کوردستانی عێراق / حرکة النهضه الاسلامیه فی الکردستان العراق» دامەزراند کە بە ئیخوانی خەتی دوو ئەناسران. ئەم حزبە کە بایەخی زۆری بە پەروەردەو جیهاد ئەدا، دوای ماوەیەك قەبارەیەکی گەورەتری بەخۆیەوە گرت بە جۆرێك کە شانی لە شانی بزووتنەوەی ئیسلامی ئەدا. بزووتنەوەی راپەڕینی ئیسلامی لە بڵاوکراوەکانیدا بەرواری دەسپێکردنی کاری رێکخراوەیی خۆی ئەگێڕایەوە بۆ ساڵی ١٩٧٨ی زایینی و گوایە لەو کاتەوە وەك لقێکی ئیخوانولموسلیمین کاری کردووەو بە تەبلیغی مەنهەج و بیروباوەڕی ئەم رێکخراوەوە خەریك بووەو ئەگەریش ئەم ئیدیعایە راست بێ ئەوا ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە لانی کەم ١٥ ساڵ پێش دامەزرانی یەکگرتووی ئیسلامی، رێکخراوێکی سەر بە ئیخوان لە کوردستانی عێراقدا بوونی هەبووە.

ئێمەیش ئەوە دەزانین کە ساڵی ١٩٤٨ی زایینی، حیزبی ئیسلامیی عێراقی کە بە تەواوی لقی ئیخوانولموسلیمین بوو لە عێراق، دامەزراو چەند کەسایەتییەکی ئایینیی کوردیش بەشدارییان تێدا کرد کە دواتر دووانیان بوون بە نوێنەری کوردەکان لەو رێکخراوەیەدا. بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە کە حیزبی ئیسلامیی عێراق حیزبی کوردانیش بووەو ناتوانین بڵێین یەکەم رێکخراوی ئیسلامیی کوردیی لە ١٩٤٨دا دامەزراوە. بەشداریکردنی کەسایەتییە کوردەکان و تەنانەت دروستکردنی رێکخستن و تەنزیماتی ئیسلامی لە کوردستاندا مادام سەر بە حیزبێکی عێراقی بووە وەك حیزبی کوردی لە قەڵەم نادرێ، ئەو کاتە ئەتوانین باسی دامەزرانی حیزبی کوردیی ئیسلامی بکەین کە راستەوخۆو سەربەخۆ لە کوردستاندا دامەزرابێ کە مەکتەب قورئان، یەکگرتووی ئیسلامی، بزووتنەوەی ئیسلامی و دەیان نموونەی تر هەڵگری ئاوا تایبەتمەندییەکن بەڵام رێکخستنی حیزبی ئیسلامیی عێراقی ئاوا تایبەتمەندییەکی نەبوو.

ئەگەر بەم پێوەرە بۆ یەکەم جار بەدوای حیزب یان رێکخراوی ئیسلامیی کوردستاندا بگەڕێین «مەکتەب قورئان» یەکەمینە مەگەر ئەوەی پێش ئەو رێکخراوێکی دیکە دامەزرابێ کە بە پێی قسەکانی جەنابت ئاوا شتێك رووی نەداوە. ئەگەرچی مەکتەب قورئانیش بە جۆرێك لە جۆرەکان لە ژێر کاریگەری ئیخواندا بوو بەڵام گرێدراوییەکی ئۆرگانیکی بەو رێکخراوە دایکەوە نەبووە. ئەم رێکخراوە چەند لێکچوون و هاوشێوەییەکی لەگەڵ بیری سەلەفییەتدا هەبوو، بۆ نموونە ئەوانیش فاتێحەیان لە کاتی نوێژکردندا بە بیدعە دەزانی، دژی هەموو ئەو تەفسیر و تەعبیرە کۆن و کلاسیکانە بوون کە لە ئایین دەکرا، دژی دیاردەی شێخ و شێخایەتی بوون و..... هتد. هەر بۆیە لە کوردستاندا وەك تاقمێکی (وەهابی) ناو

دهبران و له لایەن ئیسلامی سوننەتی و مەلایانی کوردستانەوە رەفز دەکران. دیارە مەرحووم ئەحمەدی موفتی زادە دوو قۆناغی جیاوازی ژیانی هەبوو، لە قۆناغی یەکەمدا لەگەڵ هەموو تایبەتمەندییەکی نەتەوەخوازانەدا رەنگی ئیسلامێکی تۆختر و رادیکاڵتری پێوەدیار بوو بەڵام لە دوا قۆناغدا کە دواهەم ساڵانی ژیانی دەگرتەوە، گۆڕدرا بۆ موسوڵمانێکی میانڕەو کە تەنانەت قایل بە هیچ چەشنە تەکفیر کردنێك نەبوو. هۆکاری ئەم ئاڵوگۆڕە فیکرییە چی بوو؟

لە سەرەتای ئەم پرسیارەدا روونکردنەوەیەك هاتووە کە پێویستی بە وەڵام نییە بەڵام ئەگەر ئەوەی کە ئێوە ئەیڵێن راست بێ واتە کۆمەڵی مەکتەب قورئان لە ساڵی ١٩٧٧ی زایینیدا دروست بووبێ ئەوا بە پێچەوانەی وەڵامەکانی پێشووم منیش دێمە سەر ئەو رایە هەرچەند بە باشی ئاگام لە رووداوەکانی کوردستانی تورکیا نییە بۆیە بەدەر لەو بەشەی کوردستان، ئەتوانم ئیعتراف بکەم کە بە پێی روونکردنەوەکانی ئێوە ئەتوانین بڵێین مەکتەب قورئان یەکەم رێکخراوی ئیسلامیی کوردستانە.
لە پێوەندیی لەگەڵ ئەو ئاڵوگۆڕە فیکرییەی کە بەسەر کاك ئەحمەدی موفتی زادەدا هات بەوجۆرەی کە بیروبۆچوون و روانگەکانی ئەو پێش زیندان و پاش زیندان پێکەوە فەرق و جیاوازییان هەیە، بەڕای من هۆکارەکانی ئەم ئاڵوگۆڕە گەلێ زۆرن و گرنگترینیان ئەوە بوو کە کاك ئەحمەد و گروپەکەی لەگەڵ عالەمی ئیسلامی دەرەوەی ئێراندا هیچ پێوەندییەکیان نەبوو و لە چوارچێوەیەکی بچووك و بەرتەسکدا بیریان دەکردەوەو چالاکییان بەڕێوە دەبرد. لە لایەکی ترەوە ئەم حاڵەتە بووبووە هۆی ئەوە کە کۆمەڵی مەکتەب قورئان بکەوێتە بەر هەڕەشەو دەستدرێژی نەیارەکانی و ئەمەش دەقاودەق ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری ئیسلاممان (دروودی خوای لێ بێ) بیر ئەخاتەوە کە ئەڵێ: (گورگ لە گۆشتی ئەو مەڕە ئەخوات کەوا لە ڕان دابڕابێت و تاك کەوتبێ). جا ئەم دابڕان و دوورە پەرێزییە بوو کە کاك ئەحمەدی تووشی دەمارگیریی فیکری کرد و وای لەو کرد تاکوو بە شێوەیەکی رەها دەست بداتە تەفسیر و ماناکردنەوەی ئایینی ئیسلام. هەروەها یەکێکی تر لەو هۆکارانەی بۆتە هۆی بەلاڕێداچوونی مەکتەب قورئان، بەستراوەیی لە ڕادەبەدەری ئەندامانی ئەم گروپەیە بە رێبەرەکەیان و رێکخراوەکەیان بە جۆرێك کە پلەی دوای پێغەمبەر (سلاو و دروودی خوای لێ بێ) ئەبەخشنە ئەحمەدی موفتی زادەو هەتا قسەو نەسیحەتەکانی ئەو وەستایێ ئەوا حەدیس و ئایەتی قورئان بەکار ناهێنن. بە نیسبەت ئەوەیشەوە کە گروپی مەکتەب قورئان لای عامەی خەڵك بە سەلەفی یان وەهابی ناسراون لە راستیدا تەنیا ئەتوانێ هەڵەیەك بێت و بەس ئەگەریش لای هەندێ کەس ئەو فەهمە هاتبێتە ئاراوەو مەکتەب قورئانیان بەهۆی جۆری بیرکردنەوەو رەفتارەکانیەوە بە سەلەفی شوبهاندبێ ئەمە پێوەندیی هەیە بە هێندێك خاڵی هاوبەشی نێوان مەکتەبییەکان و سەلەفییەکانەوە. بۆ نموونە وەك خۆتان باستان کردووە لە مەسەلەی بیدعەدا. هۆکاری ئەوەش کە زۆربەی مەلاکانی کوردستانیش مۆرکی وەهابی بوونیان لە مەکتەب قورئان داوە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە کاتی خۆی کاك ئەحمەدی موفتی زادە وتوویەتی: (یەکێك لە موعجیزەکانی دینی ئیسلام ئەوەیە کەوا لەگەڵ بوونی ئەو هەموو مەلایەدا هێشتا دین هەر ماوەو نەفەوتاوە!!) هەروەها باسی ئەوە دەکرێ رێبەر و دامەزرێنەری مەکتەب قورئان ئەوەندە لە توێژی مەلا بێزار بووە کە قەت رازی نەبووە پێی بڵێن «مەلا» یان «مامۆستا».
بەدەر لەو ئاڵوگۆڕانەی بەسەر مەکتەب قورئاندا هاتووەو بە پێی ئەو خەسڵەت و تایبەتمەندییانەی ئەم رێکخراوە بوویەتی و هەیەتی، ئەتوانین مەکتەب قورئان بە رێکخراوێکی شلڕەوی ئیسلامی ناو ببەین چونکوو بەڕای من ئەوان نەیانتوانیوە یان نەیانویستووە بە تەواوی پەیڕەوی لە قورئان و سوننەت بکەن بە تایبەت مك ئێوەش ئاماژەتان پێداوە رێبەری گروپەکە پاش ئازادبوونی لە زیندان ئاڵووگۆڕێکی وای بەسەردا هاتبوو کە بە هیچ شێوەیەك باوەڕی بە تەکفیر نەبوو و هەموو کەسێکی بە موسوڵمان ئەزانی و لە (سی دی) کوفر و ئیماندا بە روونی باسی ئەم بابەتە ئەکات.

**ماوەیەك پاش مردنی ئەحمەدی موفتی زادە، مەكتەب قورئان بوو بە دوو بەشەوە یان بە واتایەكی تر تووشی دابڕان هات. جەماعەتێك بە ڕیبەری «حەسەن ئەمینی» جیابوونەوەی خۆیان لە بەشی زۆرینە واتە بەشی «شۆرای مودیرییەتی مەكتەب قورئان» ڕاگەیاند. هەندێ ئاماژە باس لە گەورەیی قەبارەی باڵی شۆرا دەكەن و ژمارەی ئەندامانی ئەم لقەی مەكتەب قورئان و هەروەها ڕووبەری چالاكی و تێكۆشانیان سەلمێنەری ئەم ڕاستییەن. ڕای جەنابت لەمبارەیەوە چییە؟ جیا لەوە ئایا لەباری بیروبۆچوونەوە جیاوازییەكی زەق و بەرجەستە لە نێوان دوو لایەنەكەی مەكتەب قورئاندا ئەبینرێ؟**

لە سەر دوو بەشەكەی مەكتەب قورئان واتە قۆڵی مەكتەب قورئانی كوردستان و قۆڵی شۆرای مودیرییەتی مەكتەب قورئان، بە پێچەوانەی بۆچوونەكەی ئێوە من قەبارەی هیچكامیان بە گەورە یان بچووك دیاری ناكەم چونكوو بە دروستی ئاگاداری ڕادەی نفووز و جەماوەریان نیم و لەو باوەڕەدام كە هەردوولا لە جێی خۆیاندا شوێنكەوتوو و لایەنگریان هەیە. هەروەها بە نیسبەت پابەندبوونیان بە بیروڕاكانی كاك ئەحمەدی موفتی زادەشەوە هەریەك لەم قۆڵانە بە نیسبەت و ئەندازەیەك بەم بیروڕایانە وەفادارن. سەرباری ئەوەش دیسان هەندێ فەرق و جیاوازییان پێكەوە هەیە بۆ نموونە تاقمەكەی حەسەنی ئەمینی تا ڕادەیەك هەوڵی شكاندنی تەوقی دوورەپەرێزی و گۆشەگیرییان داوەو وازیان لە خۆپەسەندی ڕێكخراوەیی هێناوەو لەباری فیكر و مەنهەجیشەوە زیاتر لە تاقمەكەی سەعدی قورەیشی، لە كیتاب و سونەتەوە نزیكن و تەنانەت لە مەسەلەی تەكفیریشدا جیاواز لە ئەحمەدی موفتی زادە بیر ئەكەنەوەو لەو باوەڕەدان كە خەڵكانی كافر بوونیان هەیە بەڵام دیسان كێشەیان هەیەو بە پارێزەوە هەڵسووكەوت لەگەڵ مەسەلەی تەكفیردا دەكەن.
بە نیسبەت بیروبۆچوونی مەكتەب قورئانەوەو ئەوەی لە چ جۆر بیروباوەڕێكی ئیسلامیانەوە پێڕەوی دەكەن، بۆچوونی لایەنەكەی سەعدی قورەیشی تا ڕادەیەك لە بۆچوونی «كۆمەڵی قورئان/ القرانیون»ی پاكستانەوە بە نزیك ئەزانم كە ئەیانەوێ تەنها لە قورئانی پیرۆز سوود وەرگرن و هیچ كارێكیان بە حەدیس و فەرموودەكان بە هەموو جۆرەكانییەوە نییە. ئەوان هەر شتێك كە لە قورئاندا ڕاستەوخۆ دیاری نەكرابێ و حوكمی لە سەر نەدرابێ، بە پێی ئەقڵ و لێكدانەوەی شەخسیی خۆیان بەكار ئەهێنن و سوودی لێ وەرئەگرن و بە گشتی ئاوەز و ئاوەزخوازی لای ئەوان پێگەو پلەیەكی تایبەتی هەیە. لایەنەكەی حەسەنی ئەمینییش تا ڕادەیەك بە هاوشێوەی «بزووتنەوەی نووری ئیسلامی» توركیا ئەزانم كە سەرچاوەی فیكری ئەم گرووپە ئەندێشەو بیروبۆچوونەكانی (سەعیدی نەوڕەسی)یە. ئەوانیش باوەڕیان بە توندوتیژی تەنانەت لە ئاستی مامناوەندیشدا نییەو شێوازی كاری ئیخوانولموسلیمینیشیان بەلاوە توندڕەوانەیەو بەردەوام ڕەخنە لەم گرووپەو گرووپە ئیسلامییەكانی تر دەگرن. ئەوان لەو باوەڕەدان كە زۆربەی گرووپ و ڕێكخراوە ئیسلامییەكان شێوازێكی توند و پەلەپەلیان بە مەبەستی گێڕانەوەی خەڵكی بۆلای بنەماكانی ئایینی ئیسلام گرتۆتە پێش. هەروەها ئەتوانین (جەماعەت تەبلیغ) و (حزبی تەحریر)یش لەم بازنەیەدا بگونجێنین و بڵێین ئەم چوارە واتە ( كۆمەڵی قورئان / القرانیون)، (بزووتنەوەی نووری ئیسلامی)، (جەماعەت تەبلیغ) و (حزب التحریر) لە باری عەقیدەتی و مەنهەجییەوە زۆر لە یەكتر نزیكن. تایبەتمەندی بەرجەستەی هەرهەمووشیان ئەوەیە كە بایەخێكی وەها بە (سوننەت) نادەن و زیاتر لایەنی ئاوەزخوازییان بەرجەستەیەو مەكتەبی قورئانیش بە هەردوو باڵەكەیەوە پێڕەویی لە شێوازی كاری ئەم گرووپانەوە ئەكات.

**وەك ڕوونكردنەوەیەك بۆ خوێنەر: دوای شكستخواردنی ئەزموون و ئایدیای دروستكردنی حكوومەتێكی خودموختاری ئیسلامی لە ڕۆژهەڵاتی كوردستان، گرووپی مەكتەب قورئان «هیجرەت»یان بۆ شاری كرماشان كرد و وازیان لە كاروباری**

سیاسی پەتی هێنا. لەوێ لەگەڵ سوننەکانی تری ناو ئێراندا شۆرایەکیان بە ناوی «شۆرای شەمس» دانا و لە یەکەم بەیاننامەدا هێرشێکی توندیان کردە سەر کۆماری ئیسلامیی ئێران کە بەڵێنەکانی خۆی لە ئاست سوننەکاندا جێبەجێ نەکردووە. ئیخوانەکانیش لەرێی کەسانی وەك عەبدولڕەحمان پیرانی، عەبدولڕەحمان یعقوبی و ناسری سوبحانییەوە راستەوخۆ بەشدارییان لەو شۆرایەدا کرد، با ئەوەش بڵێین کە ناسری سوبحانی فیکرەی ئیخوانی هەبوو بەڵام لەو سەردەمەدا ئیخوانەکان کە رێکخراوێکی سەربەخۆیان لە کوردستانی ئێراندا نەبوو پشتیوانییان لە مەکتەب قورئان نەکرد. ئەوان دواتر گروپی «دەعوەت و ئیسلاح»یان دامەزراند کە دواتر باسی لێوە ئەکەین، بەڵام شۆرای شەمس سەرەرای ئەو رووبەرە بەرینە کە بانگەشەی بۆ ئەکرد نەیتوانی لە مەیدانی کردەوەدا کارێکی ئەوتۆ بکات.
بێینەوە سەر باسەکەی خۆمان. لە هەمان سەروبەندی شۆڕشی ئێراندا کەسێك بە ناوی «عەبدولقادری تەوحیدی / بانەوڕەیی» دەستیدایە دامەزراندنی رێکخراوێکی ئیسلامیی کە باوەری بە چەمکی جیهاد هەبوو و تەنانەت بە کردەوەیش شەڕیان لەگەڵ ئێراندا ئەکرد. تکایە وردەکاری و سەربوردەی ئەو پیاوەو جووڵانەوەکەی و شێوازی بیرکردنەوەیمان بۆ بگێرەوە.

ئەوەندەی من بزانم مامۆستا عەبدولقادری تەوحیدی سەر بە عەشیرەتی (ئیمامییە)و خەڵکی دێیەکی ناوچەی روانسەرە بەناوی بانەوڕە. ئەگەر هەڵەم نەکردبێ لەدایکبووی کۆتاییەکانی دەیەی چلی زایینی یان سەرەتای پەنجاکانەو لە بوارەکانی فیقە و تەفسیر و فەرموودەدا شارەزاییەکی زۆری هەیە. دەوترێ لە سەرەتای شۆڕشی ١٩٧٩دا پێوەندیی لەگەڵ ئەحمەدی موفتی زادەو گروپی مەکتەب قورئاندا هەبووەو پشتیوانی لێوە کردوون. ئیتر نازانم پێش شۆڕشیش هەر پێکەوە کاریان کردووە یان نە چونکوو بەوجۆرەی من بیستوومە دەستەی مەکتەب قورئان لە سەروبەندی شۆڕشدا دژی رژێمی پاشایەتی خەباتی چەکدارییان کردووەو رۆڵی باشیان بینیوە لە شەڕکردن لەگەڵ هێزەکانی دەسەڵاتی پاشایەتیدا. بەڵام لام روون نەبۆتەوە کە جەماعەتی عەبدولقادری تەوحیدیش بەشدارییان لە رووخاندنی رژێمی شادا کردووە یان نە.
پاش سەرکەوتنی شۆڕش و هاتنەسەرکاری کۆماری ئیسلامی، جەماعەتی تەوحیدی لەگەڵ ئەم حکوومەتەدا کەوتوونەتە شەڕ و واشبزانم بەشێکی شەڕ و رووبەڕوو بوونەوەکانیان بە هاوکاری و هاوڕێیەتی رێکخراوی مەکتەب قورئان لە ناوچە شاخاوییەکانی نزیك شاری سنە ئەنجام داوەو دواتر بە تەنیایی لە ناوچە شاخاوییەکانی جوانڕۆ و پاوەو روانسەر درێژەیان بە شەڕی چەکداری دژی دەسەڵاتی ئێرانی داوەو پاشان روویان لە وڵاتی عێراق کردووەو بوونەتە پەنابەر و بەمەش کار و چالاکی ئەم گروپە لە کوردستانی ئێران بەرەو کەمڕەنگ بوونەوە رۆیشتووە. پاش چەندساڵ متبوون و بێدەنگە کردن، گروپەکەی تەوحیدی لە رێگای لایەنگرەکانییەوە لە کوردستانی ئێران، دەستی بەکار کردەوە بە تایبەت پاش راپەرینی ١٩٩١ی کوردستانی عێراق ئەم گروپە رەوتێکی نوێی کاری رێکخستن و چالاکی تەبلیغییان دەستپێکرد.
دروستبوون و دەستبەکاربوونەوەی گروپەکەی تەوحیدی هەر لە سەرەتاوە بە شێوەی (تجمُعات العسكريه) بووە واتە وەك گروپێکی سەربازی دەرکەوتووەو لەگەڵ دەسەڵاتی ئێرانییدا شەڕی کردووە. لە رووی شێوازی کارکردن و چۆنیەتی دامەزرانیشەوە هاوشێوەی بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستانی عێراق بووە. لە باری فیکری و منهەجییشەوە ئەم دوانە زۆر لە یەکتر نزیك بوون بەجۆرێك کە ئەگەر بیروباوەڕیشیان سەلەفییەتێکی تۆخ نەبووبێت یان نەبێت بەڵام رەنگ و بۆی سەلەفییانەیان پێوە دیار بووەو ئەتوانین بڵێین ئەم دوو گروپە زەمینەی سەرهەڵدانی سەلەفییەتی جیهادییان لە هەردوو کوردستانی ئێران و عێراقدا رەخساندووەو یەکەم جیلی سەلەفی جیهادی لە دڵی ئەم گروپانەوە هاتۆتەدەر.

ئەوەندەی ئێمە زانیاریمان هەیە عەبدولقادری تەوحیدی ئێستا نیشتەجێی باشووری کوردستانە، ئەو پاش شۆڕشی ۱۹۷۹ی ئێران هەستا بە دامەزراندنی ڕێکخراوێکی چەکداری ئیسلامی بەناوی بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستانی ئێران. کەوایە ئەم گروپە لە سەردەمی شادا وجوودی نەبووەو بەشداری لە رووخاندنی رژێمی پاشایەتیدا نەکردووە. هەروەها گروپی مەکتەب قورئانیش هیچ کات تێکەڵی شەڕی چەکداری نەبووە بە تایبەت لە سەردەمی حکوومەتی شادا. تەنیا دوای شۆڕشی ۱۹۷۹ و رێکەوتنیان لەگەڵ کۆماری ئیسلامیدا ئەو گومانەیان هاتە سەر کە لە دامەزراندنی تاقمی «پێشمەرگەی موسوڵمان»دا دەوری سەرەکییان بووە. خودی مەکتەب قورئان ئەم مەسەلەیە رەت دەکەنەوەو دەڵێن قەت لە دامەزران و کاروباری پێشمەرگەی موسوڵماندا خاوەن رۆڵ نەبوون.
بە هەرحاڵ بابێینەوە سەر رەوتی باسەکەمان. لە باشووری کوردستان پاش شکستهێنانی لەشکری ئیسلامی، «بزووتنەوەی ئیسلامی» دامەزراو تا ئێستاش هەر ماوەتەوەو سەرەڕای ئەو هەموو هەوراز و نشێوەو پێچەوانەی زۆر حیزب و تاقمی دیکە هێشتا لەناو نەچووە. بزووتنەوە چۆناوچۆن و لە لایەن چ کەسانێکەوە دامەزراو داوای چی دەکرد؟

بەڕێزان لەگەڵ رێزمدا، قسەکانتان هەندێکی هەندێکی تری رەت دەکاتەوەو پێکەوە جۆر دەرنایەت بۆ نموونە ئەگەر مەکتەب قورئان هیچکات تێکەڵی شەڕی چەکداری نەبووە چۆن بەرەنگاری چەکداری حیزبە کوردییەکانی کردووە؟ ئەگەر مەکتەب قورئان بۆخۆیان ئەمە رەت ئەکەنەوەو ئەڵێن قەت لە دامەزرانی پێشمەرگەی موسوڵماندا نەقشیان نەبووە ئەی چۆن ئاوەها گومانێکیان هاتە سەر کە گوایە لەم کارەدا رۆڵی سەرەکییان گێڕاوە؟ هەروەها ئەوەی کە من وتوومە ئەوان دژی رژێمی شا شەڕیان کردووە نە قسەیەکە لە گیرفانی خۆم دەرمهێنابێ و نە دەمهەوێ ئەوانی پێ بەرز بکەمەوە. ئێمە باسی رووداوێکی مێژوویی ئەکەین و پێویستە شتەکان بەوجۆرەی کە بیستوومانەو بینیومانە بگێڕینەوە. من کە ئەڵێم مەکتەب قورئان ئاوەها رۆڵێکی گێڕاوە وەکوو شاهیدێکی زیندوو ئەمە ناڵێم بەڵکوو من ئەمەم بیستووە. هێشتا زۆر کەس لە ژیاندا ماون کە شاهێدی بۆ ئەم راستییە ئەدەن. لە راستیدا شاهیدەکان ئەوەندە زۆرن کە بە هیچ شێوەیەک ناتوانین رۆڵی ئەندامانی مەکتەب قورئان لە شەڕی شاری سنەدا ئینکار بکەین و لەگەڵ رێزمدا بۆ ئێوە ئینکارکردنی ئەم راستییە لە لایەن هەر کەسێکەوە بێت بێ ویژدانییە. هەروەها بە نیسبەت ئەوەیشەوە کە وتووتانە مەکتەب قورئان گومانی ئەوەیان لەسەرە کەوا رۆڵیان لە دروستکردن و دامەزراندنی تاقمی پێشمەرگەی موسوڵماندا بووە، لە راستیدا من چاوەڕوانی ئەوەم لە ئێوەن نەدەکرد کە شتی ئاوا بێ بەڵگەو بنەما بڵێن. ئەمە هاوشێوەی بیروباوەڕی هەمان ئەو کەسانەیە کە ئیدیعا دەکەن گۆیا بن لادەن پیاوی ئەمریکایەو ئەمەش درۆیەکی گەورەیە. ئەگەر مەکتەب قورئان ئەم هەموو خۆشخزمەتییەی بە کۆماری ئیسلامی کردووە هۆی چی بوو دەسەڵاتی ئێرانی بەوجۆرەی لەگەڵ کردن و بەشی هەرەزۆری ئەندامەکانی ئەم گروپەی بە ئەحمەدی موفتی زادەیشەوە رەوانەی زیندان کرد و بەشێکی تریانی دوورخستەوە بۆ شار و ناوچەکانی تری ئێران، هەروەها ژمارەیەکیانی کوشت و ئێعدام کرد و بۆ ماوەیەکی زۆریش پێشی بە هەرجۆرە تێکۆشان و چالاکییەکی ئەوان گرت.
ئێستا با بێمە سەر باسی چۆنیەتی دروستبوونی بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستانی عێراق. ئەوەندەی من ئاگادارم لە ساڵی ۱۹۸۲ی زایینی بەدواوە کوردە ئیسلامخوازەکانی کوردستانی عێراق بەهۆی زەبروزەنگی رژێمی بەعس ودرێژەکێشانی شەڕی ئێران و عێراقەوە روویان لە وڵاتی ئێران کرد و وەك پەنابەر لە کەمپ و ئۆردووگاکانی ئەم وڵاتەدا نیشتەجێ بوون. ئەم ئاوارە بوون و راکردنە هۆکاری تریشی هەبوو بۆ نموونە ترس لە سەربازی و بەزۆر راپێچکران بەرەو بەرەکانی شەڕ، کەوتنە بەر هەڕەشەی ئەو هێزە چەپ و عیلمانییانەی کە بەناو بۆ لابردنی ستەمی چینایەتی و نەتەوەیی خەباتیان دەکرد و کۆنترۆڵی هەندێ ناوچەی کوردستانی عێراقیان بەدەستەوە بوو. ئەم هێزانە بەرەبەرە

دەستیان دابووە تیرۆرکردن و لەناوبردنی مەلا ناودارەکان و کەسایەتییە ئیسلامییە ناسراوەکان. مەلا ئەحمەدی تیمار یەکێك لەو کەسانە بوو کە ساڵی ١٩٨٢ لە دەورووبەری رانییە بە دەستی ئەم لایەنانە کوژرا. لەو سەردەمەدا کە ئیسلامییەکانی باشووری کوردستان لە کەمپ و ئۆردووگاکانی ئێراندا کۆ بووبوونەوە، بەرەبەرە هەستیان بە پێویستی و زەروورەتی دامەزراندنی رێکخراوێکی ئیسلامی دەکرد و هەر لەو کاتانەدا یەکەم زەمینە فیکرییەکانی دروستکردنی ئاوەها رێکخراوێك هاتە ئاراوە. ئەمە لە حاڵێکدا بوو کە لایەنی خانەخوێ واتە کۆماری ئیسلامی پێی خۆش بوو لە پاڵ حزبە نەتەوەیی و عیلمانییەکاندا حزبێکی ئیسلامییش هەبێ کە دژایەتی رژێمی بەعس بکاو ئامادە بوو هەموو جۆرە یارمەتییەك بدا تاکوو ئاوەها رێکخراوێك دروست ببێ.

بەوجۆرەی کە من بیستوومە لە سەردەمی کەمپ نشینیاندا لە ئێران، کۆماری ئیسلامی بەردەوام هانی کوردە ئیسلامخوازەکانی کوردستانی عێراقی داوە تاکوو هەوڵی دامەزراندنی رێکخراوێکی ئیسلامی بدەن بۆ ئەوەی هەم هەیمەنەو مانا ببەخشنە هێز و توانای خۆیان و هەمیش هیوا ببەخشنە ئەو جەماوەرە موسوڵمانەی ماوەیەکی زۆر بوو چاوەڕوانی شتێکی وایان دەکرد. لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٨٤/١٩٨٦دا یەکەم بەرهەمی رێکخراوەیی ئیسلامیی کوردستانی عێراق بە ناوی «رابطة الاسلامیه الکردیه» بە سەرکردەیی مەلا شێخ لەتیف دامەزرا. پاش لەشکری ئیسلامی ئەمە دووهەم رێکخراوی ئیسلامیی کوردی بوو لە کوردستانی عێراق دائەمەزرا. ئەم رێکخراوە تا ساڵی ١٩٨٨ جگە لە شێخ لەتیف، دوو سەرکردەی تریشی ئەزموون کرد کە بریتی بوون لە ماموستا عەبدولرەحمان نەورەسی و ماموستا شێخ موحەممەدی بەرزنجی. هەروەها هەر لەو ساڵانەدا بوو کە ئەم رێکخراوە ناوی خۆی گۆڕی بۆ «حرکة الاسلامیه الکردستان» واتە بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستان کە ئەم ناوە هاوشێوەی ناوی ئەو رێکخراوەیە بوو چەند ساڵ پێشتر لە لایەن ماموستا عەبدولقادری تەوحیدییەوە لە کوردستانی ئێران دامەزرابوو بەڵام ئەوەی کە ئەم لێکچوون و هاوشێوەییە پێوەندیی بە چییەوە هەیە نازانم.

سەبارەت بەوەی کە بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستانی عێراق پابەندی کامە فیکرەو بیروباوەڕ بووەو لە سەر چ مەنهەجێك دامەزراوەو شێوازی کارکردنی چۆن بووە، ئەتوانم بڵێم ئەم رێکخراوە بە شێوەیەکی گشتی و هەمە لایەنە بانگەشەی ئیسلامەتی و داکۆکیکردن لە شەریعەتی ئیسلام ئەکرد. بەهۆی ئەوەوە کە ئەم گروپە پێکهاتبوو لە کەسانێك بە روانگەو بیروبۆچوونی ئیسلامییانەی جیاوازەوە بۆیە لە بەرنامەکەیدا جەخت لە سەر بیرۆکەیەکی تایبەت نەکرابوو. جیهاد دژی رژێمی بەعس و خەبات بۆ دابینکردنی مافەکانی خەڵکی کوردستانی عێراق و گێڕانەوەی کۆمەڵگای کوردی بۆسەر نەریت و ئەحکامە پیرۆزەکان، سەرەکی ترین بەرنامەو داواکارییەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی بوو.

کاك ..... گیان! مەبەستمان لەو روونکردنەوەیە تەنیاوتەنیا راستکردنەوەی هەڵەکەی جەنابت بوو نەك ئەتککردنی مەکتەب قورئان. لێرەشدا هەوڵمان داوە بێلایەنی خۆمان بپارێزین. ئەوەتا وتوومانە مەکتەب قورئان تۆمەتی دروستکردنی (پێشمەرگە موسوڵمان) رەت دەکەنەوە یان وتوومانە ئەم گروپە گومانی لەسەرە کە گۆیا لە دروستکردنی تاقمی (پێشمەرگە موسوڵمان)دا دەستی هەبووە. ئەمەش نیشاندەری ئەوەیە کە نەمانویستووە تەنیا قسەی دژبەران یاخود نەیارانی موفتی زادەو مەکتەب قورئان بنووسینەوەو بایەخ بە هەڵوێستی خۆیان نەدەین.

وادیارە ئەو کەسانەی باسی رووداوەکانی سەروبەندی شۆڕشی ئێرانیان بۆ جەنابت کردووە شتەکانیان بە هەڵەو پێچەوانە باس کردووە چونکوو باسی ئەوە دەکرێ بەشی زۆری ئەوانەی تاقمی پێشمەرگە موسوڵمانیان دامەزراند ئەندامانی مەکتەب قورئان و کەسانی نزیك لە ئەحمەدی موفتی زادە بوون. هەروەها بە تەواوی روون و ئاشکرایە کە

**ئەحمەدی موفتی زادەو رێکخراوی مەکتەب قورئان کە خوازیاری دامەزراندنی خودموختارییەکی ئیسلامیانە بوون لە رۆژهەڵاتی کوردستان، بە مەبەستی گەیشتن بەم خواستە پاڵیان بە کۆماری ئیسلامییەوە دا لە حاڵێکدا کە لەو سەردەمەدا هاودەستبوون و هاوکاریکردنی حکوومەتی ئیسلامی تازە بە دەسەڵات گەیشتوو ئەیتوانی تۆمەتی خیانەتی بۆ هەر لایەنێك بەدواوە بێ.**

**بەڵام با لایەنێکی دیکەی هەڵەکانی جەنابیشت روون بکەینەوە، پاش راپەرینی ١٣٤٧/١٣٤٦ی هەتاویی رۆژهەڵاتی کوردستان کە سەرکوتی راپەرینەکەو کوژرانی ژمارەیەك لە شۆڕشگێڕانی کوردی بەدواوە بوو هیچ جۆرە شەڕێکی چەکداری دژی حکوومەتی پاشایەتی لە رۆژهەڵاتی کوردستان رووی نەداوە. لە سەردەمی شۆڕشیشدا (١٩٧٩) تێکڕای بزووتنەوەی کوردستان بە مەکتەبی قورئانیشەوە لە رێپێوان و جووڵانەوە مەدەنییەکاندا دەوریان هەبوو و تەنیا چەند شەڕێك رووی دا ئەویش بە مەبەستی چەککردنی پادگانەکان بۆ نموونە پادگانی سنەو مەهاباد کە مەکتەب قورئان بە هیچ جۆر بەشداریی تێدا نەکردوون. ئەمانە راستییە مێژووییەکانن و لە هەموو سەرچاوەکاندا تۆمار کراون. پاش شۆڕشیش مەکتەب قورئان بەهۆی ئەوە پاڵی بە کۆماری ئیسلامییەوە دابوو بەشداریی شەڕی چەکداریی شار و شاخی نەکرد بەڵام هەروەك باسکرا گومانی ئەوەیان لەسەر بوو کە بە وەرگرتنی چەك و یارمەتی لە کۆماری ئیسلامی ژمارەیەك لە هێزەکانی خۆیان چەکدار کردووەو بنکەی چەکدارییان لە هەندێ لە شارەکان کردۆتەوە. روونکردنەوەی ئەم راستییانە بەمانای ئەتککردنی مەکتەب قورئان نییەو تەنیا هەوڵی خوێندنەوەی دروستی رووداوەکانە، ئێمە وەك کەسانی بێلایەن و بە مەبەستی شیکردنەوەی دروستی رەوتە ئیسلامییەکانی کوردستان ئەم قسانە ئەکەین. ئەوەی کە مەکتەب قورئان شەڕی چەکداریی دژی حکوومەتی شاو کۆماری ئیسلامی نەکردووە بە مانای بێبایەخکردنی ئەو رێکخراوە نییە. ناکۆکی سەرەکی ئەحمەدی موفتی زادەو عەبدولقادری تەوحیدی ئەوە بوو کە تەوحیدی متمانەی بە بەرپرسانی کۆماری ئیسلامی نەبوو و هەبوونی هەرجۆرە پێوەندییەکی لەگەڵ ئەم رژێمەدا رەت دەکردەوەو باوەڕی بە شەڕی چەکداری و جیهادکردن بوو بەڵام کاك ئەحمەد بە تەواوی پێچەوانەی ئەو بیری دەکردەوە. ئەگەر جەنابت بەڵگەیەکت بۆ قسەکانی خۆت هەیە تکایە بۆمانی باس بکە.**

بەڕێزان وادیارە ئێوە سوورن لە سەر ئەوە کە مەکتەب قورئان نە شەڕی شای کردووەو نە شەڕی کۆماری ئیسلامی و چەختیشتان کردۆتەوە کە ئەم گروپە دەوری بووە لە دامەزراندنی تاقمی پێشمەرگەی موسوڵماندا. بە داخەوە هەلومەرجی ئێمە لەم بەندیخانەیە بە جۆرێکە دەستمان بە هیچ شوێن و شتێك راناگا تاکوو سەبارەت بە ئیدیعاکانمان بەڵگەی پێویست بخەینە بەردەست. سەرباری ئەوەش ئەکرێت هەر بەو شتە تیۆرییانەی کە لە زەینماندایە هەوڵی سەلماندنی باشتری ئیدیعاکانمان بدەین. ئێوە کە ئەوەندە پێداگرن لەسەر ئەوەی گۆیا مەکتەب قورئان تۆمەتی ئەوەیان لەسەرە کە تاقمی پێشمەرگەی موسوڵمانیان دامەزراندووە بۆچی نێوی چەند کەس لەو ئەندامانەی مەکتەب قورئان نابەن کە ئەندامی پێشمەرگەی موسوڵمان بوون و دەستیان بووە لە دروستکردنی ئەو تاقمەدا. گریمان ئەم ئیدیعایە راستە ئەی بۆچی لەو سەردەمەدا هەموو حزب و گروپە چەپ و نەتەوەیی و عیلمانییەکان خاوەنی هێزی چەکداری خۆیان بوون بەڵام ئەگەر ژمارەیەك ئەندامی مەکتەب قورئان چەکدار ئەبن ئەمە ئەکەن بە بیانوو بۆ لێدان و هێرشکردنە سەر ئەم گروپە، بۆچی ئەوان ئامادە بوون لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندیدا دانووستان و وتووێژ بکەن بەڵام مەکتەبی قورئان بۆی نەبوو ئاوەها کارێك بکات و ئەگەر ئەمکارەی بکردایە تۆمەتی خیانەتی لێ ئەدراو..... ئەگەر ئێوە بێلایەنن و ئەتانەوێ راستییەکان دەربخەن پێویستە بەدوای وەڵامی ئەم پرسیارانەداو دەیان پرسیاری تردا بگەڕێن تاکوو راستییەکانتان بە تەواوی بۆ دەرکەوێت و جەماوەریشی لێ ئاگادار بکەنەوە. بێگومان مەکتەب قورئان بە هەردوو باڵەکەیەوە پێویستە بە پێی ئەو بەڵگەو سەنەدانەی بە دەستیانەوەیە هەوڵی سڕینەوەی لێڵییەکان بدەن کە ئەوەندەی من بزانم تاکوو ئێستا ئەم

کارەیان نەکردووە. سەبارەت بەوەی کە وتووتانە عەبدولقادری تەوحیدی و ئەحمەدی موفتی زادە ئاوەها ناکۆکییەکیان بووە من ئاگاداری ئاوەها شتێك نیم بەڵام بێگومان ئەگەر شتی وا بووبێت ئەوا ئەمە سەلمێنەری راستبوونی شتەکانی ئێوەیە.

**ئەڵبەت باس و خواس و گومانی زۆر لە سەر هەڵوێست و کردارەکانی مەکتەب قورئان لە سەرەتای شۆڕشی ئێراندا هەیە کە هیوادارین بتوانین لە داهاتوودا لەگەڵ یەکێك لە ئەندامانی شارەزای مەکتەب قورئاندا وتووێژ بکەین و لەو باسانە بکۆڵینەوە.**

**با ئەم باسە دابخەین و بچینەوە سەرەتای بابەتی ئەسڵیی وتووێژەکەمان، ئەوتریْ رێکخراوگەلێکی تری ئیسلامی پێش و پاش بزووتنەوەی ئیسلامی دامەزران کە یەکێك لەوانە لقی ئیخوانی شێخ سدیق عەبدولعەزیز بوو کە لە ١٩٧٩دا دامەزراو لە کۆتایی ئەوەدەکاندا لەگەڵ بزووتنەوەی ئیسلامی مەلا عوسمان عەبدولعەزیزی برایدا یەکیان گرت و (حەرەکی وەحدەتی ئیسلامی/ بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامی)یان دروست کرد. لقێکی دیکەی ئیخوان (جماعە الانصار الاسلامیە) بوو کە لە هەشتاکاندا دامەزرا. عەبدولرەحمان ئازادیی کەسی یەکەم و سەلاحەدین بەهادین کەسی دووهەمی ئەم رێکخراوە بوون. ئەم حیزبە دوای ماوەیەك هەڵوەشایەوە بەڵام بیرۆکەکەی مایەوەو لە ١٩٩٤دا یەکگرتووی ئیسلامی لەسەر دامەزرا. لە لایەکی ترەوە ساڵی ١٩٧٨ی زایینی -وەك خۆیشت پێشتر وتبووت- رابیتەی ئیسلامی لە لایەن شێخ موحەممەدی بەرزنجییەوە دامەزرا کە لە ١٩٨٨داو پاش کارەساتی هەڵەبجە مەلا عوسمان عەبدولعەزیزیش تێکەڵ بەم گروپە بوو و ئەمەش دروستبوونی بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستانی عێراقی لێکەوتەوە. چەندین و چەند تێکەڵبوون و ئاوێتە بوونی هاوشێوە لەم قۆناغەی جووڵانەوەی ئیسلامییانی کوردستاندا دەبینریْ. بۆچی ئەم جووڵانەوەیە ئاوا پرژ و بڵاو و پڕ رێکخراو بوو؟ ئایا نەدەکرا ئیسلامییانی کوردستان لە چوارچێوەی یەك رێکخراودا یەك بگرن و بەر بەم هەموو شپرزەییە بگرن؟**

بیرۆکەی دامەزراندنی رابیتەی ئیسلامیی کورد ساڵی ١٩٨٤ زایینی هاتە ئاراوە بەڵام ئەم رێکخراوە ساڵی ١٩٨٦زایینی دامەزرا. رابیتەی ئیسلامی لە نێوان ساڵەکانی ١٩٨٦/١٩٨٨دا سێ سەرکردەی گۆڕی کە بریتی بوون لە مەلا لەتیف، مەلا عەبدولرەحمانی نەورەسی و شێخ موحەممەدی بەرزنجی. پاش کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە مامۆستا عوسمان عەبدولعەزیز بوو بە رابەری گشتی ئەم رێکخراوە کە ناوی خۆی گۆڕیبوو بۆ بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستانی عێراق. ئەگەر بمانەویْ بە شێوەیەکی بنەمایی باسی ئەم رێکخراوە بکەین و لە بنچینەو بنەماکانی بکۆڵینەوە پێویستە باسی ئەو رەوتە ئیسلامخوازییە بکەین کە ئەم رێکخراوەی تیادا لە دایك بوو.

لە دەیەی حەفتاکانی زایینیدا رەوتێکی بەرین و بەربڵاوی ئیسلامخوازی لە کوردستانی عێراقدا دەستی پێکرد کە ئەم رەوتە لە ناوچەی شارەزووردا جیدی تر بوو و دانیشتوانی ئەم دەڤەرە پێشوازییەکی گەرم و گوڕتریان لێوە کرد و ئەمەش بووە هۆی ئەوە کە بەشداری شارەزوورییەکان لە حزب و رێکخراوە ئیسلامییەکاندا بەرچاوتر بێت و هەروەها بووە هۆی ئەوە خەڵکی ئەم ناوچەیە لە ئاستی رێبەرایەتی و قیادەی رێکخراوە ئیسلامییەکاندا بە رێژەیەکی زۆرەوە بەشدار بن. خوالێخۆشبوو مەلا موحەممەدی شارەزووری، مامۆستا بەهادین باوکی ئەمینداری گشتیی یەکگرتووی ئیسلامی، شێخ عەبدولعەزیز باوکی مەلا عەلی و مەلا عوسمان و مەلا شێخ سدیق، مامۆستا ئەحمەدی کاکە مەحموود، شێخ نەزیر تەوێڵەیی باوکی مەلا لوقمان سەرکردەی جوندولا کە ئەوتریْ ئێستا ئەندامی یەکگرتووی ئیسلامییە، مەلا شێخ سدیق سەرگەتی، مەلا موحەممەدی سازانی، شەهید مەلا عەلی بیارەیی و شەهید مامۆستا سەیفەدین هەڵەبجەیی

و..... هتد، بەشێکن لە رێبەر و سەرکردەی حیزب و رێکخراوە ئیسلامییەکان و هەموویان خەڵکی دەڤەری شارەزوورن. ئەڵبەت ئەمە بە مانای کەمڕەنگ کردنەوەی رۆڵ و دەوری خەڵکی ناوچەکانی تری کوردستانی عێراق نییە لە سەحوەی ئیسلامییدا بەڵکوو تەنیا بۆ دیاریکردنی جێگەو پێگەی خەڵکی ناوچەی شارەزوورە لە گۆڕەپانی ئیسلامەتیدا.

لە نێوان ساڵانی ١٩٨٦/١٩٨٨زاییینیدا چەند گروپێکی بچووك لە بزووتنەوەی ئیسلامی جیابوونەوە کە یەکێکیان گروپی «جوندولاّ» بوو بە سەرکردەیی مەلا لوقمانی کوڕی شێخ نەزیر تەوێڵەیی. ئەم گروپە ساڵی ١٩٨٧ لە بزووتنەوە جیا بۆوەو تا ساڵی ١٩٩٢ واتە ساڵێك پاش راپەڕینی کوردستانی عێراق، بەردەوام بوو لە کار و چالاکی و پاشان پووکایەوە. مەلا لوقمان ئێستە نیشتەجێی شاری سنەیەو ساڵانێکی زۆرە لەوێ بەسەر ئەبات. لە سەرووبەندی راپەڕینی ١٩٩١ی زاییینیدا شێخ ئیبراهیم ناوێك کە پێشتر ئەندامی پارتی (پارتی دیموکرات) بوو و لە رێگای ئۆردووگاکانی ئێرانەوە لەگەڵ ئیسلام و ئیسلامییەکاندا ئاشنا بووبوو، لە پارتی جیا بۆوەو کۆمەڵی «جیش الاسلام»ی دامەزراند بەڵام ئەم گروپەش پاش ماوەیەك هەڵوەشایەوە.

بەڕای من رەوتی بووژانەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق لە ساڵانی نێوان ١٩٧٩ تا ١٩٩١زاییینیدا دوو تەوژمی فیکری ئەزموون کرد. یەکەم، تەوژمی ئیخوانولموسلیمین. دووهەم، تەوژمی سەلەفییەت و جیهادی گەری. ساڵی ١٩٧٨ ژمارەیەك لە ئەندامانی ئیخوانولموسلیمین لەم رێکخراوە جیا بوونەوە کە مەلا شێخ سدیق رابەرایەتی ئەکردن، ئەم جەماعەتە کە بە ئیخوانی خەتی دوو نێوبانگیان دەرکردبوو ساڵی ١٩٩٢ حزبێکیان بە ناوی بزووتنەوەی راپەڕینی ئیسلامیی کورد (حرکة النهضة الاسلامیه الکردیه) دروست کرد. هەر لە نێوان ساڵانی ١٩٨٤/١٩٨٦دا دوو گروپی تر بە ناوەکانی حیزبولاّی کوردستانی عێراق و حیزبولای شۆڕشگێڕی کورد دامەزران کە حیزبولاّی شۆڕشگێڕ لە لایەن ئەدهەم بارزانییەوە رابەرایەتی دەکرا. بە گشتی لە وەڵامی پرسیارەکەی ئێوەدا ئەتوانم بڵێم نەبوونی روانگەو فیکرەو مەنهەجێکی هاوبەش هەروەها نەبوونی زەعیم و رابەرێکی بەرجەستەو بەتوانا هەروەها کاریگەری هاوکێشە جیهانی و ناوچەییەکان و کێشەو گرفتی نێوان حزب و رێکخراوەکان و تەنانەت رەفتاری بەرژەوەندیخوازانەو رۆحیاتی ناوچەگەرایی و خۆویستانەی هەندێ کەس، لەو هۆکارانەن کە بوونەتە هۆی پرژ و بڵاویی ئیسلامخوازەکانی کوردستان و هەروەها بوونەتە هۆی دروستبوونی چەندین حزب و رێکخراوی جۆراوجۆری ئیسلامی لەم وڵاتەدا.

بۆ خۆیشت لە شوێنێکدا ئاماژەت بەوە دابوو کە کۆمەڵە ئیسلامییەکانی کوردستان زۆر جار بیری ئیسلامییان لەگەڵ بیری نەتەوەیی و کوردایەتیدا تێکەڵ ئەکرد و بەدوای رێگەچارەی ئیسلامییانەی کێشەی کورددا ئەگەڕان کە لە نموونەی مەکتەب قورئاندا دیارترین شێوازی ئەم ستراتیژە ئەبینین. ئاشکرایە «کوردایەتی» لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا هەمیشە دژایەتییەکی قووڵی لەگەڵ حکوومەتەکانی ئەو چوار وڵاتەدا کردووە. ئێستا پرسیار ئەوەیە کە ئایا رێکخراوە ئیسلامییەکانی کوردستانیش شان بە شانی حیزبە نەتەوەخوازەکان دژایەتی دەوڵەتە ناوەندییەکانیان ئەکرد یاخود میتۆدێکی دیکەیان گرتبووە بەر؟ بە ئاستی یەکەم هەڵوێستی ئیسلامییانی کوردستانمان لەم بوارەدا بۆ روون بکەرەوەو ئایا جیاوازی لە نێوان لایەنە ئیسلامییە جۆراوجۆرەکاندا هەبوو؟ ئایا ئەم نەتەوەخوازییە دژایەتی نییە لەگەڵ پەیامە جیهادییەکەی ئایینی ئیسلامدا کە زیاتر باسی ئوممەتی ئیسلامی دەکا تا میللەتانی جۆراوجۆر؟

لە راستیدا وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە لایەنی جۆراوجۆر لەخۆی ئەگرێت و پێویستی بە بەراوردکردنە لەگەڵ دەقە دینییەکان و میتۆدە نەتەوەییەکاندا. جۆراوجۆری بیروبۆچوونە ئیسلامییەکان هەروەها جۆراوجۆری بیروبۆچوونە نەتەوەییەکان وایکردووە کە باس و بابەتی نەتەوەو نەتەوەگەرایی لە روانگەی ئیسلامەوە پێویستی بە هەڵسەنگاندنێکی

تایبەتی بێ. لە قورئاندا هەرکات باسی پێغەمبەرێك کراوە یەکسەر بە دوایدا باسی هەڵسووکەوتی «قەومەکەی» کراوەو بە گشتی لە قورئان و فەرموودەکاندا بە وردی باسی هەموو لایەنەکانی ژیانی پێغەمبەران (علیهم السلام) و هۆز و نەتەوەکەیان کراوە. هەروەها ئەم لایەنەی ژیانی مرۆڤ وەك دیکەی لایەنەکانی ژیان، لە ئیسلامدا بێ وەڵام نەماوەتەوەو پشتگوێ نەخراوە. لە ناو ساحەی جیهاد و شەڕی بەربەستەکانی بەردەم بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامیشدا، سوننەت وابووە کە هەر هۆز و نەتەوە یاخود بنەماڵەو عەشرەتێك پێکەوە بەشداری لە شەڕدا بکەن و لە یەك جەبهەدا ئامادە بن و ئیتر ئەم نەریتە بایەخی زۆری پێدراوە. لە لایەکی تریشەوە لە کەسانی دەورووبەری پێغەمبەری ئیسلام (سلاو و درودی خوای لێ بێ) جگە لە چەند کەسێکی وەکوو سوهەیبی ڕۆمی، بیلالی حەبەشی و سەلمانی فارسی و کابانی کوردی نەبێ، ئەوانی تر هەموویان سەر بە هۆز و نەتەوەی قورەیش بوون. ئینجا لە قورئانیشدا بە ئاشکرایی باسی نەژاد و نەتەوە کراوەو کەم نەتەوەیش هەیە کە پێغەمبەرێکی تیا هەڵنەکەوتبێ بەڵام ئەو مەنهەجەی کە لە لایەن خوای گەورەوە بۆ هەر پێغەمبەرێك دیاری کراوە، بە نیسبەت بابەتەکانی وەك زمان و نەژاد و نەتەوەوە گرنگایەتی و بایەخی زۆرتری پێدراوە. ئەم مەسەلەیە (مەنهەج) ئەوەندە گرنگ بووە کە تەنانەت ناوی خودی پێغەمبەرکانیش و ناوبردنیان زۆر گرنگ نەبووەو هەر بۆیە تەنیا ناوی سی پێغەمبەر لە قورئاندا هاتووە.

من هیچ بەڵگەیەکم نەدیوە کە باس لەوە بکات جگە لە پێغەمبەری ئیسلام واتە حەزرەتی موحەممەد (سلاو و درودی خوای لێ بێ) کەسێکی تر لە پێغەمبەران عەرەب بووبێ و بە عەرەبی وەحی بۆ هاتبێ. هەروەها ئەوەندەی لە قورئاندا باسی خوو و رەوشت و داستانی ئیبراهیم و مووسا و نووح (درودی خوایان لێ بێ) کراوە باسی زمان و تایبەتمەندیی قەومی و نەتەوەییان نەکراوە. لە راستیدا نەتەوەخوازی و نەتەوەگەرایی ئەوەندە لەگەڵ ئیسلامدا رێك دێتەوە کە لە خزمەت ئەم دینەدا بێت و سوود بە موسوڵمانان بگەیەنێت نەك ببێتە هۆی بەشبەشبوون و پارچەپارچە بوونی مرۆڤەکان. لە روانگەی ئیسلامەوە جیاوازی زمان و نەژاد و نەتەوە نابێتە هۆی ناکۆکی و دابڕانی مرۆڤەکان بەڵکوو ئەوە تەنها باوەڕ و ئیمانە کە مرۆڤەکان لە یەکتر جودا دەکاتەوە. دینی ئیسلام باوەڕی بە عەداڵەت و دادپەروەری لە نێوان هەموو مرۆڤەکاندا هەیە بەڵام باوەڕی بەوەش هەیە کە هەر قەوم و نەتەوەیەك بە زمانی خۆی قسە بکات، جلوبەرگی تایبەتی خۆی بپۆشێت و پێڕەویی لە هەندێك نەریتی نەتەوەیی خۆیەوە بکات. بۆ نموونە پێغەمبەری ئیسلام (درودی خوای لێ بێ) لەناو قەومی عەرەبدا سەری هەڵداوەو جلی ئەوانی لەبەر کردووەو بە زمانی ئەوان قسەی کردووەو خوای گەورەیش کتێبەکەی بە هەمان زمان بۆ ناردۆتە خوارەوە. هەر بۆیە ئەگەر من وەك موسوڵمانێکی کورد بمەوێ هەمان جلوبەرگی پێغەمبەرەکەم لەبەر بکەم تەنیا پێڕەویم لە عورف و عادەتی نەتەوەی عەرەب کردووە. بەڵام ئەگەر بمەوێ واجبێکی دینیی وەکوو (نوێژ) بە زمانی نەتەوەکەی خۆم واتە زمانی کوردی بخوێنم ئەمە لە روانگەی ئیسلامەوە رەوا نییە بۆیە هەر کەسێکی موسوڵمان بە هەر رەگەز و زمان و نەریتێکەوە پێویستە فەرزێکی وەکوو نوێژ بە هەمان زمانی قورئان واتە زمانی عەرەبی بەجێ بهێنێت. هەروەها پێوەر و فاکتەری دینداری و موسوڵمانیەتی لە روانگەی ئایینی ئیسلامەوە تەنیاوتەنیا پێڕەویکردنە لە دەستووراتی ئەم دینەوەو هەر کەس بە هەر رەگەز و قەومییەتێکەوە ئەم کارە بکات پلەی موسوڵمانیەتی پێ ئەبەخشرێ و هیچ کەس بە حوکمی ئەوەی سەر بە فلان هۆز و نەتەوەیە بۆ نموونە کەسێك کە عەرەبەو سەر بە هۆزی پێغەمبەری ئیسلامە (درودی خوای لێ بێ) هیچکات لە کەسێکی کورد یان ئەفغان موسوڵمانتر نییە مەگەر ئەوەی تاعەت و عیبادەتی زیاتر بێت و لەخواترس و دیندارتر بێت. کەوایە لە روانگەی ئیسلامەوە لەبەرکردنی جلوبەرگی نەتەوەیی، قسەکردن بە زمانی قەومی و بەکارهێنان و پێڕەویکردن لەو عورف و عادەتانەی دژایەتی دین ناکەن، بۆ مرۆڤی موسوڵمان رەوایە. هەروەها هەر جۆرە نەتەوەگەرییەك کە تێکەڵ بێت لەگەڵ خۆشەویستی خاك و نەژاد و نەتەوەو دیاریکردنی هەرچەشنە سنوورێك لەسەر بنەمای نەتەوەو نەتەوەگەری، لە روانگەی ئیسلامەوە مەحکوومەو سەرجەم ئایەت و فەرموودەکان بەڵگەن بۆ ئەم قسانەی من. لە سوورەی (ئەنبیا)دا هاتووە: «إن الارض يرثها عباد

الصـالحين» واتـه (ئـهم زەويـەی خـوای گـەورە عەبـدە سـاڵحەكانی مـن ئەيبـەن بـۆ خـۆيـان و تيايـدا ئـەبن بـه دەسـەڵاتدار).
هەروەها لە سوورەی (بەقەرە)دا هاتووە: «إن جاعل فی ارض خليفه» واتـه (مـن لـه سـەر زەوی خەليفەو جێنشين ديـاری ئەكەم). لەم ئايەتانەو دەيان ئايەتی تـردا خـوای گـەورە تـەنيا باسـی بەنـدە سـاڵحەكانی خـۆی و رەفتـار و هەڵسوكەوتی ئەوان و باسی ئەوە كە تـەنيا ئـەوان مـافی خاونداريكردنی عـەرزی خـوای گـەورەيان هەيـە دەكـات و ئەمەش سەلمێنەری ئەوەيـە كـە لـە ئيسـلامدا نەتەوەگـەری لـە رووی جوگرافيـاوە بـە گـرنگ نـەزانراوەو ئـەو كەسـانەی كـە پێويسـتە ببنـە دەسەڵاتداری هەر شوێن و جێگاو جوگرافيايەكدا، مرۆڤە ساڵح و ديندار و لە خواترسەكانن.
لە وەڵامی بەشێكی تری پرسيارەكەتاندا ئەتوانم بڵێم، بەڵێ ئيسلامييەكانی كوردستان لـە سـەردەمانێكدا بـە سـۆزی نەتەوايەتييەوە هاتنـە مەيـدان و ئـەم سـۆزە تـا ماوەيـەك كـەم تـا زۆر هـەر ماوەتـەوەو سـەرجەم گـروپ و رێكخـراوە ئيسلامييەكان بە پێی ئەو مەنهەج و بيروباوەڕەی هەيانبووەو پێڕەويان لێوە كردووە، روانيويانەتە مەسەلەی نەتەوەايەتی و هـەوڵی ئـەوەيان داوە لـە چوارچێوەی ياسا ئيسلامييەكاندا رێگە چارەيەكی بۆ بدۆزنـەوە. بـۆ نموونـە كەسـێكی وەك مامۆستا عەلی باپير ئەميری (كۆمەڵی ئيسلامی) لـە كتێبێكدا بە ناوی «سۆزی نەتەوايەتی» بە باشی باسی چۆنيەتی چارەسەری كێشەی نەتەوايەتی لە كوردستاندا ئەكات. بەهۆی ئەو هەلومەرجەی نەتەوەی كوردی پيادا تێپەڕيوە، لە دێر زەمانـەوە مەسـەلەی نەتەوەگـەرايی لـەناو كۆمـەڵگای كوردسـتاندا بايـەخێكی زۆری پێـدراوەو ئـەم مەسـەلەيە هـەموو لايەنەكانی ژيانی مرۆڤی كوردی خستۆتە ژێر كاريگەری خۆيەوە. چارەسـەری كێشـەی نەتـەوەيی بەردەوام ئاوات و ئارەزوويەكی گەورەی كوردەكان بووە هەر بۆيە ئەگەر حزب و گروپێكی ئيسلاميش لەم وڵاتەدا سەری هەڵدابێ، بە حوكمی ئـەوەی هـەڵقوڵاوی ئـەم كۆمەڵگايـە بـووەو ريشـەی لـە دڵـی جـەماوەردا بـووە، زۆر ئاسـاييە كەمـەكێ لـە بيری نەتەوايـەتی تێكـەڵی بيروبۆچوونی ئيسلاميانەی بووبێ هـەروەك چۆن هەندێ لە حزبە عيلمانی و نەتـەوەخوازەكان لە بنەمادا باوەڕيان بە چەمكی دين و خواپەرستی نييە بەڵام لەبەر ئەوەی كۆمەڵگای كوردستان كۆمەڵگايەكی ئيسلامييە، لە دژايەتيكردنی دين خۆيـان پاراستووەو تەنانەت لە هيندێك بواريشدا تەداخولی كاروباری ئايينی و مەزهەبييشيان كردووەو سەنگی ديفاع لە ئيسلاميان لە سينگ داوە. ئەڵبەت ئەوەی كە ئەم حزبانە بەم شێوازەو لەم ئاستەدا گرنگی و بايەخ بە مەسەلەی دين ئەدەن، لە روانگەی منەوە نيشانەی هۆگری ئەوان نييە بۆ ئايين، بە پێچەوانەوە ئەم كارەی ئەوان بۆ دژايەتيكردنی ئايينی راستەقينەو ئەو ئيسلامەيە كە بريتييە لە دابەزاندنی شەريعەت لە كۆمەڵگای كوردستاندا. هۆكارەكەيشـی روون و ئاشـكرايەو لـە ئەساسيشـدا سـەرجەم ئـەو حـزب و رێكخـراوە عيلمـانی و ناسيۆناليستانە دژی دابەزاندنی شەريعەت و دامەزرانی دەسەڵاتی ئيسلامين و باوەڕی تەواويان بە جياوازيی دين لە سياسەت هەيە.
بە پێچەوانەی ئەوە كە ئێوە پێتان وايە تەنيا گروپێكی وەك مەكتەب قورئان لايەنێكی نەتەوەخوازانەيان پێوە ديارە بەڕای من ئەمە تايبەتمەنديی هەموو حزب و گروپە ئيسلامييەكان بووەو تەنانەت سەلەفيەتی جيهادييش ميكانيزمێكی تايبـەت بـە چارەسـەركردنی كێشـەی نەتـەوەيی دۆزيوەتـەوەو لـە بەرنامەيدايـە لـە كـاتی بـە دەسـەڵات گەيشتندا بەكاری بهێنێـت. لـە پێوەنـديی لەگـەڵ ئەوبەشـەی پرسيارەكەيشـدا كـە وتووتانـە ئايـا رێكخـراو و لايەنـە ئيسـلامييەكانيش بەشدارييان لە خەباتی رزگاريخوازانـەی كوردسـتاندا كـردووە يـان ميتـۆدێكی تريـان گرتـۆتـە بـەر؟ لـە بەشـی پێشـوودا ئاماژەم بە هەندێ شتی گشتی كرد كە رەنگە تا رادەيەك وەڵامی ئەم پرسيارەم دابێتەوە. ئەوەنـدەی مـن ئاگـادارم هـەم لـە كوردستانی ئێران و هەميش لە كوردستانی عێراقدا گروپ و رێكخراوە ئيسلامييەكان دژی دەسـەڵاتدارانی ئـەم وڵاتانـە خەباتيان كردووەو قوربانييان داوە بەڵام مەبەست و نييەتی ئەوان لە خەبات جياواز بووە لـەو شـتەی حزبـە نەتـەوەيی و عيلمانييـەكان هـەوڵيان بـۆ داوە. ئەگـەر ئـەم هێزانـە لـە هـەموو بەشـەكانی كوردسـتاندا خـەبات دژی چەوسـانەوەو ژێردەستييان كردووەو بە ناو بۆ لابردنی ستەمی نەتەوەيی هەوڵيان داوە ئەوا هێـزە ئيسلامييەكان هـەم هـەوڵی لابردنـی ستەمی چينايەتی و هەميش هەوڵی لابردنی ستەمی نەتەوەيی و مەزهەبييان داوە. هەروەها ئەگەر لايەنە نەتەوەييەكان

بۆ دابینکردنی سیستەمێکی خودموختار و فیدرال و ئۆتۆنۆمی تێکۆشاون ئەوا رێکخراوە مەزهەبییەکان دروشمی سەربەخۆییان هەڵگرتووە. جیاوازیی ئەم دوانە واتە لایەنی نەتەوەیی و لایەنی ئیسلامی ئەوە بووە کە نەتەوەیی و عیلمانییەکان هەوڵی دامەزراندنی دەسەلاتێکی دیموکرات و سیکۆلار یان سۆسیالیست و کۆمۆنیستییان داوە بەڵام ئیسلامییەکان لە بۆ دابەزاندنی شەریعەتی ئیسلام و دامەزراندنی حکوومەتێکی دینی تێکۆشاون و لەو باوەڕەدا بوون کە دەسەلاتی دینی چارەسەری هەموو کێشەکانی کۆمەڵگای کوردستان دەکات. ئەڵبەت هەندێ گروپ و رێکخراوی ئیسلامییش هەن کە بە میکانیزمێکی جیاوازترەوە هەوڵی گەیشتن بە دەسەلاتی ئیسلامی ئەدەن بۆیە ئامادەن لە رێگای بەشداریکردن لە پرۆسەی سیاسیدا بە مەرام و مەبەستەکانیان بگەن، ئەم حیزب و رێکخراوانە لە روانگەی سەلەفییەتی جیهادییەوە بە خەڵکانی چەواشە ناو دەبرێن. هەردوو بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستانی ئێران و عێراق دووان لەو رێکخراوە ئیسلامییانەن کە بە گوێرەی توانایان لە دژی دەسەلاتدارانی ئەم وڵاتانە جەنگاون و جیهادیان کردووە.

**بە بێ ئەوەی بمانەوێ هەموو ئیدیعاکانی جەنابت رەت بکەینەوە ئەمانەوێ بڵێین گروپ و رێکخراوە ئیسلامییەکان هیچکات نەیانتوانیوە شان بە شانی حیزبە نەتەوەیی و عیلمانییەکان بەشداری لە خەباتی رزگاریخوازانە دژی دەسەلاتدارانی ئەو وڵاتانەدا بکەن کە کوردیان تێدا ژێردەست بووە. لە راستیدا ئیسلامییەکان وەك جەنابت باست کردووە دید و روانگەیان بۆ شتەکان جیاواز بووە بە ئێستاشەوە، بۆیە باوەڕیان بەو شێوازی خەباتە نەبووە کە لایەنەکانی تر گرتوویانەتە بەر و تەنانەت رەتی ئەو جۆرە خەباتەیان داوەتەوە. جیهادی بزووتنەوەی ئیسلامیی رۆژهەلاتی کوردستان و بزووتنەوەی ئیسلامیی باشووری کوردستانیش دژی کۆماری ئیسلامی و رژێمی بەعس لە ئاستێکدا نەبووە کە تەنانەت خودی ئەو گروپانەش فەخری پێوە بکەن.**

**دوا پرسیاری بەشی یەکەمی مێژووی جووڵانەوەی ئیسلامیی کوردستان دەپرسین و ئیتر ئەچینە سەر رەوتی سەلەفییەت لە کوردستان. تا ئێستە تەنیا باسی دوو پارچەی رۆژهەلات و باشوورمان کردووە، ئایا لە دوو پارچەکەی تری ژێردەسەلاتی تورکیاو سووریادا جووڵانەوەی ئیسلامیی کوردیمان لە سەدەی بیستەمدا بووەو ئەگەر بووە ناویان چی بووەو هەڵگری چ جۆر بیروباوەڕێك بوون؟**

بەڵێ لەم دوو وڵاتەیشدا گروپ و رێکخراوی ئیسلامییمان بووەو هەیە. هەم لە کوردستانی سووریاو هەمیش لە تورکیا لە چەندین ساڵ لەمەو پێشەوە گروپی جۆراوجۆری ئیسلامی سەریان هەڵداوەو بە حوکمی ئەوەی کە باکوور و خۆرئاوای کوردستانیش لە باری ئاینییەوە لەگەڵ دانیشتوانی تری ئەم وڵاتانە گرێدراوییان هەیە بۆیە ئەوانیش کەوتوونەتە ژێر کاریگەری رووداوەکان و بەردەوام بەشێك بوون لە هاوکێشەکان. لە وڵاتی تورکیادا فەتحوڵلا گولێن وەك بناغەدانەر و باوکی ئیخوان لەم وڵاتە، دەمێ ساڵ پێش ئێستا کەوتە تەبلیغی بیروباوەڕی ئیخوانولموسلیمین و لە سایەی دەسەلاتی لائیك و دژە ئایینیی ناسیۆنالیستە تورکەکاندا هەوڵی بووژاندنەوەی ئیسلامی دا. پاش ئەویش نەجمەدین ئەربەکان و تەلەبەکانی واتە رەجەب تەییب ئەردووغان و عەبدوڵلا گوێل درێژەیان بە تەبلیغ و بانگەشە بۆ جۆرێك ئیسلامی میانەڕەو داو ئێستا ئەبینین ئەوان بوونەتە دەسەلاتداری یەکەم لە تورکیاداو رۆژ بە رۆژ هەوڵی پتەوکردنی زیاتری دەسەلاتەکەیان ئەدەن. ئەم رەوتە لە بەشە کوردنشینەکەی تورکیاشدا کاریگەری خۆی داناوەو ئەتوانین بڵێین بیروباوەڕی ئیخوانولموسلیمین لە ناو کوردەکانی تورکیاشدا لایەنگر و شوێنکەوتوویەکی زۆری هەیە. بۆ نموونە لە چەند ساڵ لەمەوپێشەوە حیزبێك بە ناوی (حیزبوڵلا) یان (جوندوڵلا) لە کوردستانی تورکیادا دامەزراوە کە خۆی بە گرێدراوی ئیخوانولموسلیمین دەزانێت و بە هەزاران ئەندامی هەیە. ئەڵبەت ئەم حزبە نە لە لایەنی قەومییەوە لە

حزب و لایەنە کوردی و نەتەوەخوازەکان نزیکە نە لە لایەنی ئایینیشەوە هاوتەریب و هاوشێوەی عەدالەت و گەشەی دەسەلاتداری تورکیایە. هەروەها هاوکات لەگەڵ سەرهەڵدانی فیکرەی سەلەفییەت و سەلەفییەتی جیهادیی لە ناو تورکەکانی تورکیاشدا؛ کوردەکانی ئەم وڵاتەش کەوتوونەتە ژێر کاریگەری ئەم رەوتەوەو ئێستاکە خەڵکانێکی زۆریان پێڕەویی لە سەلەفییەت بە تایبەت سەلەفییەتی جیهادییەوە دەکەن. وەك کاری رێکخستن ئەوەندەی من ئاگادارم هەم رێکخراوی قاعیدەو هەمیش رێکخراوی ئەنسارولئیسلام لەناو تورك و کوردەکانی تورکیادا نفووزیان هەیەو خاوەن تەنزیماتی تایبەت بە خۆیانن. ئەوان تاکوو ئێستا جگە لە ئەنجامدانی چەندین چالاکی لە تورکیا، بە شێوەیەکی گەرموگوڕ و جیدی بەشداری جیهادیان لە دەرەوەی تورکیاش کردووە. گروپەکەی ئەبوو ئەحمەدی تورکی کە گروپێکی سەلەفی جیهادییە، بۆتە شوێنی کۆبوونەوەی بەشی زۆری سەلەفییەکانی تورکیا بە کورد و تورکەوە. ئەم گروپە لە ناوچەی وەزیرستانی پاکستان جێگیرەو گروپێکی نزیك لە رێکخراوی قاعیدەیە.

هەروەها بە حوکمی ئەوەی وڵاتی سووریاش لە کۆنەوە بۆتە شوێنی سەرهەڵدانی چەندین گروپ و رێکخراوی ئیسلامی، کوردەکانی ئەم وڵاتەش کەوتوونەتە ژێر کاریگەری ئەم گروپانەوەو تەنانەت بۆخۆیشیان هەوڵی دامەزراندنی گروپ و رێکخراوی ئیسلامییان داوە. بۆ نموونە دامەزراندنی لقی ئیخوانولموسلیمین لە سووریاو جیابوونەوەی گروپێك لەم رێکخراوە بە رابەرایەتی «مەروان حەدید» لە سالانی هەشتاکاندا کە خویان ناو نابوو (طريقة المقاتلە) کاریگەری تایبەتیان لەسەر کوردەکانی ئەم وڵاتە دانا. تەریقەی موقاتیلە کەوتە جیهادکردن دژی دەسەلاتی سووریاو بە تەمابوو بە رێکخستنی جەبهەیەکی بەرینی جیهادی دەسەلاتی ئەم وڵاتە بڕووخێنێت. شاری (حمە ) بنکەی سەرەکی گروپی تەریقەی موقاتیلە بوو بۆیە دواتر کەوتە بەر هێرشی بەربلاوی سوپای سووریاو زیاتر لە سێ هەزار کەس لە دانیشتوانی ئەم شارەو ئەندامانی تەریقەی موقاتیلە کوژران. بەمجۆرە لە سالی ١٩٨٢زاییینیدا گروپەکەی مەروان حەدید کە هەڵگری بیروباوڕێکی ئیخوانیانەی رادیکاڵ و جیهادی بوو، بە تەواوی سەرکوت کراو مەروان حەدیدیش ماوەیەك پاش دەستگیرکرانی لە سێدارە درا. شایانی باسکردنە لە گەرمەی جیهادی مەروان حەدید و گروپەکەیدا، بالی گشتی ئیخوانولموسلیمینی سووریا بەردەوام هەولی ئەدا پێش بە هاتنی موجاهیدی وڵاتانی تر بۆ سووریاو پەیوەستبوونیان بە تەریقەی موقاتیلەوە بگرێت تاکوو پێش بە بەهێزبوونی زیاتری ئەم گروپە بگرێت. ئەوان هەر لە سەرەتای جیابوونەوەیانەوە ترسێکی زۆریان لە مەروان حەدید و جەماعەتەکەی هەبوو و نەیانەویست بیروباوەڕی ئیخوانولموسلیمین بەوانەوە بناسرێت. ئەم رووداوانە کاریگەری خۆیان لەسەر کوردەکانی سووریا داناو دواتریش بە چڕ بوونەوەی تەبلیغ و چالاکییەکان و دەرکەوتنی رەوتی سەلەفییەتی جیهادی، کوردەکانی سووریا پێشولزییان لەم رەوتەوە کرد. ئەگەر عەرەبەکانی سووریا کەسێکی ناسراوی وەك ئەبوو مەسعەبی سوورییان تیادا هەڵکەوت ئەوا کوردەکانیش ئەبوو جەعفەری کوردییان هەبوو کە یەکێك لە سیما ناسراوەکانی سەلەفییەتی جیهادییە. ئەبوو جەعفەر کاتی خۆی بەشداری لە جیهادی ئەفغانستاندا کردووەو شارەزاییەکی زۆری لە بواری عەسکەریدا هەیە. هەروەها ئەو لە بواری تیۆری و کاری رێکخستندا خاوەن ئەزموونێکی زۆرە. ئەبوو جەعفەر پێوەندییەکی گەرم و دۆستانەی لەگەڵ رێبەرانی جیهادی و کەسە ناسراوەکانی ناو سەلەفییەتی جیهادیدا هەیە. هەروەها یەکێکی تر لە سەلەفییە ناسراوەکانی کوردستانی سووریا ئەبوو عومەری کوردی بوو کە سالی ٢٠٠٧زاییینی لەگەڵ ١٨ موجاهیدی تر لە شەڕێکدا لە ئەفغانستان شەهید بوو. ئەبوو عومەریش زیاتر بە کەسێکی عەسکەری ناسرابوو و شارەزای ئەم بوارە بوو. ئەو شەڕەی ئەبوو عومەری تیادا کوژرا لە لایەن گەورەبەرپرسی رێکخراوی قاعیدە (الليس الليبي)یەو سەرپەرشتی دەکرا کە تیایدا هێزەکانی قاعیدە هێرشیان کردە سەر پادگانێکی عەسکەری بەلام بەهۆی ئامادەبوونی لایەنی بەرانبەرەوە تووشی شکست هاتن و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژراو و بریندار بوو کە یەکێکیان ئەبوو عومەری کوردی بوو. بوونی ئەم سەرکردانە هۆکار و پالنەر بووە بۆ بەربلاوبوونەوەی بیرباوەڕی سەلەفییەتی جیهادی لەناو کوردەکانی سووریادا.

بە مەبەستی تەکمیلکردنی زانیارییەکان دەربارەی ئەبوو مەسعەبی سووری، پێویستە بڵێم کە ناوبراو یەکێك لە کەسە ناسراوەکانی بزووتنەوەی سەلەفییەتی جیهادی و بەرپرسێکی بەرجەستەی ڕێکخراوی قاعیدە بوو. ئەو زیاتر بەکاری نووسین و لێکۆڵینەوەوە خەریك بوو و لە بواری مێژوودا شارەزاییەکی زۆری هەبوو. یەك لە بەرهەمە بەناوبانگەکانی ئەو کە تیایدا باسی مێژووی بزووتنەوەی سەلەفیەتی جیهادی دەکا، کتێبی (دعوة المقاومة الاسلامیه العالمیه)یە کە ٢٦٠٠ لاپەڕەیەو لە ٥ بەرگدا چاپ کراوە. ئەبوو مەسعەب لە لایەن ئەمریکاوە پارەیەکی چەند ملوێن دولاری لەسەر دانرابوو بۆ ئەوەی بتوانن زووتر بیگرن یان بیکوژن. بە داخەوە ساڵی ٢٠٠٤ لە لایەن دەوڵەتی پاکستانەوە دەستگیر کراو پاشان تەحویلی ئەمریکییەکان دراو ئیتر لەوکاتەوە چارەنووسی نادیارە.

ئەوەی تا ئێستە باسمان کرد و لێی کۆڵاینەوە تا رادەیەکی زۆر زەمینەکان و شێوازی سەرهەڵدانی ڕێکخراوی کوردیی ئیسلامیی بۆ روون کردینەوە. دیارە زۆر تێکەڵی وردەکارییەکان –بە تایبەت وردەکارییەکانی ئەو هەموو حیزب و ڕیکخراوە ئیسلامییەی کوردستان– نەبووین. هۆکاری ئەمەش لەوەدایە کە چەقی وتوویژەکەمان لە سەر سەلەفییەتە نەك کۆی جووڵانەوەی ئیسلامیی کوردستان، بەمەشەوە دەبا زەمینەی مێژوویی بەرێکخراوبوونی ئیسلامی سیاسی کوردیمان روون کردایەتەوە کە تا رادەیەك ئەو ئەرکەمان راپەڕاندووە.
لێرە بەدواوە ناوەندی باسەکەمان لەسەر سەلەفییەتی کوردستان چڕ دەبێتەوەو هەوڵ ئەدەین باسەکانی تر لە پێوەندی لەگەڵ سەلەفییەتدا بخوێنینەوە. ئەوەندەی ئێمە لێی کۆڵاوینەتەوە لە سەردەمی جیهادی ئەفغانستان یان هەمان (ایام الروس)دا کۆمەڵێ چالاك و هەڵسووڕاوی ئیسلامیی کورد بە مەبەستی بەشداریکردن لەو جیهادەدا دەچنە ئەفغانستان و پێدەچێ لەوێ بۆ یەکەمجار و لە رێی کەسانی وەك عەبدوڵڵا عەزام و ئوسامە بن لادەن یاخود ئەندامانی ئەلجیهادی میسر (کە کۆچیان کردبوو بۆ ئەفغانستان) بە بیری سەلەفییەت ئاشنا بووبێتن. بەشێك لەمانە کۆمەڵێ ئەندامی لاو و رادیکاڵی «بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستانی عێراق» بوون کە نەجمەدین فەرەج یان هەمان مەلا کرێکاری بەناوبانگ یەکێك بوو لەوان یان باشتر وایە بڵێین سەرپەرشتی ئەوانی دەکرد. ئایا ئەم گێڕانەوەیە بۆ دەستنیشانکردنی یەکەم تەوژمی سەلەفییەت لای ئیسلامییانی کوردستان لەگەڵ واقیعی مێژوودا تەبا دێتەوە یان سەلەفییەت بە جۆرێکی تر و لە سەردەمانێکی دیکەدا هاتۆتە کوردستانەوە؟

وابزانم لێرەدا پێویستمان بە جیاکردنەوەی تەوژمی جیهادی و تەوژمی سەلەفییەتە. لە راستیدا ئەم دووانە خاوەن مێژوو و رابردوویەکی کۆن و پێوەندییەکی چڕوپڕیان پێکەوە هەیە بەڵام پێویستە لێرەدا جیاواز باسیان بکەین بۆ ئەوەی بە باشی لە رەوتی مێژووییان و فەهم و مانایان بگەین. ئێمە وەك موسوڵمانانی کوردستان دەمێ ساڵە لەگەڵ ئەم دوو چەمکەدا ئاشناین. بە گشتیی ئەتوانین چوار قۆناغی مێژوویی بۆ ئیسلامییانی کوردستان لە بەرچاو بگرین بەم شێوەی خوارەوە:
یەکەم، بە رێکخراوەبوونی ئیسلامی (سیاسی) لە سەرەتای نیوەی دووهەمی سەدەی بیستەمدا. ئەم رەوتە بە دروستبوونی یەکەم لقەکانی ئیخوانولموسلیمین دەستی پێکرد. دووهەم، بە جیهادی بوونی ئیسلامی (سیاسی) لە کوردستان لە کۆتایی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکانەوە. سێهەم، سەرهەڵدانی سەلەفییەت و دەرکەوتنی یەکەم نیشانەکانی ئەم رەوتە لە کۆتایی هەشتاکان و سەرەتای نەوەدەکاندا. چوارەم، بە جیهادی بوونی سەلەفییەت و سەرهەڵدانی دیاردەی سەلەفییەتی جیهادی لە کوردستان و دروستبوونی یەکەم رێکخستنەکانی سەر بەم رەوتە لە کوردستانی عێراق لە کۆتایی نەوەدەکاندا. بەردەوامبوونی ئەم رەوتە لەم بەشەی کوردستان، دروستبوونی رێکخراوی

سەلەفی جیهادیی کوردی لێکەوتەوە. سەرەتا گروپەکانی تەوحید و حەماس پاشان جوندولئیسلام لە مانگی ۹ی ۲۰۰۱ و ئەنسارولئیسلام لە مانگی ۱۲ی ۲۰۰۱ زایینیدا دامەزران.

دەربارەی خاڵی یەکەم واتە خاڵی بەڕێکخراوەبوونی ئیسلام یان وەك دەڵێن (ئیسلامی سیاسی) لە کوردستان، لە بەشەکانی پێشوودا وردەکارییەکانی ئەم بەشەمان باس کرد. بە نیسبەت قۆناغی دووهەمیشەوە کە بە قۆناغی بە جیهادی بوونی ئیسلامی سیاسی ناومان برد، ئەتوانین بڵێین دەسپێکرانی ئەم قۆناغە ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی جیهادی ئەفغانستان. لەو سەردەمەدا کوردستانیش وەك بەشێك لە دونیای ئیسلام کەوتە ژێر کاریگەری جیهادی ئەفغانستانەوەو لە نیوەی یەکەمی هەشتاکاندا یەکەم گروپی موجاهیدە کوردەکان روویان لەم وڵاتە کرد و بە ریزی موجاهیدینەوە پەیوەست بوون. لە ساڵانی سەرەتای نیوەی دووهەمی هەشتاکانەوە فیکرەی جیهادی جێگای خۆی لە دڵی ئیسلامخوازانی کوردستانی عێراقدا کردەوە. خاڵەکانی سێهەم و چوارەم واتە هەردوو قۆناغی سەرهەڵدانی سەلەفییەت و سەلەفییەتی جیهادی (جەماعی و لاجەماعی) بەشی سەرەکی باسەکەی ئێمە پێك ئەهێنێت. وەك ئاماژەم پێدا بیروباوەڕی سەلەفییەت یەکەم جار لە کۆتایی هەشتاکاندا گەیشتە کوردستان و دەیەیەك دواتر واتە لە کۆتایی نەوەدەکاندا یەکەم ئاسەوارەکانی سەلەفییەتی جیهادی خۆی نیشان دا. دیارە لێرەدا مەبەستم کوردستانی عێراقە چونکوو یەکەم رێکخستن و دواتریش یەکەم رێکخراوی سەلەفی جیهادی هەر لەم بەشەی کوردستاندا دامەزرا. هەروەها هاوکات لەگەڵ ئەمەدا سەلەفییەتی جیهادی لە بەشەکانی تری کوردستانیشدا برەوی پەیدا کرد، بۆ نموونە ئەم بیروباوەڕە لە نیوەی دووهەمی نەوەدەکانەوە لە کوردستانی ئێران هۆگر و لایەنگرێکی زۆری بۆ پەیدا بوو.

یەکەم ئەزموونی سەلەفییەتی لاجەماعی و لاجیهادی لە کوردستانی عێراق، ئەگەڕێتەوە بۆ ۱۹۸۷ی زایینی. مەلا عومەری چنگیانی، شێخ سدیقی سەلەفی، کامەران چاوشین، مەلا تەهای چنگیان، مەلا موحسینی کولیەی شەریعەی دهۆك، کاك ئەژی مامە یارە، کاك جەمالی باقلە فرۆش، مامۆستا عەبدوللەتیف و تەهاو یاسینی کارێزە وشك و...... ئەو کەسانە بوون کە نوێنەرایەتی یەکەم تەوژمی سەلەفییەتیان لە کوردستانی عێراق ئەکرد. ئەوان بە گشتی و بە شێوەیەکی رەها تەبلیغی سەلەفییەتیان ئەکرد بەڵام هەر لە بنەمادا باوەڕیان بە لکاندنی پاشکۆ یان پاشگری (جیهاد) بە وشەی (سەلەفییەت) یان (سەلەفی)یەوە نەبوو. تەنانەت جگە لە چەند کەسێکیان ئەوانی تر باوەڕیان بە بەڕێکخراوەبوونی سەلەفییەتیش نەبوو و ئەم کارەیان بە (بیدعە)و (گومڕایی) دەزانی. کەواتە دەسپێکی سەلەفییەت لە کوردستانی عێراق ئەگەڕێتەوە بۆ هەوڵ و کۆششی ئەو کەسانەو پاشان بەرەبەرە سەلەفییەتی جیهادی سەری هەڵداو یەکەم هەنگاوی ئەم رەوتەش لە لایەن چەند لاوێکی بێناونیشانەوە هەڵگیرا کە دواتر بەهۆی ئەم کارەیانەوەو بەهۆی سووربوونیان لەسەر بیروباوەڕەکەیان، بە هەموو لایەك ناسران و ناوبانگیان دەرکرد. بۆیە ئەگەر بمانەوێ ئەمە بە یەکەم هەوڵی سەلەفییەتی جیهادی لە کوردستان دەسنیشان بکەین ئێتر لکاندنی سەلەفییەتی جیهادی بە مەلا کرێکار و ئەو گەنجانەوە کە لە سەردەمی ئەیام ئەلرووسدا سەردانی ئەفغانستانیان کرد کارێکی هەڵەیە. هەم بیروباوەڕی سەلەفییەت و هەمیش فیکرەی سەلەفییەتی جیهادی بەوجۆرە هاتوونەتە کوردستان یان باشتر وایە بڵێم هاتوونەتە کوردستانی عێراقەوە کە لە سەرەوە باسم کرد.

هەرچەند سەلەفییەت سەرەتا وەك تەوژمێکی فیکری نەك رێکخراوێکی سیاسی هاتە کوردستانەوە بەڵام هەڵگرانی ئەم بیرە لە رێکخراوە ئیسلامییەکانی ئەو سەردەمەدا ئەندام بوون و تەنانەت کەسێکی وەك مەلا کرێکار لە سەرکردە سەرەکییەکانی «بزووتنەوە» بوو. تا لێرەوە بیری سەلەفی دزەی کردە ناو ریزی ئیسلامخوازانی کوردەوە. ئەم مەسەلەیە -وەك خۆیشت بەروارەکەیت دیاری کردبوو- یەکانگیر بوو لەگەڵ شەڕە ناوخۆییەکانی هێزە کوردییەکانی باشوور لە

دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ەوە. یەکەم شەڕ ساڵی ١٩٩٢زایینی لە نێوان یەکێتی نیشتمانی و بزووتنەوەی ئیسلامیدا هەڵگیرساو ماوەیەکی باش بەردەوام بوو، واتە لە چەند قۆناغدا تا ١٩٩٧ درێژەی کێشا. بزووتنەوە لە ناوچەی دیانا بارەگایەکی فێرکاریی نیزامی کردەوە کە دەوترێ ڕاهێنەرانی ئەم بارەگایە بریتی بوون لەو موجاهیدانەی بەشداری جیهادی ئەفغانستانیان کردبوو و هەروەها مەلا کرێکاریش سەرپەرشتی کاروبارەکانی دەکرد. بەشی زۆری هێزە نیزامییەکانی بزووتنەوە لەناو ئەم بارەگایەوە تەیار دەکران و تەدریبیان پێدەکرا کە دەرکەوتووترینیان هەمان هێزە بەناوبانگەکەی ٢ی سۆران بوو. لێرەدا دوو پرسیار دێتە گۆڕێ:

یەکەم، لەو کەسانەی لە ئەفغانستان گەڕانەوە کامانەیان بە شێوەی ڕەسمی چوونە ریزی بزووتنەوەی ئیسلامییەوەو چ پلەو جێگەیەکیان وەرگرت؟ دووهەم، ئایا ئەتوانین بارەگای دیاناو هێزە ڕاهێنراوەکانی ئەو بارەگایە بە یەکەم دەرکەوتن و کاردانەوەی ڕاستەوخۆی بیری سەلەفییەت لە کوردستان بزانین؟

بۆ ئەوەی توانیبێتم دەقاودەق وەڵامی پرسیارەکەی نێوەم دابێتەوە پێویستە هەم کورتە مێژوویەکی بارەگاکەی دیاناو هەمیش کورتە مێژوویەکی هێزی ٢ی سۆران و هەروەها پێوەندیی ئەم دووانە بە مەلا کرێکارەوە باس بکەین. سەرنجێکی کتێبی (ژانی بوون)ی مەلا کرێکار کە بەشێك لە شیعرەکانی ئەوی لەخۆ گرتووە ئەوەمان بۆ دەرئەخات کە نەجمەدین فەرەج لە ساڵی ١٩٨٢ەوە بە تەواوی وازی لە ئیخوانولموسلیمین و نەتەوەگەرایی هێناوەو وەك موجاهیدێکی جیهادی و ڕادیکاڵ خۆی دەرخستووە. ڕۆیشتنی ئەو بۆ ئەفغانستان و بەشداریکردنی لە جیهاد دژی سوپای داگیرکەری سۆڤیەتدا هەروەها دیدار و ئاشنابوون و چاوپێکەوتنی لەگەڵ بەشێکی زۆری ڕێبەرانی جیهادی، کاریگەرییەکی زۆریان لە سەر ناوبراو داناو بوونە هۆی ئەوە کە بە شێوەیەکی جیدی تر ڕێباز و ڕێرەوی جیهاد بگرێتە بەر. بۆیە پاش گەڕانەوەی بۆ کوردستان دەستی دایە دروستکردنی ڕێکخراوێکی جیهادی بە ناوی (الجماعة الجهاد في الكردستان). ئەم ڕێکخراوە بە نامۆیی و نە ناسراوی مایەوە تا ئەو کاتەی لە سەردەمی ڕاپەڕینی ١٩٩١ی زایینیدا ئەندامەکانی دابەزینە ناوچە ئازادکراوەکانی کوردستانی عێراق. جگە لە بزووتنەوەی ئیسلامی کە یەکەم ڕێکخراوی ئیسلامی ئەو سەردەمە بوو و جەماوەرێکی زۆری لەگەڵدا بوو (الجماعة الجهاد)ی مەلا کرێکار هەرچەند کەم نفووز و نەناسراو بوو بەڵام لە شکڵی خۆیدا بە یەکەم ڕێکخراوی جیهادیی کوردی ئەهاتە ئەژمار.

ئەم گروپە لە کاتی ڕەوە مێژووییەکەی ١٩٩١دا بنکەی سەرەکی خۆی گواستەوە بۆ ناوچەی دیانا چونکوو وایان مەزەندە کردبوو کە ڕژێمی بەعس ناتوانی ئەوێ بگرێتەوە. بۆیە لەو ماوەیەدا بەشێك لە سەلەفییەکانی گەرمیان (کەلار) بە سەرکردەیی دڵشاد کەلاری پێوەندییان بە جەماعەت جیهادەوە کرد و تێکەڵ بەم گروپە بوون. هەردوولا واتە هەم قیادەی جەماعەتی جیهاد و هەمیش سەلەفییەکانی کەلار لە سەر ئەوە ڕێکەوتن کە کتێبی (عُمده في الاعداد العده)ی عەبدولقادر عەبدولعەزیز بکەن بە مەنهەج و بنەمای تیۆریی بۆ دامەزراندنی سەربازگەیەکی تایبەت بە تەدریب و ڕاهێنانی موجاهید. ئەم کتێبە ماوەیەکی کەم بوو لە چاپ درابوو و مەلا کرێکار لەگەڵ خۆی هێنابوویەوە بۆ کوردستان. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە لە لایەکی ترەوە بەرەیەکی کوردستانی بە بەشداری هەشت حزب و ڕێکخراوی نەتەوەیی و عیلمانی لە پێش ڕاپەڕینەوە دروست کرابوو بەڵام بەو هۆیەوە کە ئەم بەرەیەو ئەحزابی بەشداربوو تیایدا باوەڕیان بە گێڕانەوەی کۆمەڵگای کوردستان بۆلای بنەماکانی ئایینی ئیسلام نەبوو و هەوڵی دامەزراندنی حکومەت و دەسەڵاتێکی کوردیی عاری لە بیروباوەڕی ئیسلامی ئەدا بۆیە بزووتنەوەی ئیسلامی نەچووە ناو ئەم بەرەیەوە. بەڵام هەردوولا –هەم بزووتنەوەو هەم بەرەی کوردستانی– لە سەر ئەوە کۆك بوون تاکوو ڕێز لە بیروباوەڕی یەکتر بگرن و لە هەندێ بواریشدا هاوکاری یەکتر بکەن. هەر لە چوارچێوەی ئەو تەنسیق و هاوکاری کردنەدا بوو کە بەرەی کوردستانی داوای لە

بزووتنەوە کرد ئەگەر جەماعەت جیهاد سەر بە ئەوانن پێویستە ئاگاداریان بکەنەوە تاکوو ئەوانیش پابەندی ڕێکەوتنەکەی نێوانیان بن دەنا بە جۆرێکی تر هەڵسووکەوتیان لەگەڵدا ئەکرێ.

هەرچەند زۆری نەمابوو جەماعەت جیهاد لەگەڵ بەرەی کوردستانیدا بەشەڕ بێ بەڵام کار نەگەیشتە ئەوەو وەزعەکە بە ئاقارێکی تردا ڕۆیشت. ئەم گروپە لەو سەردەمەدا ڕەخنەی زۆریان لە مەکتەب سیاسی و قیادەی بزووتنەوەی ئیسلامی بە تایبەت ڕەخنەیان لە شێوازی ئیدارەکردنی ئەم حزبە هەبوو و سەرەنجام پاش قسەو باس و مشتومڕێکی زۆر، جەماعەت جیهاد لەسەر چەند خاڵێك، لەگەڵ سەرکردایەتی بزووتنەوەدا ڕێکەوت و ئەمەش زەمینەی بۆ تێکەڵبوونی مەلا کرێکار و هاوبیرەکانی لەگەڵ بزووتنەوە، فەراهەم کرد. ئەمە بە مانای توانەوەی (الجماعة الجهاد) بوو لەناو بزووتنەوەی ئیسلامییدا کە لە لایەن مەلا عوسمان عەبدولعەزیزەوە ڕابەرایەتی دەکرا. بە پێی ڕێکەوتنی نێوانیان و لە پێکهاتەی نوێی بزووتنەوەدا، مەلا کرێکار کرا بە ئەندامی سەرکردایەتی و بەرپرسی سەربازی بزووتنەوەی ئیسلامی. لەو سەردەمەدا لایەنێك لەناو بزووتنەوەدا هەبوو کە جێگری ڕابەری بزووتنەوە واتە مەلا عەلی عەبدولعەزیز سەرپەرشتی دەکرد، ئەم لایەنە هەر لە سەرەتاوە قەناعەتی بە ڕێکەوتنی نێوان بزووتنەوەی ئیسلامی و جەماعەت جیهاد نەبوو. شایانی باس کردنە لە ساڵانی یەکەمی دروستبوون و دەستبەکاربوونی بزووتنەوەدا، مامۆستا عەلی باپیر و لایەنگرەکانی ماوەیەکی کەم پاش تێکەڵبوونیان لەگەڵ ئەم ڕێکخراوە، ساڵی ١٩٨٩ شەڕێکی قورسیان لە نێوان ڕژێمی بەعس و بزووتنەوەی ئیسلامییدا دروست کرد کە قیادەی بزووتنەوە ڕازی بەم شەڕە لە ئاستێکی ئاوا بەربلاو و چڕوپڕدا نەبوو بەڵام سەرباری ئەو ناڕەزایەتییەش، مامۆستا عەلی باپیر پابەندی بڕیاراتی سەرکردایەتی نەبوو و درێژەی بە شەڕەکە دا. هەروەها لە لایەکی تریشەوە ماوەیەك بوو بزووتنەوەی ئیسلامی لەگەڵ نافەرمانی و تاکڕەوییەکانی مەلا عەلی عەبدولعەزیزدا بەرەوڕوو بووبوو و ئەمە لە کاتێکدا بوو کە هێشتا ماوەیەکی زۆر بەسەر دروستبوونی ئەم ڕێکخراوەدا تێنەپەڕیبوو و تەنانەت لە دروستبوونی ڕێکخراوەکەو داڕشتنی پێکهاتەو قەوارەو ڕابەر و قیادەشدا پەلە کرابوو. بۆیە بەرپرسانی بزووتنەوە بە مەبەستی چارەسەرکردنی لایەکی کێشەکان، سەرەڕای کەم ئەزموونی و کەم تەمەنی مامۆستا عەلی باپیر، ئەویان وەك ئەندامی مەکتەب سیاسی بزووتنەوە دیاری کرد و بێگومان ئەمە بۆ ئەو جێگای دڵخۆشییەکی ئێجگار زۆر بوو.

پاش توانەوەی جەماعەت جیهاد لە ناو بزووتنەوەدا، بنکەی سەرکردایەتی ئەم گروپە لە دیانا، کرا بە فێرگەی سەربازیی بزووتنەوەی ئیسلامی. یەکەم چالاکی ئەم بنکەیە لە قۆناغی نوێدا، کرانەوەی خولێکی تایبەت بە پەروەردەی «مامۆستا» بوو لە لایەن مەلا کرێکارەوە. ئەو کەسانەی بۆ بەشداری کردن لەم خولەدا هەڵبژێردران کادێری مام ناوەندیی بزووتنەوەی ئیسلامی و سەر بە شوێنە جیاجیاکانی کوردستانی عێراق بوون. ئەگەرچی ئەم خولە بانگەشەو تەبلیغێکی وای بۆ نەکرابوو بەڵام زۆر سەرکەوتوو بوو و بە یەکەم خولی سەربازیی ئیسلامی دائەنرێ لە مێژووی هاوچەرخی کوردستاندا کە تیایدا کەسێکی وەك مامۆستا ئاسۆ هەولێری پلەی یەکەمی بە دەست هێنا. پاش ئەم خولە، خولێکی تری سەربازی بە مەبەستی ئاشناکردنی موجاهیدینی بزووتنەوە بە چەکە سووك و نیوە قورسەکان لە ئاستی کوردستانی عێراقدا —ئەم خولە لە سەرجەم بنکەو بارەگاکانی بزووتنەوە لە دهۆکەوە تا هەولێر و سلێمانی و شارەزوور و کەلار و شارباژێڕ و دەشتی بازیان و..... بەڕێوە چوو— کرایەوە. بەم جۆرە بنکەی سەربازی دیانا بوو بە سەنتەری بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی جیهادی بە هەموو کوردستانی عێراقدا. لەو سەردەمەدا بنکەی سەرکردایەتی بزووتنەوەی ئیسلامی لە حاجی ئاوای نزیك شاری ڕانییە بوو. پاش بەڕێوەچوونی چەند خولی سەربازی و ڕاهێنان و پەروەردەی بەشێکی بەرچاوی ئەندامانی بزووتنەوە، بڕیاردرا هێزی سەربازیی بزووتنەوە لە چوارچێوەی سوپایەکدا بەناوی (سوپای بەرگری ئیسلام) یان (سوپای بەرگری ئیسلامی) کۆ بکرێتەوە.

چۆنیەتی دامەزران و دەستبەکاربوون و بەڕێوەچوونی خولە سەربازییەکانی مەعەسکەر دیانا بەوجۆرە بوو کە باسم کرد نەک ئەوەی کە ئێوە باستان کردووەو گۆیا ئەو کەسانەی لە جیهادی ئەفغانستان گەڕابوونەوە لە دامەزران و بەڕێوەبردنی سەربازگەی دیاناو خولەکانیدا رۆڵی سەرەکییان گێڕابێ. تەنیا خودی مەلا کرێکار ئەچێتە ئەم خانەیەوە تەنانەت ئەو پێش گەڕانەوەیشی بۆ کوردستان، لە سەردەمی عەبدوڵڵا عەزامدا بە ماوەی دوو ساڵ لە مەدرەسەیەکی دینییدا لە پاکستان دەرسی وتووەتەوە. لە ماوەی ئەو چەند ساڵەی پێش راپەڕیندا کە بزووتنەوەی ئیسلامی تیادا دامەزرا، بە تایبەت بەهۆی شەڕەکانی بزووتنەوەوە لەگەڵ رژێمی بەعس، بەشێک لە ئەندامانی ئەم رێکخراوە گەلێ ئەزموون و تەجرەبەیان لە بواری عەسکەریدا بەدەست هێنابوو. هەروەها بەشێکی تریش لە موجاهید و کادێرە سەربازییەکانی بزووتنەوە لە لایەن سوپای پاسدارانی ئێرانەوە لە خولی پەروەردەی عەسکەریدا بەشداری درابوون و لەگەڵ جۆرەکانی چەک و شێوازی شەڕی عەسکەری و پارتیزانیدا ئاشنا کرابوون. ئەمە بەشێک بوو لە رێکەوتنی بزووتنەوەو کۆماری ئیسلامیی ئێران. هەروەک ئاماژەم پێدا ئەو پەیامەی لە مەعەسکەر دیانای بزووتنەوەوە ئەهاتە دەرەوە زیاتر بانگەوازێک بوو بۆ جیهادکردن لە پێناو ئاییینی پیرۆزی ئیسلامدا، ئەمە وایکردبوو کە تەنانەت بڵاوکراوەکانی دەرەوەی کوردستان بۆ نموونە گۆڤاری مانگانەی (راپەڕین) کە لە پیشاوەری پاکستان و لە لایەن لایەنگران و کەسوکاری عەبدوڵڵا عەزامەوە دەردەچوو، بەردەوام باس و بابەتی پێوەندیدار بە ئیسلامییەکانی کوردستان بڵاو بکاتەوە. هەروەها وەرزنامەی (ئاڵای ئیسلام)یش کە مەلا کرێکار سەرپەرشتی دەکرد و لە پیشاوەری پاکستان چاپ دەکرا، تایبەت بوو بە بڵاوکردنەوەی فیکرەی جیهادی و بابەتی پێوەندیدار بە چۆنییەتی بەرگریکردن لە ئیسلام.

ئێستا با بێینە سەر باسی سەلەفییەت، وەک پێشتر باسم کرد ئەم فیکرەیە لە کوردستانی عێراق لە کۆتاییە هەشتاکاندا شێوازی لاجەماعی هەبوو و پاش راپەڕین لە لایەن مەلا عومەری چنگیانی و هاوبیرەکانیەوە بەرەبەرە پەرەی سەند و هۆگر و لایەنگری زیاتری بۆ پەیدا بوو. چنگیانی ئەم فیکرەیەی لە وڵاتانی عەرەبییەوە هێنابووە کوردستان، ئەو لە سەردەمی رژێمی بەعسدا کاتێک ئەیانەوێ بیگرن و وەک عەسکەر رەوانەی بەرەکانی شەڕی بکەن ناچار ئەبێ عێراق بەجێ بهێڵێت و روو لە وڵاتانی عەرەبی بکات. لە ماوەی مانەوەیدا لەو وڵاتانە، لەگەڵ بیروباوەڕی سەلەفییەت و کەسانی ناوداری ئەم بوارە هەروەها لەگەڵ عەرەبە دەوڵەمەند و سەرمایەدارەکاندا ئاشنا ئەبێ. هەر لەم رووەیشەوە دەست ئەکا بە خوێندنی ئاییینی و ئەبێتە کەسێکی شارەزای بواری «فەرمووده». پاش گەڕانەوەی بۆ کوردستان لە دوای راپەڕینی ١٩٩١، دەست ئەکا بە تەبلیغی بیروباوەڕی سەلەفییەت و بەو مەبەستەش دەست بە دروستکردنی مزگەوتێک لە گردی مامە یارەی شاری سلێمانی ئەکات کە دواتر بەناوی مزگەوتی (ئیمان) ناوبانگی دەرکرد. مەلا عومەر و هاوڕێکانی ئەم مزگەوتەیان کردە بنکەی هەمیشەیی خۆیان و مینبەری تەبلیغی سەلەفییەت. ئەوان لە هەلومەرجی ئاڵۆزی ئەوکاتدا بە مەبەستی پارێزگاری کردن لەخۆیان و بنکەکەیان، لە ئاستی پێویستدا (سیلاح)یان بەدەستەوە گرت. مانگی ١٢ی ساڵی ١٩٩٢ی زایینی لە نێوان بزووتنەوەی ئیسلامی و یەکیەتی نیشتمانیدا شەڕ و تێکهەڵچوونێک هاتە ئاراوەو سەلەفییەکانی مامە یارە واتە جەماعەتەکەی مەلا عومەر چنگیانییش کەوتنە ناو ئەم شەڕەوە کە بە شکستی ئەوان و بزووتنەوە کۆتایی هات. ئەو ئاڵوگۆڕە سەیرەی کە پاش ئەم شەڕ و شکستە بەسەر مەلا عومەردا هات بووە هۆی ئەوە لای شێخ و دەوڵەمەندە عەرەبەکانی دەرەوەی کوردستان متمانەی خۆی لە دەست بدات و ئەویش لە بەرانبەردا کەوتە لۆمەکردنی ئەوان. ئەم رووداوەو چەند رووداوێکی تر بوونە هۆی ئەوە سەلەفییەکانی کوردستان لە شێوازی کارکردنیاندا هەندێ ئاڵوگۆڕ پێک بهێنن بەڵام ئاڵوگۆڕی سەرەکی ئەوە بوو کە ئەوان بۆ هەمیشە ماڵئاواییان لە چەک و سیلاح کرد و تەنیا خۆیان بە کاری بانگەشەو تەبلیغەوە خەریک کرد. ئەو بەشە لە سەلەفییەکان تاکوو ئێستایش بە هەمان شێواز کار دەکەن و باوەڕیان بە هەڵگرتنی چەک و کاری جیهادی نییە. ئەوان زیاتر پێڕەوی لە کەسانی ناسراوی سەر بە رەوتی (مورجیئە)و لاجیهادی بە تایبەت (شێخ ئەلبانی)یەوە دەکەن. هەرچەند وەڵامەکە هەندێ درێژ بۆوە بەڵام

هەموو ئەو وردەکاریانەی باسم کردن، پێوەندییان بە پرسیارەکەی ئێوەوە بوو و باسکردنیانم بە پێویست زانی. وەك باسم کرد سەربازگەکەی دیانا بەو ئاستەی بووە شوێنی پەرەپێدان و بەرجەستەبوونەوەی رۆحیاتی جیهاد، نەبووە هۆی تەبلیغی کەلتوور و بیروباوەڕی سەلەفییەت. هەروەها هێزی ٢ی سۆرانیش کە زادەی هەندێ رووداو و ئاڵوگۆڕ بوو، بۆخۆی هەڵگری باس و خواسێکی زۆرە کە لە بەشەکانی داهاتوودا لە وەڵامی پرسیارەکانی ئێوەدا (ئەگەر باستان کرد) دەربارەی قسە ئەکەم.

تێبینییەك لە سەر (الجماعة الجهاد): لە سەرەتای هەشتاکان و لە شاری هەولێردا رێکخراوێك بەم ناوەوە لە لایەن مەلا ئەمینی پیرداوودەوە دامەزرا، مەلا ئەمین کۆنە ئەندامێکی ئیخوان بووە لە حەفتکاندا بەڵام دواتر لە ئیخوان جیادەبێتەوەو تاوانباریان ئەکا بەوەی هۆکاری لاوازی و دواکوتوویین لە عالەمی ئیسلامیدا. بە واتایەکی تر مەلا ئەمین (الجماعة الجهاد)ی وەك ئەلترناتیڤێك بۆ ئیخوان دروست کرد. ئەڵبەت دەرکەوتنی ئاشکراو چەکداریی ئەم رێکخراوە دەگەڕێتەوە بۆ دوای راپەڕین و پاش گیان لە دەستدانی ئەمیرەکەیان (مەلا ئەمین) لە ١٩٩٧دا، رێکخراوەکە هەڵوەشایەوە و ئەندامەکانی چوونە ریزی «کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان»ەوە. ئەڵبەت پێشتریش لە ساڵی ١٩٩١داو پاش راپەڕین، ئەم رێکخراوە تێکەڵ بە بزووتنەوەی ئیسلامی بوو بەڵام دوای ماوەیەك لێی جیابووەوە. ئایا ئەوەی جەنابت باسی دەکەی واتە ئەو جەماعەت جیهادەی مەلا کرێکار و دڵشاد کەلاری و سەلەفییەکانی گەرمیانی تێدا بوو هەر هەمان جەماعەت جیهادی هەولێر بوو یان رێکخراوێکی تر بوو؟ هەروەها ئەوەشمان بۆ روون بکەوە عەبدولقادر عەبدولعەزیز لەو کتێبەیدا چۆن مەنهەجێکی بۆ جووڵانەوەو جیهادی ئیسلامیی دیاری کردووە کە لەو سەردەمەدا ئاوا کەوتە بەر سەرنجی سەلەفییەکانی کوردستان. پرسیارێکی تریش ئەوەیە کە مەلا عومەر چنگیانی و هاوڕێیانی باوەڕیان بە چ جۆر سەلەفییەتێك بوو، ئایا ئەتوانین بڵێین دەقاودەق باوەڕیان بە سەلەفییەتی لا جیهادی بوو؟

ئەم دوو رێکخراوە هەرچەند ناوەکەیان یەکێك بوو بەڵام دوو رێکخراوی بە تەواوی جیاواز بوون و هیچ پێوەندییەکیان پێکەوە نەبوو و هەرکام لە هەلومەرجێکی تایبەتدا دامەزرابوون. ئەو رێکخراوەی کە مەلا ئەمینی پیرداوود یان مەلا ئەمینی جیهاد سەرپەرشتی دەکرد ئەوەندەی من ئاگادارم تەنیا چەند ساڵێك و تا ماوەیەك پاش کوژرانی مەلا ئەمین بەردەوام بوو لە کار و چالاکی. مەلا ئەمین ساڵی ١٩٩٦ی زایینی لە لایەن بزووتنەوەی ئیسلامییەوە بە شێوازی تیرۆر کوژراو کوشتنەکەیشی بەو بیانووەوە بوو گۆایە ئەو دەستی لە رژانی خوێنی چەند ئەندامێکی بزووتنەوەدا بووە کە ماوەیەك پێشتر لە لایەن پارتییەوە کوژرابوون. هەروەها جگە لەوەش ماوەیەك بوو بەهۆی دەرکرانی کاسێتێکی سەوتی لە لایەن مەلا ئەمینەوە، ئاڵۆزی کەوتبووە نێوان جەماعەت جیهاد و بزووتنەوەی ئیسلامییەوە، مەلا ئەمین لە کاسێتەکەدا رەخنەی لە مامۆستا عەلی باپیر گرتبوو و بەشێك لە وتار و خوتبەکانی ئەوی بە ناشەرعی و تەنانەت بە کوفریش باس کردبوو. بۆیە هەندێ کەسیش ئەمەیان بە هۆکاری کوژرانی مەلا ئەمین دەزانی بەڵام بزووتنەوەی ئیسلامی هیچکات ئیعترافی بە تیرۆرکردنی مەلا ئەمین نەکرد و ئەم تیرۆرەی نەگرتە ئەستۆ. کوژرانی مەلا ئەمین بە دەستی ئەندامانی حزبێکی ئیسلامی، نیگەرانییەکی زۆری خستە دڵی ئیسلامییەکانی کوردستانەوە بەلام بە خۆشییەوە ئەم رووداوە هیچ خوێنرژانێکی تری بەدواوە نەهات. پاش کوژرانی مەلا ئەمین، کەسێك بەناوی مەلا نامیق کە خەڵکی تەوێڵەی ناوچەی هەورامان بوو و دواتر تێکەڵ بە ریزەکانی ئەنسارولئیسلام بوو، جێگای ئەوی گرتەوەو بوو بە ئەمیری جەماعەت جیهاد. هەروەها پاش جیابوونەوەی جەماعەتی مامۆستا عەلی باپیر لە بزووتنەوەی ئیسلامی، پاشماوەکانی جەماعەت جیهاد کە سەردەمانێك ئەمیرەکەیان رەخنەی توندی لە مامۆستا عەلی باپیر ئەگرت و دەنگۆی ئەوەش هەبوو کە ئەم رەخنانە

بۆتە هۆی تیرۆرکرانی مەلا ئەمین لە لایەن ئەوانەوە، تێکەڵ بە کۆمەڵی ئیسلامی بوون کە یەکەم رۆژی مانگی پێنجی ٢٠٠١ دامەزرانی خۆی راگەیاندبوو. ئەندامانی ئەم دوو رێکخراوە پاش چەندجار دانیشتن و راگۆڕینەوە، بڕیاری یەکگرتنیان داو بە پێی ئەم بڕیارە (الجماعة الجهاد) تێکەڵ بە کۆمەڵی ئیسلامی بوو و لەناو ئەم رێکخراوەدا توایەوە.

دەربارەی کتێبەکەی عەبدولقادر عەبدولعەزیزیش واتە کتێبی (العُمده فی اعداد العُده) پێویستە بڵێم ئەم کتێبە یەکەمجار لە نیوەی دووهەمی هەشتاکاندا بڵاو بۆوەو زۆر بە خێرایی سەرنجی موسوڵمانە جیهادییەکانی بۆلای خۆی راکێشاو بوو بە سەرچاوەیەکی بە کەڵك بۆ هەموو گروپ و رێکخراوە جیهادییەکانی دونیاو کاریگەرییەکی زۆری لەسەر هەموو رەوت و گروپ و رێکخراوە جیهادییەکان دانا. هەر گروپ و رێکخراوێکی جیهادی بە پێی ئەو هەلومەرجە کە تیایدا بوو و هەروەها بە نیسبەت شوێنی چالاکی و تێکۆشانیەوە، لە بابەتە فێرکارییەکانی ناو ئەم کتێبە کەڵکی وەردەگرت. ئەم کتێبە ٤٢٠ لاپەڕەییە حەوت بەشی لەخۆ گرتووە کە باس و بابەتە سەرەکییەکانی بریتین لە: بنەماکانی کاری ئەمیرایەتی و ئەرك و بەرپرسایەتی ئەمیر، رەواندنەوەی گومانەکانی جایزنەبوونی جیهاد لە کاتی نەمانی ئیمام یان خەلیفەدا، شێوازی هەڵسووکەوت کردنی ئەمیر لەگەڵ کەسانی خوارەوەی خۆیدا هەروەها شێوازی هەڵسووکەوتی ئەندامانی پلەخوار لەگەڵ ئەمیرەکەیاندا، هەڵسووکەوتی ئەمیر و ئەندامان لەگەڵ دانیشتوانی ناوچەی ژێر دەسەڵاتیاندا، پێویستی ئەعدادکردن و فێربوونی فەن و تاکتیکی سەربازی، پێویستی بەکارهێنان و کەڵکوەرگرتن لەو شتانەی (اسباب)ی سەرکەوتنن هەروەها قەزییەی حاکمییەت و دەسەڵاتداری. سەلەفییەکانی کەلار و ناوچەکانی تر تینووی کتێبێکی ناوەها بوون هەروەها هەم ئەمیر و ئەندامانی (الجماعة الجهاد) و هەمیش رابەر و سەرکردەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی تەنیدی کتێبەکەی عەبدولقادر عەبدولعەزیزیان دەکرد و فێربوونی باس و بابەتەکانی ناو ئەم کتێبەیان بە پێویست دەزانی. بۆیە بەشی زۆری ئەو باس و بابەتانەی لەم کتێبەدا هاتبوون، لە خولە سەربازییەکانی مەعەسکەر دیانادا دەوترانەوە.

دەربارەی ئەوجۆرە سەلەفییەتەش کە مەلا عومەری چنگیانی و گروپەکەی پێڕەوییان لێوە ئەکرد ئەتوانم بڵێم بەڵێ ئەم خەڵکانە لاجەماعی بوون بەڵام ئەم فیکرەو بیروباوەڕە بەتەواوی لە کردار و هەڵسووکەوتی ئەواندا رەنگی ئەدابووەوە. بۆ نموونە هەرچەند لە هەلومەرجی ئاڵۆزی دوای راپەڕیندا چەك هەڵگرتن دیاردەیەکی باو و عورف هەڵگر بوو بەڵام چەکداربوون و کۆبوونەوەی ئەم سەلەفییانە رەنگ و بۆی جەماعەتی پێ بەخشیبوون. هەروەها ئەمیرەکەیان (مەلا عومەر) ئەوەی کە وەك تیۆری لە وتار و خوتبەکانیدا دەیوت دەقاودەق لەگەڵ ئەوەدا کە بە کردەوە دەیکرد و ئەنجامی ئەدا یەکی نەدەگرتەوە. وەك نموونە ئەتوانم ئاماژە بە دەرهێنانی دەمانچە لە لایەن مەلا عومەرەوە لە کاتی وتارخوێندنەوەو هەڕەشەکردن لە لایەنە نەیارەکاندا بکەم!! هەر ئەم ناتەباییەش هۆکاری سەرەکی تێوەگلانی ئەوان بوو لە شەڕی یەکییەتی نیشتمانی و بزووتنەوەی ئیسلامی لە ساڵی ١٩٩٣ دا. بەڵام ئەو شەڕە ئەوانی بردەوە سەر رێڕەوی راستەقینەی خۆیان، پاش ئەوەی کە مەلا عومەر لەو شەڕەدا هەیمەنەی خۆی لە دەست دا لەناو پاشماوەکانی جەماعەتەکەیشیدا قەدر و قیمەتێکی وەهای بۆ نەماو ئەوان ئامادە نەبوون بیکەنەوە بە ئەمیری خۆیان. هەروەها ئەوان پاش عەفوکرانیان لە لایەن یەکیەتیەوە بە تەواوی وازیان لە چەك هێناو کەسێکیان لە ئەندامانی رێکخراوەکە بەناوی مەلا عەبدولکەریم وەك خەتیب و پێشنوێژی مزگەوتی ئیمان دیاری کرد. مەلا عەبدولکەریم یەکێك بوو لە قوتابیانی مەلا عومەر و وانە ئایینیەکانی لای ئەو تەواو کردبوو. پاشماوەکانی جەماعەت جیهاد لەوە بەدواوە هەموو کارەکانیان لە چوارچێوەی یاساکانی حکوومەتی هەرێم و وەزارەتی ئەوقافدا بەڕێوە ئەبرد. ئەم سەلەفییانە تاکوو ئێستاش بەردەوامن لە کار و چالاکی و ژمارەیان روو لە زیادبوون بووەو نوێنەرایەتی رەوتی (مورجیئە) یان سەلەفییەتی لاجەماعی لە کوردستانی عێراقدا دەکەن و ماموستا عەبدولکەریم، ماموستا عەبدوڵلەتیفی چوارقوڕنەو حەمەدی سەلەق ناسراوترین کەسانی ناو ئەم رەوتەن. پێویست بە ئاماژەیە سەلەفییەتی مورجیئە ماوەی چەند ساڵێکە جێگای خۆی لەناو

سوننەکانی ئێرانیشدا کردۆتەوە، ئەم فیکرەیە سەرەتا بەهۆی (عەبدولقادری تورشابی)یەوە لە ناوچەکانی باکووری ئێران و پاشان بە هۆی (عەبدولهادی کانی سوورە) و قوتابییەکانییەوە (عەبدولڕەحمان و عەبدولڕەحیمی حسەینپوور) کاری بۆ کراوە. عەبدولڕەحمان و عەبدولڕەحیم بە فەرمی لە ساڵی ۱۳۸۲ی هەتاوییەوە بوونە پێشڕەوی سەلەفییەتی لاجەماعی لە کوردستانی ئێران و بە زۆری عەبدولڕەحمان کاریگەری هەبووە لە بڵاوکردنەوەی ئەم فیکرەیەدا. مورجیئەکانی کوردستان پێوەندیی راستەوخۆیان لەگەڵ مورجیئەکانی وڵاتی سعوودییە بە تایبەت لەگەڵ (شیخ ربیع بن هادی المدخلی)دا هەیە کە یەکێکە لە عالمە گەورەکانی رەوتی مورجیئە لە دونیاداو پێوەندییەکی گەرمی لەگەڵ دەسەڵاتی سعوودیدا هەیە. مورجیئەکانی کوردستانی ئێران و وڵاتی ئێران بە گشتی، بە شێوەیەکی بەردەوام کتێب و گۆڤار و بڵاوکراوەکانی سەلەفییەتی لاجەماعی سعوودییان پێ ئەگات. هەروەها سەلەفییەتی مورجیئە لەناو کوردەکان و تورکەکانی تورکیاشدا نفووز و پێگەیەکی باشی هەیە، (مکتبە غُربة ) ناوەندێکی گەورەی تایبەت بە چاپی کتێب و بڵاوکراوەکانی ئەم رەوتەیە لە تورکیا کە تا چەند ساڵ پێش ئێستا لە لایەن کەسێکەوە بە ناوی (عەبدوڵڵا ئەسەری) سەرپەرشتی دەکرا. وەک خاڵی کۆتایی پێویستە ئەوەش بڵێم کە مورجیئەکان نەک بۆخۆیان باوەڕیان بە جیهاد نییە بەڵکوو بەردەوام رەخنە لە رەوتی سەلەفییەتی جیهادییش ئەگرن و بە کەسانی چەواشەکار، تێنەگەیشتوو، ئاژاوەگێڕ و .....هتد ناویان دەبەن. ئەوان هیچکات لە وشەی (جهاد) کەڵك وەرناگرن و زیاتر وشەی (توحید) وەك پاشگری ناوی (سەلەفییەت) بەکار ئەهێنن. هەروەها زۆرجاریش خۆیان وەکوو (التبلغ والدعوه) یان (التوحید و السلف) ناو ئەبەن.

**ئەی دڵشاد کەلاری و هاوڕێیانی کە پەیوەست بوون بە (الجماعة الجهاد)ەوە پێشتر لەناو کام رێکخراو یان رەوتی ئیسلامیدا بوون و چ پێشینەیەکیان هەبوو؟ هەروەها هێزی ۲ی سۆران لە کەیدا دروست بوو و ئایا راستە کە گوێیان بۆ رێبەرایەتی بزووتنەوە شل نەکردووەو تا رادەیەکی زۆر وەك هێزێکی سەربەخۆ جووڵاونەتەوە؟ بە واتایەکی تر وا بەناوبانگە کە فەرماندەکانی هێزی ۲ی سۆران بزووتنەوەیان تەنیا وەك رووپۆشێك بەکار ئەهێنا و لە راستیدا حزبێك بوون لەناو حزبێکی تردا؟**

ئەوەندەی ئاگادارم دڵشاد کەلاری پاش ئەوەی ساڵەکانی ۱۹۸۷/۱۹۸٦ی زایینی وازی لە یەکیەتی نیشتمانی هێناوە راستەوخۆ پێوەندیی بە بزووتنەوەی ئیسلامییەوە کردووەو هەر لە سەرەتای دامەزرانی بزووتنەوەوە یەکێك بووە لە پێشمەرگە سەرەتاییەکانی ئەم رێکخراوە. ئەو لە سەرەتای دەستبەکاربوونی مەفرەزە سەرەتاییەکانەوە بەشداری لە وردە چالاکییەکانی بزووتنەوەدا کرد و پێوەندیکردن بە خەڵکی ناوچەکانی گەرمیان و سەردانی ئەو ناوچانەی کەوتە سەر شان کە بە تەواوی کەوتبوونە ژێر زەبر و زەنگی حکوومەتی بەعسەوە. ئەگەر بە وردی سەرنجی مێژوو و رەوشت و تایبەتمەندییەکانی خەڵکی ناوچەی گەرمیان بدەین بۆمان دەرئەکەوێ خەڵکی ئەم ناوچەیە زۆر لەخۆبردوو و چاونەترسن و هەر رێچکەو رێبازێکیان گرتبێتە بەر بە رۆحی خۆبەخشی و فیداکارییەوە کاریان بۆ کردووە. پێدەچێ یەکێك لە هۆکارەکانی زووتر ئاشنابوونیان لەگەڵ سەلەفییەت پێوەندیی بە هەڵکەوتەی جوگرافی ناوچەکەوە بێ کە هاوسنوورە لەگەڵ ناوچە عەرەبنشینەکانی ناوەڕاستی عێراق و ئەمەش بۆتە هۆی درووستبوونی جۆرە پێوەندییەك لە نێوان گەرمیانییەکان و عەرەبە سوننەکانی دراوسێیان. هەروەها ئەوان لە زۆر بواردا کەوتوونەتە ژێر کاریگەری یەکترەوەو تەئسیریان لە یەکتر وەرگرتووە کە بێگومان یەکێك لەم تەئسیر وەرگرتنانە لە بواری ئایینی و مەزهەبیدا بووە. بەو پێیە کە ناوچە عەرەبنشینەکانی ناوەڕاستی عێراق یەك لەو شوێنانە بوون کە زووتر سەلەفییەتیان پێ گەیشتبوو بۆیە ئەمە بووە هۆی ئاشنابوونی کوردەکانی گەرمیان بەم بیروباوەڕە. پاشان کە بەرەبەرە سەلەفییەت لە کوردستانی

عێراقدا گەشەی کرد و پەرەی سەند، دڵشاد کەلاری بوو بە نوێنەری سەلەفییەکانی ناوچەی گەرمیان. لەو سەردەمەدا کە سەرەتای، تەبلیغ و ناساندنی سەلەفییەت بوو لە کوردستان، مەسەلەی جەماعی بوون و لاجەماعی بوون واتە ئەو شتەی کە دواتر بووە هۆی پۆلێنکردنی سەلەفییەکان، زۆر گرنگ نەبوو هەروەها هێشتا سەلەفییەکان نە لە باری تیۆری و نە لە باری کاری تەنزیماتی و رێکخراوەییەوە خۆیان جیا نەکردبووەوە. بۆ نموونە سەلەفییەکانی کەلار واتە دڵشاد گەرمیانی و جەماعەتەکەی پێوەندیی رێکخراوەییان بە بزووتنەوەی ئیسلامییەوە هەبوو و ئەندامی ئەم رێکخراوە بوون. ئەوان کە زیاتر رێڕەوی سەلەفییەتی جەماعییان بەلاوە پەسەند بوو، پاش راپەڕین پاڵیان بە (الجماعة الجهاد)ی مەلا کرێکارەوە دا کە گروپێکی جیهادی بوو و گەڵ خاڵی هاوبەشی لەگەڵ سەلەفییەتی جیهادیدا هەبوو. بە گشتی سەلەفییەکانی گەرمیان چ ئەوانەی بە جەماعەت جیهادەوە پەیوەست بوون چ ئەوانەی ئەندامی بزووتنەوەی ئیسلامی بوون، هەموویان بە سەلەفی جەماعی ئەهاتنە ئەژمار و تەنیا بە ئاستێکی کەم فیکرەی ئیخوانی و لاجەماعی و (ارجە )یان پێوە دیار بوو.

ئێستا با وەڵامی ئەوبەشەی پرسیارەکەتان بدەمەوە کە دەربارەی هێزی ٢ی سۆرانە. لەو سەردەمەدا کە بزووتنەوە بە سەر سێ خەتی سەرەکیدا دابەش بووبوو واتە خەتی مەلا عەلی عەبدولعەزیز، مامۆستا عەلی باپیر و خەتی مامۆستا کرێکار، هەرکام لەم خەتانە هەوڵی راکێشان و جەزبکردنی هێزەکانی ناو ئەم رێکخراوەیان بۆلای خۆیان ئەدا. یەك لەو هێزانە هێزی هەولێر یان هەمان مەڵبەندی چواری هەولێر بوو. بۆیە ژمارەیەك لە کادێرە مامناوەندییەکانی ناوچەکانی هەولێر، خەلیفان، باڵەکایەتی، گەڵاڵەو حاجی ئۆمەرانی ناو بزووتنەوە هەوڵی ئەوەیان دا تاکوو هێزێك دروست بکەن کە لەگەڵ سەرجەم هێڵەکانی ناو بزووتنەوەدا پێوەندیی هەبێت و هاوکات نەبێتە دارەدەستی هیچکام لەو هێڵانە. سەرەتا بە تەمابوون ئەم هێزە ناو بنێن (هێزی ٢ی سۆران) چونکوو پێشتریش ئاوەها شتێك لەناو بزووتنەوەدا رووی دابوو بۆ نموونە لەگەڵ هەبوونی هێزێك بە ناوی (هێزی هەڵەبجە) کە تایبەت بوو بە موجاهیدینی ناوچەی هەڵەبجە، ژمارەیەکی تر لە هەڵەبجەییەکانی ناو بزووتنەوە هێزێکی تریان بە ناوی (هێزی ٢ی هەڵەبجە) دروست کرد. سەرەنجام پاش مشتومڕێکی زۆر، بەو هۆیەوە کە ئەو هێزەی بڕیار بوو دابمەزرێ خەڵکی ناوچە جۆراوجۆرەکانی هەولێری لەخۆ دەگرت، بڕیاردرا ناوی (هێزی ٢ی سۆران)ی لەسەر دابنرێت. هێزی ٢ی سۆران ساڵی ١٩٩٥دا دروستبوونی خۆی راگەیاند و وەك هێزێکی گەورەی ناو بزووتنەوەی ئیسلامی دەستی بەکار کرد. جیاوازیی سەرەکی ئەم هێزە لەگەڵ هێزەکانی تری ناو بزووتنەوە ئەوە بوو کە ئەم هێزە سەر بە هیچکام لە هێڵەکانی ناو رێکخراوەکە نەبوو و خاوەن هەڵوێستێکی توندتر و جیدی تر بوو بە نیسبەت ئەیاران و دوژمنانی بزووتنەوەی ئیسلامییەوە. ئەوان هەر لە سەرەتاوە سەرسەختی خۆیان لە بەرانبەر دوژمنانی بزووتنەوەدا پیشان داو ئەمەش دەنگۆی ئەوەی هێنایە ئاراوە کە گۆایە بەرپرسانی ئەم هێزە بە تەواوی سەربەخۆن و مل بۆ سەرکردایەتی بزووتنەوە شل ناکەن. بەڵام بە رای من ئەم دەنگۆیە راست نەبوو چونکوو ئەوان بە رادەیەکی زۆر ملکەچ و گوێڕایەڵی قیادەی رێکخراوەکە بوون بە هەر سێ خەتەکەوەو ئەمەش وای کردبوو کە هەموو لایەك لە خۆیان رازی بکەن بەجۆرێك کە تەنانەت سەرکردە سەربەخۆکانی ناو بزووتنەوەش ئەوانیان بە دڵسۆزی خۆیان و رێکخراوەکە ئەزانی.

کۆی ئەم رەوشت و تایبەتمەندییانە بوونە هۆی ئەوە هەرکەس لە ئاست خۆیەوە یارمەتی هێزی ٢ی سۆران بدات، بەشێکی ئەم یارمەتییانە یارمەتی ماڵی بوو و ئیتر وای لێهاتبوو کە هۆگران و لایەنگرانی بزووتنەوە زەکات و سەدەقەی خۆیشیان ئەدایە ئەم هێزە. لە هەلومەرجێکدا کە بزووتنەوە بە دەست کێشەی نێوخۆییەوە ئەیناڵاند، دروستبوونی ئاوەها هێزێك خۆشحاڵییەکی زۆری بەخشیبووە خەڵکی نائومێد و هیوابڕاوی ناوەوەو دەرەوەی ئەم رێکخراوە. بۆیە بەرەبەرە لە سەرجەم هێز و بەشەکانی ناو بزووتنەوەوە خەڵکانی سەربەخۆو بێزار لە قوڵ و قوڵبازی، روویان لە هێزی

٢ی سۆران کرد و هەروەها چەند هێزێکی تری ناو بزووتنەوەش لە رووی فیکری و کرداری و ئەخلاقییەوە کەوتنە ژێر کاریگەری ئەم هێزەوە.
ئیتر دڵسۆزی و هەست بە بەرپرسایەتی کردنی ئەندامانی هێزی ٢ی سۆران گەیشتبووە ئاستێك کە خەمخۆرانی بزووتنەوە بەردەوام پرۆژەی جۆراوجۆریان ئەدایە بەرپرسانی ئەم هێزە، یەکێك لەو پرۆژانە تایبەت بوو بە چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب و رەزامەندیی رابەرایەتی بزووتنەوەیشی بۆ وەرگیرابوو. بۆیە بەو مەبەستە بەشێکی تایبەت بە ناوی (المرکز الاعلام الاسلامی)یە دامەزراو ماوەیەك پاش دەستبەکاربوونی ئەم بەشە، هێزی ٢ی سۆران بە ناوی جەماعەت مەرکەز نێوبانگی دەرکرد. هەرچەند ئەم ناوەندە تەمەنێکی زۆری نەکرد بەڵام لەو ماوە کەمەیشدا توانی چەندین کتێبی ناوازەی ئیسلامییانەو پێوەندیدار بە مەنهەجی سەلەفییەت چاپ و بڵاو بکاتەوە. ئەم کتێبانە بە خۆڕایی لە رێگای هێز و ئۆرگانەکانەوە بەناو ئەندامانی بزووتنەوەدا بڵاو ئەکرانەوەو لە دەرەوەی بزووتنەوش بە نرخێکی کەم ئەفرۆشران.
بزووتنەوەی ئیسلامی کە خۆی بە رێکخراوێکی ئیسلامیی کوردستانی ئەزانی، لە کۆنەوە یاسایەکی هەبوو کە بە پێی ئەم یاسایە نەیدەتوانی ئەندامی غەیرە کورد وەربگرێ. ئەوە کە هۆکاری دانرانی ئاوەها یاسایەك چ بوو لە مەجالی ئەم باسەدا نییە بەڵام ئەوەی کە شایانی باسکردنە ئەوەیە کە بۆ یەکەمجار هێزی ٢ی سۆران ئەم یاسایەی شکاند و دەستی دایە وەرگرتنی ئەندام و موجاهیدی غەیرە کورد واتە موجاهیدی عەرەب. ئەوان لە روانگەی شەرعییەوە ئەمکارەیان کرد چونکوو ئەو یاسایە کە بزووتنەوە دایناببوو پشتی بە هیچ بەڵگەیەکی شەرعی نەبەستبوو. روانگەی زاڵی جەماعەت مەرکەز ئەوە بوو کە نەك عەرەبی عێراقی بەڵکوو عەرەب و موسوڵمانی غەیرە عێراقیش وەربگیرێت. ئەم هێزە لە سەرەتادا بۆ ئەوەی لە لایەك قیادەی بزووتنەوەی تووڕە نەکردبێت و لە لایەکی تریشەوە لایەنە کوردییەکانی لەخۆی نەورووژاندبێت، بە شێوەی نهێنی کەوتە پێوەندی گرتن لەگەڵ عەرەبەکان و دەستی دایە وەرگرتنی ئەندامی عەرەب. سەیر ئەوە بوو کاتێك چەند بەرپرس و سەرکردەیەکی بزووتنەوە بەمەیان زانی نەك تووڕە نەبوون بەڵکوو ئەمکارەیان بە کارێکی رەواو بە بەجێهێنانی ئەرکی شەرعی وەسف کرد. پاشان هێزی ٢ی سۆران کەوتە راهێنان و پەروەردەی ئەو ئەندامە عەرەبانەی کە پێوەندییان پێوە کردبوو و ئەوانی هەم لە خولی شەرعی و هەمیش لە خولی عەسکەریدا بەشداری دا. ئەوانیش پاش تەواوکردنی خولەکان، ئەگەڕانەوە ناوچەکانی خۆیان و بەکاری رێکخستن و تەبلیغ و وەرگرتنی ئەندامەوە خەریك دەبوون. جەماعەت مەرکەز بەم کارەو لەم رێگایەوە بەرەبەرە بووە خاوەن تەنزیماتێکی بەهێز لە ناوچە سوننەنشینەکانی عێراق بە تایبەت لە شاری بەغداو دورووبەری.
یەکێکی تر لە کارە گرنگەکانی هێزی ٢ی سۆران گۆڕینی ئەو تێگەیشتنە بوو کە ساڵانێك بوو بزووتنەوەی ئیسلامی وەکوو بزووتنەوەیەکی ئیسلامیی نەتەوەیی سەیر دەکرد. جیهادییەکانی دەرەوەی عێراق و کوردستان بە نیسبەت ئیسلامییەکانی کوردستان و بزووتنەوەی ئیسلامییەوە ئاوەها روانگەیەکیان هەبوو بەڵام بۆ یەکەم جار جەماعەتی مەرکەز ئەو تێگەیشتنەیان گۆڕی و توانییان ئەوە بە دونیای دەرەوە بسەلمێنن کە لانیکەم هەموو خەڵکانی ناو بزووتنەوە وەك یەك بیر ناکەنەوەو کەسانێکیان تیادا هەیە کە بەهاو بایەخە ئیسلامییەکان بەلایانەوە لە هەموو شتێك گرنگترەو هیچ هۆگرییەکیان بۆ نەتەوەو نەتەوەپەرەستی نییە. هەر بەو مەبەستە ئەوان بیریان لە دروستکردنی پێوەندیی لەگەڵ جیهادییەکانی دەرەوەی کوردستان بە تایبەت جیهادییەکانی جێگیر لە ئەفغانستان کردەوە کە لە سایەی ئیمارەتی ئیسلامیی تاڵەباندا گیرسابوونەوە. پاش پێوەندیکردنی.جەماعەت مەرکەز بەوانەوە، ئەم هێزە بەرەبەرە سەفیر و نوێنەرانی خۆی رەوانەی ئەفغانستان کرد. هەروەها لە ماوەی چەند ساڵدا چەندین گرووپی سەر بەم هێزە سەردانی ئەفغانستانیان کرد و بەشێکی بەرچاویان بەشدارییان لە خولی پەروەردەی مەعەسکەرەکانی رێکخراوی ئەلقاعیدەدا

کرد. لە لایەکی تریشەوە هێزی ٢ی سۆران کەوتە پێوەندیگرتن لەگەڵ زاناو بیرمەندانی ناوداری جیهانی ئیسلام بە تایبەت ئەوانەی کە سەر بە رەوتی سەلەفییەتی جیهادی بوون.

جەماعەت مەکەز بایەخێکی زۆری بە راهێنان و پەروەردەی سەربازی ئەندامانی خۆی ئەداو بەو مەبەستەش هەوڵێکی چڕوپڕی دەستپێکرد، هەروەها بایەخێکی زۆریشی بە مەسەلەی کۆکردنەوەی چەك و تەقەمەنی ئەداو بەشێکی تایبەت بە چاککردنەوەی سیلاحە لەکارکەوتووەکانی کردەوە. بەرپرسانی ئەم هێزە کە شاهێدی ئەوە بوون چۆناوچۆن لە کاتی شەڕی بزووتنەوەو یەکیەتیدا کۆماری ئیسلامی پێدانی چەك و تەقەمەنی بە بزووتنەوە رادەگرت؛ نەیانەویست خۆیان لەو بەستراوەییە رزگار بکەن تاکوو لەوە بەدواوە بزووتنەوە پشت بە هاوکاری و یارمەتی ئێرانییەکان نەبەستێ. بۆیە هەوڵێکی جیدی و بەرفراوانی کڕین و کۆکردنەوەی هەموو جۆرەکانی سیلاحی دەست پێکرد و ئەنبارێکی گەورەی چەك و تەقەمەنی پێکەوە نا.

بە نیسبەت ئەو بەشەی پرسیارەکەیشەوە گۆیا بۆچوونێك هەبووە کە هێزی ٢ی سۆرانی بە حزبێك شوبهاندووە لە ناو حزبێکی تردا، ناتوانم داکۆکی لەم بۆچوونە بکەم و بڵێم بە تەواوی راستە چونکوو ئەم هێزە لەگەڵ ئەو هەموو تاکرەوییانەدا کە ئەیکرد هێشتا هەر خۆی بە بەشێك لە بزووتنەوەی ئیسلامی ئەزانی و لە چوارچێوەی سیاسەت و بەرنامەکانی ئەم رێکخراوەدا ئەجووڵایەوە. ئەم هێزە نە ئەیویست لە بزووتنەوە جیا بێتەوە نە بەتەمابوو بە هەمان رێچکەو رێبازدا بڕوات کە بزووتنەوە پێوابووی، بۆیەلە خەتختەتێن و ململانێ نێوخۆییەکاندا لایەنی هیچکام لە باڵەکانی ناو بزووتنەوەی نەدەگرت. جەماعەتی مەرکەز و چەند هێزێکی تری هاوشێوەی، لەو هەلومەرجەدا کە بزووتنەوەی پیادا تێدەپەڕی، بووبوونە هۆی دڵگەرمی دڵسۆزانی بزووتنەوەو چاوەڕوانی ئەوەیان لێ دەکرا لە کاتی رووداني هەر جیابوونەوەو لێکترازانێکدا تەنانەت لە کاتی هەڵوەشانەوەی رێکخراوەکەدا، جارێکی تر بی بووژێننەوەو پێش بە پووکانەوەو فەوتانی بگرن. بەڕای من ئەم چاوەڕوانییە لە جێی خۆیدا بوو چونکوو ناکۆکی و مشتومڕی ناو قوڵەکان گەیشتبووە ئاستێك کە هیچ هیوایەك بە هێوربوونەوەی باروودۆخەکە نەمابوو و رابەری ئەوکاتی بزووتنەوە ماموستا عوسمان عەبدولعەزیزی رەحمەتییش نەیدەتوانی چارەیەك بۆ حەلی کێشەکان بدۆزێتەوە یان باشتر وایە بڵێم کەس بە گوێی ئەوی نەدەکرد. باشم لە بیرە کاتێك ناکۆکییەکانی نێوان باڵی مەلا عەلی عەبدولعەزیز و باڵی ماموستا عەلی باپیر بە تەواوی زەق بووبوووەوە، ماموستا مەلا عوسمان ئەیوت: (ئەترسم بمرم و پاش من ئەم دوو عەلییە بزووتنەوە لەت لەت بکەن).

سەرەنجام بزووتنەوی ئیسلامی تووشی ئەو چارەنووسە هات و لە هەنگاوی یەکەمدا باڵی ماموستا عەلی باپیری لێ جیا بووەوەو پاشان هێزی ٢ی سۆران و جەماعەتی ئیسلاحی ماموستا کرێکاریش ئەم رێکخراوەیان بەجێهێشت و بەشدارییان لە دامەزراندنی یەکەم رێکخراوی سەلەفی جیهادی کوردیدا کرد.

**بۆچوونێك هەیە کە ئەڵێت تێکەڵبوونی جەماعەت جیهاد لەگەڵ بزووتنەوە تێکەڵبوونێکی رواڵەتی و تاکتیکی بووە، چونکوو دوای پەیوەستبوون بە بزووتنەوە هەوڵی ئەوەیان ئەدا لە ئاست حیزبە عیلمانییەکان بە تایبەت یەکێتی نیشتمانیدا قایم و پتەو رابوەستن و ملکەچی ئەو یاساو رێسایانە نەبن کە ئەوان وەك دەسەڵاتی حاکمی کوردستان دایان ئەنا. ئەمە یەکێك بوو لە هۆکارەکانی هەڵگیرسانی شەڕی نێوان بزووتنەوەو یەکێتی نیشتمانی. بە حوکمی ئەوەی یەکەم شەڕی ساڵی ١٩٩٢ی نێوان بزووتنەوەو یەکێتی لە ناوچەی کەلار هاتە ئاراوە ئایا ئەتوانین بڵێین سەلەفییەکانی کەلار هۆکاری سەرەکیی شەڕەکە بوون؟**

ئەم بۆچوونە بە تەواوی هەڵەیەو دوورە لە راستی، بۆچوونی ئەو کەسانەیە کە چاویان بە ئیسلام و ئیسلامییەکان هەڵنایەو ئەیانەوێ بە سازکردنی درۆ و دەلەسە ببنە هۆی لاوازیی ئیسلامییەکان. بۆ رەتدانەوەی ئەم بۆچوونە پێم باشە هەم ئێوەو هەمیش خوێنەران ئەوە بزانن کە لە ئیسلامدا تێکەڵبوونی رواڵەتیی شتێکی نامۆو بێ مانایەو بە شتێکی ناشەرعی دانەنرێ. من وەك ئیسلامییەك و وەك لایەنێکی ئەم وتووێژە، هەر لە سەرەتاوە هەوڵم داوە بێ هیچ لایەنگری کردنێك خاڵە لاواز و بەهێزەکانی رەوتی ئیسلامخوازیی کوردستان باس بکەم بۆ ئەوەی لە لایەك دۆست و دڵسۆزی ئیسلام سوودی لێوەرگرن و لە لایەکی تریشەوە دوژمنانی ئەم دینە مەجالی ئەوەیان نەبێ راستییەکان بە ناڕاست و پێچەوانەوە بکەیەننە خەڵکی و مێشێك بکەنە گامێشێك.

بە نیسبەت ئەوەیشەوە گۆیا ئەندامانی جەماعەت جیهاد شەڕی نێوان یەکیەتی و بزووتنەوەیان هەڵگیرساندووە، رەتی دەکەمەوە چونکوو هەر لە بنەمادا باوەڕم بەوە نییە کە بزووتنەوە لایەنی دەسپێشخەری ئەو شەڕە بووبێ. باوەڕم بەوەش هەیە کە ئەگەر لە شوێنێکدا ئەندام و پێشمەرگەیەکی بزووتنەوە یەکەم تەقەی کردبێت بێگومان بۆ دیفاعکردن بووە لە خۆی و ئەمەش کارێکی پیرۆزە. ئەڵبەت من ناڵێم بزووتنەوە هیچکات لایەنی تاوانباری شەڕی نێوان خۆی و یەکیەتی نەبووە چونکوو لە ناو ئەم رێکخراوەیشدا کەسانێکی توندڕەو هەبوون کە شەڕی بزووتنەوەو لایەنە کوردی و عیلمانییەکانیان بە جیهادی رەواو راستەقینە ئەزانی و بەردەوام بەدوای بیانوویەکەوە بوون تاکوو شەڕێکی پێ هەڵگیرسێنن. ئینجا کاتێك لایەنی بەرانبەریش بەردەوام بەدوای ئاوا شتێکەوە بوو ئیتر هەڵگیرسانی شەڕ زۆر ئاسان بوو. بۆیە تاوانباری یەکەم یەکیەتی نیشتمانی بوو کە بەردەوام بیانووی بە بزووتنەوە ئەگێڕاو نەیدەهێشت ئەم رێکخراوە کار و چالاکییەکانی خۆی بەڕێوە ببات. ئەوانەی لەو سەردەمەدا بە خەڵکانی توندڕەوی ناو بزووتنەوە ئەناسران، سەر بە ناوچەو هێز و رەوتی جۆراوجۆری ناو رێکخراوەکە بوون و کەسانێکیشیان لە ناودا بوو کە ئەندامی پێشووی جەماعەت جیهاد بوون و ئەمەش بەو مانایە نییە کە هەموو ئەندامانی پێشووی ئەم جەماعەتە هەڵگری ئاوەها خەسڵەت و تایبەتمەندییەك بووبن.

بە رای من ئەگەر بمانەوێ باری شەڕ و تێکهەڵچوونەکانی بزووتنەوەو لایەنە عیلمانییەکان بخەینە سەر شانی هەندێ کەس بۆ نموونە سەلەفییەکانی کەلار یان فلان هێزی ناو بزووتنەوە، ئەمە غەدرکردنە لە هەموو ئەو موجاهیدانەی سەر بە هێز و ناوچە جۆراوجۆرەکان بوون و بە فیداکارییەوە چوونە شەڕی دوژمنانان و بەرگرییان لە بەهاو بایەخە ئیسلامییەکان کرد. بۆیە داوەریکردنی لەم چەشنە بە مانای کەم بایەخکردنی ماندووبوون و تێکۆشانی هەموو ئەو کەسانەیە کە لە پێناو ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا ئازایانە جەنگان و شەهید بوون. شەڕی بزووتنەوە لەگەڵ ئەو حیزبانەدا شەڕی مان و نەمان بوو، ئەوان بە هەموو توانایانەوە لە بزووتنەوەیان ئەداو ئەیانویست ئەم رێکخراوە بفەوتێنن بۆیە موجاهیدینی بزووتنەوەش پشت بە خوای گەورە لە بەرانبەریاندا راوەستان و توانییان سەربەرزانە قۆناغە سەختەکان تێپەڕێنن. بە نیسبەت شەڕی ١٩٩٢ی نێوان بزووتنەوەی ئیسلامی و یەکیەتیشەوە، ئەتوانم بڵێم ئەگەرچی شەڕەکە لە ناوچەی کەلاردا رووی دا بەڵام هیچ پێوەندییەکی بە سەلەفییەکانی کەلار و کەسانی نزیك لە دڵشاد کەلارییەوە نەبوو. یەکیەتی بە تەمابوو ئەوەی لە هەشتاکاندا بەسەر لەشکری ئیسلامی هێنابوو بەسەر بزووتنەوەی ئیسلامی بێنێت بەڵام ئەم جارەیان سەرکەوتوو نەبوو و تووشی شکستێکی گەورە هات. راستە سەلەفییەکانی کەلار پاش تێکەڵبوونیان لەگەڵ بزووتنەوە، جۆرە دەسەڵاتێکی تایبەت بە خۆیان هەبوو بەڵام ئەم دەسەڵاتەیان لە رووی لێهاتوویی و دڵسۆزییەوە بەدەست هێنابوو نەك بەهۆی تاکڕەوییەوە. پاش تێکەڵبوونی ئەوان بوو کە بزووتنەوە مەڵبەندی گەرمیانی دامەزراند و هەموو گەرمیانییەکان بە سەلەفییەکانی کەلاریشەوە لەناو ئەم مەڵبەندەدا نۆقرەیان گرت.

**لە وەڵامی پرسیارەکانی پێشوودا سووکە ئاماژەیەکت بە ناکۆکییە نێوخۆییەکانی بزووتنەوەی یەکبوون کردووە، بەڕای جەنابت هۆکاری دروستبوونی ئەو ناکۆکیانە چ بوو و مێژووی سەرهەڵدانی ئەگەڕێتەوە بۆ کوێ؟ لەناو بەرپرسانی بزووتنەوەدا جگە لە مەلا کرێکار چ کەسانێکی تریان بەشدارییان لە باڵی (ئیسلاح)دا کرد و ئایا ئەم باڵە لە ڕووی مەنهەجییەوە چ جیاوازییەکی لەگەڵ باڵەکانی تری بزووتنەوەدا هەبوو؟**

باشتر وابوو سەرەتا دەربارەی یەکگرتنی بزووتنەوەی ئیسلامی و بزووتنەوەی راپەڕینی ئیسلامی بتانپرسیبایە ئینجا پرسیاری هۆکاری ناکۆکییە ناوخۆییەکانی ئەم رێکخراوەتان بکردایە. بەهەرحاڵ ئەمە باس و خواسێکی زۆری ئەوێ و ئەگەر مەجال بوو و پرسیارتان لەبارەوە کرد ئەپەرژێینە سەری و باسی ئەکەین. بەڵام سەبارەت بە باڵی ئیسلاح و پێکهاتەو مەنهەجی ئەم باڵە ئەتوانم بڵێم بەو کەسانە ئەوترا (ئیسلاح) کە هۆگر و شوێنکەوتووی مامۆستا کرێکار بوون و پێرەوییان لە ئەو و بەرنامەکانییەوە دەکرد. ناوی (ئیسلاح) پێوەندیی بە پرۆژەیەکی مەلا کرێکارەوە بوو کە کاتی خۆی بە مەبەستی هەندێ ئیسلاح و چاکسازیی لە ناو بزووتنەوەدا، ئامادەی کردبوو و پاش گەڕانەوەی بۆ کوردستان لە ساڵی ١٩٩٥دا خستیە بەردەس سەرکردایەتی بزووتنەوەی ئیسلامی. ئەو پێی وابوو پرۆژەکەی لە لایەن قیادەی بزووتنەوەوە پێشوازی لێ دەکرێت و ئەخرێتە قۆناغی جێبەجێکردنەوە بەڵام بە پێچەوانەوە بایەخ و گرنگییەکی وەهای پێ نەدرا. هۆکارەکەشی ئەوەبوو کە خودی مامۆستا کرێکار وەك نووسەری پرۆژەکە نەیتوانیبوو لە مەیدانی کردەوەدا رەزامەندیی قیادەو ئەندامانی رێکخراوەکە بە دەست بهێنێ و لەمبارەیەوە رەخنەی زۆری لە سەر بوو. ساڵی ١٩٩٤ کاتێك بزووتنەوە بە ناچار رووی لە شاخ کردەوە، مامۆستا کرێکار کرایەوە بە بەرپرسی بەشی عەسکەری تاکوو بە دەسپێکردنەوەی شەڕ قەرەبووی ئەو شکستە بکاتەوە کە لە شەڕە سەرتاسەرییەکەی مانگی ١٢ی ١٩٩٣دا بزووتنەوە تووشی هاتبوو. بەڵام لە هەلومەرجێکی هەستیاری ئاوادا، مامۆستا کرێکار بێ راوێژکردن لەگەڵ بەرپرسانی بزووتنەوەو سەرکردە سەربازییەکانی ژێردەستی خۆی، بە شێوەیەکی پەنامەکی و لەناکاو سەفەری دەرەوەی وڵاتی کرد. ئینجا هەرچەند بزووتنەوە توانی بەهۆی کەسێکی وەك مامۆستا عەبدولقادری برایەتییەوە جێگای مامۆستا کرێکار پڕ بکاتەوەو لە هەڵگرساندنەوەی شەڕەکاندا سەرکەوتن بەدەست بهێنێ بەڵام ئەمە نەبووە هۆی ئەوە بەرپرسانی بزووتنەوە خۆدزینەوەکەی مامۆستا کرێکار فەرامۆش بکەن و لێی خۆش بن. بۆیە کاتێك ئەو بە پرۆژەی ئیسلاحەوە گەڕایەوە کوردستان پێشوازییەکی وایان لە خۆی و پرۆژەکەی نەکرد. ئەم هەڵسووکەوتەی قیادەو ئەندامانی بزووتنەوە مامۆستا کرێکاری لە پرۆژەکە دڵسارد کردەوەو هەر لەو کاتەیشەوە ناوی (ئیسلاح) برا بە باڵای باڵەکەی ئەو لە ناو بزووتنەوەی ئیسلامیدا. هەروەها کاتێك لە ساڵی٢٠٠١ی زایینیدا مامۆستا کرێکار و لایەنگرەکانی لە بزووتنەوەی یەکبوون جیابوونەوە، ناوی کۆمەڵی ئیسلاحی کوردستانیان لەسەر خۆیان داناو لە ناو خەڵکیشدا هەر بەم ناوەوە ناسرابوون و دواتریش هەر بە هەمان ناوەوە تێکەڵ بە جوندولئیسلام بوون.

دەربارەی بەشداریکردنی سەرکردەکانی تری بزووتنەوە لە ناو باڵی ئیسلاحدا، پێم باشە لە سەرەتادا ئەوەتان پێ بڵێم کە لایەنگرانی مامۆستا کرێکار بە دوو دەستە دابەش ئەبوون. بەشێکیان لە خەڵکی سادەو نەخوێندەوار پێکهاتبوون و ئەمانە زیاتر لە رووی عاتیفەو ئیحساساتەوە مامۆستا کرێکاریان خۆش ئەویست و هەر لەم رووەیشەوە ئەو هەر پرۆژەیەکی بدایە پشتیوانییان لێوە ئەکرد. بەشێکی تریشیان ئەو کەسانە بوون کە هەرکام بەجۆرێك و لە ئاستێکدا خاوەن بەرپرسایەتی بوون و گرێدراوییەکی فیکرییان لەگەڵ مامۆستا کرێکاردا هەبوو. هەروەها ئەوان لە رووی ئەو ئاشنایەتییەی لەگەڵ مامۆستاو سەربوردەو کەسایەتی ئەودا بوویان هەروەها بە هۆی ئەو ناسراوی و ئیعتیبارەی مامۆستا کرێکار لە ناو ئیسلامخوازانی دەرەوەی عێراق و کوردستاندا هەیبوو، پێرەوییان لە بەرنامەو پرۆژەکانی ئەو

دەکرد و پێیان وابوو پرۆژەی ئیسلاح نەبێتە هۆی نەمانی کوتلەبازی و سڕینەوەی ناکۆکییە نێوخۆییەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی.

لە ناو لایەنگرانی مامۆستا کرێکاردا کەسانێك هەبوون کە پلەی ئەندامی سەرکردایەتییان هەبوو. مامۆستا عومەری فێرگە خەڵکی ناوچەی شارباژێڕ و ئەندامی سەرکردایەتی، کاك هەڤاڵی کارێزە وشك، عەبدولباری دهۆك، کاك سەیدی ئامۆزای مامۆستا کرێکار، دوکتور عومەر، مەلا مەردانی برای مام ئاراس، کاك عومەری عەسکەری، کاك ئامۆ (فەرهەنگ)، کاك هەژاری نانەوا، عەبدولڕەحمانی موتابەعە. هەروەها لە سەردەمێکی تردا کاك عەلی حەیدەری زاوای مامۆستا کرێکار، مامۆستا هاوڕێ، مامۆستا فەرهادی شەکرەکە، کاك سەرکەوتە سووری چۆخماخی، سدیقی فێرگە، عەبدولفەتاحی سلێمانی، مامۆستا نەبەزی فێرگە، کاك موسلیمی فێرگە، کاوەو ئەنەسی ژنبرام کە هەردووکیان سەرتیپ بوون، سالاری جنۆکە(سەرتیپ)، عەبدولسەلامی سلێمانی، ئارامی تاسڵووجە (ئارامی کۆمپیتەر)، ئەبوو حوزەیفەی هەولێری، جووتیار هەولێری، شێخ جەلال خەمزەیی، شێخ جەبار خەمزەیی، مەلا عەبدوڵڵا دۆڵەرووتی، مامۆستا موحەممەدی قەرتاسییە، سوارەی سلێمانی، مەلا یاسینی مایاوا، عەبدولحەمیدی کەلار، هیوای ئەمیری هێزی یەکی گەرمیان، دوکتور قودس، ئامێقی ئاوەڵزاوام، زەید تاسڵوجەیی، یەحیا تاسڵوجەیی، سۆران عومەری رۆژنامەنووس، خەلیلە سووری کەلاری، عەبدەلغەفووری برای عەبدولڕەحیم (ئەم عەبدولڕەحیمە لە سالآنی هەشتاکان و لە سەردەمی جەماعەت جیهادد ماوەیەك جێگری مامۆستا کرێکار بوو) ژمارەیەك لەو ئەندامانی باڵی ئیسلاح بوون کە لە ناو بزووتنەوەی ئیسلامیدا خاوەن بەرپرسایەتی بوون.

ئیسلاحەکان باوەڕیان بە شەڕکردن لەگەڵ حزبە کوردی و عیلمانییەکاندا بوو و لەو باوەڕەدا بوون کە تەنیا رێگای دابەزاندنی شەریعەتی ئیسلام لە کوردستان، جیهادکردنە دژی ئەو لایەنانە. ئەوان باوەڕیان بە سیستەمی پارلەمانی و بەشداریکردن لە پرۆسەی سیاسی و هەڵبژاردندا نەبوو بەڵام دوو لایەنەکەی تر واتە هەم باڵی مامۆستا عەلی باپیر و هەم باڵی مەلا عەلی عەبدولعەزیز پێچەوانەی ئەوان بیریان نەکردەوەو باوەڕیان بە بەشداریکردن لە پرۆسەی سیاسی و خۆڕێکخستن لەگەڵ حزبە کوردییەکاندا بوو. ئەوان دواتر لە شکڵی دوو رێکخراوی جیادا –بزووتنەوەی ئیسلامی و کۆمەڵی ئیسلامی– بە کردەوە ئەمەیان سەلماند و چوونە ژێر سێبەری حکوومەتی هەرێمی کوردستانەوەو بەشدارییان لە پرۆسەی سیاسیدا کرد و تاکوو ئێستاش چ بە بەشداریکردن لەو دەسەڵاتەداو چ وەك ئۆپۆزسیۆنی ئەم دەسەڵاتە، بەردەوامن لە کار و چالاکیی سیاسیانەی خۆیان. هەرچەند مامۆستا کرێکار وەك باڵی کەمینە زۆر تێکەڵی ناکۆکییە نێوخۆییەکان نەئەبوو و بیری لە زاڵکردنی باڵەکەی خۆی بەسەر باڵەکانی تردا نەئەکردەوە بەڵام بەردەوام لە لایەن دوو باڵەکەی تر بە تایبەت باڵی مامۆستا عەلی باپیرەوە دژایەتی دەکرا. بۆ نموونە کاتێك لە کۆتایی نەوەدەکاندا بەرپرسایەتی مەڵبەندی سلێمانی بزووتنەوەی ئیسلامی کەوتە سەرشانی سەرکردەی باڵی ئیسلاح، لایەنگرانی مامۆستا عەلی باپیر هەر لە سەرەتاوە دژی ئەم بڕیارە بوون و قبووڵیان نەکرد بکەونە ژێر بەرپرسایەتی مامۆستا کرێکار. بۆیە ئەوان مەڵبەندێکی تری سەر بە بزووتنەوەیان لە شاری سلێمانی دامەزراند. ئەم دژایەتی کردنانە لە ئاستێکی بەرفراوانتردا بوونە هۆی ئەوە ئەندامانی باڵی ئیسلاح قەناعەت بەو کەمە بەرپرسایەتییە بکەن کە هەیانبوو و بەرەو پەراوێز و گۆشەگیری بڕۆن. هەروەها ئەوان هیچکات بە مانەوە لە ناو بزووتنەوەیەکی لاواز و پڕ لە ناکۆکیدا دڵخۆش نەبوون. مامۆستا کرێکار بایەخێکی وای بە بەهێزکردنی باری ماڵی و دارایی باڵەکەی نەئەدا، ئەو بڕە پارەیەش جاروبار لەملاولاوە وەری ئەگرت بەناو کەسانی دەوروبەری خۆیدا بڵاوی ئەکردەوە. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە دوو باڵەکەی تر بەشی زۆری داهات و دارایی رێکخراوەکەیان خستبووە چنگی خۆیانەوە.

لاوازی ماڵی، نەبوونی بەرنامەی کاری، جیدی نەبوونی مامۆستا کرێکار لە ئیدارەکردنی باڵەکەیداو سەفەرە کوتوپڕەکانی بۆ دەرەوەی وڵات و چەندین هۆکاری تر، بوونە هۆی ئەوە باڵی ئیسلاح رۆژ بە رۆژ لاوازتر بێت و

ئەندامەکانی دڵسارد بینەوەو بڕیاری وازهێنان بدەن. ئاسایی بوو لە ئاوەها هەلومەرجێکدا ژمارەی ئەو کەسانەش کە پێوەندییان بەم باڵەوە دەکرد روو لە کەمبوون بوو.

**لە نێوان دە ساڵی ۱۹۹۱ تا ۲۰۰۱ی زایینیدا جووڵانەوەی ئیسلامیی کوردستان زۆر هەوراز و نشێوی بەخۆوە بینیوە، جەنابت لە هەموو ئەو ساڵانەدا بە حوکمی ئەوەی ئەندامی گروپ و رێکخراوە ئیسلامییەکان بوویت شایەتی راستەوخۆی ئەم قۆناغە پڕ رووداوەیت. وەکوو جەنابیشت ئاگاداری ئێستاشی لەگەڵدا بێ زۆرێك لە رووداوەکانی دواتر رەگ و ریشەیان ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو دە ساڵە گرنگە، بۆیە ئەمانەوێ کەمێك وردتر لە بیچمبەندیی و پۆلێنبەندیی ئیسلامییەکانی کوردستان لەو سەردەمەدا بکەین، بە تایبەت کە رەوتگەلی جیهادی و سەلەفییەتی جیهادی بەجۆرێك لە جۆرەکان درێژەی هەمان ئەو سەردەمانەن. بە زمانێکی سادەتر تەنیا لە سونگەی ئەو دەیە گرنگەوە ئەتوانین لە ئێستای بزاڤی ئیسلامیی کوردی بگەین.**

**هەرچەند پێشتریش کەم تا کورت باسی هێزی ۲ی سۆرانی بزووتنەوەمان وەك یەکێك لە یەکەم لایەنە جیهادییەکانی کوردستان کردبوو بەڵام بە باشی لە رۆڵی ئەم هێزەی بزووتنەوە لە پەرەسەندنی سەلەفییەت لە کوردستاندا نەگەیشتین. ئەمە لە حاڵێکدایە بە پێی وتەکانی خۆیشت تێڕوانینی ئەو هێزە بۆ سەلەفییەتی جیهادی تێڕوانینێکی هۆگرانە بوو و ئەتوانین بڵێین ئەندام و فەرماندەکانی ناو هێزی ۲ی سۆران دواتر بوونە سەرکردەی رێکخراوە سەلەفی جیهادییەکانی کوردستان. تکایە کەمێك وردتر باسی مەنهەجی فیکری و رەوتی کارکردنی ئەم هێزەمان بۆ بکە.**

بەڵێ وایە منیش ئەو دەیەیەی باستانکردووە بە دەیەیەکی پڕ هەوراز و نشێو لە هەمان کاتدا پڕ دەسکەوت بۆ رەوتی ئیسلامخوازیی لە کوردستانی عێراق ئەزانم. هەرچەند هەلومەرجی نوێی پاش راپەڕین کاریگەرییەکی زۆری لە سەر رووداوەکانی دواتر دانا بەڵام نابێ ئەوەیشمان بیر بچێ کە پێش ئەم قۆناغە واتە قۆناغی دەساڵەی پاش راپەڕین، بزووتنەوەی ئیسلامخوازیی لە کوردستانی عێراق گەلێك قۆناغی تریشی تێپەڕاندووە کە چەند ساڵی پێش راپەڕین واتە ساڵانی کۆتایی دەیەی هەشتا، یەك لەو قۆناغانەیە کە کاریگەرییەکی زۆری لە سەر رووداوەکانی پاش راپەڕین داناوە. لە راستیدا باسکردنی رووداوەکانی ئەم قۆناغە وەڵامێکە بۆ هەموو ئەو کەس و لایەنانەی کە لە سەر ئەو باوەڕەن ئیسلامییەکان رۆڵێکی وەهایان لە راپەڕین و خەباتی ساڵانی پێش راپەڕیندا نەبووە. بۆیە بە پێویستی ئەزانم کەمێك وردتر باسی رووداوەکانی ئەم قۆناغەتان بۆ بکەم و بتانگێڕمەوە بۆ ساڵانی کۆتایی هەشتاکان. ئەو ساڵانە ساڵی سەرکوتکردنی بێبەزەییانەی کوردەکان بوو لە لایەن رژێمی بەعسەوە؛ سەدام حسەین ئەیەویست هەر دەنگێکی نارەزایەتی کوردەکان بە تایبەت هەرجۆرە دەنگ و بانگەوازێکی ئیسلامخوازیی بتاسێنێت. من کە لەو کاتەدا تەمەنێکی وام تێنەپەڕاندبوو، لە کۆتاییەکانی ۱۹۸٦و سەرەتای ۱۹۸۷دا لەگەڵ یەکەم رێکخستنەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی ئاشنا بووم. لەو سەردەمەدا مزگەوتەکان بووبوونە شوێنی بووژاندنەوەی بیروباوەڕی ئیسلامی و گەنجانی گەڕەك بە مەبەستی ئاشنابوون لەگەڵ ئایینی ئیسلام و خوێندنی وانە ئیسلامییەکان روویان لە مزگەوتەکان ئەکرد. منیش یەکێك لەو گەنجانە بووم کە رووم لە مزگەوتی گەڕەکەکەی خۆمان واتە مزگەوتی ئەبووبەکری سدیق لە گەڕەکی سلێمانی تازە کرد.

پاشان لە رێی موسوڵمانانی ناو مزگەوتەوە لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامی جیهادی و رێکخراوە جیهادییەکان ئاشنا بووم و بەشداریم لە خولی فێربوونی تەفسیر و حەدیسدا کرد. هەر لەم رێگایەوە پێوەندیم بە رێکخستنەکانی بزووتنەوەی ئیسلامییەوە کرد. بەهۆی کەمتەمەنییەوە تەنانەت ئاگام لە هەواڵ و رووداوەکانی ناوشاری سلێمانی نەبوو بەڵام هەستم

بەوە كردبوو ئەوانەی هاتوچۆی مزگەوتی گەڕەكی ئێمەیان ئەكرد، بە هەندێك شتی نائاساییەوە خەریكن. من هەوڵم نەئەدا لە كاروباری ئەوان سەردەربهێنم و ئەوانیش لەبارەیەوە شتێكیان بە من نەئەوت. ئالەم كات و ساتەدا بوو كە دەزگای ئەمنی رژێمی بەعس لە شەوێكدا هەڵی كوتایە سەر ماڵی دە كەس لە چالاكترین ئیسلامییەكانی گەڕەكی ئێمەو رۆژی دواتریش ماڵی هەر دەكەیان رووخاندن و پاشان سەرجەم ئەندامانی بنەماڵەكانیشیان گیران و دوای شەش مانگ بەر عەفوی گشتیی كەوتن و ئازاد كران. سەرەنجام پاش ١٦ساڵ بۆمان دەركەوت ئەو دە كەسە كە سیانیان واتە ئەبووبەكری شێخ سەلام، جەمالی حاجی مەولوود خەمزەیی و لوقمانی ساڵح بەحری لە كەسە نزیكەكانی من بوون، شەهید كراون .

ماوەیەك دواتر لە گەڕەكی شێخ محیەدینی شاری سلێمانی رژێمی بەعس دوازدە كەسی تریشی بە هەمان شێوە بێسەروشوێن كرد كە ناسراوترینیان ئەفەرێك بوو بەناوی گۆران. هاوكات لەگەڵ ئەم سەركوتانەدا، لە قۆڵێكی تری شاری سلێمانییەوە «كەیوان» و هاوڕێیانی دەستیان بە چالاكی كرد كە عادڵ باخەوان رۆمانێكی لەسەر نووسیون. هەروەها لە لایەكی تریشەوە هەر لە شاری سلێمانی دەستەیەك گەنجی تری موسوڵمان سەریان هەڵداو دەستیان دایە ئەنجامدانی چالاكی. سەرەتا «سمكۆ» ناوێك و پاش ئەویش «موحەممەد»ی برای بەرپرسایەتی وسەرپەرشتی ئەو گەنجانەیان دەكرد كە لە دانیشتووانی گەڕەكەكانی سەركارێز، سەرشەقام و ئیبراهیم پاشا پێكهاتبوون. جێگری ئەمیری ئەم گروپە كە یەكێك بوو لە چالاكترین رێكخستنە ئیسلامییەكانی ناوشاری سلێمانی، ناوی «شوان حەمە ساڵح» بوو. ئەوان تا سەردەمی راپەڕینەكەی ١٩٩١ بەردەوامبوون لە بەڕێوەبردنی چالاكی و پاشان چوونە ریزەكانی بزووتنەوەی ئیسلامییەوە. ساڵی ١٩٩٢ كاتێك بە رەسمی بوومە پێشمەرگەی بزووتنەوەی ئیسلامی، لەگەڵ شوان حەمە ساڵح ئاشنا بووم كە یەكێك بوو لە كادێرە كاراكانی بزووتنەوە، بەداخەوە شوان رۆژی ١٠/١٠/١٩٩٦ لە جیهاد و رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هێزەكانی یەكیەتیدا شەهید بوو(خوا لێی قبووڵ بكات).

خاڵی جێگای سەرنج ئەوەیە كە ئەم گروپانە جگە لە ئەنجامدانی چالاكی دژی رژێمی بەعس و تیرۆركردنی مۆرە بەدناوەكانی ئەو رژێمە، هاوكات دژایەتی بەكردەوەی ئەو كەسانەشیان ئەكرد كە بە شێوازی جۆراوجۆر دژایەتی ئایینی ئیسلامیان ئەكرد ئەگەرچی سەر بە حزبە كوردی و عیلمانییەكان و دژی رژێمی بەعسیش بوون. باشم لە بیرە لە چەند مانگی یەكەمی ساڵی ١٩٩٤دا رۆژنامەی كوردستانی نوێی یەكییەتی نیشتمانی بابەتێكی لەخۆ گرتبوو بەناوی (ئەمیرە مرۆڤ كوژەكەی شاری سلێمانی)، مەبەستی نووسەر لە ئەمیرە مرۆڤ كوژەكەش شەهید شوان حەمە ساڵح بوو. لە پاڵ بابەتەكەدا دەستنووسێكی شەهید شوانیش چاپ كرابوو كە لە كاتی دەستبەسەراگرتنی بارەگای سەركردایەتی بزووتنەوەدا لە بێتواتە دەست جەلالییەكان كەوتبوو. ئەم دەستنووسە نامەیەكی شوان بوو بۆ سەركردایەتی بزووتنەوەی ئیسلامی كە پێش شەڕەكەی مانگی ١٢ی ١٩٩٣بۆی ناردبوون. ئەو لە نامەكەدا ناوی هەموو ئەو كەسانەی نووسیوە كە تا رۆژی راپەڕین تیرۆری كردبوون و لەوانە چوار كەسیان لە گەورە دوژمنانی ئیسلام و چەند كەسێكیشیان ئەندامی حزبە كوردییەكان بوون كە كەوتبوونە بەردەستیان و كوشتبوونیان. یەكێك لەوان «فایەقی مۆتە» بوو كە شوان بە دەستی خۆی كوشتبووی. ٢٢ كەسیش لە تیرۆر كراوەكان بەهۆی باش بەرنەكەوتن تەنیا بریندار ئەبن و لە مردن رزگاریان ئەبێ كە یەكێكیان «ئەحمەد سالاری» شانۆكار بوو كە بە هونەرەكەی دژایەتی ئیسلامی ئەكرد. هەروەها شوان لە نامەیەكی تردا باسی شەست و چەند كەسێكی تری كردووە كە لە لیستی گروپەكەیاندا بوون و هەموو ئامادەكارییەك بۆ كوشتنیان كرابوو بەڵام وەك خۆی باسی ئەكا بەهۆی راپەڕینەوە فریای كوشتنیان نەكەوتوون. هەروەها یەكێكی تر لەو كەسانەی ویستوویانە بیكوژن «میشل ئەفلەق» بووە كە جارێكیش بە مەبەستی كوشتنی چوونەتە شاری مووسڵ بەڵام وەك شوان ئەڵێ، پێش ئەوەی بەر فیشەكی ئیسلام بكەوێ، بە شێوەی ئاسایی ئەمرێت و بەرەو جەهەنەم ئەبێتەوە.

ئەوەی کە باسم کرد گۆشەیەکی بچووکی چالاکی و کاری ڕێکخستن بوو کە پێش ڕاپەڕین لە لایەن ئیسلامییەکانەوە لە شاری سلێمانی بەڕێوەچوو و ئەمە دڵۆپێك بوو لەو دەریا فراوانەی خەبات و جیهادی ئیسلامخوازانەی کوردستانی عێراق دژی ڕژێمی بەعس و دیکەی دوژمنانی ئیسلام. هەر ئەم چالاکیانەش بوو کە زەمینەی بووژانەوەی ئیسلامی و زەمینەی بۆ دەرکەوتنی بەهێزی ئیسلامییەکان پاش ڕاپەڕین فەراهەم کرد. بزووتنەوەی ئیسلامخوازانەی کوردستان بە گشتی بە تایبەت بزووتنەوەی ئیسلامی و گروپە جیهادییەکانی تر قەرزداری ئەو گەنجە چاونەترسانەن کە بە لێهاتووی خۆیان مۆرکی هەرمان و بەردەوامبوونیان لە لاپەڕەکانی مێژووی بزاڤی ئیسلامخوازیی کوردستان دا.

ئێستا با بێینە سەر ئەو دەیەیەی پاش ڕاپەڕین واتە سالانی ١٩٩١ تا ٢٠٠١ی زایینی. هەرچەند لە وەڵامی پرسیارەکانی پێشوودا باسی گروپ و ڕێکخراوە ئیسلامییەکانی کوردستانی عێراقم کرد بەڵام بۆ وەڵامدانەوەی ئەو بەشەی پرسیارەکەتان کە دەربارەی چۆنیەتی پۆلێنکردنی ئیسلامییەکانی کوردستانە، ئەتوانم بڵێم وەك گروپ و ڕێکخراو لە سەرەتادا چەند گروپێکی ئیسلامی لە کوردستانی عێراقدا هەبوون کە هەرکام نوێنەرایەتی فیکرەو بیروباوەڕێکیان دەکرد. (الجماعة الجهاد)ی مەلا کرێکار نوێنەرایەتی جۆرێك فیکرەی سەلەفییەتی جیهادی دەکرد، بەڵام ئەوان نەیانتوانی بە کردەوە سەلەفیبوون و جیهادیبوونی خۆیان بسەلمێنن و ڕەخنەی ئەوەیان لەسەر بوو کە نەیانتوانیوە یان نەیانویستووە تیۆری و کردەوەکانیان لەگەڵ یەکدا ڕێکبخەن. بزووتنەوەی ئیسلامی لە سەرەتادا چەندین فیکرەی پێوە دیار بوو، ڕابەرایەتییەکەی زیاتر لە ئەشعەرییەتەوە نزیك بوو واتە لە بواری عەقیدەدا ئەشعەری و لە بواری ئەحکامدا پێڕەویی لە ئیمامی شافیعییەوە دەکرد. هەروەها بەشێك لە بەرپرس و ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە هەڵگری بیروباوەڕی سەلەفییەتی جیهادی بوون بەڵام نەیاندەویست خۆیان دەربخەن و بەشێوەی پەنامەکی تەبلیغی بیروباوەڕی خۆیان ئەکرد و هەوڵی ڕاکێشانی ئەندامانی بزووتنەوەیان بۆلای خۆیان ئەدا. سەرەنجام ئەو کەسانە لە ساڵی ١٩٩٥دا هێزی ٢ی سۆرانیان پێکهێناو ئەم هێزە بەرەبەرە هەوڵی پەرەپێدانی سەلەفییەتی جیهادی لە ناوەوەو دەرەوەی بزووتنەوە ئەداو دواتریش لەم ڕێکخراوە جیابۆوەو بەشداری لە دروستکردنی یەکەم ڕێکخراوی سەلەفی جیهادی کوردستانی عێراقدا کرد.

هەروەها گروپەکانی ئەهزەو یەکگرتووی ئیسلامی نوێنەرایەتی فیکرەی ئیخوانولموسلیمینیان لە باشووری کوردستان دەکرد. ئەم دوو گروپە ئەکەونە خانەی گروپە لاجیهادییەکانەوەو وەك بەشی زۆری لقەکانی تری ئیخوان زیاتر بەکاری تەبلیغ و دەعوەتەوە خەریك بوون. هەم ئەمان و هەمیش بزووتنەوەی ئیسلامی کە خاوەن ئەزموونێکی چەند ساڵەی شەڕکردنە لەگەڵ حزبە کوردییەکاندا، باوەڕیان بە جیهاد نەبووەو نییەو هەر لە سەرەتاوە پێیان وابووە کە بە بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پرۆسەی سیاسی و لە حکوومەت و پارلماندا، ئەتوانن بە مەرام و مەبەستەکانیان بگەن. بێگومان ئەمە پێچەوانەی دەستووراتی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەو نیشانەی ئەوەیە کە ئەم گروپ و ڕێکخراوانە ئەوەی کە بیری لێناکەنەوە دابەزاندنی شەریعەتی ئیسلامە. لە دوا ساتەکانی ئەم دەیەیەو لە کۆتاییەکانی ساڵی ٢٠٠١ دا یەکەم گروپی سەلەفی جیهادی بە ناوی جوندولئیسلام دامەزرا کە پاش ماوەیەکی کەم و دوای یەکگرتنی لەگەڵ باڵی ئیسلاحی مامۆستا کرێکاردا ناوی خۆی گۆڕی بۆ ئەنسارولئیسلام. ئەم گروپە بێ هیچ پێچ و پەنایەك باوەڕی بە دابەزاندنی شەریعەت بوو لە کوردستان و شەڕ و جیهادی بە تەنیا ڕێگای دابەزاندنی شەریعەت ئەزانی، بۆیە کەوتە تەکفیرکردنی بەڕێوەبەرانی دەسەڵاتی کوردی لە کوردستانی عێراق و جیهادی لە دژی ئەوان ڕاگەیاند.

چۆن بوو پێش ڕاپەڕین شوان حەمە ساڵح و هاوڕێکانی بڕیاری کوشتنی کەسانێکیان دا کە نەك سەر بە ڕژێمی بەعس نەبوون بەڵکوو دژایەتی ئەم ڕژێمەشیان دەکرد و سەر بە حیزب و لایەنە کوردستانییەکان بوون. شێوازی کوشتن و

**تیرۆرکرانی ئەوان کە تەنانەت هەندێکیان پاش ئەسیرکران کوژران تا چەند لەگەڵ بنەماکانی ئایینی ئیسلامدا رێکدێتەوە؟ بەرای جەنابت ئەم تیرۆرانە چ کاریگەرییەکیان لەسەر رووداوەکانی پاش راپەرینی ۱۹۹۱ی باشووری کوردستان واتە شەڕی نێوان بزووتنەوەی ئیسلامی و لایەنە کوردییەکان دانا؟**

لە وەڵامی بەشی یەکەمی پرسیارەکەتاندا بە پلەی یەکەم ئاماژە بەوە ئەکەم کە کوشتن و لە ناوبردن و زەربەلێدان لە هەرکەس و لایەنێك کە بە وتە یان بە کردە دژایەتی ئیسلام بکات بە مەرجێ دوژمنایەتییەکەی سەلمێندرابێ، ئەرکی هەر موسوڵمانێکی دڵسۆزە. بە پلەی دووهەمیش ئەمەوێ هەندێ شت سەبارەت بە تیرۆر (اغتیال) و دیل کوشتن لە ئیسلامدا باس بکەم تاکوو توانیبێتم بە شێوەیەکی گشتی هەم ئێوەو هەمیش خوێنەران لەگەڵ روانگەی ئیسلام دەربارەی ئەم دوو بابەتە ئاشنا بن. ئەگەر بمانەوێ باس لە ئیسلامەتیی راستەقینە بکەین و شێوازە نموونەییەکەی بەکار بهێنین و ئەمانەوێ راستییەکان بە پێی هەلومەرج و باروذۆخی سەردەم هەڵبسوورێنین وەك چۆن هەندێ نووسەر و سەرکردەی ئیسلامی ئەیکەن، پێویستە بە راشکاوی باسی بۆچوون و روانگەکانی ئیسلام بکەین و ئامادە نەبین لە پێناو هیچ بەرژەوەندییەکی تاکەکەسی و رێکخراوەییدا ئەم بۆچوون و روانگانە چەواشە بکەین.
ئەوەی کە ئایا لە ئیسلامدا تیرۆر هەیەو رێگای پێ دراوە، وەڵامەکەی ئەرێیە. لە سەردەمی پێغەمبەری ئیسلامدا (سڵاوی خوای لێ بێ) بە کردەوە لە شێوازی تیرۆرکردن بۆ لەناوبردنی دوژمنانی ئیسلام کەڵکیان وەرگرتووە. خودی پێغەمبەر (سڵاو و دروودی خوای لێ بێ) هەرکات بە نیسبەت یەکێك لە دوژمنانی ئیسلامەوە کە هەوڵی بەدناوکردنی دینی خوای ئەدا، تووڕەو بێزار ئەبوو، ئەیفەرموو: «کێ ئامادەیە بچێ بۆ کوشتنی (تیرۆرکردنی) فڵانە کەس؟» وەك نموونە ئەتوانین ناوی «کەعبی کوڕی ئەشرەفی یەهوودیی» بهێنین، ئەو نە شەڕی موسوڵمانانی کردبوو و نە کەسی کوشتبوو بەڵام بەوە تاوانبار بوو کە تەئیدی قوڕەیشە کافرەکانی کردبوو و ئەوانی لە پێغەمبەری ئیسلام (سڵاوی خوای لێ بێ) و موسوڵمانان بە ئیماندارتر ئەزانی. بۆیە موحەممەدی کوڕی مەسلەمە (خوای لێ رازی بێ) بە هاوکاری دەستەیەك لە هاوەڵ و هاوهۆزییەکانی، کەعبی یەهوودیی لەناو ماڵ و منداڵەکەیدا تیرۆر کرد.
هەروەها هەر لە سەردەمی پێغەمبەری ئیسلامدا (سڵاوی خوای لێ بێ) کەسێك بە ناوی ئەبوو رافیع خەریکی کۆکردنەوەی هێز بوو بۆ هێرش کردنەسەر مەدینە بەڵام پێش ئەوەی فریای هێرشکردن بکەوێ، پێغەمبەری ئیسلام یەکێك لە هاوەڵانی خۆی نارد بۆ کوشتنی ئەو. نێردراوەکە بە فێڵکردن لە رافیع و دژایەتیکردنی درۆیین و رواڵەتیی ئیسلام و موسوڵمانان، متمانەی ئەوی بە دەست هێناو پاشان لە کوتوپڕێکدا سەری لە لاشەی جیاکردەوەو هێنایەوە بۆ پێغەمبەری ئیسلام (سڵاو و دروودی خوای لێ بێ). بۆیە شتی لەم چەشنە لە ئیسلامدا زۆرەو کەم نین ئەو کەسانەی بەهۆی دژایەتیکردنی ئیسلام و موسوڵمانانەوە، بە شێوازی تیرۆرکردن تۆڵەیان لێ کراوەتەوەو لەناو براون. بە پێی ئەو شتانەی باسم کرد و سەدان و هەزاران شتی تری لەم چەشنە، تیرۆر لە ئیسلامدا جایزەو رێگە پێدراوەو باشترین بەندەی خوا پێی رازی بووەو ئەنجامی داوە. ئینجا دونیای نوێ و مرۆڤی مۆدێرن لەمبارەیەوە چۆن بیر بکاتەوەو ئیسلام و ئیسلامییەکانی پێ تاوانبار بکات و بە تیرۆریستیان بزانێت، بەتاڵەو هیچ لە راستییەکان ناگۆڕێ. هەروەها بە نیسبەت (قەساس)یشەوە خوداوەند لە قورئانی پیرۆزدا ئایەتی روون و ئاشکرای بۆمان ناردووەو لە یەکێك لەو ئایەتانەدا ئەفەرموێ: «ولکم فی القصاص حیاةٌ یا اولی الالباب» واتە: «لە تۆڵە سەندندا ژیان هەیە ئەی خاوەن بیر و هۆشەکان».
بۆیە رەتکردنەوەی تۆڵەسەندن و تۆڵەکردنەوە بە هەر بیانوییەك، دژایەتیکردنی فەرمانی خوایە. لەمبارەیەشەوە خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێ: «فمن اعتدی علیکم ماعتدوا علیه بمثل ما اعتدی علیکم» واتە: «هەرکەس دەستدرێژی کردنە سەر ئێوەش تۆڵەی لێ بکەنەوە بەوجۆرەی ئەو ستەمی لێکردوون». کەواتە رازیبوون بەوەی کە دەستدرێژی بکرێتە سەر و ستەمت لێ بکرێ و لە بەرانبەردا دەسدرێژی نەکەیتەوە سەر کەس یان لایەنی ستەمکار، ئەو مانایە ئەدا

که لانیکەم لە ڕێی ڕاستی ئیسلامەتی لات داوە. تەنانەت ئەگەر قسەیشت پێ وترابێ و وەڵامت نەدابێتەوە، چونکوو ئەم شتە بۆ ئێمەی ئیسلامی نەگونجاوەو وەرناگیرێ.

هەروەها دەربارەی ئەسیر کوشتنیش خوای گەورە لە سوورەتی ئەنفال ئایەتی ٦٧دا بە روونی ئیجازەی ئەسیر کوشتنی بە پێغەمبەری ئیسلام (سلاو و دروودی خوای لێ بێ) داوەو تەنانەت ئەگەر پێغەمبەر پێچەوانەی ئەمەی کردبێ هەروەك چۆن لە شەڕی بەدردا لە باتی ئەوەی بە قسەی ئیمامی عومەر (خوای لێ ڕازی بێ) بکات کە ڕای وابوو دیلەکان بکوژن، بە قسەی ئیمامی ئەبووبەکری کرد کە ڕاکەی پێچەوانەی ئەو بوو و دوابەدوای ئەمەش خوای گەورە پێنج جار لە قورئانی پیرۆزدا لۆمەی پێغەمبەری کرد. ئەمە ئاماژەیە بەو ڕاستییە کە خوای گەورە تا چەند تەئکیدی لەسەر بەجێهێنانی فەرزیاتی ئیسلامی کردۆتەوە کە یەکێك لەوان دیل کوشتنە. ئەڵبەت ئەمە بەو مانایە نییە لە هەرکات و هەلومەرجێکداو هەر دیلێك بکوژرێت بەڵکوو لە ئیسلامدا یاسای دیل نەکوشتنیشمان هەیەو ئەم یاسایە مەرجدارە بە هەندێ شتەوە. بۆ نموونە ئەگەر ئەو کەسەی کە بەدیل گیراوە وەڵامی داواکاریی تۆ بداتەوەو تۆبە بکات یان ئەمیری موسوڵمانان بیەوێ دیل بە دیلی پێ بکات یان بە تەحویلدانەوەی ئەو ئیمتیازێکی باش وەربگرێت و سوود بە موسوڵمانان بگات، ئەوا نەکوشتنی ڕەوایە. ڕەنگە ئەم شتانەی باسم کردن لەگەڵ هەموو ئەو یاسایانەدا ناکۆك بێ کە ساختەی دەستی مرۆڤن و ئەمڕۆ تەبلیغ و بانگەشەیان بۆ ئەکرێت بەڵام ئەوەی کە لای موسوڵمانی ڕاستەقینە جێگای بایەخەو کاری پێ دەکرێت فەرموودەو دەستووراتی خوای پەروەردگارە.

کەوایە ئەو تیرۆرانەی کە پێش ڕاپەڕین لە لایەن شوان حەمە ساڵح و کەیوان و هاوبیرەکانیانەوە ئەنجام ئەدەران، بە حوکمی ئەوەی کە ئەو کەسانە داکۆکییان لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە ئەکرد، بە تەئکید لە چوارچێوەی یاساکانی ئەم دینەدا بەڕێوە چوون. ئەڵبەت بە سەرنجدانێکی کەسە تیرۆرکراوەکان و ئاگاداربوون لە بیروباوەڕ و کردەوەکانیان باشتر ئەمەمان بۆ روون ئەبێتەوە. بۆ نموونە کەسێکی وەك ئەحمەد سالار بەردەوام بە هونەرەکەی دژایەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلامی ئەکرد و هەر ئەمەش بووە هۆی تیرۆرکرانی ئەو. هەروەها مەرج نییە کەسە تیرۆرکراوەکان لەو سەردەمەدا دژایەتی بەعسیان کردبێت یان نا، گرنگ ئەوەیە ئەوان لە پاڵ دژایەتیکردنی بەعسدا دژایەتی خوای گەورەو دینی ئیسلامیشیان کردووە بۆیە لە روانگەی ئێمەی پێڕەوانی ئیسلامەوە پێویستە تۆڵەیان لێ بکرێتەوەو بە هەرجۆرێك ئیمکانی هەبوو زەربەیان لێ بدرێت. ئەوەی کە ئەم تیرۆرانە کاریگەرییان لە سەر ڕووداوەکانی پاش ڕاپەڕین دانابێ و شەڕی نێوان بزووتنەوە یاخود ئیسلامییەکان و حیزبە عیلمانی و نەتەوەییەکانی لێکەوتبێتەوە ناتوانێ دەقاودەق ڕاست بێت بەڵام بێگومان تێکەڵبوونی ئەو کەسانە لەگەڵ بزووتنەوە، ڕق و قینی لایەنە کوردی و عیلمانییەکانی بە نیسبەت ئەم ڕێکخراوەوە زیاتر کرد. بە تایبەت پاش ئەوەی نامە دەستنووسەکەی شوان حەمە ساڵح کەوتە دەست هێزەکانی یەکییەتی نیشتمانی ئیتر تەم و تۆزی سەر ئەم تیرۆرانەی بە تەواوی داماڵی و بۆ هەموو لایەکی ئاشکرا کرد کە ئەم تیرۆرانە کاری ئیسلامییەکان بووە.

کەوایە ئەتوانین بڵێین بزووتنەوەی ئیسلامی لە کاتی تیرۆرەکاندا بە حوکمی ئەوەی ئەنجامدەرانی تیرۆرەکان ئەندامی ڕێکخستنەکانی ئەم ڕێکخراوە بوون، ئاگاداری هەموو شتێك بووە یان ئەگەر لەو کاتەشدا بەمەی نەزانیبێ ئەوا پاش ڕاپەڕین پێی زانیوەو هەروەك جەنابیشت باست کردووە نامە دەستنووسەکەی شوان حەمە ساڵح سەلمێنەری ئەم ڕاستییەیە. بۆیە بە هەڵەدا ناچین ئەگەر بڵێین بزووتنەوەی ئیسلامی بە ئەنجامدانی ئەم تیرۆرانە یان لانی کەم بە چاوپۆشی کردن لێیان و پەنادانی ئەنجامدەرانی، دەسپێشخەر بووە لە شەڕی هێزە کوردییەکاندا. بە سەرنجدان بەم بابەتە پێویستە وردەکارییەکانی ئەم شەڕە تاووتوێ بکەین بۆ ئەوەی خوێنەر باشتر لە ڕاستییەکان بگات.

وابزانم ئەو باسە گشتییەی لە سەرەتای وەڵامی پرسیاری پێشوودا لەسەر تیرۆر کردم بۆ ئەوە ئەبێ کار و چالاکی شوان حەمە ساڵح و سەرجەم ئیسلامییەکانی تری لەگەڵ بەراوەرد بکەیت. ئەوەی کە بزووتنەوە تاچەند وەك رێکخراو ئاگای لە تیرۆرەکانی پێش راپەڕین بووە پرسێکە کە تاکوو ئێستایش بە باشی نەزانراوەو روون نەبۆتەوە بەڵام هەرچی بێ ئەم رێکخراوە دواتر بە هەموو شتێکی زانیوەو ئەو کەسانەیشی لەناو ریزەکانی خۆیدا جێکردۆتەوە کە تیرۆرەکانیان کردووە. جا ئەمە لە لایەك ئەتوانێ سەلمێنەری ئەوە بێت کە بزووتنەوە لە کاتی خۆیدا ئاگاداری هەموو شتێك بووەو لە لایەکی تریشەوە ئەتوانێ بەو مانایە بێت کە ئەگەرچی دەستی لەم تیرۆرانەدا نەبووە بەڵام بێدەنگەی لێ کردوون و بەرێوەبەرەکانی پەنا داون و ئەمەش لای زۆر کەس بە مانای واژۆکرانی ئەو تیرۆرانەیە لە لایەن بزووتنەوەی ئیسلامییەوە. بە هەرحاڵ ئەمە ئەو قەزاوەت و داوەریانەیە کە رەنگە مێشکی زۆرکەسیان بەخۆیانەوە خەریك کردبێت.

وەك پێشتر باسم کرد، لە سەردەمی راپەڕینەکەی ١٩٩١دا بەرەیەکی کوردستانی بە ئەندامەتی هەشت حزب و رێکخراوی نەتەوەیی و عیلمانی دروست بوو. بزووتنەوەی ئیسلامی وەك تاکە حزبی ئیسلامیی کوردستانی عێراق بەشداریی لەو بەرەیەدا نەکرد. جا ئەگەرچی ئەم رێکخراوە لە ئاستێکی زۆر خواریشدا گرنگی بە بەهاو بایەخە ئیسلامییەکان ئەداو هیچ پلان و بەرنامەیەکی ئیسلامییانەی بۆ داهاتووی کوردستانی عێراق نەبوو بەڵام ئامادە نەبوو تێکەڵ بە بەرەی کوردستانی بێت. لەو سەردەمەدا زۆرینەی جەماوەری کوردستان هەستی نەتەوەیی بەسەریاندا زاڵ بوو و هێشتا سیمای ئیسلامی راستەقینەی حزبە نەتەوەیی و ناسیۆنالیستەکانیان بۆ دەرنەکەوتبوو. لە بەرانبەر ئەو سەربوردەو مێژوو و هەیمەنەیەدا کە حزبە کوردییەکان هەیانبوو، رێکخراوێکی وەك بزووتنەوەی ئیسلامی، وەك تاقانە حزبی ئیسلامی کوردستانی عێراق تەنیا چەند ساڵێك بەسەر لەدایکبوونیدا تێپەڕیبوو و هێشتا لە قۆناغی کاڵ و کرچییدا بوو و خاوەن ئەزموون و تەجرەبەیەکی وەها نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم رێکخراوە بە شێوەیەکی جیدی و بە ئیمان بە خوای گەورەو پشتبەستن بە جەماوەری خەمخۆری ئیسلام، بەشداری جیهادی سەردەمی راپەڕینی کرد و دژی بەعسیەکان جەنگا.

موخابن بەرەی کوردستانی بە تایبەت پارتی و یەکیەتی کە خۆیان بە حەقداری بێ ئەملاوئەولای جەماوەری موسوڵمانی کوردستان ئەزانی، هەر لە سەرەتاوە کەوتنە دژایەتیکردنی بزووتنەوەو لە یەکەم هەنگاودا بەو بیانووە کە ئەندامی بەرە نین و کارتی تایبەتیان پێنییە پێشیان بە دابەزینی هێزی چەکداری بزووتنەوە بۆ ناو شارەکان گرت. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە لەو سەردەمەدا بەهۆی پشێوی و نالەباربوونی وەزعی ئەمنییەوە هەموو لایەك تەنانەت خەڵکی ئاساییش چەکیان هەڵگرتبوو و ئەندامانی هەموو حزب و رێکخراوەکان نەك بە چەکەوە هاتوچووی شارەکانیان ئەکرد بەڵکوو دەیان مەقەڕ و بارەگایان لە ناوەڕاستی شارەکاندا دامەزراندبوو. ئەمە سەرەتای بیانوویەکی گەورە بوو کە سات بە سات مەیدانی لە بزووتنەوەی ئیسلامی تەنگتر ئەکردەوەو زەمینەی هەڵگیرساندنی شەڕێکی گەورەی فەراهەم ئەکرد. سەرکردەکانی یەکیەتی نیشتمانی کە رقێکی زۆریان لە ئیسلام و ئیسلامییەکان بوو، رێکخەر و زەمینەسازکەری ئەو شەڕ و ئاژاوەیە بوون و هەر بەو هۆیەشەوە بوو کە یەکەم شەڕ و زۆرترین شەڕی بزووتنەوە لەگەڵ ئەواندا بوو. لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٩٢دا لە سەر هەندێ کەلوپەلی ناو دەزگاکانی حکوومەتی بەعس شەڕێك لە نێوان هێزەکانی یەکیەتی و بزووتنەوەدا رووی دا. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە هێزەکانی یەکیەتی نیشتمانی لەوپەڕی ئامادەییدا بوون. پێش ئەوەی شەڕەکە درێژ بێتەوەو بگاتە شوێنەکانی تر، بەرەی کوردستانی کەوتە نێوانیان و کۆتایی بە شەڕەکە هێنا. هەر ئەو ساڵە حزبی شیوعی نووسەرێکی ئیسلامییان بەناوی مامۆستا سەیفەدین رفاند و کاتێ بزووتنەوە بەمەی زانی چەند ئەندامێکی شیوعی بە بارمتە گرت و پاشان لەگەڵ مامۆستا سەیفەدیندا گۆڕینییەوە کە کەسێکی سەر بە رەوتی ئیخوان و دۆستی

بزووتنەوەی ئیسلامی بوو. دیسان لە ساڵی ١٩٩٢دا کەسانێکی نەناسراو ئەندامێکی بزووتنەوەیان بە ناوی حسەین کەلاری لە شاری سلێمانی رفاند و پاش چەند حەفتە تەرمەکەی لە قەراغ شار دۆزرایەوە.
ساڵی ١٩٩٣چەند ئەندامێکی پارتی دیمۆکرات لە نزیک شارۆچکەی خورماڵ تەقەیان لە بنکەیەکی مەشق و تەدریبی موجاهیدینی بزووتنەوە کرد و لە وەڵامدانەوەی هێزەکانی بزووتنەوەیشدا یەک دوو کەسیان لێ ئەکوژرێت. پارتی داوای لە بزووتنەوە کرد ئەگەر نایەوێ شەڕ بکەوێتە نێوانیانەوە پێویستە بەرپرسی ئەو بنکەی مەشقەیان تەسلیم بکرێت و بەداخەوە بزووتنەوەش ئەم داواکارییەی ئەوانی جێبەجێ کرد و بەرپرسەکەی خۆی تەحویلی پارتی دا. هەر لەم ساڵەدا لە ناوچەکانی کەلار، کفری و باوەنوور و دەربەندیخان شەڕێکی تر لە نێوان بزووتنەوەو یەکیەتیدا رووی دا. کاتێک دەستەیەکی سوڵحی بزووتنەوەوە بە مەبەستی راگرتنی شەڕەکە، ئەیانەوی سەردانی مەڵبەندی رێکخستنی یەکییەتی لە دەربەندیخان بکەن، شەڕێک لە نێوان ئەوان و هێزەکانی یەکییەتیدا دروست ئەبێ کە تیایدا دوو ئەندامی یەنەک ئەکوژرێن. کاتێ تەرمی ئەم دوو کوژراوە رەوانەی چەمچەماڵ ئەکرێتەوە، ئاهەنگی ناشتنەکەیان ئەبێتە خۆپیشاندانێکی تۆڵەئامێز و مەقەڕی بزووتنەوە لەم شارۆچکەیە ئەکەوێتە بەر هێرش. موجاهیدینی بزووتنەوە بە مەبەستی بەرگریکردن لە خۆیان، دەست بە تەقە دەکەن و ئەمەش بووە هۆی بەرفراوانتربوونی شەڕی نێوان بزووتنەوەو یەنەک و شەڕەکە تەشەنەی کرد بۆ ناوچەکانی تەکییەو گۆپاڵەو ئۆردووگاکانی باینجان و دەشتی بازیان. ئەم شەڕە چەند رۆژێک درێژەی کێشاو پاشان رێکەوتنی سەرکردایەتی هەردوولا کۆتایی پێهێنا.
لە کاتێکدا رۆژی ١٩٩٣/١٢/٢٦چەند میوانێکی کۆماری ئیسلامیی ئێران لەگەڵ مامۆستا عەبدولغەنی هەولێری ئەندامی مەکتەبی سیاسی بزووتنەوەدا بەرەو ناوچەی قەرەداغ ئەرۆیشتن، لە لایەن هێزی تایبەتی یەکیەتییەوە پێشیان پێ ئەگیرێت و پاشان بەو بیانووەی کە بزووتنەوە کاری نایاسایی کردووە، یەکیەتی شەڕێکی سەرتاسەری دژی بزووتنەوە راگەیاند. لەم شەڕەدا هێزەکانی حزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵەش بە بیانووی ئەوەی گوایە بزووتنەوە جاشایەتی ئێران ئەکات و وەفدی ئێرانی هێناوەتە هەرێمی کوردستانەوە تاکوو لەسەر ئەوان زانیاری کۆ بکاتەوە، بە کردەوە پشتیوانی هێزەکانی یەکیەتییان کرد. لە شەڕەکەدا کە وادیاربوو یەکیەتی بە ئامادەیی تەواوەوە هەڵیگرساندبوو، بەشی زۆری مەقەڕ و بارەگاکانی بزووتنەوە تەنانەت بارەگای سەرکردایەتیش داگیر کرا، مامۆستا عوسمان عەبدولعەزیز رابەری گشتی بزووتنەوە، مامۆستا مەلا شەریف ئەندامی مەکتەبی سیاسی، مەلا وریاو مامۆستا مەغدید و مامۆستا موحەممەد بازیانی ئەندامانی سەرکردایەتی و چەندین کادێر و موجاهیدی بزووتنەوەش لە لایەن هێزەکانی یەکییەتییەوە بەدیل گیران کە خۆم یەکێک بووم لەوانەو دواتر بە عەفووی مام جەلال ئازاد کراین. ئەم شەڕە بە شکستی بزووتنەوەی ئیسلامی کۆتایی هات و ئەندامانی تری ئەم رێکخراوە بە ناچار روویان لە زنجیرە چیاکانی سوورێن و هەورامان کرد.
پاش ماوەیەک بە دەستپێرکانی شەڕی نێوان پارتی و یەکیەتی، بۆشاییەک هاتە ئاراوە کە بە قازانجی بزووتنەوەو لایەنە ئیسلامییەکان بوو. لە پلەی یەکەمدا بزووتنەوە هەموو مقەڕ و بارەگاکانی خۆی لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پارتیدا دانایەوەو لە ناوچەکانی یەکیەتیشدا سەرلەنوێ مزگەوتەکان بوونەوە بە شوێنی کۆڕ و کۆبوونەوەی ئیسلامییەکان.
مانگی ٥ی ١٩٩٦ یەکییەتی بڕیاری داخستنی مزگەوتەکانی ناو شاری سلێمانی لە پاش نوێژی عیشاوە دەرکرد، ئەم بڕیارە شەڕ و تێکهەڵچوونی نێوان بزووتنەوەی ئیسلامی و یەنەکی لێکەوتەوە. ئەندامێکی یەکییەتی کوژرا بەڵام بە تەسلیمکردنی چەند ئەندامێکی بزووتنەوە بە یەنەک (بە مەرجێک گیانیان پارێزراو بێ)، شەڕەکە کۆتایی پێهات. هەر لەم ساڵەدا چەند ئەندامێکی بزووتنەوە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکیەتیدا، کوژران یان واباشە بڵێین تیرۆر کران.
لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٧دا هەندێ رووداو هاتە ئاراوە کە شەڕێکی تری نێوان یەکییەتی و بزووتنەوەی لێ کەوتەوە. لە یەکێک لەم رووداوانەدا کەسێک بە ناوی عەبدولڕەحمان چەمچەماڵی کە ماوەیەک بوو وازی لە یەنەک هێنابوو و پێوەندیی

به بزووتنەوەی ئیسلامییەوە کردبوو، بە شێوەیەکی دڵتەزێن لە لایەن هێزەکانی یەکیەتییەوە کوژرا. ئەم ڕووداوە بووە هۆی تووڕەیی ئەندامانی بزووتنەوە بەڵام سەرکردایەتی بزووتنەوە پابەندبوونی خۆی بە ڕێکەوتنی ئاشتی بەلاوە گرنگتر بوو بۆیە هەوڵی ئاسایی کردنەوەی بارودۆخەکەی ئەدا. ئەم هەڵوێستەی سەرکردایەتی نەیتوانی سەرکەوتوو بێ و ئەندامێکی ئەم ڕێکخراوە بە ناوی حەسەن عومەر ناسراو بە حەسەن سۆق کە سەرتیپی هێزی دووی گەرمیان و پابەندی سوننەت و حودووداتی ئیسلامی و بیروباوەڕی سەلەفییەتی جیهادی بوو، بە بێ گوێدانە هەڵوێستی سەرکردایەتی بزووتنەوە لەگەڵ چەند کسێکی تری تیپەکەیدا سێ ئەندامی یەکیەتییان گرت و ڕەمییان کردن. لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٧وە تاکوو ڕێکەوتنی تاران، چەندین شەڕی قورس لە نێوان بزووتنەوەی ئیسلامی و یەنەکدا ڕووی دا کە لە زۆربەیاندا هێزەکانی بزووتنەوە سەرکەوتوو بوون. ئەمانە تەنیا بەشێکی بچووك بوون لەو بڕوبیانوو و دەستدرێژییە دوژمنکارانەیەی لە لایەن هێزە کوردییەکان بە تایبەت یەکیەتی نیشتمانییەوە ئەکرانە سەر بزووتنەوەی ئیسلامی، بێگومان ئەوەی باسم کرد هیچکات ناتوانێ هەموو ئەو بێحورمەتی کردن و تیرۆر کران و ئاوارەبوونە پیشان بدات کە بەرۆکی ئیسلامییەکانی گرتبوو. بۆیە ئەوان ناچار بوون لە پێناو بەرگریکردن لە خۆیان و بیروباوەڕەکەیان و بە مەبەستی بەجێهێنانی ئەرکی شەرعی و ئایینی خۆیان، شەڕی شەڕ بکەن.

**بە داخەوە جەنابت دەقاودەق وەڵامی پرسیارەکان نادەیتەوەو وەلامەکانت لایەنگرییەکی تا ڕادەیەك دەمارگیرانەیان پێوە دیارە. ئەوەی باست کردووە تەنیا تایبەتە بە پاش ڕاپەڕین بەڵام وەك خۆیشت باست کرد شوان حەمە ساڵح و هاوبیرەکانی پێش ڕاپەڕین و پێش دروستبوونی بەرەی کوردستانی و پێش بەدەسەڵات گەیشتنی کورد لە باشووری کوردستان و لە کاتێکدا کە هێشتا هیچ شەڕ و تێکهەڵچوونێك لە نێوان بزووتنەوەو لایەنە کوردییەکاندا نەهاتبووە ئاراوە دەستیان دایە تیرۆری ئەو هەموو خەڵکەو بە تەمای تیرۆرکردنی دەیان کەسی تریش بوون. باشە ئەمە مانای دەسپێشخەری نادات لە شەڕدا، ئەمە بە مانای نکوڵی کردن نییە لە هەموو ئەو بەهاو بایەخانەی لایەنە کوردی و عیلمانییەکان ساڵەهای ساڵ هەوڵیان بۆ ئەدا؟ هەروەها لە وەڵامەکاندا باسی هەندێ شت دەکەی کە دوورن لە ڕاستییەوە بۆ نموونە لە گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٩٣دا باسی هاوپەیمانی کۆمەڵەو دیموکراتی کوردستانی ئێرانت کردووە گۆیا لەگەڵ هێزەکانی یەکییەتی نیشتمانیدا شەڕی بزووتنەوەیان کردووە. لە ڕاستیدا تاکوو ئێستا هیچ شتێکی ئاوامان نەبیستووەو لە هیچ شوێنێکدا نەمانخوێندۆتەوە حیزبەکانی کوردستانی ئێران لە شەڕی ناوخۆی باشووری کوردستاندا بەشدارییان کردبێ. ئەگەر وابووەو پێشت وایە ئاوەها هاوپەیمانییەك هەبووە تکایە وردەکارییەکان و بەرواری ڕێکەوتننامەکەیانمان بۆ باس بکە. جیا لەمە ئەگەر ئاوا شتێك ڕووی دابێ پێدەچێ بزووتنەوەش دواتر کارێکی تۆڵە ئەستێنانەی دژی ئەو حیزبانە کردبێ، ئایا ئاوا شتێك ڕووی داوە؟**

سەبارەت بە بەشی یەکەمی پرسیارەکە پێم وایە لە وەڵامەکانی پێشوودا باسی هەموو شتێکم کردووەو وەڵامی پێویستم داوەتەوە بۆیە بە پێویستی نازانم لەوە زیاتر لەسەری بچم و داوەریکردن ئەهێڵمەوە بۆ ئێوەو خوێنەران.
بەلام بە نیسبەت بەشەکانی تری پرسیارەکەوە لە پێشدا با ئەوەتان عەرز بکەم کە نەخێر نەمدیوەو نەمبیستووە بزووتنەوەی ئیسلامی هەنگاوێکی تۆڵەئەستێنانەی هەڵگرتبێ. تەنها ڕووداوێك کە ڕەنگە مەبەستی جەنابتان لە تۆڵەکردنەوە هەر ئەوە بێ ئەو شەش پێشمەرگەیەی حیزبی دیمۆکرات بوو کە کاتی خۆی لە سنووری پاوەوە تەسلیمی حکوومەتی ئێران کرانەوەو پاشان جگە لە دانەیەکیان ئەوانی تر هەموو ئێعدام کران. ئەگەرچی بە تەواوی ئاگاداری وردەکارییەکانی ئەم ڕووداوە نیم بەڵام ئەزانم کە ئەم شەش کەسە بە هۆی چەند ئەندامێکی مام ناوەندیی بزووتنەوەو لە

چوارچێوەی سات و سەودایەکدا تەسلیمی ئێران کرانەوە. هەروەها سەرەڕای ئەو هەموو لۆمەکردنەیان و ئەوەی کە پێیان ئەوترا سیخوڕ یان پیاوی ئیتلاعاتی ئێران، سەرکردایەتی بزووتنەوە رازی بە کاری ئەو کەسانە نەبوون بەڵام بە هۆی ئەوە ئەو کەسانە رەتیان ئەکردەوە دەستیان لەوکارەدا بووبێ بۆیە نەیاندەتوانی سزایان بدەن. ئەگەر ئەو چەند کەسە کارێکی وایان کردبێ ئەمە بە حیسابی بزووتنەوەی ئیسلامی دانانرێ و سەرکردایەتی ئەم رێکخراوەی پێ تاوانبار ناکرێت.

بە نیسبەت بەشداری کردنی کۆمەڵەو دیموکراتیشەوە لە شەڕی بزووتنەوەدا پێویستە بڵێم کە لەم هەلومەرجەدا سەنەد و بەڵگەی پێویستم لە بەردەستدا نییە تاکوو باشتر راستییەکانتان پێ بسەلمێنم. بەڵام هەوڵ ئەدەم باسی ئەو خاڵ و هۆکارانەتان بۆ بکەم کە بوونە هۆی بەشداربوونی ئەوان لەو شەڕەدا کە رۆژی ١٩٩٣/١٢/٢٦ لە نێوان یەکییەتی و بزووتنەوەدا هاتە ئاراوە. یەکەم، پێویستە هەموو لایەك ئەوە بزانن هەردوو حزبی کۆمەڵەو دیموکراتی کوردستانی ئێران هەر لە کۆنەوە هاوپەیمانی یەکیەتی نیشتمانی بوون و لە باری فیکری و ئایدۆلۆژیایشەوە لە یەکەوە نزیك بوون. کۆمەڵەکان بە هۆی چەپ بوونیان و دیموکراتەکانیش بە هۆی نیمچە چەپبوون و نەتەوەیی بوونیانەوە، چونکوو یەکیەتی نیشتمانی هەم خۆی بە چەپ ئەزانێ و هەمیش بایەخی بە مەسەلەی ناسیۆنالیزم و نەتەوەگەرایی ئەدا. هەروەها مێژوو شاهێدی ئەوەیە کە چۆن هێزەکانی یەکیەتی نیشتمانی لە شەڕەکانی کۆماری ئیسلامی و هێزە کوردییەکانی کوردستانی ئێران لە کۆتایی حەفتاکان یان سەرەتای هەشتاکاندا بە ناوی هێزی پشتیوانەوە بەشدارییان لە شەڕ دژی دەسەلاتی ئێرانیدا کرد. بۆیە زۆر ئاساییە ئەوانیش لە هەلومەرجی پاش راپەڕیندا قەرزی خۆیان دابێتەوەو یارمەتی یەکیەتییان دابێ. بە تایبەت لەو کاتەدا کە یەکیەتی بەردەوام تەبلیغی ئەوەی ئەکرد گۆیا بزووتنەوەی ئیسلامی کار بۆ ئێرانییەکان ئەکات و بەشێك لەو کارەش سیخوڕیکردنە لەسەر کۆمەڵەو دیموکرات. لەو سەردەمەدا بەشێکی تری تەبلیغەکەی یەکیەتی ئەوە بوو کە شەڕەکەی بە شەڕی کوردایەتی و عیلمانییەت لەگەڵ بونیادگەری ئیسلامی ناوزەد ئەکرد و ئەمەش رەوایی ئەدایە بەشداریکردنی کۆمەڵەو دیموکراتی نەتەوەگەراو عیلمانی لەو شەڕەدا. ئەڵبەت ئێمە وەك بزووتنەوە ئاگادار بووین حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران چۆناوچۆن لەو سەردەمەدا بە ئاراستەی دوژمنایەتیکردنی بزووتنەوە یارمەتی یەکیەتی ئەدا. بۆ نموونە ماوەیەك جیهازە گەورەکانی سەرکردایەتی و هەندێك مەقەڕی تری بزووتنەوە خەلەلیان تێکەوتبوو و کاریان نەدەکرد بۆیە پاش بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە بۆمان دەرکەوت ئەمکارە لە لایەن چەند ئەندامێکی دیموکراتەوە بە مەبەستی یارمەتیدانی یەنەك ئەنجام دراوە. جا نموونەی ئەم هاوکاریانەیان زۆر بوو و هەموشیان بە نهێنی ئەکرد و بەشداریکردنیشیان لە شەڕی دژی بزووتنەوەدا هەر بە نهێنی و شاراوەیی بوو تاکوو لە کاتی خۆیدا نکۆڵی لێبکەن بەڵام ئەمەیان لەسەر ساقبۆوەو بزووتنەوە بە تەواوی ئەمەی بۆ سەلمابوو. باشە ئەگەر ئەمکارانەیان نەکردووە بۆچی بە دەرکردنی روونکردنەوە یان بە پێوەندیگرتن لەگەڵ قیادەو سەرکردایەتی بزووتنەوەی ئیسلامی هەوڵی رەواندنەوەی تەم و مژی نێوان خۆیان و بزووتنەوەیان نەداو بەردەوام بوون لە دژایەتیکردنی ئەم رێکخراوە و ئیسلامییەکان. نازانم تا چەند ئاگاداری ئەوەن کە جەماعەتی دیموکرات لە ساڵی ٢٠٠٤دا سیدییەکیان بڵاو کردەوە لەسەر بزووتنەوەو جوند و ئەنساروئیسلام کە بە شێوەیەکی ناراست و چەواشە شتەکانی باس ئەکرد و دژایەتی سەرجەم رەوتە ئیسلامییەکانی پێوە دیار بوو.

**وەڵامەکەی جەنابت ناتوانێ نە قەناعەت بە ئێمەو نە قەناعەت بە خوێنەرانیش بکات بۆیە وەك روونکردنەوە پێمان باشە بڵێن: یەکەم، لە راستیدا ئێمە هیچ بەڵگەو سەنەد و نووسراویکمان نەبینیوە باسی بەشداریکردنی کۆمەڵەو دیموکرات لە شەڕی بزووتنەوەی ئیسلامیدا بکات. دووهەم، پێمان وایە هێزێکی گەورەی وەکوو یەکییەتی نیشتمانی لە شەڕی**

ڕێکخراوێکی بچووکی وەك بزووتنەوەی ئیسلامیدا پێویستی بە یارمەتی ڕاستەوخۆو تەنانەت ناڕاستەوخۆی حیزب و لایەنە ئێرانییەکان نەبووە. سێهەم، ئەو سیدییەی ئاماژەت پێداوە، ئێمەش بینیومانەو بەوجۆرەی جەنابت باست کردووە بەرهەمی بەشی ڕاگەیاندنی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانەو باسی ڕەوتی مێژوویی ئیسلامی سیاسی لە کوردستاندا ئەکات و دژایەتییەکی ئەوتۆ یان ڕاستەوخۆی گروپ و ڕێکخراوە ئیسلامییەکانی کوردستانی تێدا نەکراوە.
لە بەرانبەردا چەندین سیدی لە لایەن سەلەفییەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە دەرچووە کە بە ئاشکرا تیایاندا هێرش کراوەتە سەر لایەنە نەتەوەیی و عیلمانییەکان بە تایبەت حیزبی دێموکرات. نموونەی ئەم سیدییانە سیدییەکی «مەلا عەبدولهادی هەرمێدۆڵ» و چەند سیدی «مەلا موحەممەدی عەلەوی» و «مەلا عەبدولحەمیدی عالی»یە.
بە نیسبەت تەحویلدرانەوەی پێشمەرگەکانی حیزبی دێموکراتیشەوە ئێمە ئاوامان بیستووە کە ئەوان لە کاتی گەڕانەوەیاندا لە کوردستانی ئێران، کاتێ ئەگەنە بازگەیەکی بزووتنەوەی ئیسلامی بە بیانوویەك دایان ئەگرن و پاشان چەکیان ئەکەن و دواتریش تەحویلی ئیتلاعاتی ئێرانیان ئەدەن. بەرپرسی ئەم بازگەیە کەسێك بووە بەناوی ئەنوەر عەنەبی و هەر ئەویش بە تاوانباری سەرەکی ئەمکارە دائەنرێ. هەرچەند ئەمکارە بە تەواوی لکێندرا بە بزووتنەوەی ئیسلامییەوەو ڕێبەرایەتی حیزبی دێموکرات بە فەرمی ئەم ڕێکخراوەی تاوانبار ناساند بەڵام ئەوان بە پێچەوانەی ئەوەی کە جەنابت وتووتە گۆیا نارازی بوون و تەئیدی کارەکەیان نەکردووە، ئامادە نەبوون لێکۆڵینەوەو لێپرسینەوە لەگەڵ ئەنوەر عەنەبی و هاودەستەکانیدا بکەن. سەرکردایەتی بزووتنەوە هیچکات ئامادە نەبوو مەسەلەکە بۆ بیروڕای گشتی ڕوون بکاتەوە چ بکات بەوەی سزای تاوانباران بدات یان لانیکەم بە پێی یاسا ڕێکخراوەییەکانی خۆی ئیجرائاتیان لەگەڵدا بکات. گریمان ئەمکارەی بزووتنەوە بە مەبەستی تۆڵەکردنەوە بووە لە حیزبی دێموکرات چوونکوو وەك جەنابت باست کردووە پێیان وابووە ئەم حیزبە یارمەتی یەکێیەتی نیشتمانی داوە. بەڵام وەکوو دواپرسیار پێمان خۆشە بزانین ئەگەر بزووتنەوە ئەم بیانوووەی بۆ تەحویلدانەوەی شەش پێشمەرگەکەی دێموکرات هەبوو ئەی پەکەکە چ کارێکی دژی بزووتنەوەو ئیسلامییەکان کردبوو کە لە لایەن هێزەکانی ئەم ڕێکخراوەوە هێرش کرایە سەر بارەگایەکیان لە چیای سوورێن و چەند کەسێکیان لێ کوژرا؟

لە بەر درێژنەبوونەوەی ئەم بەشە خۆم لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکان دەبوێرم و داوەریکردن ئەهێڵمەوە بۆ خوێنەران، هیوادارم ئەندامانی بەرجەستەی بزووتنەوەی ئیسلامی بە هەر شێوەیەك بووە ئەم شتانە بۆ جەماوەر ڕوون بکەنەوە. بە نیسبەت کۆتایی پرسیارەکەتانەوە کە پێوەندیی بە لێدانی مقەڕێکی پەکەکەوە هەیە ئەتوانم بڵێم ئەوەی وتووتانە ڕاستەو نکۆڵی لێ ناکرێ. لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٧دا پەکەکە بنکەیەکی لە بناری زنجیرە چیای سوورێن لە دەرەوەی بازنەی دەسەڵاتی بزووتنەوە کردەوە، ئەگەرچی دواتر بۆمان دەرکەوت مەبەستی پەکەکە لەمکارە دژایەتیکردنی بزووتنەوەو ئیسلامییەکان نەبووە بەڵام بە هۆی دژایەتی زۆر و ئاشکرای بەرنامەی حزبەکەیان لەگەڵ ئیسلام و ئیسلامییەکان، هاتنی ئەوان بۆ ناوچەکە پێش هەموو شتێ ئەوەی لێ دەفامرایەوە کە ڕەنگە پیلانی لێدانی بزووتنەوەیان لەسەردابێ. بۆیە دەستەیەك لە خەڵکە رادیکاڵ و نوسوولییەکانی ناو بزووتنەوە بە ئەمیرایەتی حەسەن سۆفی خۆیان بۆ لێدانی ئەو بنکەیە ئامادە کرد. هەر لە سەرەتاوە بڕیار درا ئەمکارە بە شێوەی پەنامەکی و تەنانەت بە دزیی سەرکردایەتی بزووتنەوەوە بەڕێوە بچێ و هەموو ئەندامانی دەستەکە بەڵێنیان بە حەسەن سۆفی دا ئەگەر دواتر بزووتنەوە لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا کردن تاوانەکە نەخەنە ئەستۆی حەسەن سۆفی بە تەنهاو هەموویان وەك یەك و بە یەك ئەندازە خۆیان بە بەرپرسیار بزانن. سەرەنجام کاتێکی لەبار بۆ لێدانی پەکەکە دیاری کراو لە ئەنجامدا چەند کەس کوژران و بریندار بوون. پاشان هەم بزووتنەوەو هەمیش پەکەکە خۆیان مت کرد و هیچ باسێکیان لێوە نەکرد.

ئەوەی کە چۆناوچۆن ئەندامانی بزووتنەوە بە شێوەی سەربەخۆ هەموو کارێکیان کرووەو دواتریش سەرکردایەتی بزووتنەوە هیچی لەگەڵ نەکردوون ئاماژەیە بە دوو شت. یەکەم، رەنگە قیادەی بزووتنەوە بۆخۆی فەرمانی ئەنجامدانی ئەو کارانەی دەرکردبێ بەڵام بە شێوەیەکی تاکتیکی خۆی لێ بێئاگا کردووەو تاوانەکەی داوەتە پاڵ چەند ئەندامێکی رێکخراوەکە. دووهەم، سەرکردایەتی بزووتنەوە پێش یان پاش بەڕێوەچوونی کارەکان ئاگاداری هەموو شتێك بوون بەڵام بۆچی پێشیان بە ئەنجامدانیان نەگرتووە یان بۆچی دواتر ئەنجامدەرانی ئەم کارانەیان سزا نەداوە پرسیارێکە کە هەوڵ ئەدەین لە داهاتوودا بە چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەندامانی شارەزای بزووتنەوەی ئیسلامی وەڵامی بگرینەوە.
ساڵی ١٩٩٧ی زایینی رێکەوتننامەی ئاشتی تاران لە نێوان بزووتنەوەو یەکییەتی نیشتمانیدا ئیمزا کرا، لە هەمان سەرەتاوە دەنگێکی نارەزایەتی لە بەرانبەر ئەم ئاشتییەدا دروست بوو کە تەوژمە سەلەفییەکەی ناو بزووتنەوە نوێنەرایەتی ئەو نارەزایەتییانەی ئەکرد، ئەوان لەسەر ئەو باوەڕە بوون ئەبێ «جیهاد» لە دژی عیلمانییەکان نەوەستێ. دوابەدوای ئەمەو لە هەمان ساڵدا «کۆنفرانسی گشتی» بزووتنەوە گرێ دراو هەندێ ئاڵوگۆڕ بەسەر پێڕەو و پرۆگرامی ناوخۆی حیزبەکەدا هات. کۆی ئەم رووداوانە بوویە مایەی جیاوازی و بگرە نارەزایەتی جیدی لە نێو ریزەکانی بزووتنەوەدا لێکەوتەوە. ئالێرەوە لیژنەی «ئەمر بە چاکەو بەرگری لە خراپە» لە لایەن سەلەفییەکانی ناو بزووتنەوەوە دامەزرا کە بەجۆرێك لە جۆرەکان وەك بنەچەی رێکخراوە سەلەفییەکانی پاشتر واتە «تەوحید» و«حەماس» لەقەڵەم ئەدرێ. کەمێك زیاتر ئەو قۆناغ و رووداوانەمان بۆ شی بکەرەوە.

بە مەبەستی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە ئەبێ بگەڕێینەوە بۆ کۆنفرانسی ساڵی ١٩٩٥ی بزووتنەوەی ئیسلامی کە تیایدا مەسەلەی هەڵبژاردنی بەرپرسی بەشی سەربازی بزووتنەوە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر هاوکێشە نێوخۆییەکان دانابوو. هەرباڵ و لایەنێك لە هەوڵی ئەوەدا بوو ئەم بەرپرسایەتییە گرنگە بە دەست بهێنێت و هیچ باڵێك بەوە رازی نەبوو ئەم بەرپرسایەتییە بسپێرێت بە باڵەکەی تر. باڵی رابەری گشتی و مامۆستا عەلی عەبدولعەزیز کە دارشتنی شێوازی هەڵبژاردنەکانیان بە دەستەوە بوو ئەگەر زۆرینەی دەنگەکانیان بە دەست نەهێنایە بە ئاکامی هەڵبژاردنەکە رازی نەئەبوون و دەسەڵاتی تێکدانی کۆنفرانسیشیان هەبوو. لە لایەکی تریشەوە باڵی مامۆستا عەلی باپیر بە هۆی ئەوەوە کە ناوبراو خۆی بەرپرسی مەکتەب تەنزیم بوو –هەر بەو بۆنەیشەوە پێیان ئەوترا باڵی مەکتەب تەنزیم– خۆیان بە خاوەنی ئەزموونی بزووتنەوەو خەمخۆری ئەم رێکخراوە ئەزانی بۆیە نەیانەویست کۆنفرانس تێك بچێت و هەموو پۆست و بەرپرسایەتییەکان بکەوێتە دەست باڵی بەرانبەر کە ئەوان بە باڵی بنەماڵە ناویان ئەبردن. سەرەنجام هەموو لایەك بەو ئەنجامە گەیشتن «دوکتور ئیبراهیم» بکرێتە بەرپرسی بەشی عەسکەری بزووتنەوەی ئیسلامی. ئەگەرچی ئەم پیاوە پسپۆڕی بواری عەسکەری نەبوو بەڵام موسوڵمانێکی رۆشنبیر و بە شەرم و حەیاو کەسێکی زیرەك و زاناو خۆشەویست بوو. ئەو کە هەم خۆی و هەمیش خێزانەکەی پزیشك بوون هیچکات تێکەڵی کێشمانکێشە نێوخۆییەکان نەدەبوو و بەردەوام بەرژەوەندیی گشتی رێکخراوەکەی بەلاوە گرنگ بوو. جا هەرچەند هەر لە سەرەتاوە بەهۆی ناشارەزابوونی ئەو لە بواری عەسکەریدا، خەڵکانێك دژی دانرانی بوون لەو شوێنەدا بەڵام زۆر بە باشی ئەو بەرپرسایەتییەی بەڕێوە برد و دڵی هەموو لایەکی لەخۆی رازی کرد. ئەو بەو ئاستەی فەرمانبەرداری دەزگای رابەر بوو بە هەمان ئاستیش بایەخی بە راو بۆچوونەکانی مەکتەب تەنزیم ئەدا. دوکتور ئیبراهیم ئەو بەرپرسایەتییەی تا ساڵی١٩٩٧ بە دەستەوە بوو کە لەم ساڵەدا بە ناوبژیوانی کۆماری ئیسلامیی ئێران پەیمانێکی ئاشتەوایی لە نێوان یەکییەتی و بزووتنەوەدا بەسترا. دوابەدوای ئەمە بزووتنەوە بەشداری لە حکوومەتەکەی یەکیەتیدا کرد ئەو حکوومەتەی کە هیچ بایەخێکی بە یاسا ئیسلامییەکان نەئەداو کاری پێ نەئەکردن. لەو سەردەمەدا ئەندامێکی بزووتنەوە ئەچێتە لای مامۆستا عەبدولڕەحمانی

ئەوڕەسی وەزیری دادی حکوومەتی سلێمانی لە سەر لیستی بزووتنەوە، کاتێ ئەو کەسە سەیری مێزەکەی بەردەم وەزیر ئەکات ئەبینێ تەنانەت کتێبێکی قورئانیشی لێ دانەنراوە کە نیشان بدات ئەم وەزیرە کەسێکی ئیسلامییە. بۆیە کاتێك لەمبارەوە پرسیار لە جەنابی وەزیر ئەکات، وەزیر پێی ئەڵێ: (من خۆم ناخەڵەتێنم، چۆن قورئانێك بۆ رووکەش دائەنێم کە سوور ئەزانم لە سەر ئەم مێزەو لە ناو ئەم وەزارەتەدا حوکمی پێ ناکرێ). لەو سەردەمەدا ئەمە بووبووە نوکتەی سەر زاری ئەندامانی بزووتنەوەو پرسیارێکی گەورەی لە زەینی ئەواندا دروست کردبوو.

ئیتر ئەم ئاشتبوونەوەیە هەرچەند لایەنی پۆزەتیڤیشی هەبوو بەڵام ئاسەوار و کاریگەری خراپیشی هەبوو کە لە درێژخایەندا خۆیان نیشان ئەدا. بۆ نموونە ئەو ئەندامانەی بزووتنەوە کە لە ناو دامودەزگا حکوومییەکاندا کاریان ئەکرد و تێکەڵ بە عیلمانی و نەتەوەییەکان ئەبوون، بە ئاستێك ئەکەوتنە ژێر کاریگەری ئەوانەوە کە بەرەبەرە لایەنی ئیسلامەتییان بەرەو لاوازی ئەرۆیشت. جا ئەم جۆرە رووداوانە بۆ ئەندامانی رێکخراوێکی ئیسلامی شتێکی سادە نەبوو بۆیە لە ئاوەها هەلومەرجێکدا ژمارەیەك ئەندامی بزووتنەوە کە فیکرەی سەلەفییەتی جیهادی بە سەریاندا زاڵ بوو، زیاتر لە ئەندامانی تری بزووتنەوە تووشی نیگەرانی و دڵەڕاوکە دەبوون. ئەمانە هەمان ئەو کەسانە بوون کە هەر لە بنەمادا باوەڕیان بە ئاشتبوونەوە لەگەڵ یەکیەتی نیشتمانیدا نەبوو چ بگات بەوەی بەشداری لە حکوومەتێکدا بکەن کە بە حکوومەتی کوفریان دەزانی. بۆیە ئەم کەسانە بە کەڵکوەرگرتن لە هەلومەرجی نوێ و بەکارهێنانی ئەو ئیمکانیاتەی بزووتنەوە هەیبوو، دەستیان دایە کار و چالاکی و هەوڵی بەجێهێنانی ئەرکە شەرعییەکانیان دا. دامەزراندنی لیژنەی «حل والعقد» یەکێك لە کارەکانی ئەوان بوو کە فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە بەشێك بوو لە چالاکییەکانی ئەم لیژنەیە. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە هەندێ ئاڵوگۆڕی تر لە ناو بزووتنەوەدا هاتبووە ئاراوەو سەلەفییەکان بەم ئاڵوگۆڕانە رازی نەبوون. لە کۆنفرانسی کۆتایی ساڵی ١٩٩٧دا کە پاش تەواوبوونی شەڕی چەندساڵەی نێوان یەنەك و بزووتنەوە بەسترا، لەبری مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیز کە لە ساڵی ١٩٨٨ەوە رابەرایەتی بزووتنەوەی ئەکرد، مەلا عەلی عەبدولعەزیزی برای وەك رابەری گشتیی بزووتنەوە هەڵبژێردراو پێڕەوی ناوخۆی بزووتنەوە ئاڵوگۆڕێکی زۆری بە سەردا هات و سەرلەنوێ دارێژرایەوە. ئەم دوو ئاڵوگۆڕە بە پێچەوانەی ویستی سەلەفییەکان بوو و وای لێکردن تاکوو بە شێوازی تر پەرە بە چالاکی خۆیان بدەن. لیژنەی حەل و عەقد لەو ئەندامانەی بزووتنەوەو بە گشتی لە خەڵکی خوێندەوار و شارەزای مەسەلە شەرعییەکانی ناو موجاهیدینی بزووتنەوە پێکهاتبوو. ئەندامانی ئەم لیژنەیە بە مەبەستی تەبلیغکردنی پرسە شەرعییەکان هەرکامەیان رەوانەی مزگەوتی گوندێکی ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی بزووتنەوە کران. ئەم لیژنەیە بە بێ ئەوەی خۆی بە لایەنێکی ناو بزووتنەوەدا هەڵبواسێت تێکەڵ بە ململانێی دەسەڵات بوو و بە بێ جیاوازیی، دەستی دایە ئامۆژگاریکردنی ئەندامانی بزووتنەوەو چەسپاندنی خاڵە شەرعییەکان لە ناو ئەم رێکخراوەدا. ژمارەیەك بەپرسی بزووتنەوەو یەك لەوان دڵشاد کەلاری دژی دامەزرانی ئەم لیژنەیە بوون چونکوو ئەوانیان بە مەترسی بۆسەر خۆیان و رێکخراوەکە ئەزانی. سەرەنجام ئەم پێشبینییە بە راست دەرچوو و دواتر ئەندامانی لیژنەی حەل و عەقد بوونە رەوت و خەتێکی جیاوازی ناو بزووتنەوە.

ئەوان پێش جیابوونەوە، بەرەبەرە کەوتنە راکێشانی ئەندامانی بزووتنەوە بۆلای خۆیان و بە پێی ئەو تەبلیغات و بانگەشەیەی کە ئەیان کرد هەروەها بە پێی ئەو بەڵێنانەی کە ئەیاندا، وردە وردە خەڵکی دڵسۆزی ناو بزوتنەوەیان پێوە ئەلکا. هێندێك لەو خەڵکانە پێشتر هەڵگری فیکرەی جیهادی بوون و پاش پێوەندیی کردنیان بە لیژنەی حەل و عەقدەوە، بەرەو سەلەفییەتی جیهادی رۆیشتن. ئەم دەستەیە لەو باوەڕەدا بوون کە پێویستە بزووتنەوە وەك حزبێکی ئیسلامی بەو پێشینەی خەبات و جیهادەوە کە هەیبوو هەروەها بە پێی بەرنامەو مەنهەجێکی ئیسلامییانە، لەگەڵ رووداوەکاندا مامەڵە بکات و هەیبەت و هەیمەنەی خۆی بپارێزێت. بۆ نموونە ئەوان رەخنەی توندیان لەوە بوو کە بۆچی هەرکات یەکیەتی نیشتمانی پێی خۆش بێ شەڕی بزووتنەوە ئەکاو پاشان هەرکاتیش پێی خۆش بێ، بزووتنەوە ناچار

بە مۆرکردنی پەیمانی سوڵح و ئاشتی ئەکات. ئەوان پێیان وابوو نابێ بزووتنەوە بکەوێتە ناو ئەم گەمەیەوەو پێویستە هەڵوێستێکی توند و تۆڵ بگرێتە پێش، بۆ ئەمەش رێگا چارەیان دۆزیبووەوە. بۆ نموونە پێیان وابوو ئەبێ بزووتنەوەی ئیسلامی لە باری ئابوورییەوە بەرنامەیەك بۆخۆی دابنێ و لەمبارەیەوە بەرەو سەربەخۆبوون هەنگاو بنێ تاکوو بە پشت بەستن بە ئابووریی خۆماڵی چەك و تەقەمەنی پێویست دابین بکات و بە شێوەیەکی جیدی دەست بکات بە پەروەردەکردنی ئەندامان و هێزەکانی خۆی. هەروەها لەو باوەڕەدا بوون بزووتنەوەی ئیسلامی لە باتی پشت بەستن بە دەوڵەتێکی وەك ئێران یان لە باتی هاوپەیمانیکردنی حزب و لایەنە کوردییەکان، لەگەڵ گروپ و رێکخراوەو کەسایەتییە ئیسلامییەکانی دەرەوەی کوردستاندا پێوەندیی دابمەزرێنێت. ئەم کەسانە پاش ئەوەی لە ئەنجامدانی هەرجۆرە چاکسازییەك لە ناو بزووتنەوەدا ناهومێد بوون، بڕیاری جیابوونەوەیان داو پاشان لە دەرەوەی بزووتنەوە هەوڵی گەیشتن بە مەرام و مەبەستەکانی خۆیانیان دا.

با کەمێك وردتر بچینە سەر باسی تەوژمی سەلەفییەتی کوردیی کە ئەتوانین بڵێین سەلەفییەتی جیهادی وەك یەکەمجار لە چوارچێوەی رێکخراوی «حەماس»دا ئۆرگانیزاسیۆنێکی سەربەخۆی لە کوردستاندا وەرگرت. تا پێش ئەو بەروارە وەك باس کرا– زیاتر لە چوارچێوەی «بزووتنەوەی ئیسلامی»دا خۆی رێك دەخست بەڵام لە حەماس بەدواوە یەکسەر قاڵبێکی سەربەخۆی وەرگرت. ماوەیەکی کورت پاش دامەزرانی حەماس، لە شاری هەولێریش رێکخراوی «تەوحید» دامەزرا کە لەباری قەبارەوە لە حەماس گەورەتر بوو. ئەم رێکخراوە لە سەرەتای دامەزرانیدا کۆمەڵێ کاری زیاتر سەمبولیکیان ئەنجام ئەدا، وەك شکاندنی شووشەی نادییەکان و هێرشکردنە سەر ئارایشتگەی ژنان و تێزابکردن بە جلوبەرگی ژنانی (بێ حیجاب)دا، ئەم دوو رێکخراوە لە بەهاری ساڵی ۲۰۰۰دا یەکیان گرت و ناوی «جماعە التوحید»یان بۆخۆیان هەڵبژارد. بە پلەی یەکەم پێمان باشە بە وردی باسی دامەزرانی ئەم رێکخراوانەمان بۆ بکەیت پاشان پێمان بڵێ ئەو وەفدانەی چوونە ئەفغانستان کامانە بوون و لە چ بەروارێکدا سەردانی ئەم وڵاتەیان کرد، ئایا بەیعەتیان بە ئەلقاعیدەو ئۆسامە بن لادەن دا؟

ماوەیەك پاش لێدانی بنکەکەی پەکەکە لە بناری سوورێن، حەسەن عومەر ناسراو بە حەسەن سۆفی لە بزووتنەوەی ئیسلامی جیابۆوە. ئەو کە پێش کۆنفرانسی گشتیی بزووتنەوەی بەجێهێشتبوو لەو باوەڕەدا بوو ئەم کۆنفرانسە نەك ئاوات و ئارەزووەکانی ئەو و هاوبیرەکانی تیادا نایەتە دی بەڵکوو بڕیارات و پەسەندکراوەکانیشی پێچەوانەی بیروباوەڕی ئەوان ئەبێ. هەندێ لە سەرکردەکانی ناو بزووتنەوە بۆ نموونە دڵشاد کەلاری هەوڵی زۆریان دا بۆ ئەوەی حەسەن سۆفی بگێڕنەوە ناو بزووتنەوە بەڵام ئەو قبووڵی نەکرد و نەگەڕایەوە. لە راستیدا پێشبینییەکەی حەسەن سۆفی بەڕاست دەرچوو و ئاڵوگۆڕەکان نەك بە ئاراستەی بیروبۆچوونی سەلەفییانەی ئەواندا نەبوو بەڵکوو تەنانەت پێچەوانەی ئەمەش بوو. هەرچەند ناوبراو بە تەنیا ریزەکانی بزووتنەوەی بەجێهێشت بەڵام پێش ئەویش کەسانێکی تر جیابووبوونەوەو پاش ئەویش ئەم رەوتە درێژەی هەبوو و خەڵکانێکی تر ریزەکانی بزووتنەوەیان بەجێهێشت. هەموو ئەو کەسانە بەجۆرێك لە جۆرەکان گرێدراوی فیکرەی سەلەفییەتی جیهادی بوون و تووشی ناهومێدی بووبوون.
ساڵی ۱۹۹۸ بڵاوکراوەیەك بە ناوی «بزووتنەوەی حەماسی ئیسلامی»یەوە لە شاری سلێمانی بڵاو کرایەوە. ئەم بڵاوکراوەیە بە شێوەی نووسراو لە شوێنە گشتییەکانی شاردا فڕێ درابوو. ئەمە هاوکات بوو لەگەڵ یەکگرتنی حەسەن سۆفی و ژمارەیەکی تر لە سەلەفییە دابڕاوەکان کە ماوەیەك بوو یەکیان گرتبوو و گروپێکیان پێکهێنابوو. بەرپرسانی بزووتنەوە لەگەڵیان کەوتنە قسەکردن تاکوو بیانگێڕنەوە ناو بزووتنەوە بەڵام نەیانتوانی قەناعەتیان پێ بکەن بۆیە

داوایان لیٚ کردن ناوچەی ژێردەسەڵاتی ئەوان بەجێ بهێڵن. بە گشتی پابەندنەبوونی ئەم دەستەیە بە سوڵحی نێوان بزووتنەوەو حزبە کوردییەکان و داکۆکی کردنیان لە فیکرەی سەلەفییەتی جیهادی و رەخنەگرتنیان لە بزووتنەوەی ئیسلامی، وایان لە بزووتنەوە کرد کە ئەوان لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆی دەر بکات. ئیتر لەوە بەدواوە حەسەن سۆفی و هاوبیرەکانی بە نهێنی لە ناوچەی دەسەڵاتداریی بزووتنەوەدا هاتووچۆیان نەکرد بەڵام کاتێك بزووتنەوە بەمەی زانی، بڕیاری گرتنیانی دەرکرد و هاتوچوو و جموجوڵەکانی ئەوانی کۆنترۆڵ کرد. ئەگەرچی ئەم گروپە نکوڵییان لەوە نەکرد کە (گروپ) و (دەستە)یان دامەزراندبێ و ئیدیعایان ئەکرد هیچ پێوەندییەکیان بەو بڵاوکراوەیەوە نییە کە بە ناوی بزووتنەوەی حەماسەوە بڵاو بۆتەوە بەڵام هەموو نیشانەکان و شێوازی هەڵسووکەوتی ئەوان هەروەها هاوکاتبوونی بڵاوکراوەکەی سلێمانی و خۆدەرخستنی ئەوان، ئاماژە بوون بۆ ئەوە کە ئەم خەڵکانە هەمان ئەو کەسانەن گروپی سەلەفی جیهادی حەماسیان دامەزراندووە. حەماس کورتکراوەی «حركة المقاومة الاسلامية» بوو و ئەم ناوە دەقاودەق ناوی رێکخراوێکی فەلەستینییە کە نوێنەرایەتی رێکخراوی ئیخوانولموسلیمین لەم وڵاتەدا ئەکات.

شەوی ٢١ی رەمەزانی ١٩٩٩ی زایینی لە کاتێکدا حەسەن سۆفی لە ماڵی یەکێك لە ئەندامانی گروپەکەیدا لە شارۆچکەی هەڵەبجەی شەهید خەریکی حەسانەوە بوو، لە لایەن چەند کەسی نەناسراوەوە تیرۆر کرا. بەهۆی ئەوەوە کە ئەو پێشتر لە لایەن بزووتنەوەوە هەڕەشەی لیٚ کرابوو و لە ناوەندی دەسەڵاتداری ئەم رێکخراوەشدا کوژرا بوو، زۆر کەس تاوانی کوشتنەکەی ئەویان ئەخستە پاڵ بزووتنەوە بەلام ئەم رێکخراوە ئەمەی رەت دەکردەوەو ئیدیعای دەکرد گۆیا ئەندامانی دەستەکەی (حەماس) ئەویان کوشتووە. پاش کوژرانی حەسەن سۆفی، عومەر بازیانی وەك دەمڕاستی گروپەکە دیاری کراو ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە ئەوان هێشتا بڕیاری بە جەماعە بوون و دیاریکردنی ئەمیریان نەدابوو. هەر لە ساڵی ١٩٩٨دا ژمارەیەك لەو کەسانەی بە سەلەفی ناسرابوون، کەوتنە تەبلیغی بیروباوەڕی سەلەفییەت لە شاری هەولێر و مزگەوتەکانی ئەم شارەیان کردە شوێنی تەبلیغ و کۆبوونەوەی خۆیان. ئەوان هەر لە سەرەتاوە پێوەندییان بە خەڵکانێکی ناو بزووتنەوەو دەرەوەی بزووتنەوەوە کرد و ئەوانیان بە بیروباوەڕی سەلەفییەت ئاشناکرد. بە گشتی ئەم هەوڵە تەبلیغییانە هەم لە شاری هەولێر و هەمیش لە سلێمانی و ناوچەی شارەزوور پێشوازییەکی بەرچاوی لیٚ کرا.هەرچەند کوژرانی کوتوپڕ و خێرای حەسەن سۆفی زەبرێکی قورس بوو بۆ گروپی حەماس و سەلەفییە جیهادییەکان بەڵام کوژرانی ئەو لە لایەن بزووتنەوەی ئیسلامییەوە، دڵی زۆرێك لە ئەندامانی بزووتنەوەو ئیسلامییەکانی دەرەوەی بزووتنەوەی تەزاند و گروپی حەماسی لای ئەوان خۆشەویست کرد.

ماوەیەکی کەم پاش کوژرانی حەسەن سۆفی (سەرەتاکانی ساڵی ١٩٩٩)، بزووتنەوەی ئیسلامی دەستی کرد بە گرتنی ئەندامانی خۆی لە ناو ئۆرگان و بەشە جۆراوجۆرەکاندا کە گومانی ئەوەیان لە سەر بوو پێوەندییان بە گروپی حەماسەوە هەیە. هەر لەم شاڵاوی گرتنەدا عومەر بازیانی و چەند کەسێکی بەرجەستەی حەماس بە بیانووی لێکۆڵینەوە دەربارەی کوژرانی حەسەن سۆفی، دەستگیر کران کە منیش یەکێك بووم لەوانە. سەرەنجام پاش چەند مانگ مانەوە لە زیندانی بزووتنەوەدا کە چەندین ساڵ خەبات و جیهادمان تیادا کردبوو، بە دانی بەڵێنی وازهێنان و کارنەکردن لە پێناو پەرەپێدان بەو بیروباوەڕەی کە گروپی حەماس لەسەری دامەزرابوو، ئازاد کراین. پاشان وەکوو ئەو برادەرانەی تر کە لەگەڵمدا زیندان کرابوون، بە تەواوی وازم لە بزووتنەوە هێنا بەڵام لە ناوچەی ژێردەسەڵاتی ئەم رێکخراوەدا مامەوەو دوای ماوەیەك کە زانیم ئەگەری دووبارە گرتنم هەیە بە ناچار رووم لە شاری سلێمانی کرد. بەلام لەوێش بە هەمان تاوان واتە ئەندامبوون لە گروپی حەماسدا، لە لایەن یەکیەتییەوە گیرام و تا کۆتاییەکانی ساڵی ٢٠٠٠ لە زیندانی ئەواندا بووم.

لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٩٩دا لە کاتی متبوون و بێدەنگ مانی حەماسدا، گروپێکی تری سەلەفی جیهادی بە ناوی «جماعة التوحيد» لە شاری هەولێر خۆی ئاشکرا کرد. ئەمیری ئەم گروپە کەسێك بوو بە ناوی «سەرباز» کە لە ناو

گروپەکەدا بە «ئەبوو بەسیری یەکەم» ئەناسرا. هەروەك ئێوەش ئیشارەتتان پێداوە، ئەم گروپە لە باری قەبارەوە گەورەتر لە جەماعەت حەماس بوو و ژمارەیەکی زۆر خەڵکی شارەزاو کادێری بە ئەزموونیان لەگەڵدا بوو. گروپی تەوحید توانی لە ساڵی ١٩٩٩دا زیاتر لە ١٥٠ موجاهید رابهێنێت و ئامادەی جیهادیان بکات. بە نیسبەت ئەو بەشەی پرسیارەکەتانەوە کە وتووتانە «جماعة التوحید» لە سەرەتای دامەزرانیەوە دەستی داوەتە بشێوی و ئەنجامدانی کاری تێکدەرانە، لە سەرەتادا لێتان ئەپرسم بەڵگەتان چییە کە ئەڵێن ئەم جەماعەتە ئەوکارانەی کردووە؟ باشە ئەگەر خەڵکی سەرشەقام یان وەکوو ئێوە ئەڵێن خەڵکی کووچەو بازاڕ لە رووی نەزانینیەوەو خەڵکی دژ بە ئیسلام لە رووی غەرەز و دوژمنایەتییەوە ئەمجۆرە قسەو قسەڵۆکانە ئەکەن چۆنە ئێوەی سەربەخۆو رۆشنبیریش بە هەمان شێوازی ئەوان بیر ئەکەنەوەو بە پشتبەستن بە درۆودەلەسەی ئەوان پرسیار دەکەن؟ من وەك کەسێکی ئیسلامی بە ئەرکی خۆمی ئەزانم بە بێ ئەوەی بمەوێ راستییەکان چەواشە بکەم، وەڵامی پرسیارەکە بدەمەوە. ئێمەمانان کە لەگەڵ بەرنامەی پیرۆزی ئیسلامدا تێکەڵ بووین وا راهاتووین کە درۆ نەکەین تەنانەت بە مەبەستی گاڵتەکردنیش ئەوکارە ناکەین. ئەوەی ئێوە بە بشێوی و خراپکاری ناوتان بردووە بەشێکە لەو ئەرك و بەرپرسسایەتییەی کە هەر موسوڵمانێکی سەلەفی پێویستە لە کات و ساتی خۆیدا ئەنجامی بدات و پێی هەڵبستێ. جا بۆ باسکردن لەم بارەیەوە ئەبێ بگەرێینەوە بۆ ساڵانی پێشتر تەنانەت بۆ پێش راپەرین. جارێکیان عادڵ باخەوانی نووسەر بۆی گێراینەوە کە گروپەکەی «کەیوان» پێش راپەرین، دایك و کچێکیان لە شاری سلێمانی کوشتووە کە ئارایشتگەیان بووەو خەریکی کاری خراپە بوون. هەر لە شاری سلێمانی لە ساڵی ١٩٩١داو پاش راپەرین، چەند لاوێك کە تازە گەرابوونەوە کوردستانی عێراق، زنجیرە چالاکییەکی فەرمان بە چاکەو مەنعکردن لە خراپەیان ئەنجام دا، لە شاری هەولێریش لە چەند قۆناغدا بۆ نموونە لە کاتی سەرهەڵدانی جەماعەت تەوحیددا زنجیرە چالاکییەکی هاوشێوەی چالاکییەکانی سلێمانی بەرێوە چوو. ئەنجامدەرانی ئەم کارانە ژمارەیەك گەنجی نوسووڵی بوون کە زیاتر لەرووی ئیحساسەوە ئەمکارانەیان دەکرد. جارێکیان یەکێك لەم گەنجانە بۆی گێرامەوەو وتی: (ئێمە ژمارەیەك گەنج بووین کە بە سواریی پاسکیل بە شاری هەولێردا ئەسووراینەوەو تێزابمان بە قاچ و قولی ژنانی بێحیجابدا ئەکرد و پاشان بۆی دەرنەچووین و خۆمان ون ئەکرد). جەماعەتی پارتیی پاش ئەوەی لەم بارەیەوە زانیارییان پێدەگات، وەك بڵێی هەنگیان لەگوێزدا دۆزیبێتەوە، لە گۆڤاری گوڵانەوە بگرە تا تەلەفزیۆن و کەناڵە ئاسمانییەکانیان، بە مەبەستی بەدناوکردنی ئیسلامییەکان دەستیان کرد بە دیعایەی سەیر و سەمەر. جا بەرێزان حزبێك کە ئەم شتە بچووکانە ئەکاتە بیانوو بۆ هێرشکردنە سەر ئیسلام و ئیسلامییەکان، زۆر ئاساییە کە گروپەکەی شێخ زاناو کردەوەکانی ئەم گروپەش بکەن بە بیانووی گەورەتر بۆ بەدناوکردنی ئیسلام.

لە ناوەها هەلومەرجێکدا بوو کە سەلەفییە جیهادیەکانی ناوچە عەرەبنشینەکانی عێراق (بەغداد) پێوەندییان بە سەلەفییەکانی کوردستانەوە کرد و دەستیان کرد بە تیرۆرکردنی ئەفسەر و ئەندامانی رژێمی بەعس. گروپی «جُند المُنتقم»یش بە هەمان مەبەست لە لایەن ژمارەیەك لەو سەلەفییانەوە دامەزرابوو. هەرچەند تەنزیماتی مەرکەز (هێزی ٢ی سۆران) لە بەغداو عەرەبە سەلەفییەکانی ناوەوە لە باری مەنهەجییەوە وەك یەك بیریان ئەکردەوە بەڵام مەرکەز دژی ئەو تیرۆرانینە بوون کە ئەوان هەیان بوو. جەماعەت مەرکەز لەگەڵ ئەو رێکخراوە ئیسلامییەدا کە لە مووسڵ لە لایەن «ئەبوو تەڵحە»و براکانییەوە دامەزرابوو هەروەها لەگەڵ گروپی «جُندالرحمن» کە لە هەشتاکاندا دامەزرا بوو و یەك لە ئەمیرەکانی بە ناوی «ئەبوو نازم» لە لایەن بەعسەوە ئێعدام کرابوو، پێوەندیی گەرمی هەبوو. بۆ ئاگاداریی ئێوەو خوێنەران، پاش ئێعدامکرانی ئەبوو نازم، «ئەبوو وائێل» بووبووە ئەمیری گروپی جوندولرەحمان. پاشان ئەبوو وائێل کە پێشتر یەکێك بوو لە ئەفسەرانی بەعس، لە ترسی دەستگیرکرانی لە لایەن رژێمەوە، خۆی گەیاندە کوردستان و تێکەڵ بە هێزی ٢ی سۆران بوو. ئەو دوای دروستبوونی جوندولئیسلام، کرایە ئەندامی قیادەو لەبەر ئەوەی کولیەی قانوونی تەواو کردبوو و لەباری شەرعییەوە توانایی و شارەزاییەکی زۆری هەبوو، وەك بەرپرسی هەیئەی شەرعی دیاری کرا.

ئەبوو وائیل لەو کاتەدا پیرترین ئەندامی جوندولئیسلام بوو. هەروەها جەماعەتی مەرکەز لە وڵاتی سووریاش پێوەندییان بە چەند گرووپێکی سەلەفی/جیهادییەوە گرت کە ئەمیری یەکێك لەم گرووپانە «ئەبوو ئەحمەد» یان «ئەبوو موحەممەد» ناوێك بوو. «ئەبوو جەعفەری کوردی» کە راگەیاندنی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەو سیدییەدا کە دژی سەلەفییەت و سەلەفییەکان بڵاوی کردەوە ئەو وەك سەری فیتنە لە کوردستان ناو ئەبات؛ رۆڵێکی بەرچاوی لە دروستکردنی پێوەندیی نێوان سەلەفییە جیهادییەکانی سووریاو هێزی ۲ی سۆراندا هەبوو. لە وڵاتی ئەردەنیش مەرکەزەکان پێوەندییان بە کەسێکی بە رەگەز فەلەستینی بە ناوی «قائد کرێسات»ەوە کرد کە ئەمیرایەتی دەستەیەکی جیهادی دەکرد کە لە ئەفغانستانیش لقی هەبوو. پێوەندیی ئەم گرووپە لەگەڵ سەلەفییەکانی کوردستان گەیشتە ئاستێك کە لە سەردەمی جوند و ئەنسارولئیسلامدا کەتیبەیەکی تایبەتیان لەسەر ئەرکی خۆیان (دارایی) دامەزراند. قائد کرێسات لە شەڕی شنرۆیدا شەهید بوو (خوا لێی قبووڵ بکات) و لە کاتی هێرشی ئەمریکاشدا بۆسەر چیاکانی هەورامان لە بەهاری ۲۰۰۳دا، سەرکردەیەکی تری ئەم جەماعەتە بە ناوی «ئەبوو تەیر/ موحەممەد» کوژرا. ئەبوو تەیر هاوڕێی نزیکی ئەبوو مەسعەب زەرقاوی بوو و چونکوو بە شێوەی (انغماس) شەهید بوو، زەرقاوی لە کرتەیەکی ڤیدیۆییدا باسی خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی ئەو ئەکات.

لە کۆتاییەکانی ساڵی ۱۹۹۹دا جەماعەت تەوحید گەیشتنە ئەو ئەنجامە شاری هەولێر بەجێ بهێڵن و لە هەیمەنەی گرووپێکی سەلەفی جیهادیدا لە بناری قەندیل جێگیر بن بەڵام بڕیاریاندا پێش چوونە قەندیل بە مەبەستی چاوپێکەوتن و بینینی گرووپی حەماس، سەردانێکی ناوچەی شارەزوور و بناری سوورێن بکەن. سەردانەکەی ئەوان دوو مانگێکی خایاند و لەو ماوەیەدا زیاتر لە مزگەوتێکی شارۆچکەی سیروان ئەمانەوە. ئەم سەفەر و سەردانە بووە هۆی ئەوە زیاتر لەگەڵ حەماسەکان ئاشنا بن و چونکوو ئەم دوو گرووپە لەباری مەنهەجییەوە وەك یەك بیریان ئەکردەوە، بۆیە تێکەڵبوون و یەکگرتنیان کارێکی ئاسان بوو و هەر بەو هۆیەشەوە ژمارەیەکی بەرچاو لە حەماسەکان پێوەندییان بە جەماعەتی تەوحیدەوە کرد. هەر لەو ماوەیەدا بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامی چەند دانیشتنێکی لەگەڵ تەوحیدەکان پێکهێنا تاکوو لێیان تێبگات و لەخۆیدا بیانتوێنێتەوە بەڵام سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. هەروەها باڵی ئیسلاحی مەلا کرێکار و جەماعەتی مەرکەزیش بە جیا پێوەندییان لەگەڵ گرتن بەڵام هەوڵەکانی ئەوانیش بێئەنجام بوو. هەروەها باڵەکەی مامۆستا عەلی باپیریش لە رێگای وەفدێکەوە بە سەرپەرشتی عەبدولستاری زاوای مامۆستاو وەفدێکی باڵی مەلا عەلی عەبدولعەزیز بە سەرپەرشتی تەحسینی کوڕی مامۆستا، لە نزیکەوە چاویان بە ئەندامانی تەوحید و حەماس کەوت و هەوڵی راکێشانی ئەوانیان بۆلای خۆیان دا. جگە لەمانەش، چەند بەرپرسێکی تری بزووتنەوەی یەکبوون بە جیا لەگەڵ ئەواندا پێوەندییان گرت کە پێوەندیی گرتنەکەی ئەوانیش بێئاکام بوو. سەرئەنجام ئەم هەموو چاوپێکەوتن و پێوەندیی گرتنانە نەیانتوانی زەمینەی مانەوەی ئەندامانی جەماعەتی تەوحید لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بزووتنەوەی یەکبووندا فەراهەم بکەن. بۆیە بزووتنەوە داوای لێکردن بە خێرایی ناوچەکە بەجێ بهێڵن و ئەوانیش بە تەواوی روویان لە بناری قەندیل کرد و لە گوندەکانی «قرناقە»و «پشت ئاشان» گیرسانەوە تاکوو بتوانن لەوێوە دژی حزبەکەی مەسعوود بارزانی چالاکی ئەنجام بدەن.

لە ماوەی مانەوەی جەماعەت تەوحیددا لە ناوچەی شارەزوور و ئاشنابوون و راوێژکردنیان لەگەڵ گرووپی حەماس، ئەم دووانە لە سەر چەند شتێك ساقبوونەوەو چەند بڕیارێکی مێژووییان دا. بڕیارەکان بەم شێوەیە بوون، یەکەم، پێوەندیکردنی چڕوپڕ بە رێبەرانی رۆحیی سەلەفییەتی جیهادی جیهانییەوە. دووهەم، هیجرەتکردنی کۆمەڵێ لە ئەندامانی حەماس و تەوحید بۆ ئەفغانستان بە مەبەستی مانەوەو جیهادکردن. (بەشی زۆری ئەو کەسانە کەخۆیان گەیاندە ئەفغانستان، شەهید بوون) سێهەم، رەوانەکردنی ژمارەیەك لە ئەندامانی حەماس و تەوحید بۆ بەشداریکردن لە جیهادی داغستاندا. ئەو موجاهیدانە پاش ئەوەی خۆیان گەیاندە وڵاتی ئێران و پاش ماوەیەکی زۆر چاوەڕوانی لە

شاری تاران، به هۆی خراپبوونی ڕێگەوە نەیانتوانی خۆیان بگەیەننە شوێنی مەبەست و گەڕانەوە. چوارەم، ناردنی وەفدی تایبەت بۆ ئەفغانستان بە مەبەستی پێوەندیی گرتن لەگەڵ ڕێبەرانی جیهادی و بەرپرسانی ڕێکخراوی ئەلقاعیدەوە. هاوکات لەگەڵ ئەمانەدا (١٩٩٩) بەرەبەرە ئەوانەی کە پێشتر لیژنەی (حل العقد)یان لەناو بزووتنەوەدا پێکهێنابوو پێوەندییان بە رەوتی تازە سەرهەڵداوی سەلەفییەتی جیهادییەوە کرد و لە ناو گروپەکانی حەماس و تەوحیدەوە سەریان دەرهێنا. هێمن بانی شاری، عەبدولستار تیژە، عومەری سیرە، مەلا قارەمانی هێزی کەرکوك، عەبدولحەمید حەبەشی خانەقینی، هەژاری ئانەوا، مام حەمەخان سەرگەتی، سەید حسەین قادر کەرەمی، حەسەن ڕۆڵەی کەلاری (سەرتیپی هێزی گەرمیان)، ئەبووبەکر و باسام باڵانپێیی، عوسمانی کفری ناسراو بە ئەبوو بەرائ ، عەبدولخالق هەولێری و شێخ موحەممەد (چالاك قەرەداغی) ئەو ئەندامانەی حەل و عەقد بوون کە لەو ساڵەدا تێکەڵ بە حەماس و جەماعەت تەوحید بوون. هەر لە ساڵی ١٩٩٩دا دوو کەس لە ئەندامانی «جماعة التوحید» لە پرسگەیەکی هێزەکانی یەکێتیدا لە شارۆچکەی سەید سادق دەستگیر ئەکرێن و کاتێك بە مەبەستی لێکۆڵینەوە ئەیبرێنە لای «یاوەر» ناوێکی بەرپرسی ئاسایش، یەکێك لەو دوو کەسە بە ناوی «عەبدولرەحمان» بە تەقاندنەوەی نارنجۆکێك کە شاردبوویەوە، بەرپرسەکەی یەکێتی ئەکوژێت و خۆیش شەهید ئەبێ. کەسی دووهەمیش بە ناوی «عەبدولباست» لە لایەن هێزەکانی یەنەکەوە تەقەی لێ ئەکرێت و ئەکوژرێ. ئەمە یەکەم خۆتەقاندنەوەی ئیستشهادی بوو لە کوردستان.

ساڵی ٢٠٠٠ لە کاتێکدا جەماعەتی تەوحید لە بناری قەندیل جێگیر بووبوون، لە لایەك نوێنەرانی یەکەکەو یەکێتی سەردانی ئەوانیان کرد و لە لایەکی تریشەوە مقەڕ و بارەگاکانی ئەم جەماعەتە کەوتە بەر هێرشی کوتوپڕ و لە ناکاوی هێزەکانی پارتی دیموکراتی مەسعوود بارزانی. لە شەڕ و پێکدادانێکی سەخت و دژواردا، ئەبوو بەسیری یەکەم ئەمیری جەماعەت تەوحید، دەستەیەکی هەڵبژاردە لە شوراکان و ژمارەیەکی بەرچاو لە موجاهیدینی ئەم گروپە، شەهید بوون. هێزەکانی پارتی پاش دەستبەسەراگرتنی بنکەو بارەگاکانی جەماعەتی تەوحید، تەرمی شەهیدەکانیان بردە دیاناو لە ڕێگای خەڵکی ئەم شارۆچکەیەوە بە خاکیان سپاردن.

پاش ئەم کارەساتە «کاك ئەبووبەکر» وەك ئەمیری جەماعەت تەوحید دیاری کراو پاشماوەکانی ئەم گروپەش دوای یەکگرتنەوەو خۆ ڕێکخستنەوە، ڕوویان لە بناری سوورێن کرد بەڵام هاوکات لەگەڵ گەیشتنیان، تووشی شەڕی حزبی سۆسیالیست بوون. ئەم شەڕە بە ناوبژیوانی بزووتنەوەی یەکبوون کۆتایی هات و بڕیاردرا گروپی تەوحید لە گوندی «بانیشار»ی نێوان دەسەڵاتی بزووتنەوەو سۆسیالیستدا جێگیر بن. هەر لە ساڵی ٢٠٠٠دا کاك عومەر بازیانی پاش گەڕانەوەی لە ئەفغانستان، خۆی و ئەو دەستەیەی حەماسەکان کە مابوونەوە، تێکەڵ بە جەماعەتی تەوحید بوون بەم تێکەڵبوونە گروپی حەماس بە تەواوی هەڵوەشایەوەو سەرجەم ئەندامانی ئەم گروپە چوونە ناو جەماعەت تەوحیدەوە.

پاش ئەم تێکەڵبوونەش کاك ئەبووبەکر هەروا لە پلەی ئەمیرایەتی جەماعەت تەوحیددا مایەوەو کاك «تەییار» ناسراو بە ئەبوو بەسیری دووهەم جێگری ئەو بوو و کاك عومەر بازیانی و ژمارەیەکی تر لە کادێرە پێشکەوتووەکانیش بوونە ئەندامی شورای جەماعەتەکە. دوابەدوای ئەمە، زەمینەی دانووستان و وتووێژ بۆ هەموو سەلەفییە جیهادییەکانی کوردستانی عێراق چ ئەوانەی ناو بزووتنەوەی یەکبوون و چ ئەوانەی دەرەوەی بزووتنەوەی یەکبوون فەراهەم بوو. «جماعة الجهاد»ی دووهەم، باڵی ئیسلاحی مامۆستا کرێکار، باڵی حاجی تەحسین عەبدولعەزیز و جەماعەت مەرکەز (هێزی ٢ی سۆران) ئەو گروپ و لایەنانە بوون کە ویستیان لەگەڵ «جماعة التوحید»دا یەك بگرن بەڵام لە قۆناغی یەکەمدا تەنیا هێزی ٢ی سۆران توانی بە کردەوە ئەم کارە بکات.

سەبارەت بە سەردانی وەفدەکان بۆ ئەفغانستان کە لەبارەیەوە پرسیارتان کردووە، ئەتوانم بڵێم هەموو باڵ و گروپەکانی سەر بە تەوژمی سەلەفییەتی جیهادیی کوردستانی عێراق جگە لە «جماعة الجهاد»ی دووهەم، لە نێوان ساڵەکانی ١٩٩٨ تا ٢٠٠٠ وەفدی خۆیان ڕەوانەی ئەفغانستان کرد. ئەم وەفدانە لە ڕێگای ئێرانەوە خۆیان گەیاندە ئەفغانستان و

لەوێ چاویان بە ئەمیر و بەرپرسانی ئەلقاعیدەو گروپە جیهادێیەکانی تر کەوت. لە ناو ئەم وەفد و گروپانەدا جگە لە حاجی تەحسین عەبدولعەزیز کە بەیعەتی بە بەرپرسانی ڕێکخراوی قاعیدە داو بووە موبایەعی ئەم ڕێکخراوە، ئەوانی تر بە بێ دانی بەیعەت گەڕانەوە.

**یەك لەو چالاکییە گرنگانەی کە «جماعة التوحید» لە سەرەتای دامەزرانیدا ئەنجامی دا تیرۆرکردنی «فرانسۆ حەریری» بوو لە شاری هەولێر. مەبەست لە هەڵبژاردنی ناوبراو بۆ تیرۆرکردن چی بوو؟ ئایا لە بەر ئەوە بوو سەرکردەیەکی پارتی بوو یاخود مەسیحی بوونیشی بۆ سەلەفییەکان گرنگ بوو؟**

پێش هەموو شتێك با بڵێم ئەم تیرۆرە لە سەرەتای دامەزرانی تەوحیددا نەبوو چونکوو ڕۆژی ٢٠٠١/١/٢٨ واتە ماوەیەکی زۆر پاش دروستبوونی ئەم جەماعەتە، بەڕێوە چوو. ئەم تیرۆرە بە تەواوی سەری لە پارتی شێواند، ئەوان لە سەرەتادا پێیان وابوو یەکیەتی نیشتمانی فرانسۆ حەریری کوشتووە بۆیە دەستیان کرد بە گرتنی ئەندامان و لایەنگرانی یەنەك. هۆکارەکانی هەڵبژاردنی حەریری بەم شێوەیە بوون: یەکەم، ئەو چەندین بەرپرسایەتی گرنگی لە ناو پارتیدا هەبوو. دووهەم، ئەو یەکێك بوو لە ئەندامە کۆنەکانی پارتی و بە هۆی نزیکاتی زۆری لە مەلا مستەفاوە کەسێکی جێگای متمانەی بنەماڵەی بارزانی بوو. سێهەم، دەنگۆی ئەوە هەبوو ناوبراو پردی پێوەندیی نێوان پارتی و ئیسرائیلە. چوارەم، ئەو کەسێکی ناموسوڵمان و تەنانەت دژە ئیسلامیش بوو و پێڕەویی لە مەسیحییەتەوە ئەکرد کە لە ڕوانگەی ئیسلام و سەلەفییەتەوە ئەم کەسانە کافرن. هەروەها باسی ئەوەش دەکرا کە ناوبراو سەگێکی بووە ناوی «موحەممەد»ی لێ نابوو و مەبەستی لەم کارەش بێحورمەتی کردن بوو بە پێغەمبەری ئیسلام (درروودی خوای لێ بێ). ئینجا هەموو ئەمانە بوونە هۆی ئەوە ناوبراو ببێتە یەکەم نیشانەو ئارمانج. هەروەها جەماعەتی تەوحید ئەیەویست بە وەشاندنی زەبرێکی باش لە پارتی، تۆڵەی شەهیدەکانی قەندیل لەم حزبە بکاتەوەو پێیان بڵێ کە بە شەهیدبوونی ئەوان نەك جەماعەتەکە نەفەوتاوە بەڵکوو توانای ئەنجامدانی چالاکی گەورەشی لە شاری هەولێری ناوەندی دەسەڵاتداریی بارزانییەکاندا هەیە. لە ڕاستیشدا ئەم چالاکییە ئەوەندە ڕێك و پێك و سەرکەوتووانە بەڕێوە چوو کە خودی ئەمیر و بەرپرسانی جەماعەت تەوحید سەریان سووڕما. بەڕێوەبەرانی چالاکییەکەش کە خۆیان بۆ شەهیدبوون دانابوو، بە بێ ئەوەی تووشی هیچ کێشەو زیانێك بن، گەڕانەوە بۆ لای جەماعەتەکەیان.

**دەربارەی سەفەری سەلەفییەکانی کوردستان بۆ ئەفغانستان هەرچەند خۆت پاراستووە لە ناوبردنی ئەم وەفدانە بەڵام با بزانین لەوێ چاویان بە کێ کەوت و لەگەڵ کام یەك لە بەرپرسانی تالیبان و ئەلقاعیدەدا کۆبوونەوە؟ دوای گەڕانەوەی ئەو وەفدانە هەندێ گۆڕانکاری لە پێکهاتەی تەنزیماتیی ڕێکخراوە سەلەفییەکانی باشووری کوردستاندا دروست بوو، بۆ وێنە وەك خۆتان ئاماژەتان پێکرووە عومەر بازیانی کە ئەمیری (حرکة المقاومة الاسلامیە / حماس) بوو، بە تەواوی تێکەڵ بە جەماعەت تەوحید بوو، ئینجا ئەم گروپەش لەگەڵ گروپە سەلەفییەکانی تردا کەوتە وتووێژ و ئەنجامی ئەمەش تێکەڵبوونی جماعة التوحید و جماعة المرکز واتە هێزی ٢ی سۆران و دامەزراندنی ڕێکخراوی سەلەفی جیهادیی «جُندالاسلام» بوو لە ڕێکەوتی ٢٠٠١/٩/١دا. بەڕای تۆ کە لە نزیکەوە ئاگاداری ئەم ڕووداوانە هەیت، ئایا ئەتوانین یەکگرتنی هێزە سەلەفییەکانی کوردستان بە دەرەنجامی سەفەری ئەفغانستان و دیداری ڕێبەرانی سەلەفی جیهادی بزانین؟**

سەرەتا با ئەوەتان عەرز بکەم ناونەبردنی ئەندامانی وەفدەکان زیاتر هۆکاری ئەمنی هەیە چونکوو ناوبردنیان لە وتووێژێکی ئاوادا بە مانای شەهادەت دانە لە سەر ئەوەی کەوا ئەوان سەردانی ئەفغانستانیان کردووەو چاویان بە ڕێبەرانی سەلەفی جیهادی کەوتووە و ..... هتد. بۆیە من بەش بە حاڵی خۆم نامەوێ ناویان بهێنم و ئەوانەیان کە ماون بیانخەمە مەترسییەوە. ئەوەش کە ناوی عومەر بازیانی و حاجی تەحسین عەبدولعەزیزم هێناوە پێوەندی هەیە بە خودی ئەوانەوە کە هەر لەو کاتەدا دۆست و دوژمن لە سەفەرەکەیان ئاگادار بوون و ئیتر پێویست ناکا من ناویان نەبەم و بیان شارمەوە. دەربارەی ئەوەش ئەم وەفدانە چاویان بە چ کەسانێك کەوتووە تەنیا ئەتوانم ئەوە بڵێم کە بێگومان مەبەستی ئەوان لە چوون بۆ ئەفغانستان، پێوەندیکردن بوو بە بەرپرسانی ئەلقاعیدەوەو زۆر ئاساییە چاویان بەوان کەوتبێ و لەگەڵیان کۆ بووبێتنەوە. بە نیسبەت عومەر بازیانییەوە کە وتووتانە گۆیا من وەکوو ئەمیری گروپی حەماس ناوم بردووە پێویستە ئەوە ڕاست بکەمەوە کە من وتوومە ناوبراو دوای کوژرانی حەسەن سۆفی، بۆتە دەمڕاست و وتەبێژی گروپەکە نەك ئەمیریان. بەڵام ئەوەی کە یەکگرتنی هێزە سەلەفییەکانی کوردستانی عێراق دەقاودەق ئەنجامی سەردانی وەفدەکان بووبێت بۆ ئەفغانستان، من لەو باوەڕەدا نیم چونکوو دڵنیام بە بێ چوونی ئەوان بۆ ئەفغانستانیش ئەم یەکگرتنە هەر ڕووی ئەداو تەنانەت کاریشی بۆ کرابوو. لەم بارەیەوە تەنیا ئەتوانم بڵێم سەردانەکان بوونە هۆی ئەوە لایەنە سەلەفییەکان زووتر و خێراتر یەك بگرن.

وەك لە بەشەکانی پێشوودا ئاماژەم پێکرد، سەلەفییەتی جیهادی هەر لە بنەمادا باوەڕی بە سنوور نییەو هیچ کات لە جوگرافیایەکی تایبەت و دیاریکراودا قەتیس نامێنێ، ئەمەش یەك لەو هۆکارانەیە کە بۆتە هۆی ئەوە سەلەفییەکانی کوردستانیش هەر لە سەرەتاوە پێوەندیی بە کەسایەتی و ڕێکخراوە سەلەفی جیهادییەکانی دەرەوەی کوردستانەوە بکەن و بە مەبەستی جیهاد کردنیش ڕوو لە وڵاتان و شوێنەکانی تر بکەن.

**کەوابوو ئەتوانین بڵێین بزاڤی ئیسلامخوازیی سەلەفییەتی جیهادی لە کوردستاندا بە جۆرێك لە جۆرەکان لە پێوەندیی لەگەڵ دەرەوەی کوردستاندا فۆرمی گرت و ستراتیژ و تاکتیکەکانی خۆی هەڵبژارد. ئەم دیاردەیە لە بزووتنەوەشدا ئەبینرا: بە پێی پێڕەوی ناوخۆی بزووتنەوە ڕێگە بە وەرگرتنی عەرەب و بە ئەندامگرتنیان نەئەدرا بەڵام هێزی ۲ ی سۆران ئەم یاسایەی ڕەچاو نەکرد و ئەندامانی عەرەب لە ڕیزی ئەم هێزەدا ئەبینران. ئەم مەسەلەیە گومانێکی دروستکردبوو گوایە موسوڵمانانی کوردی جیهادخواز سەر بە عەرەبن و بزاڤەکەیشیان بزاڤێکی خۆڕسك و بەرهەمهاتووی ناوخۆی کوردستان نەبووەو لە لایەن کەسی تر و شوێنی ترەوە دروست کراوە. ڕای تۆ بەرامبەر ئەم مەسەلەیە چییە؟**

لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ئەمجۆرە جیاوازی و سنووردانانە بێ مانایە. دینی ئیسلام دینێکی جیهانییەو هیچ جۆرە چوارچێوەیەك ناناسێ. کورد و عەرەب و تورك و عەجەمی لا وەك یەکە. هەر کەسێ سەر بە هەرکام لەم نەتەوانە بێ ئەتوانێت ببێتە موسوڵمانێکی باش و نموونەیی یان بە پێچەوانەوە ببێتە دژە دین و بێباوەڕ. خاڵی سەرەکی برایەتی و لێکنزیکبوون لە ئیسلامدا، پابەندبوونە بە دەستووراتی دینەوە. ئەم شتانە لە ڕوانگەی سەلەفییە جیهادییەکانەوە بایەخێکی زیاتریان هەیەو بەهایەکی زۆرتریان پێ ئەدرێ. بۆیە هەروەك پێشتر ئاماژەم پێدا نابێ چاوەڕوان بین ئەم ئایینە لە چوارچێوەیەکی بەرتەسك و بچووکی وەکوو کوردستان یان هەر ناوچەو وڵاتێکی تردا ئۆقرە بگرێ. یەك لە خەسڵەتە هەرە باشەکانی ئیسلام و ئیسلامییەکان بە هانای یەکترەوە چوونە لە کاتی پێویست و تەنگانەدا بە تایبەت

کاتێك کە مەوزووعێکی پیرۆزی وەك «جیهاد» لە ئارادا بێ. بۆیە هەروەك سەلەفییەکانی کوردستان بە مەبەستی جیهاد کردن روویان لە وڵاتان و شوێنەکانی تر کردووە، زۆر ئاساییە ئیسلامییەکانی شوێنەکانی تریش بەشداری لە جیهادی کوردستاندا بکەن.

جا خەڵکانی دەرەوەی بازنەی ئیسلامەتی بە تایبەت عیلمانی و نەتەوەپەرستەکان چۆن ئەروانن ئەم مەوزووعەو لە کام روانگەوە سەیری مەنهەج و کرداری بزاڤی سەلەفییەتی جیهادیی کوردی ئەکەن ئەمە بۆ ئێمە هیچ بایەخێکی نییە. بە نیسبەت قەومی کورد و وڵاتی کوردستانیشەوە بە ڕای من زۆر ئاساییە لە وڵاتی ئێمەدا کە زۆربەی دانیشتوانەکانی موسوڵمانن، گروپ و ڕێکخراوەی ئیسلامی دابمەزرێت و لە پێناو دینی ئیسلامدا جیهاد بکات. کورد سەدان ساڵ پێش ئەوەی دیموکراسیەت، کۆمۆنیزم، سۆسیالیزم، سیکۆلاریزم و..... لە دایك بن، قەومێکی موسوڵمان بووەو لە پێناو دابەزاندنی شەریعەتی ئیسلامدا خەبات و جیهادی کردووە. بۆیە ئەگەر لەم سەردەمەدا کە نەدامەتییەکی زۆر بەرۆکی موسوڵمانانی گرتووە، جیلێکی موسوڵمانی فیداکار و لەخۆبردوو بە ناوی «سەلەفییەتی جیهادی»یەوە لە کوردستاندا دیفاع لە مەوجوودییەتی ئیسلام بکەن، پیش هەموو شتێك ئەرکی شەرعی و ئایینی خۆیانیان بەجێ هێناوە. جا ئەگەر موسوڵمانێکی غەیرە کورد لە شوێنێکی ترەوە هیجرەتی کردبێت و بە هانای برا دینییەکانییەوە هاتبێ ئەوا لە روانگەی ئیسلامەوە کارێکی پیرۆزی کردووە، هەروەك چۆن لە سەردەمی ئیمارەتی بیارەدا بە دەیان کەس لە دوور و نزیکەوە روویان لە کوردستانی عێراق کرد و لە سایەی ئەم ئیمارەتەدا دەستیان دایە جیهاد. جگە لەو کەس و لایەنانەی پێشتر باسم کردن تورکەکانی وڵاتی تورکیاش بەشێکی تر بوون لەو موجاهیدانەی کە لە سەردەمی ئیمارەتی بیارەدا جگە لە بەشداریکردنی راستەوخۆی جیهاد، بەشێکی زۆر لە کاروباری خەستەخانەی ئەنسارولئیسلام لە سەر شانی ئەوان بوو. لە راستیدا زۆر بوون ئەو کەسانە بە تایبەت ئەو برا عەرەبانەی لەو سەردەمەدا بە مەبەستی جیهادکردن روویان لە کوردستان ئەکرد. من خۆم لەوانم بیستووە کە ئەیانوت کاتێ بە کەس و کار و هاوڕێکانمان وتووە بە مەبەستی جیهاد کردن روو لە کوردستان ئەکەین، پێیان وتووین ئاگاتان لە خۆتان بێ چونکوو کوردە موجاهیدەکان بە ئازایەتی بەناوبانگن و جیهادکردن لەگەڵ ئەواندا سەخت و دژوارە. یان کاتێك لەگەڵ خەڵکی مەککەو مەدینەدا رووبەڕوو ئەبوومەوە کە هاتبوون بەشداری لە جیهادی کوردستاندا بکەن و خۆزگەم ئەخواست منیش خەڵکی وڵاتی ئەوان بوومایە تاکوو لە تەمەنی ٢٥/٢٤ ساڵیدا حەجی ماڵی خوام بکردایە، ئەوان ئەیانوت ئێمە هەزار جار خۆزگە ئەخوازین کە لە وڵاتی «سُغور» واتە لە سنوور و بەرەکانی جیهاد و جەنگدا بە دونیا بهاتباینایە تاکوو بمانتوانیبایە زیاتر و زۆرتر بەشداریی جیهادمان بکردایە. هەروەها ئەیانوت: (ئەوەتانێ خوای گەورە ئەم شتە پیرۆزەی بە نەسیب ئێوە کردووە کە هیچکات لەگەڵ حەج و ئەو ئەرکانەدا کە مرۆڤی موسوڵمان لە کاتی حەجکردندا بە جێی ئەهێنێ، بەراورد ناکرێ). لە کۆتاییدا ئەتوانم بڵێم بزاڤی سەلەفییەتی جیهادی لە کوردستان بە ڕێژەیەکی زۆر لە ژێر کاریگەریی بزاڤی سەلەفییەتی جیهادیی جیهانیدا بووەو خۆیشی بە بەشێك لەم بزاڤە جیهانییە زانیوە.

«تەوحید» و«حەماس» لە چ بەراوردێکدا یەکیان گرن؟ ئایا پاش ئەم تێکەڵبوونەو هەڵبژاردنی ناوی « جماعة التوحید» بۆ ڕێکخراوە هاوبەشەکە، لە شوێن یان ناوچەیەکی دیاریکراودا دەسەڵاتیان بە دەست بوو یان با بڵێین ئیمارەتێکی ئیسلامییان راگەیاندبوو؟ هەروەها تا کاتی تێکەڵبوونی دووهەمیان لەگەڵ هێزی ٢ی سۆران، چ کار و چالاکییەکیان ئەنجام دا. جیا لەم دوو بابەتە مەسەلەیەکی دیکەش کە بە لێڵی ماوەتەوە ئەوەیە کە بۆچی دوای دروستبوونی (جُندالاسلام) یەکێك لە ئەندامانی هێزی ٢ی سۆران بە ناوی وریا رەش هەولێری (ئەبوو عەبدوڵڵای شافیعی) بوو بە

**ئەمیر؟ ئایا لە ناو ئەندامانی تەوحیددا کەس لەو ئاستەدا نەبوو بکرێتە ئەمیر؟ بە گشتی ئەو فاکتەرانە چی بوون کە ئەبوو عەبدوڵڵای شافیعییان کردە ئەمیر لە حاڵێکدا تەنانەت لە ناو مەرکەزیشدا ئەندامێکی دیار و ناسراو نەبوو؟**

وەک پێشتر ئاماژەم پێدا تەوحید و حەماس لە دوو قۆناغدا یەکیان گرت. یەکەم جار لە کاتی دەرچوونی تەوحیدەکان لە هەولێر و نیشتەجێبوونیان لە شارۆچکەی سیروان واتە لە نیوەی یەکەمی ساڵی ۲۰۰۰دا بوو کە بەشی هەرەزۆری حەماسەکان واتە حەفتاد لە سەدیان بە ریزەکانی تەوحیدەوە پەیوەست بوون. بەڵام یەکگرتنی ئێجگارەکی لە مانگی ٣ یان ٤ی ۲۰۰۱دا بوو، ئەم یەکگرتنە پێویستی بە زەمینە سازییەکی ئەوەها نەبوو و زۆر بە ئاسانی رووی دا واتە بە بێ ئەوەی هیچ مەرج و پێش مەرجێك لە لایەن دەستەیەکەوە بۆ دەستەکەی تر دابنرێت. لەو چەند مانگەدا کە (جماعة التوحید)ی یەکگرتوو خەریکی کار و چالاکی بوو، لە هیچ شوێنێکدا دەسەڵاتی شەرعیان دانەمەزاند و زیاتر بە کاری خۆئزیك کردنەوەو تێکەڵبوون لەگەڵ لایەنەکانی تری سەلەفی جیهادی خەریك بوون. لەو سەردەمەدا (ئەبوو بەسیری یەکەم) ئەمیرایەتی ئەم گروپەی ئەکرد و وەکوو کاری تریش ئەتوانین تیۆری فرانسۆ حەریری بە جیدی ترین چالاکی ئەم جەماعەتە لەو قۆناغە کورتەدا ئەژمار بکەین.

پاش زەقبوونەوەی ناکۆکییە نێوخۆییەکانی بزووتنەوەی یەکبونی ئیسلامی و پارچەپارچە بوونی ئەم رێکخراوە، هێزی ۲ی سۆران بە پێی ئەو نزیکبوونەوەو وتووێژانەی کە پێشتر کرابوون، بڕیاری جیابوونەوەی دا. مانگی ۹ی ساڵی ۲۰۰۱ی زایینی ئەم هێزەو جەماعەت تەوحید یەکیان گرت و رێکخراوی «جُندالاسلام»یان دامەزراند. دەربارەی ئەوەی کە بۆچی ئەبوو عەبدوڵڵای شافیعی وەك ئەمیری ئەم رێکخراوە دیاری کرا؟ ئەتوانم بڵێم ئەوەندەی پابەندبوون بە مەسەلەی مەنهەجەوە بۆ هەردوولا -جەماعەت تەوحید و جەماعەت مەرکەز- گرنگ بوو، مەسەلەی ئەمیر و ئەمیرایەتی گرنگ نەبوو. هەروەها بە هۆی ئەوەوە کە مەرکەزییەکان لە باری هەیمەنەو قەبارەوە گەورەتر و بە ئەزموون تر بوون بۆیە تەوحیدەکان بۆخۆیان پێداگرییان ئەکرد تاکوو ئەندامێکی مەرکەز بکرێتە ئەمیر. جا هەروەك ئێوەش وتووتانە، ئەبوو عەبدوڵڵا کەسێکی ناسراو و دەرکەوتوو نەبوو بەڵام بێگومان شورای مەرکەز بە پشت بەستن بەو ئەزموون و تایبەتمەندییانەی کە ئەو هەیبوو، ئەویان بۆ ئەمیرایەتی جوندولئیسلام واتە بۆ یەکەم رێکخراوی سەلەفی جیهادیی کوردستان پێشنیار کرد. لەبەر ئەوەش ئەڵێم یەکەم رێکخراوی سەلەفی جیهادیی کوردستان چونکوو جیا لە تورك و عەرەبەکان، کوردانی هەر چوارپارچەی کوردستانیش بەشدارییان تیادا کرد.

وریا رەش هەولێری کە بە ئەبوو عەبدوڵڵا شافیعی ناسرابوو، بەرپرسی پێوەندیی گرتن و گەیاندنی پەیام و بەرنامەکانی جەماعەت مەرکەز بوو بە عەرەبەکانی عێراق و سووریاو وڵاتانی تر و لە راپەڕاندنی ئەرکەکانیدا کەسێکی بە تواناو بە بڕشت بوو. ئەمانەو ئەو ئاشنایەتی و نزیکایەتییەی کە ئەو لەگەڵ عەرەبەکاندا هەیبوو، لە هۆکارە سەرەکییەکانی پێشنیارکردنی ئەبوو عەبدوڵڵای شافیعی بوون بۆ ئەمیرایەتیکردنی یەکەم رێکخراوی سەلەفی جیهادی لە کوردستان. شایانی باسکردنە لە کاتی یەکگرتنی تەوحید و حەماسیشدا هەردوولا بە دڵگەرمییەکی زۆرە داوایان لە یەکتر ئەکرد تاکوو ئەمیرایەتی جماعەت تەوحید بکەن و لە نێوان کاك ئەبووبەکر و کاك عومەر بازیانیدا فەرموو فەرموویەکی زۆر کراو هەرچەند کاك ئەبووبەکر چەند ساڵێك لە کاك عومەر بازیانی بچووکتر بوو -کاك ئەبووبەکر لە دایکبووی ۱۹۷۵ی زایینی و کاك عومەریش لە دایکبووی ۱۹۷۱ بوو- و ئەندامانی جەماعەت تەوحید لە حەماسەکان کەم ئەزموونتر بوون بەڵام سەرباری ئەمەش سەرەنجام کاك ئەبووبەکر بوو بە ئەمیری « جماعة التوحید»ی یەکگرتوو.

له دایکبوون و تەمەنی کورتی ۱۰۰ ڕۆژەی جوندولئیسلام یەکانگیر بوو لەگەڵ گەلێ ڕووداوی سەرنجڕاکێش و پڕ کاریگەردا. یەکەم ڕووداوی گرنگ هێرشەکانی ۱۱ی سێپتامبری ئامریکا بوو کە نەخشەی سیاسی دونیای بە تەواوی گۆڕی. بەم شێوەیە قۆناغێك لە ئیسلامی سیاسیی جیهادگەرا دروست بوو کە زۆرێك لە پێناسە کۆنەکانی گۆڕی و لە بەشی دووهەمی ئەم وتووێژەدا هەندێکیمان خستە بەرباس. بێ گومان موجاهیدانی کوردیش کە ئەودەم زیاتر لە دووتوێی جوندولئیسلامدا خۆیان تەیار کردبوو لە ئاسەوارەکانی ئەم قۆناغە نوێیە بێبەش نەبوون، ئەوەبوو زۆر زوو کەوتنە شەڕکردن لەگەڵ دەسەڵاتی کوردی لە کوردستانی عێراق. ئامانجی جوندولئیسلام چی بوو، ئایا تەنیا ڕووخاندنی حکوومەتی هەرێم و دامەزراندنی حکوومەت یا خود ئیمارەتێکی ئیسلامی بوو لە باشووری کوردستان؟ بە واتایەکی تر ئایا ئەتوانین بڵێین ڕێکخراوی جوندولئیسلام ئەیەویست لە ڕووبەرێکی بەرینی جوگرافی وەکوو وڵاتی عێراق یان هەموو پارچەکانی کوردستاندا جیهاد بکات و هەوڵی دابەزاندنی شەریعەت بدات؟

هەر وەك ئێوەش وتووتانە، لە دایکبوونی جوندولئیسلام تەنیا ۱۱ ڕۆژ پێش ڕووداوی ۱۱ی سێپتامبری ئەمەریکا بوو. ئەم ڕێکخراوە وەك زەروورەت و وەك پێویستییەکی گرنگ بۆ کوردستانی عێراق، لە لایەن لایەنگرانی سەلەفییەتی جیهادییەوە دامەزرا. ئەوان جگە لەوەی بۆخۆیان بڕیاری دروستکردنی ڕێکخراوێکی وایان دابوو، لەملاولاشەوە گوشارێکی زۆریان کەتبووە سەر تاکوو هەرچی زووتر ئاوەها کارێك بکەن. بۆ نموونە ژمارەیەکی بەرچاو لە خەڵکانی ناو بزووتنەوەی ئیسلامی و باڵی ئیسلاحی مامۆستا کرێکار، بە پەرۆشەوە بوون بۆ ئەم یەکگرتنەو بە ئەندامانی تەوحید و مەرکەزیان ئەوت، بەڵێن ئەدەین ئەگەر ئێوە یەك بگرن ئەوا ئێمەش ئامادەین بێینە پاڵتان و بە ڕیزی ئێوەوە پەیوەست بین. ئەندامانی باڵی ئیسلاح زۆرترین گوشاریان هێنابوو و ئەیانوت ئامادەین قەناعەت بە مەلا کرێکاریش بکەین تاکوو ئامادە بێ بۆ یەکگرتن لە گەڵتان. هەروەها پێش یەکگرتنی تەوحید و هێزی ۲ی سۆران، «جەماعەت جیهادی دووهەم» کە بە یەکەمین گرووپی سەلەفی جیهادیی کوردستانی عێراق حیساب ئەکرا —ئەڵبەت ئەوان هیچ کات بە کردەوە جیهادیان ڕانەگەیاند— هەوڵیدا لەگەڵ «جماعة التوحيد»دا وەحدەت بکات بەڵام ئەمەیان بۆ نەکراو دواتر تێکەڵ بە کۆمەڵی ئیسلامی بوون. بۆیە ئەوەندەی پێوەندیی بە کوردستانەوە هەیە بە تەواوی زەمینە بۆ دروستبوونی ڕێکخراوێکی جیدی سەلەفی جیهادی ئامادە بوو. بەڵام بە نیسبەت ئاڵوگۆڕ و هاوکێشە جیهانی و ناوچەییەکانیشەوە، ئەتوانم بڵێم ئەوانیش کاریگەری خۆیان هەبوو. بە تایبەت زۆر ئاسایی بوو ڕێکخراوێکی وەك جوندولئیسلام کە تەنیا دە ڕۆژ پێش ڕووداوەکەی ۱۱ی سێپتامبر دامەزرابوو، بە ئاستێکی زۆر بکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو ڕەوتەوە کە پاش ئەم ڕووداوە هاتە ئاراوە. ئەڵبەت جوندولئیسلام هەر لە کاتی دامەزرانیدا مەنهەج و بەرنامەکانی خۆی دیاری کردبوو و بەرنامەی ناوخۆی ئەم ڕێکخراوە هەموو شتێکی تیادا گونجا بوو. ئەم بەرنامەیە بە بێ لەبەرچاوگرتنی هەرجۆرە مەوزووع و بابەتێکی نەتەوەیی و چینایەتی تەنیاو تەنیا باسی دابەزاندنی شەریعەتی ئیسلام و دامەزراندنی دەسەڵاتێکی ئیسلامی ئەکرد. لە سەر بنەمای ئەم بیروباوەڕەش بوو کە لە سەرەتای دامەزرانیدا، ئەم ڕێکخراوە ئیمارەتێکی ئیسلامی لە ناوچەی هەورامان ڕاگەیاند کە دواتر بە ناوی ئیمارەتی بیارەوە ناوبانگی دەرکرد. هەرچەند ناوبانگی ئەم ئیمارەتە بچووکە سنوورەکانی کوردستانی بەزاند و بووە هۆی ناساندنی سەلەفییەکانی کوردستان بە دونیای ئیسلام بەڵام ئەمە تەنیا بەشێکی بچووکی خواست و ئارەزووی ئەمیر و ئەندامانی جوندولئیسلام و پاشانیش ئەنسارولئیسلام بوو. لە ڕاستیدا ئامانجی ئەوان فراوانترکردنی دەسەڵاتەکەیان ودابەزاندنی شەریعەتی ئیسلام بوو لە ڕووبەرێکی جوگرافیایی بەرینتردا تەنانەت بەرینتر لە کوردستانی عێراق و چوارپارچەی کوردستان. بۆیە هیچکات ناتوانم بڵێم بەرنامەی جوند یان ئەنسارولئیسلام لە چوارچێوەی کوردستان یان عێراقدا بەرتەسك ئەبۆوە. بە پێچەوانەوە ئەتوانم بڵێم ئەگەرچی جوند و ئەنسار لە باری ڕێکخستنەوە سەر بە ڕێکخراوی ئەلقاعیدە نەبوون و لە باری قەبارەو دەسەڵاتەوە لەگەڵ ئەم

ڕێکخراوەدا بەراوەرد نەئەکران بەڵام لە کردەوەدا وەك ڕێکخراوی ئەلقاعیدە بەرنامەیان بۆ سەرجەم ئۆممەی ئیسلامی هەبوو. بینیمان پاش داگیرکرانی عێراق لە لایەن ئەمەریکاوە، چۆناوچۆن ئەنسارولئیسلام لە هەموو ناوچەکانی عێراقدا حوزووریان هەبوو و چالاکییان بەڕێوە ئەبرد. هەروەها بینیمان کە چۆن ئەم ڕێکخراوە پەلوپۆی هاوێشت بۆ پارچەکانی تری کوردستان و وڵاتانی دەوروبەر.

بە نیسبەت ڕاگەیاندنی شەڕ دژی حکوومەتی هەرێمی کوردستان و دەستپێکردنی جیهاد دژی حزبە کوردییەکانەوە، پێویستە بڵێم ڕێکخراوی جوندولئیسلام بەو پێیە کە هەڵگری مەنهەجی سەلەفییەتی جیهادی بوو و بە شێوەیەکی زۆر جیدی داکۆکی لە بەهاو بایەخە ئیسلامییەکان ئەکرد، ئەو پێشبینییەی کردبوو کە ڕەنگە هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ لایەنە نائیسلامییەکانی کوردستانی عێراقدا بەشەڕ بێت. بە نیسبەت پارتییەوە زۆر پێشتر لەوە شەڕ دەستی پێ کردبوو و ئەم حزبە زەبری خۆی لە گرووپی تەوحید وەشاندبوو و لە بەرامبەریشدا سەلەفییەکان تۆڵەیەکی باشیان لەوان کردبۆوە. بۆیە پاش دامەزرانی جوندولئیسلام بڕیار وابوو کەتیبەیەك ڕەوانەی ناوچەی قەندیل بکرێت بۆ ئەوەی لەوێوە دژی بەرژەوەندییەکانی پارتی چالاکی بەڕێوە ببات. لە سەرەتاوە بەرنامەو سیاسەتی ڕێکخراوەکە ئەوە بوو کە تەنیا دژی پارتی دیموکرات شەڕ بکەن بەڵام هاتنی هێزی چەکداری یەکیەتی نیشتمانی بۆ ناوچەکە ئەویش بەو هەیمەنەو ژمارە زۆرەوە هەموو شتێکی گۆڕی و جوندولئیسلامی ناچار کرد تاکوو بڕیاراتی تازە دەربکات.

لە کاتێکدا بزووتنەوەی یەکبوون تووشی شەقبوون و لێکترازان هاتبوو، هێزەکانی یەکیەتی بە بیانووی ناوبژیوانی و پاراستنی ئاسایشی ناوچەکەوە هاتبوونە ئەوێ. لە ڕاستیدا ئەو شەقبوون و لێکترازانەی بزووتنەوەی یەکبوون یەکیەتی هێنابووە سەر ئەو باوەڕە کە ئیتر هیچ گرووپ و ڕێکخراوێکی ئیسلامی نەماوە تاکوو لە بەرانبەریاندا بووەستێ و پێش بە لەشکرکێشی و تەڕاتێنی ئەوان بگرێ. بۆیە هەرگیز چاوەڕوانی ئەوە نەبوون ڕێکخراوێکی بچووك و تازە دامەزراوی وەك جوندولئیسلام ئەم خەون و خەیاڵەیان بکاتە بڵقی سەر ئاو. دوای ئەوەی بەرپرسانی جوندولئیسلام بە تەواوی لە مەبەستی هێزەکانی یەکیەتی نیشتمانی گەیشتن، بڕیاریان دا دەستیان لێ بوەشێنن. لە کاتێکدا ٣٠٠/٤٠٠ پێشمەرگەی یەکیەتی گوندی خێڵی حەمەیان کردبووە شوێنی حەوانەوەی خۆیان، ڕۆژی ٢٠٠١/٩/٢٣ لە لایەن هێزێکی جوندولئیسلامەوە بە ئەمیرایەتی کاك «سەلمان هەولێری» هێرشیان کرایە سەر و نزیك بە ١٠٠ کەسیان لێ کوژرا. ئەمە دەسپێکی شەڕێکی قورس و بەردەوامی نێوان یەکیەتی نیشتمانی و جوندولئیسلام و دواتریش ئەنسارولئیسلام بوو کە تا بەهاری ٢٠٠٣ و کاتی هێرشی ئەمەریکا بۆسەر عێراق، درێژەی کێشا.

**کاتێ باسی خێڵی حەمە ئەکرێ، مرۆڤی کورد زەینی بۆلای ئەو شەڕە ئەچێت کە جەنابت باست کردووە. بەڵام خاڵی بەرجەستەی ئەم شەڕە سەربڕین و شێواندنی جەستەی ئەو پێشمەرگانە بوو کە تەنانەت ژمارەیەکی زۆریان پاش بەدیل گیران سەریان لە لاشەیان جیا کرابووەوەو ئەندامەکانی لەشیان شێوێندرابوو. ڕات سەبارەت بەم بابەتە چییەو تا چەند بە کردارێکی ئیسلامییانەی ئەزانیت؟**

ڕاستە بە هۆی ئەم شەڕەوە بوو کە خێڵی حەمە ناوبانگی دەرکرد، ئێستاش هەرکات و لە هەر شوێنێك ناوی ئەم گوندە ئەبرێ و ئەبیسرێ مرۆڤ یەکسەر یادی شەڕەکەی ٢٣ی سێپتامبری ٢٠٠١ی نێوان جوندولئیسلام و یەکیەتی ئەکاتەوە. بەڵام لەو شەڕەدا جگە لە پێشمەرگەیەکی یەکیەتی کە بە ڕێکەوت لە لایەن موجاهیدێکی جوندولئیسلامەوە بە ناوی «سەید حسەین قادرکەرەمی» سەربڕدرا ئەویش بە بێ ئیزن و ئاگاداری ئەمیر و بەرپرسەکانی، سەری هیچ کەسێکی تر لە لاشە جیانەکرایەوەو جەستەی کەسیش نەشێوێندرا.

**پێویستە ئاماژە بە ڤیدیۆیەك بدەین کە خودی جوندولئیسلام لە دووتوێی سیدییەکدا بە ناوی «بۆ ڤێنکی دڵی ئیسلام» بڵاوی کردەوە. بە پێی دیمەنەکانی ناو ئەم فیلمە، سووکایەتی کردن و شێواندنی تەرمی کوژراوانی مەیدانی جەنگ لە لایەن موجاهیدانی جوندولئیسلامەوە کارێکی ئاسایی و رێگەپێدراو بووەو بە پێی تەعلیمات و ئیجازەی قیادەو سەرکردایەتی ئەنجام دراوە نەوەك هەڵوێستێکی شەخسی و بەدەر لە بڕیاری حیزبی بوو بێ. لەم بارەیەوە چی ئەڵێیت؟**

یەکیەتی نیشتمانی پاش تەحویلگرتنەوەی تەرمی کوژراوەکان، هەوڵێکی چڕوپڕی تەبلیغی بە مەبەستی بەدناوکردنی جوندولئیسلام دەست پێکرد. ئەوان بە دەستکاری کردن و گۆڕینی وێنەی کوژراوەکان لە رێگای مۆنتاژی تایبەتەوەو بڵاوکردنەوەی ئەم وێنانە لە شاشە تەلەفزیۆنییەکانیانەوە هەروەها بە دروستکردنی سیدی و نەواری ڤیدیۆ بڵاوکردنەوەی بەناو خەڵکدا، ویستیان سیمای جوندولئیسلام و سەلەفییەکان ناشیرین بکەن. من یەکێك لەو کەسانە بووم کە دەربارەی ئەم رووداوە بەدواداچوونی زۆرم کرد و لەگەڵ زۆربەی ئەو موجاهیدانەش قسەم کرد کە بەشدارییان لە شەڕی خێڵی حەمەدا کردبوو. بەڵام جگە لەو سەربڕینەی کە باسم کرد، کەسی تر سەرنەبڕدرابوو و دڵنیای دڵنیاتان ئەکەمەوەو خوای گەورەش بە شاهێد ئەگرم کە ئەو سیدییەی باستان کردووە هیچ پێوەندییەکی بە جوندولئیسلامەوە نییەو ئەمە یەکەم جارە لە بارەیەوە شتێك ئەبیسم. ئەڵبەت لە رووی ئینسافەوە ئەتوانم بڵێم ئەو ناوەی بۆ ئەم سیدییە دیاری کراوە زۆر زیرەکانە دانراوەو پێوەندیی هەیە بە ئایەتێکی قورئانەوە کە خوای گەورە لە باسی کوشتنی کافرەکاندا لە ئایەتی ١٤ی سوورەتی تۆبەدا ئەفەرموێ: «خوای گەورە بەو کوشتنەیان سینەی هۆزی ئیماندار ڤێنك ئەکاتەوە».

جوندولئیسلام دوو سیدی تایبەت بە چالاکی جیهادیی موجاهیدینی خۆی بڵاو کردەوە بە ناوەکانی (نصرالمُبین)ی یەك و (نصرالمبین)ی دوو. لەم دوو سیدییەدا تەنیا چەند دیمەنێك لە کوژراوەکانی خێڵی حەمە پیشان ئەدرێ کە پاش شەڕەکەی خێڵی حەمە تەسویر کراوە. ئەوەندەی بەدواداچوونم کردووە، ئاگاداری ئەوەم کە موجاهیدینی جوندولئیسلام لە شەڕی خێڵی حەمەدا کامێرایان پێ نەبووەو هیچ تەسویرێکیان لەم شەڕە هەڵنەگرتۆتەوە. جا ئەگەر ئێمەش وەك حزبە کوردی و عیلمانییەکان بە درۆو دەلەسەو فرت و فێڵ سیاسەتمان بکردایە ئەوا ئیدیعامان ئەکرد هیچ کەسمان سەرنەبڕیوەو تەنانەت هەوڵمان ئەدا حاشا لەو تاقە سەربڕینەش بکەین. بەڵام با هەموو لایەك بزانن کاتێك من یاخود ئێمە ئەڵێین تەنیا کەسێك سەربڕدراوە بە بێ هیچ سڵکردنێك ئیعترافمان بە کار و کردەوەی خۆمان کردووەو بە دڵنیاییەوە ئەڵێم ئەگەر ژمارەی سەربڕاوەکان لەوەش زیاتر بووایە ئەوا دیسان بە بێ سڵکردن ئیعترافم پێ ئەکرد و بە هیچ شێوەیەك هەوڵی شاردنەوەیم نەئەدا.

بۆ باشتر دەرخستنی درۆو فێڵبازی جەلالییەکان پێم باشە باسی شتێك بکەم تاکوو لە لایەك زانیاری زۆرترم دابێتە خوێنەر و لە لایەکی تریشەوە سیمای راستەقینەی بانگەشەکەرانی ئازادی و دیموکراسیەتم زیاتر دەرخستبێت. حەفدە رۆژ پاش شەڕی خێڵی حەمە، لە زنجیرە چیای شنرویدا شەڕێکی تر رووی دا، شەڕەکە رێکەوتی ٢٠٠١/١٠/١٠ دەستی پێ کرد و پاشان هەموو زنجیرە چیای شنرویی گرتەوە. جوندولئیسلام کامێرای بردە ئەم شەڕەوەو راستەوخۆ تەسویری لێ هەڵئەگرتەوە. دوو کامێراوان ئەرکی تەسویرکردنی ئەم شەڕەیان لە سەر شان بوو کە یەکێکیان پاش شکستی جوندولئیسلام لە شەڕەکەدا، تووشی شڵەژان و کارەسات ئەبن و بە ناچار جیبێکی لەندکرۆزەری بەشی راگەیاندن بەجێ ئەهێڵن کە یەکێك لە کامێراکانیشی تیادا ئەبێ و پاشان ئەم کامێرایە ئەکەوێتە دەست هێزەکانی یەنەك. بۆیە ئەم رووداوە گلەیی زۆری هێنایە سەر کاك «ئەیوب ئەفغانی» بەرپرسی بەشی راگەیاندنی جوندولئیسلام. لەو

کاتانەدا بوو کە من دەربارەی ئەم مەوزووعە لەگەڵ کاک ئەیوب قسەم کرد بەڵام ئەو ئەیویست خەتاکە لە سەر خۆی نەبماڵێ و لەم بارەیەوە ئەیوت: (من بە نیسبەت ئەم هەڵەیەوە خۆم بە بەرپرس نازانم و تا کاتی بڵاوبوونەوەی تەسویرەکان لە کەناڵەکانی یەکییەتییەوە هیچ زانیارییەکم لەم بارەیەوە پێ نەدراوە. بۆیە کامێراوانەکەو سەرنشینانی لەندکرۆزەرەکە بەرپرسن لەم هەڵەیەو لە بەجێهێشتنی کامێراکە). ئینجا راگەیاندنی یەکیەتی نیشتمانی بە پشت بەستن بە تەسویرەکانی ناو ئەم کامێرایە کەوتنە هات و هاوار و پروپاگەندەیەکی زۆریان دژی «هیوا»ی هێزی لێدان کە ئەوان بە «هیوا کوێر» ناویان ئەبرد، دەست پێ کرد. ئەمەش بەو هۆیەوە بوو کە ئەو لە بەشێکی تەسویرەکاندا بە چەك و رەختەوە بە سەر مەیتی کوژراوەکانی خێڵی حەمەوە وەستاوە. بۆیە ئەم حاڵەتە ئەیتوانی بینەر فریو بداو وای تێبگەیەنێ کە ئەویش واتە هیواش دەستی بووە لە کوشتنی پێشمەرگەکانی یەکییەتیدا. بەشی راگەیاندنی یەنەك ئەمەی کردە گورزی دەستی خۆی و سیمای کەسێکی جینایەتکاریان لە هیوا دروست کرد و تەبلیغاتێکی زۆریان پێوە کرد. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە ئەو بە هیچ شێوەیەك بەشداری شەڕی خێڵی حەمەی نەکردبوو و تەنیا لە کاتی تەسویرکرانی مەیتەکاندا -دوای شەڕەکە- خەریکی سەیرکردنییان بووە. هەروەها کاتێك لە خۆیشیمان ئەپرسی ئەیوت: (یەکیەتی زۆر رقیان لە منەو خەریکن کای کۆنە بە با ئەکەن. من بەو کارەی ئەوان هیچ نیگەران نیم و ئەوەی کە بە فلان و فلان ناوم ئەبەن، بۆ من گرنگ نییە بەڵام نیگەرانی ئەوەم بە بێ ئەوەی بەشداریی ئەو شەڕەم کردبێ و کوشتنی چەند کەسێکیانم بەر کەوتبێ، ئاوا بە درۆ ناوم ئەبەن). لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێ کێ راستەو کێ ناڕاستە، بۆیە دووپات و چەندپاتی ئەکەمەوە لە شەڕی خێڵی حەمەدا تەنیا پێشمەرگەیەکی یەنەك سەربڕدراوەو ئیتر نازانم یەکیەتی چۆناوچۆن دەستی داوەتە شێواندنی جەستەی کوژراوەکانی خۆی؟

هۆکارێکی تر بۆ درۆنەکردنی من و کەسانی هاوبیری من ئەوەیە کە سەربڕینی مرۆڤی کافر و مورتەد بە شتێکی ئاسایی ئەزانین و ئەگەر جوندولئیسلام لە شەڕی خێڵی حەمەدا هەموو کوژراوانی یەکیەتیشی سەر بڕیایە ئەوا بە بێ سڵکردن باسمان ئەکرد. وەك ئاگادارن، ئیسلامییە جیهادییەکان لە عێراقی پاش سەدام حسەیندا دەستیان دایە سەربڕینی سەدان کەس و سیدی و ڤیدیۆیەکی زۆریان بڵاو کردەوە کە تیایاندا کەسانی کافر و مورتەد لە لایەن موجاهیدینەوە سەرئەبڕدران. ئەوان ئەم کارانەیان بە ناوی خۆیانەوە ئەنجام ئەداو بە ناوی خۆیشیانەوە بڵاویان ئەکردەوە. لە کاتی ئەو سەربڕینانەدا ئایەتی تایبەت بە سەربڕین و گەردن لێدان ئەخوێنرایەوەو پاشان لەگەڵ هاواری «الله و اکبر»دا وەکوو ئەو ئاژەڵانەی بە پێی شەرعی پیرۆزی ئیسلام تێغیان لەسەر حەڵاڵ کراوە سەربڕینەکان ئەنجام ئەدران. بۆیە لەم دەرفەتەدا کە خوای گەورە بۆی رەخساندووم، رائەگەیەنم کە ئەگەر سەلەفییە جیهادییەکان بە پشت بەستن بە قورئان و سوننەت و وەك ئەنجامدانی شێوازێکی جیهاد دەست ئەدەنە سەربڕینی دوژمنانی دینی خوا ئەوا خەڵکانی نا ئیسلامی و بە ناو مرۆڤدوستیش هەن کە ئامادەن لە پێناو بەرژەوەندی دونیایی خۆیاندا گوێ و لووتی کوژراوەکانی خۆیان ببڕن!!؟؟

مامۆستا کرێکاریش پاش ئەوەی بوو بە ئەمیری ئەنسارولئیسلام، دەربارەی سەربڕینەکەی خێڵی حەمە لە وتارێکدا ئاوای وت: (لە شەڕی خێڵی حەمەدا، پێشمەرگەیەکی یەکیەتی لە شوێنێکدا سەنگەری گرتبوو و خەریکی مەقاومە بوو و لەو کاتەدا مەجاهیدێکی جوندولئیسلام فرسەتی لێ ئەیەنێت و ئەیگرێت و سەری لە لاشەی جیا ئەکاتەوە). لەگەڵ رێزمدا بۆ مامۆستا کرێکار بەڵام شێوازی سەربڕینەکە جۆرێکی تر بووەو لەو شەڕەدا هێزەکانی یەکییەتی مەجالی دەستکردنەوەیان پێ نەدراوەو نەیانتوانیوە بەرگری لە خۆیان بکەن. وەك پێشتریش ئاماژەم پێ کرد ئەو کەسەی یەکەم سەربڕینی کوردستانی ئەنجام دا ناوی سەید حسەین و خەڵکی قادرکەرەم و لە دایکبووی ساڵی ١٩٦٩ی زایینی بوو. سەید حسەین یەکێك بوو لە ئەندامانی حەماس و پێش دامەزرانی جوندولئیسلام بەشداریی لە کوشتنی فرانسۆ حەریریدا کرد کە لە لایەن جەماعەت تەوحیدەوە ئەنجام درا. سەرەنجام ئەو لە شەڕی گوندی ناوگردانی ناوچەی

هەڵەبجەدا لەگەڵ هاوڕێیەکی بە ناوی شۆڕش (مقاتل) پاش ئەوەی بە شێوەی (إنغماس) چوونە ناو هێزەکانی یەکییەتییەوەو دەستێکی باشیان لێیان وەشاند، شەهید بوون.

**دەربارەی جوندولئیسلام ناچارین پرسیارەکەمان بە جۆرێکی تر دووپات بکەینەوە، جوندولئیسلام هەڵگری چ بەرنامەو مەنهەجێکی سیاسی بوو و ڕێک ئەیەویست چی بکات. درێژەدانی ئەم باسە بە بێ روونکردنەوەی ڕێک و دروستی ئامانجی دوارۆژی جوند نامومکینە، کەوایە با روونتر لەو مەسەلەیە بکۆڵینەوە. هەروەها لە رووی فۆرم و شێوازی ڕێکخراوەییشەوە هەرچەند تا رادەیەك باست لێ کردووە بەڵام با لەو رووەشەوە کەمێك زیاتر بۆمان روون بێتەوە کە جوندولئیسلام چۆن ڕێکخراوێك بوو و چۆن پۆلێنبەندییەکی ڕێکخستنی و تەنزیماتیی بۆ کراوە؟**

وەك لە بەشەکانی پێشوودا ئاماژەم پێ کرد جوندولئیسلام ئاوێنەی باڵانوێنی فیکرەی سەلەفییەتی جیهادی بوو لە کوردستان. یەکەم سیدی کە لە لایەن ئەم ڕێکخراوەوە درایە دەرەوە جگە لە پەیامی دامەزراندنی جوندولئیسلام، تا رادەیەك باسی مەنهەج و بەرنامەی ڕێکخراوەکەیشی تیادا کرابوو. لەم سیدییەدا بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا بانگەشەی دامەزرانی ئیمارەتێکی ئیسلامی کرابوو و جیهادی لە پێناودا راگەیەندرابوو. ئەمەش لەوەوە سەرچاوەی ئەگرت کە ئەم ڕێکخراوە ئیدیعای ئەکرد پراوپڕ هەوڵی جێبەجێکردنی دەقەکان ئەدات. هەر لەو سیدییەدا باسی ئەوەش کرابوو کە گەیشتن بەو بەرنامەو ئامانجانە ئاسان نابێت و بێ گومان کۆسپ و تەگەری زۆری دێتە سەر ڕێ. بۆیە پێویستە هەر لە سەرەتاوە چاوەڕوانی پێشهاتەکان بین و بە بێ سڵکردن لە هەڕەشەی دوژمنانی دینی خوا، بە ڕۆحی فیداکاری و خۆبەخشییەوە بەگژ ئەم هەڕەشانەدا بچینەوە. هەروەها لەو سیدییەدا ئاماژە بە دژوارترین جۆری جیهاد کرابوو کە مەبەست لێی هەمان شەڕی مورتەد و هەڵگەڕاوەکان بوو بۆ بەڕێوەبردنی حوکمی شەرع لە سەریان و زەمینە سازکردن بوو بۆ گێڕانەوەی سەروەری بۆ وڵاتی موسوڵمانان و هێنانەوەی خەلیفە واتە ئیمام یان ئەمیرلمونمنین بۆسەر کورسی دەسەڵات.

لە سیدییەکەدا ئاماژە بە فەرموودەیەکی پێغەمبەری ئیسلام (سڵاو و دروودی خوای لێ بێ) کراوە کە ئەفەرموێ: «لە دوایین سەردەمی ژیاندا (ئاخر زەمان) فیتنەو ئاشووب فراوان ئەبێ و بێ دینی پەرە ئەسێنێ و خەڵك پشت لە دینی خوا ئەکەن. لە ئاوەها کاتێکدایە دەستەیەك لە ئوممەتی من دێنە مەیدان کە لە سەر ڕێڕەوی حەق و دینداری ماون و ئاڵوگۆڕەکان کاریان تێناکات و ئامادە نین دەستبەرداری دینی خوا بن و لە پێناویدا ئەجەنگن». تەنانەت بە «جوند»یش ناویان ئەبات و ئەفەرموێ: «دەستەیەکی ئەم جوندانە لە شامەوە، دەستەیەك لە یەمەنەوەو دەستەیەکیش لە عێراقەوە سەر هەڵئەدەن.» جوندولئیسلام دڵخۆش بوون بەوەی کە لە سەردەمی زۆربوونی فیتنەو فەساددا کە لە سایەی دەسەڵاتی عیلمانییەتدا رۆژ بە رۆژ ئەم دیاردەیە لە کوردستاندا زیاتر پەرە ئەسێنێ، ئەمان یەکێك لەو دەستانە بن کە پێغەمبەری ئیسلام (دروودی خوای لێ بێ) لە فەرموودەکەیدا باسیان ئەکات و لە بارەیانەوە ئەفەرموێ: «ئەوان کار بۆ نەهێشتنی ئەم دیاردانەو چەسپاندنی حوکمی (الله) ئەکەن».

ساڵی ۲۰۰۱ ماوەیەك پێش بە فەرمی راگەیەنرانی جوندولئیسلام، لەگەڵ چەند برایەکدا، لە بیارە چاومان بە مامۆستا هەڵگورد هەولێری، شێخ ئەبوو وائیل و ئەبوو عەبدولرەحمانی شامی ئەندامانی قیادەی ئەم ڕێکخراوە کەوت. چەند کاتژمێرێك پێکەوە قسەمان کرد و دەرفەتێکی باش بوو بۆ ئەوەی بە تێروتەسەل پرسیار بکەین و وەڵام بگرینەوە. سەبارەت بە زۆر شت پرسیارمان لێ کردن و بێ پێچ و پەنا وەڵاممان درایەوە، لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا کە بۆچی عەرەبەکان کوردستانیان هەڵبژاردووە تاکوو جیهادی تیا بکەن، ئەبوو عەبدولرەحمان ئاوا وەڵامی دایەوە: «کوردستان بە

پلەی یەکەم بەشێکی وڵاتی گەورەی موسوڵمانانەو بە پلەی دووهەمیش ڕەوتێکی سەر ڕاست و خۆبەخشی سەلەفی جیهادی لەم وڵاتەدا سەری هەڵداوە کە پێویستیان بە یارمەتی ئێمەیە. بە پلەی سێهەمیش کوردستان لە زۆر لایەنەوە لە وڵاتی فەڵەستین ئەچێ کە لە لایەن یەهوودییەکانەوە داگیر کراوە». ئەبوو عەبدولرەحمان کە خۆی خەڵکی فەڵەستین بوو، لەو باوەڕەدا بوو سەرکەوتنی سەلەفییەتی جیهادی لە کوردستان هەنگاوێکە بۆ نزیکبوونەوە لە ڕزگاری وڵاتی فەڵەستین و یەک لە هۆکارەکانی بەشداریکردنی خۆیشیان لە جیهادی کوردستاندا بەم مەسەلەیەوە گرێ ئەدا. بە ڕای من یەکێک لە ئامانجە سەرەکییەکانی جوندولئیسلام بە تایبەت عەرەبەکانی ناو ئەم ڕێکخراوە ئەوە بوو کە لە ڕێی ڕزگارکردنی کوردستانەوە وردەوردە لە ڕزگارکردنی قودسی پیرۆز و خاکی داگیرکراوی فەڵەستین نزیک ببنەوەو بکەونە ململانێی ئیسرائیلییەکان.

لە باری فۆرم و شێوازی ڕێکخراوەییەوە، جوندولئیسلام بە ئاستێکی زۆر تەقلیدی لە ڕێکخراوە سەلەفی جیهادییەکانی تر کردبوو. ئەمیری گشتی، قیادە واتە سەرکردایەتی و هەیئەی شەرعی بەرزترین ناوەندەکانی بڕیاردانی ناو ئەم ڕێکخراوە بوون و گەلێ دامودەزگای تریش هەبوون کە بەرپرسیار بوون لە ڕاپەڕاندنی کارەکاندا. دەزگاکانی ڕاگەیاندن، کۆمەڵایەتی، ئاسایش، بەیتولماڵ (بەشی ماڵی و دارایی)، تەنسیق و پێوەندییەکان، دەزگای ڕێکخستن کە سەر بە ئاسایش بوو، دەزگای بێسیم و بیتەلەکان، دەزگای ئەندازیاریی سەربازی (الهندسە العسکریە)، دەزگای خەستەخانە، دەزگای تەداروکات و دەزگای پەروەردەو فێرگەو خولە سەربازییەکان بەشێک بوون لەو نێدارەو دەزگایانە. هەروەها لە سەردەمی ئەنساریشدا دەزگای شارەوانی و ڕێگەوبان و پەیمانگای شەرعی بۆ بەشی هەیئەی شەرعی زیاد کرا.

لە سەردەمی جوندولئیسلامدا وریا ڕەش هەولێری ناسراو بە ئەبوو عەبدوڵڵای شافیعی ئەمیری گشتی ڕێکخراوەکەو عومەر بازیانی، کاک ئەبووبەکر (ئەمیری پێشووی تەوحید)، ئەبوو عەبدولرەحمانی شامی و ئەبوو وائیل ئەندامانی قیادەی ڕێکخراوەکە بوون و ئەندامانی تری قیادە هەموویان ئەندامای پێشووی هێزی ٢ی سۆران (جماعة المرکز) بوون. جگە لەو کەسانەی کە ناوم هێنان، مامۆستا کرێکار، ئەبوو عەبدوڵڵای شافیعی، ئەیوب ئەفغانی (بەرپرسی ڕاگەیاندنی جوند و ئاسایشی ئەنسار)، موحەممەد ئەمین خەلیفانی بەرپرسی دەزگای کۆمەڵایەتی، کاک موحەممەد حەسەن و حاجی عەبدولحەمیدی هەولێری بەشێکی تر بوون لە ئەندامانی بەرجەستەی جوند و ئەنسارولئیسلام. حاجی عەبدولحەمید کە خۆی نیشتەجێی شاری بەغدا بوو، نوێنەری ئەمیری جوند و ئەنسار بوو لەم شارەو سەرپەرشتی لقی ناوەوەی عێراقی دەکرد. چەند کەسێکی کورد و عەرەب و تورکی کەرکوک و هەولێر و تەلعەفەریش لە ئەنجامدانی کارەکاندا یارمەتی ئەویان ئەدا. هەروەها مامۆستا ئاسۆ هەولێری بەرپرسی گشتی بەشی عەسکەری و مامۆستا عەلی وەلی (هەولێری) ناسراو بە «ئەبوو دەرداء» بەرپرسی فێرگەی سەربازی و پەروەردەی عەسکەری، دوو کەس لە بەرجەستە ترین بەرپرسە عەسکەرییەکانی ئەم دوو ڕێکخراوە بوون.

کەتیبە سەربازییەکانی جوندولئیسلام بریتی بوون لە: ١-«کەتیبەی فەتح»، ئەم کەتیبەیە بە زۆری لە ئەندامانی پێشووی حەماس و تەوحید پێکهاتبوو، ئەمیر یان ئامر کەتیبەی فەتح «حەسەین سەلیم» ناسراو بە هێمن بانیشاری بوو، کاک هێمن لە دایکبووی ١٩٦٩زایینی گوندی بانیشاری ناوچەی شارەزوور بوو، ئەو ساڵی ٢٠٠٤ لە شەڕی فەلووجەدا شەهید بوو. هەروەها ماوەیەکیش کاک تەییار ناسراو بە ئەبوو بەسیری دووهەم، ئەندامی پێشووی تەوحید و لە دایکبووی١٩٧٥زایینی کە خەڵکی شاری هەولێر بوو، جێگری ئامر کەتیبەی فەتح بوو کە ئەویش لە شەڕی شنرۆیدا شەهید بوو. ٢-«کەتیبەی بەدر»، مامۆستا عەبدوڵڵا خەلیفانی ئامر کەتیبەی بەدر بوو، ئەو کە خەڵکی خەلیفان و لە دایکبووی ساڵی١٩٦٥ ی زایینی بوو، لە شەڕی تەپەکوڕەو گردە درۆزنەدا لەگەڵ ئەبوو عەبدوڵڵای مالکیدا پێکەوە شەهید بوون. بەشی زۆری ئەندامان و موجاهیدینی کەتیبەی بەدر خەڵکی خەلیفان بوون. جێگری ئەمیری ئەم کەتیبەیە «کاک زۆزک» بوو کە ئەویش خەڵکی خەلیفان بوو و ئێستا لێی بێ خەبەرم. ٣-«کەتیبەی الاقصة »، ئەم کەتیبەیە لە

لایـەن «ئـەبوو تەڵحـەی عێراقی»یـەوە سەرپەرشـتی دەکـراو ئـەبوو عەبـدولڕەحمانی فەڵەسـتینی هەرچـەند ئەنـدامی سەرکردایەتی بوو بەڵام ئەویش بەشێکی بەرچاو لە کاروباری ئەم کەتیبەیەی ڕائەپەڕاند. کەتیبـەی ئەقسا پێکهاتبوو لە موجاهیدینی عـەرەب. ئەبوو تەڵحەی ئامر کەتیبە کە وابزانم خەڵکی مووسڵ بوو، نوێنەرایـەتی عەرەبە عێراقییـەکانی ئەکرد و عەرەبەکانی تریش بە زۆری پێوەندییان بە ئەبوو عەبدولڕەحمانی فەڵەستینی (شـامی) و براکـەی و زاواکەیەوە بوو. هەروەها بەشێکی تر لە موجاهیدەکانی کەتیبـەی الاقصـﮥ کوردەکانی کوردستانی ئێران بوون. مەعەسـکەر «سید سلام» تەرخان کرابوو بۆ مانـەوەو جێگیربوونی کوردەکانی کوردستانی ئێران. ٤-«کەتیبـەی سـەلاحەدین»، «مامۆسـتا موحەممەد ڕەشید» ئەمیری ئەم کەتیبەیە بوو. ئەگەر هەڵەم نەکردبێ ئەو لە دایکبووی کۆتایی پـەنجاکان یان سـەرەتای شەسـتەکان بـوو. پـاش هـاتنی ئەمـەریکا بـۆ عێـراق و دەسـتبەکاربوونەوەی ئەنساروئیسـلام، لـە کاتێکـدا مامۆسـتا موحەممەد ڕەشید لە ناوچەی مووسڵ خەریکی چالاکی بوو، لە لایەن بە ناو موجاهیدێکەوە کە وابزانم ناوی عابید بوو و دەوتـرا کەسێکی سـەر بـە پـارتی دیمـوکرات واتـە حزبەکـەی مەسـعوود بـارزانی بـووە، تـیرۆر کـرا. جێگـری کەتیبـەی سـەلاحەدین لـە سـەردەمی ئیمـارەتی بیـارەدا، کـاك «سـوهەیبە ڕەش» بـوو کـە بـەهاری ٢٠٠٣ لـە ڕۆژی دووهـەمی هێرشەکانی ئەمریکادا بۆ سەر بنکەو بارەگاکانی ئەنساروئیسلام، لەگەڵ شەش موجاهیدی تردا پێکەوە شەهید بـوون. ٥-«کەتیبەی نصر»، کاك «سەلمان هەولێری» کە سەرکردەو فەرماندەی شەڕەکەی خێڵی حەمە بـوو و لـە شـەڕی تـاوێرە لە ناوچەی هاوارییەکان شەهید بوو، ئامر کەتیبەی نەسر بوو.

هەروەها سەلەفییەکانی ناوچەی کفری پاش ئەوەی بە ئەمیرایـەتی هیوای هێزی لێدان ئـەو هیوایـەی کـە یەکیـەتی بـە (هیوا کوێر) ناوی ئەبرد، تێکەڵ بە جوندولئیسلام بوون، لە ناو کەتیبەی بەدردا ئۆقرەیان گرت و دواتر لـە سـەردەمی ئەنساروئیسلامدا بەشدارییان لە دروستکردنی کەتیبەی موهاجیریندا کرد.

کەوایە هەرچەند جوندولئیسلام لە بانگەشەو ڕاگەیاندنەکانیدا بە فەرمی و ئاشکرا شەڕی لە دژی حکوومـەت و حیزبە کوردییەکان ڕانەگەیاند بەڵام بەرنامەو مەنهەجی ئەم گروپە سەلەفی جیهادییە ئەوەمان بۆ ئاشکرا ئەکات کە هەموو هێزە کوردییـەکانیان بـە «مورتـەد» و دەسـەڵاتی کوردیشیان بـە «تـاغووت» دەزانـی و هـەر لـە بنـەماوە دژایـەتیکردنی ئـەم دەسەڵاتەیان بە ئەرکی شەرعی خۆیان لە قەڵەم ئەدا. تا لێرەوە ئەوان هەوڵی دامەزراندنی خیلافەتێکی ئیسلامییان لـە کوردستاندا ئەدا. ئایا بە پێی واقیعەکانی کۆمەڵگای کوردستان سەرکردە سەلەفییەکان دەیانەویست بە زەبری جیهاد ئیمارەتی ئیسلامی دابمەزرێنن یاخود جۆری خوێندنەوەو تێگەیشتنیان بۆ کۆمـەڵگای کوردسـتان، ئـەو ئومێـدەی پـێ بەخشیبوون کە دەتوانن لەم وڵاتەدا ئاوا دەسەڵاتێك ڕۆبنێن؟ جیا لەمە ئایا ئەو ئیمارەتە بچووك و بەرتەسـکەی لـە ناوچەی بیارە دایانمەزراند توانیبووی ئەزموونێکی سەرکەوتوو بێ و جێگەی خۆی لە دڵی خەڵکی ناوچەکەدا بکاتەوە؟

سەرەتا با ئەوەتان بۆ ڕاست بکەمەوە کە وشەی «خیلافەت» بۆ دەسەڵاتی بچووکی ئیسلامی بەکار نابرێ تەنانەت ئەگەر جوگرافیای دەسەڵاتەکە وڵاتێکی وەکوو عێراق یان ئەفغانستانیش بێت. وەك لە کۆتایی پرسیارەکەدا ئاماژەتان پێداوە، بەم جۆرە دەسەڵاتانە واتە دەسەڵاتی بچووکی ئیسلامی ئەوترێ «ئیمارەت»ی ئیسلامی. ئیمارەتی ئیسلامی ئەفغانستان و ئیمارەتی ئیسلامی بیارە نموونەی ئەم جۆرە دەسەڵاتانەن. ئەتوانین بڵێین دامەزرانی ئیمارەت و دەسـەڵاتێکی بچووکی ئیسلامی زەمینەسازکەرە بۆ دامەزراندنی خیلافەتی ئیسلامی و دابەزاندنی شەریەتی ئیسلام لە جوگرافیایەکی پان و بەرینتردا.

سەلەفییە جیهادییەکانی کوردستانی عێراق لە هەوڵی دامەزراندنی ئیمارەتێکی ئیسلامیدا بوون کە بتوانن لە سەر پێی خۆی بوەستێ و لە ڕێگای جیهادکردنەوە پارێزگاری لە کیانی خۆی بکات. بەرهەمی تواناو مەجالی ئەوان دامەزراندنی دەسەڵاتێکی بچووکی وەك ئیمارەتی بیارە بوو و پاشان بەرگریکردن بوو لەو ئیمارەتە. بێگومان ئەگەر تواناو مەجالی زیاتریان بووایە ئەوا ئیمارەتی ئیسلامییان لە هەر هەمووی کوردستانی عێراقدا دائەمەزراند. ئەڵبەت هەروەك پێشتر ئاماژەم پێدا ڕێکخراوێکی وەك جوندولئیسلام بە پێی ئەو مەنهەج و بیروباوەڕەی لە سەری دامەزرابوو هەوڵی دابەزاندنی شەریعەتی ئیسلامی لە ناوچەیەکی بەرفراوانتردا ئەداو تەنانەت هەندێ لە قیادەی ئەم ڕێکخراوە لە سایەی ئیمارەتی بیارەوە نەخشەی ڕزگارکردنی «قودس»یان ئەکێشا. لە لایەکی تریشەوە حزبە کوردییەکان کە شانازییان بە دامەزراندنی دەسەڵاتێکی عیلمانییەوە ئەکرد، بە هیچ شێوەیەك ئامادە نەبوون مەیدان بۆ لایەنگرانی سەلەفییەتی جیهادی لە کوردستاندا ئاوەڵا بکەن، بە پێچەوانەوە ئەوان هەر لە سەرەتای دەرکەوتنی سەلەفییەکانەوە دژایەتییەکی توندی ئەوانیان ئەکرد و هەر لە سەرەتاوە هەوڵی لەباربردنی ئەو ئەزموونەیان ئەدا بەڵام نەیانتوانی بە سەریدا زاڵ بن. سەرەنجام بە هۆی زلهێزێکی وەکوو ئەمەریکاوە توانییان بە سەر ئیمارەتی بیارەدا زاڵ بن.

هەم دەسەڵاتی کوردی و هەمیش سەلەفییە جیهادییەکان ئامادە نەبوون تەحەموڵی یەکتر بکەن بە تایبەت سەلەفییەکان لە ڕووی مەنهەجییەوە نەیانئەتوانی ئەم کارە بکەن بۆیە پێشبینی ئەوەیان ئەکرد زوو بە زوو لەگەڵ عیلمانییەکاندا بە شەڕ بێن. لە لایەك پارتی و یەکیەتی سەلەفییەتی جیهادییان بە مەترسی بۆ سەر خۆیان ئەزانی و لە لایەکی تریشەوە سەلەفییە جیهادییەکان ئەوانیان بە مورتەد و دەسەڵاتەکەیانیان بە تاغووت لە قەڵەم ئەدا. بۆیە ڕوودانی شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوەی عەسکەری لە نێوان ئەواندا ئاسایی و چاوەڕوان کراو بوو. ئەوەندە حزبە کوردییەکان ڕێگرتن لە سەلەفییەکان و شەڕکردنی ئەوانیان بە ئەرکی نیشتمانی خۆیان ئەزانی، ئەم شەڕە بۆ سەلەفییە جیهادییەکانیش سەد ئەوەندە شەرعی بوو و بە جیهادی ڕاستەقینەیان دەزانی. بە نیسبەت کۆمەڵگای کوردستانیشەوە، بێگومان سەلەفییەکان هەلومەرج و تایبەتمەندییەکانی ئەم کۆمەڵگایەیان هەڵسەنگاندبوو. هەرچەند کوردستان بەشێکە لە بیلادی ئیسلامی و خەڵکی کورد خەڵکێکی موسوڵمانە بەڵام سەلەفییەکان لەو باوەڕەدا نەبوون خەڵکی کوردستان هەر لە سەرەتاوە باوەشیان بۆ بکەنەوەو پشتیوانی تەواویان لێوە بکەن. لە کۆمەڵگای مەککەی قوڕەیشەوە تاکوو ئێستای کۆمەڵگای کوردەواری، هیچ کۆمەڵگایەك یەکسەر و ڕاستەوخۆ دەسەلاتی ئیسلامی قبووڵ نەکردووە ئیلا بە بێ هەوڵ و ماندووبوون و جیهاد و خوێنڕژان نەبێ. بێگومان ئەوانەی لە سەرکردایەتی جوند و ئەنسارولئیسلامدا بوون، ئەوەندە نا واقیعی و کورتبین نەبوون کە بە هەندێ شتی ڕواڵەتی دڵ خۆش بکەن، بەراوردی ئەوان نەك بەراوردێکی خۆشبینانە نەبوو بەڵکوو لەو باوەڕەدا بوون لە کۆمەڵگایەکی وەك کۆمەڵگای کوردستاندا ئەگەری ڕووبەڕووبوونەوەی زۆر جیدی لە بەرانبەر ئەوان و بیروباوەڕەکەیاندا هەیە.

لە وەڵامی ئەوبەشەی پرسیارەکەتاندا کە پرسیوتانە ئیمارەتی بیارە تا چەند ئەزموونێکی سەرکەوتوو بوو و توانیبووی جێگای خۆی لە دڵی خەڵکی ناوچەکەدا بکاتەوە، ئەتوانم بڵێم لەم بارەیەوە سەرکەوتنەکە لە ئاستی ئایدیالی ئێمەدا نەبوو بەڵام بە وردبوونەوە لەو هەلومەرجەی کە ئەم ئیمارەتەی تیادا لە دایك بوو هەروەها بە سەرنجدانی ئەو هەموو گیروگرفتەی لە سەرەتاوە تا کۆتایی بەرۆکی ئەم ئیمارەتەی گرتبوو، ئەتوانین سەردەمی کورت و کەمخایەنی ئیمارەتی بیارە بە قۆناغێکی زێڕینی دەسەڵاتداریی ئیسلامی لە دونیای هاوچەرخدا دابنێین. من وەکوو شەخسی خۆم ئەم ئەزموونە بە سەرکەوتووتر لە ئیمارەتی تاڵەبان لە ئەفغانستان ئەزانم و لەو باوەڕەدام لە زۆر بوارەوە ئیمارەتی بەرتەسك و بچووکی بیارە پێشکەوتووتر و ئیسلامی تر لە ئیمارەتەکەی تاڵەبان بوو. بە نیسبەت ئەوەیشەوە کە ئەم ئیمارەتە تا چەند لە دڵی خەڵکی ناوچەکەدا جێگای خۆی کردبووەوە، پێویستە پرسیار لە خودی ئەو خەڵکە بکرێت. ئەڵبەت وەڵامی من لەو بارەیەوە ئەخێرە، بەڵام نەك بەو مانایە هەموو خەتاکە بخەمە سەر شانی جوند یان ئەنسارولئیسلام. بە

داخەوە خەڵکی ناوچەکە بە هۆی سیاسەتە چەوتەکانی پارتی و یەکیەتییەوە تووشی لە خۆنامۆیی هاتبوون و زۆربەیان بە بای رۆژئاوا سەمایان ئەکرد و زۆر پابەندی دەستوورات و فەرزیاتی ئایینی پیرۆزی ئیسلام نەبوون. جا هەرچەند ئەم خەڵکە لە سەردەمی ئیمارەتی بیارەدا تا رادەیەك پێرەوییان لە یاساکانی ئیسلامەوە ئەکرد و ملکەچی بڕیاراتی ئیمارەت بوون بەڵام ئەم هەڵسووکەوتەی ئەوان زیاتر لە رووی ناچارییەوە بوو تا لە رووی سۆز و عەلاقەوە. بە رای من کەمتەمەنی ئیمارەتی بیارەو خەریکبوونی موجاهیدین بە شەڕ و جیهادەوە، لە هۆکارەکانی مانەوەو بەردەوامبوونی ئەم حاڵەتە بوو، بێگومان ئەگەر ئەم ئیمارەتە تەمەنێکی درێژتری بووایە ئەیتوانی هەستی دین خۆشەویستی وخواپەرستی خەڵکی ناوچەکە بەهێزتر بکات. ئەڵبەت هەڵەکارییەکانی هەندێك لە ئەندامانی جوند و ئەنسارولئیسلام بێ تەئسیر نەبوون لە زیادبوونی کەلێنی نێوان ئەوان و خەڵکی ناوچەکەداو ئەمە متمانەی نێوان ئەوانی کەمڕەنگتر کردبوووەوە.

**لە وەڵامەکانی پێشوو و لە باسی پێکهاتەی جوندولئیسلامدا باسی ئەوەت کردبوو کە ئەم رێکخراوەیە لە چەندین بەش و کەتیبەی جیاجیا پێك هاتبوو. لە ناویاندا «کەتیبەی فەتح» و ئەندامەکانی هەندێ لە کەتیبەکانی تر جیاوازتر بوون و هەڵگری کۆمەڵە تایبەتمەندییەکی جیاواز بوون، بۆیە ناوبانگێکی زیاتریشیان دەرکردبوو. کەمێك باسی ئەو خەسڵەت و رەهەندە جیاوازانەی کەتیبەی فەتحمان بۆ بکە.**
**جیا لەمە ئەگەرچی کەمەکێك باسی «هەیئەی شەرعی» جوندولئیسلامت کردبوو بەڵام زانیاری ورد و تەواوت لە بارەی ئەو بەشەوە نەخستبووە بەردەست. سنووری بڕیار و دەسەڵاتی ئەم هەیئەیە تاکوێ بوو و بە گشتی بەرپرسیار و دەسەڵاتداری کامە لایەن و بڕیاری ناو جوند و خاوەن چ پێگەو جێگەیەك بوو؟**

بەڵێ وایە هەروەك ئێوە وتووتانە کەتیبەی فەتح و ئەندامەکانی هەڵگری کۆمەڵە تایبەتمەندییەکی جیاواز بوون و ئەمەش ئەوانی لە کەتیبەکانی تر جیا ئەکردەوە. من خۆم خاڵی سەرەکی ئەم جیاوازییە بەوە ئەزانم کە ئەندامانی کەتیبەی فەتح خوای گەورە ئەو تواناییەی پێبەخشیبوون کە سەرباری کەمبوونی تەمەنیان، دوو رێکخراوی سەلەفی جیهادی دابمەزرێنن. ئەوان لە سەردەمی پێش جوندولئیسلامدا ئەوپەڕی ئازایەتی و فیداکارییان لە خۆیان نیشان داو هەر ئەمەش بوو کە زەمینەی بۆ دروستبوونی رێکخراوێکی جیدی سەلەفی جیهادی فەراهەم کرد، لە راستیدا ناوبانگ و ناو دەرکردنی ئەوان ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمە. دواتریش کە جوندولئیسلام دروست بوو ئەوان هەروا لە دەوری یەك مانەوەو لە ناو کەتیبەی فەتحدا ئۆقرەیان گرت و تایبەتمەندییە پێشووەکانی خۆیان پاراست. ئەوان دژوارترین قۆناغی کاری رێکخراوەیی و جیهادیان لە کوردستاندا تەجرەبە کرد، ئەو قۆناغەی کە پڕ بوو لە هەوراز و نشێو، ناسۆر و زەحمەت، ئاوارەیی و دەربەدەری، زیندان و ئەشکەنجە. ئەو قۆناغەی کە لە سەرەتادا کەم کەس ئامادە بوو ئیعتراف بە رەوابوونی بکات، تەنانەت زۆر بوون ئەو ئیسلامییانەی ئامادە نەبوون گوێ بۆ قسەی ئەو گەنجە سەلەفیانە بگرن چونکوو ئەوانیان بە شێت و بێ ئەقڵ یان بە چەواشەو فیتنە ئەزانی. بەڵام ئەوان هەموو ئەم شتانەیان بە گیانی خۆیان کڕی و لەم پێناوەدا باشترین براو هاوبیرەکانیان لە دەستدا. بەرهەمی ئەو هەموو ماندووبوون و کۆڵنەدانە دروستبوونی جماعە التوحید، جندالاسلام و الانصارالاسلام بوو؛ کەتیبەی فەتحیش کە ئەو سەلەفییە خوێن گەرم و خۆنەویستانەی لەخۆ گرتبوو، بازووی بە هێزی جوند و ئەنسارولئیسلام بوو لە ئەنجامدانی هەموو ئەرك و کارەکانیدا بە تایبەت جیهاد کاری عەسکەری.

ئاسایی بوو ئەم گەنجانە هەندێ کەموکوڕیشیان هەبێت، هەندێ جار ئەندامە سادەو کەم ئەزموونەکانی کەتیبەی فەتح فەخریان بەو ناوبانگەوە ئەکرد و رابردوو و ئازایەتی خۆیان بە رووی ئەندامانی کەتیبەکانی تردا ئەدایەوەو ئەمەش هۆکاری دروستبوونی گرفت و کێشە بوو لە ناو رێکخراوەکەداو دەبوایە زۆرجاریش ئەم گرفتانە لە لایەن قیادەو سەرکردایەتییەوە چارەسەر بکرایەت. زاڵبوونی ئەم رۆحییەتە جۆرێك بەدگومانی لە هزر و دەروونی ئەندامانی کەتیبەی فەتحدا بە نیسبەت ئەندامانی تری جوند و ئەنصارولئیسلامەوە دروست کردبوو، بۆ نموونە کاتێك پاش سەرکەوتنی جوندولئیسلام لە شەڕی تاوێرەو ناوچەی هاورلرییەکاندا کۆمەڵی ئیسلامی بۆ جارێکی تر بە مەبەستی تاووتوێکردنی مەسەلەی یەکگرتن، داوای دانیشتنی لە قیادەی جوندولئیسلام کرد، ئەندامانی کەتیبەی فەتح دژی هەرجۆرە دانیشتن و وتووێژێك بوون چونکوو ئەترسان جوندولئیسلام تووشی چەواشەبوون و بەلاڕێداچوون بێت. ئەوان باوەڕ و متمانەی تەواویان بە قیادەی رێکخراوەکە نەبوو و لەو باوەڕەدا بوون لانیکەم بەشێك لە ئەندامانی قیادەی جوندولئیسلام بە ئاستی پێویست پابەندی فیکرەی سەلەفییەتی جیهادی و بەرنامەکانی رێکخراوەکە نین. بۆیە قیادەش ناچار بوو کات و وزەیەکی زۆر سەرف ئەمێشتنی بڕ و بیانووەکانی ئەوان بکات و پێش بە خۆ جیاکردنەوەو دابڕانیان بگرێت. لەو کات و ساتە ناسکەدا کە ژمارەیەکی زۆر لە سەلەفییە جیهادییەکانی ولآتانی تر بە مەبەستی جیهادکردن هاتبوونە کوردستان و ژمارەیەکی زۆری شێخ و موفتی و موجاهیدیش کەوتبوونە پشتیوانیکردنی سەلەفییەکانی کوردستان و خەریکی پێوەندییکردن بوون لەگەڵ ئەوان، هەر جۆرە کوتلەبازی و جیابوونەوەیەکی ناو جوندولئیسلام کاریگەرییەکی خراپی لە سەر ئەوان دائەنا. بۆیە قیادەی جوندولئیسلام بە هەستکردن بەم شتە ئەیەویست پێش بە هەر جۆرە کوتلەبازی و جیابوونەوەیەك بگرێ.

ئەم حاڵەتە تا کاتی هێرش کرانە سەر بنکەو بارەگاکانی ئەنصارولئیسلام بەردەوام بوو و لەو ماوەیەدا خەریك بوو چەند جارێك جیابوونەوە روو بدات بەڵام هەر جارەو بە هۆکارێك پێشی پێ ئەگیرا. تەنانەت جارێك مقۆمقۆکان گەیشتە ئاستێك کە دڵی خەڵکی نەیار و دوژمنانیشی پێ خۆش بوو، یەکیەتی نیشتمانی لە رێگای دامودەزگاکانی راگەیاندنەوە باسی ئەوەی کرد گۆیا چل کەسێك لە ئەندامانی ئەنصارولئیسلام بە سەرکردایەتی عومەر بازیانی لەم رێکخراوە جیابوونەتەوەو لە ناوچە شاخاوییەکانی هەورامان جێگیر بوون. ئەم هەواڵە بە تەواوی درۆ بوو بەڵام بڵاوبوونەوەکەی پێوەندیی بە ئاڵۆزی و ناکۆکییەکانی ناو ئەنصارەوە بوو، یەکییەتی ئەیزانی عومەر بازیانی یەکێکە لە کەسە ناڕازییە ناسراوەکان بۆیە هەواڵی ئاوای لە بارەوە بڵاو ئەکردەوە.

بە گشتی هۆکاری ئەم خۆ بە چاکتر زانینە ئەوە بوو کە فەتحییەکان لە رووی شەرعی و زانستییەوە خۆیان بە ئاگاتر و لە لایەکی تریشەوە خۆیان بە خاوەنی (رایەو غایە) واتە ئاڵاو مەبەست ئەزانی. یەکەم جار ئاڵای رەش لە لایەن جەماعەت تەوحیدەوەو پاشان لە لایەن جوندولئیسلامەوە هەڵکرا. لە بەرانبەر ئەم خۆ بەچاکترزانینەی کۆنە حەماس و تەوحیدەکاندا، جەماعەت مەرکەزیش زۆر شتیان هەبوو کە شانازی پێوە بکەن. ئەوان بە پلەی یەکەم لە باری رێژەو نفووزەوە ژمارەیان زیاتر بوو و بەشێکی زۆری بەرپرسایەتییەکانیان بە دەستەوە بوو و خاوەن چەندین کەتیبەی سەربازییش بووون. هەروەها بەشی زۆری ئەو ناوچانەی کە دواتر ئیمارەتی بیارەیان تیادا دامەزرا، لە کۆنەوە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی جەماعەت مەرکەز بوون و ئەوان لە کاتی جیابوونەوەیان لە بزووتنەوەی یەکبوونیش، بڕێکی زۆر ئۆتۆمبیل و چەك و تەقەمەنییان بەر کەوتبوو کە تەنسیرێکی زۆری لە دەوڵەمەنبوونەوەی جوندولئیسلامدا بوو. جگە لەوەش ئەوان خاوەن زۆر تایبەتمەندیی و پێشینەی باش و بەرجەستەی تر بوون و لە رووی شەرعییشەوە ئاست و ستەوایەکی بەرزیان هەبوو، بەڵام هیچکات ئەم شتانەیان نەکردە بیانوو بۆ خۆ بە چاکتر زانین و پێرەویی نەکردن لە قیادەی رێکخراوەکە؛ بە پێچەوانەوە ئەوان هەمیشە بە حورمەتەوە ئەیانڕوانییە هەموو کەتیبەکان بە تایبەت کەتیبەی فەتح و بە پێی بڕیاراتی ئەمیر و قیادەی جوند و ئەنصارولئیسلام هەڵسووکەوتیان ئەکرد.

دەربارەی هەیئەی شەرعی و جێگەو پێگەو ئاستی بەرپرسیارییەتی و دەسەڵاتی ئەم هەیئەیەش ئەتوانم بڵێم هەیئەی شەرعی یەکێك بوو لە دەزگا هەرە گرنگەکانی جوند و ئەنسارولئیسلام. ئەم دەزگایە لە سەردەمی جوندولئیسلامدا لە نۆزدە ئەندام و جێگرێك پێکهاتبوو و هەم لە سەردەمی جوندولئیسلام و هەمیش لە سەردەمی ئەنسارولئیسلامدا لە لایەن ئەبوو وائیلەوە سەرپەرشتی ئەکرا. ئەوان لە رووی شەرعییەوە لە بەرانبەر هەڵوێست و سیاسەتەکانی جوند و ئەنسارولئیسلامدا بەرپرسیار بوون. ئەگەر هەموو ئەندامانی هەیئە لە سەر بابەتێکی شەرعی هاوڕاو کۆدەنگ بوونایە پێویست بوو ئەمیری رێکخراوەکەیش پابەندی ئەم بابەتە بووایە. لە سەردەمی جوندولئیسلام و ئەمیرایەتی ئەبوو عەبدوڵڵای شافیعیدا ئەم حاڵەتە بۆ جارێکیش ئەزموون نەکرا بەڵام لە سەرەتای دامەزرانی ئەنسارولئیسلامدا بە مەبەستی پێشگرتن بە لە هێڵ دەرچوونەکانی مامۆستا کرێکار لە کاتی تەسریح و وتار خوێندنەوەدا، هەیئەی شەرعی هەندێ حەد و حودوودی بۆ ناوبراو دیاری کرد. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە مامۆستا کرێکار بۆ خۆی داوای ئەکردبوو بیکەنە ئەمیر، بەڵام بە هۆی ئەو ئەزموون و شارەزاییە زۆرەوە کە لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا هەیبوو، بە رەزامەندیی زۆربەی ئەندامانی رێکخراوەکە پلەی ئەمیرایەتی پێ بەخشرا. ئینجا بە هۆی هەندێ تایبەتمەندیی تریشەوە کە ئەو هەیبوو، ناچاربوون هەر لە سەرەتاوە سنوورێك بۆ کار و کردەوەکانی ئەو دابنێن.

بە گشتی هەیئەی شەرعی لە سەردەمی ئەنسارولئیسلامدا بە برشت تر بوو، چەند ئەندامێکی ئەم هەیئەیە بەرپرسی چارەسەرکردنی گرفتەکانی ناو خەڵك و سەقامگیرکردنی سوڵح و ئاشتی لە ناو دانیشتوانی ناوچەکەدا بوون. ئەگەر کێشەیەکی گەورەش رووی بدایەو بەوان چارەسەر نەکرایە یان پێویستی بە قەزاوەت بووایە، ئەوا لە لایەن بەرپرسی هەیئەوە چارەسەر دەکرا. چەند ئەندامێکی تری ئەم هەیئەیە کرابوونە بەرپرسی بەشی (حسبە) ئەمر بە چاکەو مەنع کردن لە خراپە. ئەوان بە فەرمانی بەرپرسی هەیئەکە چۆنیەتی هەڵسووکەوتی خەڵکیان دیاری ئەکرد. بۆ نموونە چۆنیەتی پۆشینی عەبا لە لایەن ئافرەتانەوە، مەنعکردن و دیاری کردنی سیدی و ئەواری ڤیدیۆ و ئەواری کاسێت هەم لە رووی مۆسیقاوەو هەم لە رووی تەسویر و دیمەنەوە (مەنعکردنی سەتەلایت، مەنعکردنی ئەو ڤیدیۆ و سیدیانەی وێنەی ئافرەتی رازاوەو دانەپۆشراویان لە خۆ ئەگرت، مەنعکردنی هەموو جۆرە مۆسیقایەك و دەنگی ئەو گۆرانی بێژانەی گۆرانیەکانیان کوفراوی بوون و ئەبوونە هۆی بە لارێداچوونی موسوڵمانان)، مەنعکردنی فرۆشتن و خواردنەوەی مەشروب و مادە موخەدیرەکان، مەنعکردنی هەرجۆرە تێکەڵاوییەکی کوڕ و کچ تەنانەت لە ناو قوتابخانەکانیشدا، مەنع کردنی شایی و زەماوەند و حەفلەو..... هتد. هەر کەسێك لە هەرکام لەم بوارانەدا تووشی نافەرمانی و سەرپێچی بهاتایە، لە لایەن هەیئەی شەرعییەوە سزا ئەدرا. هەروەها بەشێکی تر لە ئەندامانی هەیئەی شەرعی ئەنسارولئیسلام، ئەرکی وتنەوەی دەرس و وانە شەرعی و ئایینیان بە موجاهیدین و وەڵامدانەوە بە پرسیارە شەرعییەکانی ئەوانیان کەوتبووە سەرشان. ئەندامانی هەیئەی شەرعی لە ناو موجاهیدین و ئەندامانی رێکخراوەکەو ئەمیر و بەرپرسانی بەشی عەسکەریدا قەدر و حورمەتێکی زۆر و تایبەتیان هەبوو.

**تەحسینی کوڕی مەلا عەلی عەبدولعەزیز سیمایەکی سەیر و سەرنجڕاکێشی ناو بزاڤی ئیسلامی جیهادییە، ئەو لە نێو بزووتنەوەدا بەرپرسایەتی گەورەی هەبوو و بەوجۆرەی باسی دەکەن و جەنابیشت وتووتە، لە کۆتایی ئەوەدەکاندا سەردانی ئەفغانستانی کردووەو بەیعەتی بە رێبەرانی قاعیدە داوە بەڵام ئەو هیچکات تێکەڵ بەو تەوژمە سەلەفییە نەبوو لە پاڵیدا ئیمارەتێکی ئیسلامی راگەیاندبوو. هۆکاری ئەمە چی بوو؟ ئایا راستە لە ناوچەیەکی ژێر دەسەڵاتی بزووتنەوەدا ئیمارەتێکی ئیسلامی راگەیاندبوو؟**

لە سەرەتادا با بیۆگرافییەکی کورتی ناوبراوتان بۆ باس بکەم، حاجی تەحسین کوڕی خوالێخۆشبوو مەلا عەلی عەبدولعەزیزەو لە دایکبووی ساڵی ١٩٧٤ی زایینییە. ئەو کوڕی چوارەمی مەلا عەلییەو تەنیا کوڕی پێنجەم واتە سامان لەو بچووکترە. لە ناو کوڕەکانی مەلا عەلیدا حاجی تەحسین لە هەموویان بەرچەستە تر و ناسراوترەو بە رای من لە هەموویشیان زیاتر پابەندی ئایینی ئیسلام و یاساو دوستووراتی ئەم ئایینەیە. ئەو هەر لە منداڵییەوە لە براکانی تری زیاتر هۆگری باوکی بووەو لەوانیش زیاتر جێگای سەرنجی مامۆستا مەلا عەلی بووە. لە ساڵی ١٩٩٤ی زایینیدا کە مەلا عەلی عەبدولعەزیز جێگری رابەری گشتی و بەرپرسی بەرەی جەنگی بزووتنەوە واتە (قیادەی مەیدانی) بوو، بڕیاری دروستکردنی هێزێکی نوێی بە ناوی (هێزی تایبەت) دەرکرد و تەحسینی کوڕی وەك ئەمیری ئەم هێزە دیاری کرد و ئەمەش ئاماژە بوو بۆ متمانەی ئەو بە تەحسینی تەمەن بیست ساڵ. هەرچەند لەو تەمەنەشدا شێخ تەحسین توانیبووی لە باری شەرعییەوە خۆی پێ بگەیەنێ بەڵام ئەو لە باری بەڕێوەبردن و بەرپرسایەتیدا ئەزموونێکی وەهای نەبوو. بۆیە مەلا عەلی بە مەبەستی پەروەردەکردنی ئەو لە بواری بەڕێوەبەریەتیدا چەندین کادێری لێهاتوو و شارەزای لە دەورووبەری دانا. تەحسین لە سەرەتادا بە هۆی ئەو نەرم و نیانییە زۆرەوە کە هەیبوو و ئەو شلگیرییەی لە کار و بەرپرسایەتیدا ئەینواند؛ زیاتر وەکوو کەسێکی ئاسایی و تەنانەت کەسێکی فەقیر حاڵ ناسرابوو بەڵام دواتر بە هۆی ئاشنابوونی لەگەڵ تاکتیکەکانی شەڕ و کاری بەڕێوەبەریەتیدا، سەلماندی کە توانای خۆ پێگەیاندنی لە هەموو بوارێکدا هەیەو شایستەی وەرگرتنی ئەرك و بەرپرسایەتی زیاتریشە. ئەو هاوکات لەگەڵ ئەم بەرەوپێشچوون و پێشکەوتنانەدا پابەندبوونی زیاتری خۆی بە ئوسووڵە ئیسلامییەکانەوە پیشان داو هێماکانی سەلەفییەتی جیهادیشی لە خۆی نیشان دا.

بەم شێوەیە حاجی تەحسین تا ساڵی ١٩٩٩ لە نزیکەوە شاهیدی تاڵی و سوێری و شکست و سەرکەوتنەکانی بزووتنەوە بوو و ئەمەش هۆکاری پێشکەوتنی زیاتری ئەو بوو لە هەموو بوارێکدا، ئەو بەرەبەرە زیاتر ئەکەوتە ناو هاوکێشەکانەوەو زیاتر لەگەڵ دونیای دەورووبەریدا ئاشنا ئەبوو. مامۆستا مەلا عەلی عەبدولعەزیزی باوکی بە هۆی ئەو بەرپرسایەتییەی کە هەیبوو، لەگەڵ بەرپرسانی قەرارگاکانی ئێراندا دۆستایەتی و تێکەڵاوییەکی زۆری هەبوو و هەر بەم بۆنەیشەوە زۆر کەس –هەم لە ناوەوەو هەم لە دەرەوەی بزووتنەوە– ئەویان بە پیاوی ئێران ناو دەبرد. بۆیە هەر لەو کاتەوە ئەم تۆمەتانە خرایە پاڵ تەحسینی کوڕیشی و زۆر کەس ئەویشیان بە پیاوی ئێران دەزانی. ئەم مەسەلەیە لە کاتی پەرەسەندنی ناکۆکییە ناوخۆییەکانی بزووتنەوەدا زیاتر بەرجەستە کرایەوەو لایەنگرانی مامۆستا عەلی باپیر لە نووسراوێکی ٤٠/٣٠ لاپەڕەییدا کە بڵاویان کردەوە، بە هەموو شێوەیەك هەوڵی بەدناوکردنی مەلا عەلی عەبدولعەزیزیان دابوو و باسی پێوەندیی ئەو و تەحسینی کوڕیان لەگەڵ بەرپرسانی قەرارگاکان و دەزگا سیخوڕییەکانی ئێران کردبوو.

هەرچەند ئەم تۆمەتانە کاریگەری نیگەتیڤی لە سەر جێگاو پێگەی حاجی تەحسین لە ناو بزووتنەوەو دەرەوەی بزووتنەوەدا دانا بەڵام کاریگەرییەکی وایان لە سەر خودی ئەو دانەنا. ئەو تا دەهات زیاتر لەگەڵ بیروباوەڕی سەلەفییەتی جیهادیدا تێکەڵاو ئەبوو و بە دوای بە کردەوەیی کردنی ئەو پلان و بەرنامانەوە بوو کە بۆ خۆیی دانابوو، بە تایبەت پاش سەردان و سەفەرەکەی بۆ ئەفغانستان و دانی بەیعەت بە ڕێکخراوی ئەلقاعیدەو دواتریش بە چوونە دەرەوەی رکابەرەکان–مامۆستا عەلی باپیر و مامۆستا کرێکار– لە بزووتنەوە، بە شێوەیەکی جیدی تر هەوڵی بەهێزکردنی خۆی و هێزە تایبەتەکەی ژێر دەسەڵاتی لە ناو بزووتنەوەی ئیسلامدا دا. ئیتر ئەو لەم قۆناغە نوێیەدا گوێڕایەڵی فەرمان و ئەوامری باوکیشی –رابەری گشتی بزووتنەوەی ئیسلامی– نەبوو و بەشداریی سەردان و پێوەندییەکانی ئەوی لەگەڵ حزبە کوردییەکاندا نەدەکرد، ئەم کارە پێوەندیی بە بیروباوەڕی ئەوەوە بوو کە حزبە کوردییەکانی بە مورتەد و دژی ئایینی ئیسلام و دەسەڵاتەکەیانی بە تاغووت ئەزانی. دەوڵەمەندبوونی ئەو لە باری ماڵییەوەو کەڵکوەرگرتنی بێ سنووری لە هەموو ئیمکانات و داراییەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی، بووە هۆی ئەوە

بەشێکی بەرچاوی ئەندامانی ڕێکخراوەکە لەگەڵ خۆی بخات و لە لایەکی تریشەوە پێوەندییەکانی خۆی لەگەڵ کەسایەتی و ڕێکخراوە سەلەفی جیهادییەکانی دەرەوەی کوردستاندا زیاتر و زۆرتر کرد. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە هێشتا زۆر کەس باوەڕیان بە سەلەفی بوونی ئەو نەبوو.

پاش دابڕان و جیابوونەوەکانی ناو بزووتنەوەی یەکبوون و لەشکرکێشی هێزەکانی یەکیەتی بۆ ناوچەکە، بزووتنەوە تەنیا شارۆچکەی تەوێڵەو چەند گوندێکی بە دەستەوە مابوو کە ئەم ناوچانە لە ساڵی ١٩٩٤ەوە لە ژێر کۆنتڕۆڵی هێزی تایبەتی بزووتنەوە واتە هێزەکەی تەحسین عەبدولعەزیزدا بوون. تەحسین ماوەیەکی کەم پاش دروستبوونی جوندولئیسلام، هەوڵیدا پێوەندیی بەم ڕێکخراوەوە بکات بەڵام سەرکردایەتی جوند کە هەبوونی هەرجۆرە پێوەندییەکیان لەگەڵ ئەودا پێ باش نەبوو، بە بێ ئەوەی دڵی بیەشێنن داواکەیان ڕەت کردەوە. تەحسین لەمبارەیەوە ناوای بە من وت: «ئەم کارەم بۆیە کرد تاکوو لای خوای گەورە وەك هۆکار و تەگەری یەك نەکەوتن تاوانبار نەبم». بەڵام ئەوەی کە بۆچی جوندولئیسلام ئاوا وەڵامی ئەویان دایەوە هۆکاری جۆراوجۆری لە پشت بوو و بە ڕای من کۆنە مەرکەزییەکان واتە ئەندامانی پێشووی هێزی ٢ی سۆران، هۆکاری سەرەکی ڕەتکرانەوەی داواکەی ئەو بوون. ئەڵبەت ئەکرێ ئەم وەڵامدانەوەیە بە تاکتیکی جوندولئیسلامیش بزانین بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستدا هەم کەڵك لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی بزووتنەوەو هەمیش کەڵك لە یارمەتییەکانی ئەوان واتە چەك و تەقەمەنی و هەرجۆرە یارمەتییەکی تر وەربگرێ و چەند جارێکیش بە کردەوە ئەم کارەیان کرد.

بە نیسبەت ڕاگەیاندنی ئیمارەتی ئیسلامییشەوە، ئەگەرچی حاجی تەحسین بە ئاشکرا ئەمکارەی نەکردووە بەڵام لە واقیعدا شتێکی وا لە ئارادا بوو وەك چۆن ئەو و هێزەکەی هیچ پێوەندییەکیان بە بزووتنەوەوە نەمابوو بەڵام ئەمەیان ڕانەئەگەیاند و ئاشکرایان نەدەکرد. هەروەها ناوچەکانی ئەوان بە تایبەت شارۆچکەی تەوێڵە بەردەوام دەرگای بە ڕووی ئەندامان و موجاهیدینی جوند و ئەنسارولئیسلامدا کرابووەوەو بەشێکی بەرچاوی سەرکردەکانی ئەنسار لەوێ نیشتەجێ بوون. لە باری کارکردن بە شەرع و یاسا ئیسلامییەکانیشەوە، ئیمارەتی تەوێڵە چەند قاتی ئەو جیاوازییەی لە نێوان خورماڵی ژێر دەسەڵاتی کۆمەڵی ئیسلامی و ئیمارەتی بیارەدا بوو، لە دەسەڵاتەکەی ئەنسارولئیسلامەوە نزیك بوو.

**لە باسەکانی پێشوودا چەند جارێك ئاماژە بە ناوی «عومەر بازیانی» کراوە. ئەم ئاماژانە باس لەوە دەکەن کە بازیانی رۆڵێکی بەرچاوی لە ڕەوتی سەرهەڵدان و گەشەسەندنی بیری سەلەفی و یەکەم ڕێکخراوە سەلەفی جیهادییەکانی کوردستاندا بووەو بە جۆرێك لە جۆرەکان تێگەیشتن لە سەلەفییەتی کوردی بە بێ تێگەیشتن لە کەسایەتی و ڕۆڵی ئەو پیاوە ناتەواوە. ئەم باسەمان زیاتر بۆ شی بکەوە.**

کاك عومەر بازیانی ساڵی ١٩٧١زاییینی لە شاری کەرکووك لە دایك بووەو تا ڕاپەڕینەکەی ١٩٩١ لەو شارە ژیاوە، پاشان بنەماڵەکەیان وەك زۆر بنەماڵەی تری کەرکووکی ئاوارە بوون و لە سەرەتادا بۆ ماوەیەك لە دەربەندی بازیان ژیاون. ناوی ڕاستەقینەی کاك عومەر «ئیبراهیم عەبدولکەریم»ەو باوکی ساڵانێکی دوور و درێژ لە ناو سوپای عێراقدا کاری کردووەو پاشان بە پلەی نایب زابت خانەنشین کراوە. لەو سەردەمەدا کە ماڵیان لە بازیان بوو کاك عومەر پێوەندیی بە یەکیەتی نیشتمانییەوە کرد و بووە ئەندامی ئەم حزبە بەڵام دواتر لە لایەن کۆنە پێشمەرگەیەکی بزووتنەوەوە بە ناوی مەلا ڕەحیم، گۆڕانکاری بەسەردا هات و بووە پێشمەرگەی بزووتنەوەی ئیسلامی. ئەمە هاوکات بوو لەگەڵ پەیوەست بوون و پێوەندییکردنی من بە ڕیزەکانی بزووتنەوەی ئیسلامییەوە. لەو سەردەمەدا ناو گۆڕین باو بوو و هەرکەس نەبووە

پێشمەرگەی بزووتنەوە، ناوێکی نوێی بۆ خۆی هەڵدەبژارد. بۆیە کاک ئیبراهیمیش نازناوی «عومەر»ی هەڵبژارد و پاشان بەو هۆیەوە کە بنەماڵەکەیان نیشتەجێی بازیان بوون، بە عومەر بازیانی ناوبانگی دەرکرد. کاک عومەر لەو کەرکووکیانە بوو کە لە ناو بزووتنەوەدا بە سێ مەوج ناسرابوون چونکوو هەم کوردی و هەمیش عەرەبی و تورکمانییان ئەزانی. ئەو مرۆڤێکی تیژ و وردبین بوو، هەر لە سەرەتاوە تێکەڵاویی کۆمەڵایەتی لەگەڵ تیپی دووسیەکان و سەلەفییەکانی کەلار پەیدا کرد و بە ئاستێکی زۆریش لە باری فیکرییەوە کەوتە ژێر کاریگەری ئەوانەوە. بۆیە پاش ماوەیەك روانگەیەکی توندوتۆڵی سەلەفییانە بە سەریدا زاڵ بوو. ئەو هەر لە سەرەتاوە لە رووی پابەندبوون بە ئایینی ئیسلامەوە، کەسێکی بە ئیلتیزام بوو و لە رووی ئەخلاقییشەوە کەسێکی رەوشت بەرز و رێزدار بوو، هەروەها کاک عومەر هەر لە سەرەتاکانەوە وەك موجاهیدێکی خوێندەوار و «طالب علم» دەرکەوت وخۆی ناساند.

سەرەتاکانی ساڵی١٩٩٣بزووتنەوەی ئیسلامی مقەرێکی گەورەی لە قەراخ شاری سلێمانی کردەوەو کاک ئەحمەدی مالییەی وەك ئەمیری ئەم مقەرە دیاری کرد. هەروەها تیپی دووسییەکانیش کە کاك عومەر بازیانی یەکێك بوو لە ئەندامانی ئەم تیپە، گوازرانەوە بۆ ئەم مقەرە. لەو کاتانەدا کە کاك ئەحمەد مقەرەکەی بەجێ ئەهێشت، کاك عومەری لە جێگای خۆی دادەناو ئەمیرایەتی موجاهیدەکانی دەسپاردە ئەو. هەر ئەو ساڵە کاتێك «سوپای بەرگریی ئیسلامی» دروست بوو، عومەر بازیانی وەك بەرێوەبەری کاروباری تیپەکانی سەر بەم سوپایە دیاری کرا. بۆیە لەو کاتەوە ناوی ئەو بوو بە ناوێکی ئاشنا هەم بۆ بەرپرسانی بزووتنەوەی ئیسلامی و هەمیش بۆ بەرپرسان و لێکۆڵەرانی یەکیەتی نیشتمانی و سەرنجی ئەوانی بۆلای خۆی راکێشا. لە ساڵی ١٩٩٤ بەملاوە کاك عومەر لە هێزی کەرکووکدا ئەرك و بەرپرسایەتی پێ سپێردراو لەم قۆناغەدا لە دوو لایەنەوە زیاتر لەگەڵ سەلەفییەت ئاشنا بوو. یەکەم، لەو ماوەیەدا لە ئۆردووگاکانی ئێران ئەماینەوە، کاك دلێر سەلەفی برای دڵشاد کەلاری دەرسی بەو موجاهیدانەی ناو ساحەی جیهاد ئەوتەوە کە بە مۆڵەت و بە مەبەستی حەسانەوەو سەردانی ژن و منداڵ ئەگەرانەوە ناو ئۆردووگاکان. کاك عومەریش یەکێك لەو موجاهیدانە بوو کە وەك کەسێکی تامەزرۆی عیلم، بەشداریی کەلاسەکانی ئەکرد و بە هۆی وانەکانی کاك دلێرەوە زیاتر لەگەڵ بیروباوەڕی سەلەفییەت ئاشنا بوو. دووەم، ئەو مەڵبەندەی عومەر بازیانی تیایدا خزمەتی ئەکرد واتە مەڵبەندی کەرکووك، لە لایەن کاك «سەید جەلال»ەوە ئیدارە دەکرا کە یەکێك بوو لە سەلەفی ترین ئەندامانی سەرکردایەتی بزووتنەوە لەو سەردەمەدا. سەید جەلال جگە لە کاروباری تایبەتی خۆی و هێزەکە ، هەموو شەوێك پاش نوێژی خەوتن ئەگەر چارەکە سەعاتێکیش مەجالی هەبووایە، موجاهیدەکانی کۆ ئەکردەوەو باسێکی ئایینی بۆ ئەکردن. باسەکانی ئەو بە زۆری لە سەلەفییەتی جیهادییەوە نزیك بوون و ئەمەیش کاریگەری لە سەر موجاهیدەکان بە تایبەت لە سەر کەسێکی وەك عومەر بازیانی دائەنا کە بە عەلاقەو هۆگرییەکی تایبەتەوە هەوڵی فێربوونی ئەداو بێ گومان ئەو زیاترین سوودی لەم کۆبوونەوانە وەرگرتووە.

پاش گەڕانەوەی هێز و مەڵبەندەکان لە ساڵەکانی ١٩٩٥/ ١٩٩٦داو جێگیربوونیان لە ناوچە ئازادکراوەکانی هەڵەبجەو خورماڵ و تەوێڵەو بیارەو سیروان، کاك عومەر بەشداریی لە کەلاس و کۆبوونەوەکانی مامۆستا دلێر سەلەفی و مامۆستا «سەعد سەلەفی/تەوێڵەیی»دا کرد کە پێکەوە بەڕێوەیان ئەبرد. بۆیە ئەم قۆناغەش کاریگەری زیاتری لە سەر فێربوون و ئاشنابوونی بازیانی لەگەڵ وانەکانی سەلەفییەت داناو ئەو بە جیدیەتێکی زیاترەوە کەوتە داکۆکیکردن لە بیروباوەڕی سەلەفییەتی جیهادی. بە سەرهەڵدانی دەستە سەلەفییەکەی حەسەن سۆفی لە ساڵی ١٩٩٧دا کە بە دەستەیەکی توسووڵی و پابەندی ناو بزووتنەوەی ئیسلامی ناسرابوو، کاك عومەر لەگەڵ ئەم دەستەیە کەوت و لەگەڵ ئەوانیشدا لە بزووتنەوە دەرکرا. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە ئەو ماوەیەك بوو وەك یەکێك لە موجاهیدە خوێندەوارەکانی ناو بزووتنەوە لە لایەن لیژنەی حەل و عەقدەوە وەك پێشنوێژی مزگەوتی گوندی تەپە زێرینە دیاری کرابوو. هەر بە هۆی ئەم بوو کە کاك

عومەر کشایە ناو ریزەکانی حەماسەوەو.دواتریش بوو بە یەکێك لە کەسە ناسراوەکانی ناو بزووتنەوەی حەماس و پاش کوژرانی حەسەن سۆفیش بوو بە دەمڕاستی ئەم گروپە، ئەڵبەت نەك بەو مانایە کە بووبێتە ئەمیریان.
پاش یەکگرتنی حەماس و تەوحید (٢٠٠١)، بازیانی بووە ئەندامی شورای (جماعة التوحید) و هەر لەو ساڵەدا بەشداری لە دروستکردنی جوندولئیسلام و ئەنساروالئیسلامدا کرد و بوو بە ئەندامێکی بەرجەستەی ئەم رێکخراوانە.
ماوەتەوە بڵێم ئەم پیاوە وەك مرۆڤێکی مەبدەئی و مولتەزیم دەورێکی بەرچاوی لە سەرهەڵدانی بزاڤی سەلەفییەتی جیهادی لە کوردستاندا هەبوو، ئەم قسەیەش لە رووی بەرپرسایەتییەوە ئەکەم نەك لە رووی دۆستایەتی و رەفاقەتەوە.
وەك باسم کرد ئێمە لە سەرەتای پەیوەندییکردنمان بە بزووتنەوەی ئیسلامییەوە یەکترمان ناسیوەو هاوڕێ و برای دینی یەك بووین و تاکوو ئێستاش کە من لە زیندانی ئێراندام و ئەویش لە زیندانی یەکیەتیدایە، پابەندی ئەم هاوڕێیەتییەمانم. هەرچەند من یەکێك لەو کەسانەم لە مەیدانی چالاکی رێکخراوەییدا زۆرترین رەخنەم لە کاك عومەر گرتووەو ئەویش وەکوو پێویست بایەخی بە رەخنەو بۆچوونەکانی من نەداوە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش هیچکات ئەوەم لە بیر ناچێت کە چۆن بە سینە فراوانییەوە گوێی بۆ ئەگرتم و پێشوازی لە رەخنەکانم ئەکرد یان ئەو کاتانەی لە سەر کاری رێکخراوەیی دەنگم بەرز ئەکردەوەو لێی تووڕە ئەبووم، چۆناوچۆن بەو پەڕی رەوشت بەرزییەوە گوێی لێ ئەگرتم و هەوڵی ئەدا هێورم بکاتەوە. بە گشتی بە پێی ئەو ئاشنایەتییەی لە کەسایەتی و رابردوو و کار و تێکۆشانی عومەر بازیانیم هەیە، ئەو پیاوە بە یەکێك لە دڵسۆزان و ماندووبووانی بواری سەلەفییەتی جیهادی لە کوردستاندا ئەزانم بۆیە ئاساییە کەسێکی وەك ئەو بەو ئاستەی کە شارەزایی و توانای بووە، لە گەشەپێدانی فیکرەی سەلەفیەتی جیهادی لە کوردستانی عێراقدا دەوری گێڕاوە. بەشداریکردنی ئەو لە دامەزراندنی هەموو گروپ و رێکخراوە سەلەفی جیهادییەکاندا، ئەو بەرپرسایەتییانەی کە پێی سپێردراوەو ئەو خۆشەویستییەی لە لای سەلەفییە جیهادییەکان هەیبوو و ئەو حیسابەی دوژمن بۆی دەکرد و.....هتد، ئاماژەن بۆ دەوری کاریگەری ئەو لە ناو بزاڤی سەلەفییەتی جیهادیی کورددا. لە کۆتاییدا لە خوای گەورە داواکارم هەردووکمان و هەموو برایانی ترمان لە کۆت و بەندی تاغووت و مورتەدەکان رزگار بکات.

**سەد رۆژ پاش دروستبوونی جوندولئیسلام، باڵی «ئیسلاح»ی مەلا کرێکار لەگەڵ ئەم رێکخراوەدا «وەحدەت»ی کرد و لە ئاکامدا رێکخراوێکی نوێی سەلەفی جیهادی راگەیەنرا. ئەم تێکەڵبوونە چەند ئاڵوگۆڕێکی گرنگی بە دواوە بوو کە سەرەکی ترینیان بریتی بوولە: گۆڕانی ناوی ریکخراوەکە لە جوندولئیسلامەوە بۆ «الانصار الاسلام»، راگەیاندنی (صلح)ی کاتی (هُدنە) بۆ ماوەی شەش مانگ و گۆڕانی ئەمیری رێکخراوەکە لە «ئەبوو عەبدوڵڵای شافیعی»یەوە بۆ«مەلا کرێکار». هۆی ئەم گۆڕانکارییانە چی بوو؟ بە تایبەت چۆن بوو مەلا کرێکار کرا بە ئەمیر لە حاڵێکدا پێشتر لە نێو بزووتنەوەدا بە پێی ئەزموونەکانی لە چەندین قۆناغدا وای لێ دەرکەوتبوو کە توانای بەڕێوەبردنی ئەرکەکانی نییە؟**

سەرەتا پێویستە دەربارەی مامۆستا کرێکار و رابردووی ناوبراو لە ناو بزووتنەوەی ئیسلامیدا ئەوەتان پێ بڵێم کە ئەم پیاوە هەمیشە بە نیسبەت سیاسەت و بەرنامەکانی ئەم رێکخراوەوە دیدێکی رەخنەگرانەی هەبوو. بۆیە کاتێك پلەو بەرپرسایەتییەکی پێ ئەسپێردرا نەیدەتوانی نە بە دڵی بزووتنەوە بەڕێوەی ببات نە بەو شێوازەی کە خۆی مەبەستی بوو. ئەمە وایکردبوو سەرکردایەتی بزووتنەوە لە شێوازی کارکردنی ئەو نیگەران بێ بەڵام خودی مامۆستا کرێکاریش لە شێوازی کارکردنی رێکخراوەکە بە گشتی رازی نەبوو. پاش دروستبوونی باڵی ئیسلاح (ساڵی ١٩٩٦)، سەرکردایەتی بزووتنەوە نەیدەزانی لە کوێی دابنێ و کامە بەرپرسایەتی پێ بسپێرێ چونکوو هەر کارێکی پێ بدرایە

ئەو بەرنامەی خۆیی تیادا پیادە ئەکرد و ئەمەش پێچەوانەی بەرنامەی ڕێکخراوەکە بوو. هەروەها گەڕانەوە یا خود سەردانی ئەو بۆ وەڵاتی نەرویج کە جاری وابوو زیاتر لە ساڵێکی ئەخایاند، یەکێکی تر بوو لە کێشەکانی ئەو کە بزووتنەوە نەیدەزانی چۆناوچۆن چارەسەری بکات. سەرەڕای ئەمەش بزووتنەوە پێی خۆش نەبوو مامۆستا کرێکار لە دەست بدات چونکوو ئەو لە کوردستاندا خاوەن خۆشەویستی و پێگەیەکی تایبەت بوو و لە دەرەوەی کوردستانیش کەسێکی ناسراو و خاوەن نفووز بوو و لەگەڵ کەسایەتی و گروپ و ڕێکخراوە ئیسلامییەکانی جیهانی ئیسلامیشدا پێوەندییەکی نزیك و دۆستانەی هەبوو. بۆیە دەبوایە بە شێوەیەکی تایبەت هەڵسووکەوتیان لەگەڵدا بکردایە تاکوو هەم پێش بە لادانی ئەو لە ڕێڕەوی گشتی ڕێکخراوەکە بگرن و هەمیش بەرپرسایەتییەکی بۆ دیاری بکەن کە لە شەئن و شەوکەتی ئەودا بێت و لەگەڵ ڕۆحیاتیدا سازگار بێت. سەرەنجام مەکتەبی سیاسی بزووتنەوە لە دانیشتنێکدا کە بە پێشنیاری مامۆستا موحەممەدی بەرزنجی پێك هات، بڕیاری دروستکردنی نووسینگەیەکی تایبەتی بە ناوی (مەکتەبی موتابەعەو تەختیت) دەرکرد تاکوو مامۆستا کرێکار و هۆگرەکانی پێوە خەریك بکات و لە چوارچێوەی بزووتنەوەدا بیانهێڵێتەوە. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە مامۆستا کرێکار لەو سەردەمەدا وازی لە دژایەتیکردنی سەرکردایەتی بزووتنەوە هێنابوو و بە هیچ شێوەیەك تێکەڵ بە ناکۆکی نێوان باڵەکانی ئەم ڕێکخراوە نەدەبوو. ئیتر ئەو تەنیا لەو کاتانەدا وەڵامدانەوەی بە پێویست دەزانی کە لایەنێك هەوڵی شکاندنی کەسایەتی ئەوی بدایەو بە زۆریش باڵەکەی مامۆستا عەلی باپیر ئەم کارەیان ئەکرد و مامۆستا کرێکاریش بە پێی پێویست وەڵامی ئەدانەوە. هەرچەند مامۆستا کرێکار دانانی مەکتەبی موتابەعەی بە مانای بەکەم زانینی خۆی و باڵەکەی ئەزانی بەڵام زۆری بەلاوە گرنگ نەبوو و ئەم بەرپرسایەتییەی قبووڵ کرد. بۆیە لەو کاتەوە تا کاتی تێکەڵبوونی ئەهزەکان و گۆڕانی پێکهاتەی بزووتنەوە، باڵی ئیسلاحی مامۆستا کرێکار وەك ئەندامانی نووسینگەی موتابەعە بوودجەی تایبەتی خۆیان هەبوو و بە کاروباری خۆیانەوە خەریك بوون.

مامۆستا کرێکار لە ساڵانی دواییدا زیاتر لە ڕووی ناچارییەوە لە ناو بزووتنەوەی ئیسلامیدا مابۆوە، ئەو هەمیشە بە دوای مەجال و دەرفەتێکدا ئەگەڕا تاکوو بتوانێ بیرۆکەو بەرنامەکانی خۆیی تیایدا بەڕێوە ببات. لە کاتی کودیتاکەی مامۆستا عەلی باپیر و جەماعەتەکەیدا ئەو لە دەرەوەی کوردستان بوو و پاش گەڕانەوە ئیتر لە سلێمانی نەمایەوەو ڕووی لە هەوارە کۆنەکەی واتە گوندی «گوڵپ»ی ناوچەی هەورامان کرد و مزگەوتی ئەم گوندەی کردە شوێنی کۆڕ و کۆبوونەوەکانی خۆی. ئەو بە وردبینییەوە خوێندنەوەی بۆ هەموو ڕووداوەکانی ناو بزووتنەوە کردبوو و لەوەش گەیشتبوو کە بە زوویی هەندێ ئاڵوگۆڕ دێنە ئاراوە. تەنانەت ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە ئەو وەفدانەی سەردانی ئەفغانستانیان کردبوو، قۆناغێکی نوێی کاری ڕێکخراوەیی دەست پێ دەکەن و لەو هەلومەرجە تازەیەدا کە دێتە ئاراوە، بە هۆی ئەوانەوە تەوژمی سەلەفییەتی جیهادی لە کوردستان بەرەو پێشەوە ئەڕوات و بەهێزتر ئەبێت. بۆیە گوندی گوڵپیشی وەك شوێنی مانەوەی خۆی هەڵبژارد چونکوو ئەم گوندە ئەکەوتە نێوان شارۆچکەکانی خورماڵ و بیارەوەو سەرجەم لایەنگرەکانیشی بە هێز و تیپەکانیشەوە کە ئەوانیش هیجرەتیان کردبوو، لە گوندەکانی (گوڵپ، نارنجلە، زەردەهاڵ و خارگێڵان)دا جێگیر بووبوون. هەرچەند ئەوان هەوڵیان ئەدا خۆیان بێلایەن نیشان بدەن بەڵام لەو ماوەیەدا زیاتر داکۆکییان لە هەڵوێستی سەلەفییە جیهادییەکان و جوندولئیسلامەوە ئەکرد تاکوو لە هەڵوێستی کۆمەڵ و بزووتنەوەی ئیسلامی.

لە سەردەمی جوندولئیسلامدا مامۆستا کرێکار کەوتە ناوبژیوانیکردنی نێوان ئەم ڕێکخراوەو یەکیەتی نیشتمانی و دووجار شەوکەتی حاجی موشیر و چەند بەرپرسێکی تری یەکیەتی و کاك ئەبوو عەبدوڵڵای شافیعی و کاك عومەر بازیانی و لێپرسراوانی تری جوندولئیسلامی بە مەبەستی ئاشتەوایی و مۆرکردنی پەیمانی سوڵح، لە بنکەی سەرکردایەتییەکەی خۆی لە گوندی گوڵپ کۆ کردەوە بەڵام ئەم کۆبوونەوانە ئەنجامێکی وایان لێ نەکەوتەوەو نەبوونە

هۆی بەسترانی پەیمانی ئاشتەوایی. ئەم پێوەندیی و نزیکایەتییە کاریگەری لە سەر لایەنگرانی مامۆستا کرێکار داناو لە باری فیکرییەوە ئەوانی لە جوندولئیسلام نزیك کردەوەو وای لێکردن تاکوو هانی ئەمیرەکەیان بدەن بۆ نزیکبوونەوەی زیاتر و تەنانەت یەکگرتن لەگەڵ جوندولئیسلام. هەر بەو مەبەستەش کەوتنە ئەعداد و خۆ ئامادەکردن تاکوو لە کاتی هێرشی بەربڵاوی هێزەکانی یەکیەتیدا بۆسەر ناوچەکە، هێزی خۆیان بخەنە پاڵ هێزی جوندولئیسلام بۆ بەرگری کردن لە ناوچەکەو لەو ئیمارەتە ئیسلامییەی کە ماوەیەك بوو دامەزرابوو. هەرچەند خودی مامۆستا کرێکار بە پارێزەوە مامەڵەی لەگەڵ وەزعەکەدا ئەکرد و نەیدەویست بە خێرایی و لە ژێر کاریگەری جەوی زاڵی ناو لایەنگرانیدا بڕیاری بە پەلە بدات بەڵام ئەویش دواجار بڕیاری خۆی داو ئامادە بوو لەگەڵ جوندولئیسلامدا وەحدەت بکات. پێش تێکەڵبوونی ئەوان لەگەڵ جوندولئیسلام، چاوم بە چەند ئەندامێکی ئیسلاح کەوت و قسەم لەگەڵ کردن. ئەوان ئەیانوت: «ئەگەر مامۆستا کرێکار ئامادە نەبوو وەحدەت بکات، ئەوا ئێمە بۆخۆمان وەحدەت ئەکەین و تێکەڵ بە برایانی جوندولئیسلام ئەبین». ئەوەندەیش دیقەتم دابێ، زۆرینەی سەرتیپ و ئامرهێز و بەرپرس و ئەندامانی باڵی ئیسلاحیش هەمان بڕیاریان دابوو و دواتریش کە هاتنە ناو جوندولئیسلامەوە باسی ئەمەیان کرد. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە لایەنی جوندولئیسلام چەند حەزی بە تێکەڵبوونی ئەندامانی باڵی ئیسلاح لەگەڵ ریزەکانی خۆی ئەکرد بە هەمان ئەندازەو بگرە زیاتریش نامەرزۆی هاتنی مامۆستا کرێکار بوو. بۆیە ئەوان لە کۆبوونەوەکانیاندا بۆ یەکگرتن، بە راشکاوی ئەمەیان بە مامۆستا کرێکار وتوو ئەویش بە دڵفراوانییەوە پێشوازی لێوە کرد. ئەم جۆرە هەڵسووکەوت کردنە ئاماژە بوو بۆ ئەوەی کە مامۆستا کرێکار ئەبێتە ئەمیری رێکخراوە تازەکەو هەرواش دەرچوو. بە نیسبەت گۆڕینی ناوەکەیشەوە لە جوندولئیسلامەوە بۆ ئەنسارولئیسلام، ئەمە یەکەم ئیبتیکاری مامۆستا کرێکار بوو کە لە سەر بنەمای هەندێ هەڵسەنگاندن و بیرکردنەوە پێشنیاری کرد. لە سەرەتادا بەشێکی بەرچاوی بەرپرس و موجاهیدەکانی جوندولئیسلام دژی ئەم ناو گۆڕینە بوون بەڵام دواتر بە هۆی پێداگریی مامۆستا کرێکارەوە ئەوانیش بە دڵێك رازی و دڵێك ناڕازی ئەمەیان قبووڵ کرد.

ئەوانەی رازی بە گۆڕینی ناوی رێکخراوەکە نەبوون و دژایەتی تەرح و بەرنامەکانی مامۆستا کرێکاریان ئەکرد، پێیان وابوو جوندولئیسلام ناوێکی گونجاوە چونکوو هەم لە ئاستی کوردستان و عێراقداو هەمیش لە ئاستی ناوچەییدا رێکخراوەکەی پێ ناسراوەو ئەمەیشیان بەو چالاکییە عەسکەری و تەبلیغییانەوە گرێ ئەدا کە جوندولئیسلام لە ماوەی کورتی تەمەنیدا ئەنجامی دابوو. هەروەها ئەوان ئەیانوت ئەم ناوە گوزارشت لە رۆحی جیهادخوازی رێکخراوەکە ئەکات بە جۆرێك کە هەرکات دوژمن ئەیبینێ یان ئەیبیسێ، زراوی ئەتۆقێ و تووشی ترس و شڵەژاوی ئەبێ. هەروەها بە نیسبەت بە کوردی کردن و کورتکردنەوەی ناوی ئەنسارولئیسلامیشەوە ((پشتیوانانی ئیسلام لە کوردستان / پاك) کە ئەمەش هەر پێشنیاری مامۆستا کرێکار بوو، ئەوانەی کە کارەکەیان پێ باش نەبوو لەو باوەڕەدا بوون ئەم کارە بە مانای تەقلید کردنە لە عورف و عادەتی حزبە کوردییەکان و بۆیە نابێ رێکخراوێکی سەلەفی جیهادی بە هەمان شێوەی ئەوان بکات. ئەوان ئەیانوت: «ئیتر سەردەمی بزووتنەوە بەسەر چووەو تاکوو خۆمان بە شتی تێکەڵ پێکەڵەوە خەریك بکەین. لە قامووسی ئێمەدا نەتەوەگەری جێگای نابێتەوەو وەك کۆمەڵ و بزووتنەوەی ئیسلامی (رایە و غایە)مان تیادا نییەو ئاڵاو درووشم و مەبەستمان هێچ لێڵییەکی پێوە دیار نییە، هەر شتێکیش لە روونی و سەراحەتمان کەم بکاتەوە ئەوا پێی رازی نین و دژایەتی ئەکەین».

هەروەها ئەوان ئەیان وت: «بە دانانی وشەی (انصار) لە باتی وشەی (جُند) پێویستە بەرنامەو مەنهەجی رێکخراوەکەیش ئاڵوگۆڕی بەسەردا بێت و پاشان ئەبێ بە کردەوەو رەفتارێکی نوێوە هەوڵی ناساندنی دووبارەی خۆمان بدەین. هەروەها ئەوان لەوە دەترسان کە حزبە عیلمانییەکان دانانی ناوێکی کوردی بۆ رێکخراوەکە، بە تەنەزول و ساردبوونەوە تەعبیر بکەن». بەڵام مەبەستی مامۆستا کرێکار لە پێشنیارکردنی ناوی (انصار)، لێکچواندنی ناوی

ڕێکخراوەکەو ڕێزدانان بوو بۆ ئەنسارەکانی مەدینە. ئەوانەی کە کاتی خۆی بە ڕۆحی برایەتییەوە موهاجیرەکانی مەککەیان لە ئامێز گرت و پەنایان دان. هەرچەند جوندولئیسلامیش کارێکی وای کردبوو و ئەم ڕێکخراوە چەندین موجاهیدی عەرەب و عەجەمی لە ریزەکانی خۆیدا پەنا دابوو و هێز و تواناو پسپۆڕییەکانی ئەوانی خستبووە خزمەت جیهادە ڕەواکەیەوە. سەرەنجام سەرباری هەموو دژایەتیکردنێکی موجاهیدینی جوندولئیسلام، مامۆستا کرێکار هەم ناوی ڕێکخراوەکەی گۆڕی و هەم ناوی کوردی بۆ داناو هەمیش ناوەکەی کورت کردەوە.

دەربارەی ڕاگەیاندنی هۆدنە شەش مانگییەکەش ئەتوانم بڵێم مامۆستا کرێکار ئەیەویست وا نیشان بدات کە جوندولئیسلام بەو ئاستەی توانای شەڕ و دەستوەشاندنی هەیە بە هەمان ئاستیش ئامادەی دانووستان و وتووێژە. هەرچەند هۆدنەکە ئەنجامێکی وای لێنەکەوتەوە بەڵام مامۆستا کرێکار بە ڕاگەیاندنی ئەم هۆدنەیە جیاوازبوونی خۆی سەلماند. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە ئەو پێشتر لە نێوان جوندولئیسلام و یەکیەتیدا ناوبژیوانی کردبوو و هێشتا لەگەڵ چەند بەرپرس و سەرکردەیەکی یەنەکدا لە پێوەندیدا بوو. ئەو ئەیئەویست خۆی بکاتە خاوەن ئەو توندوتیژییەی کە موجاهیدین و بەرپرسانی جوندولئیسلام لە خۆیان نیشانیان دابوو و بەرنامەی ئەوەی هەبوو تاکوو لایەنی ئایینی و شەرعی ڕێکخراوەکە بەرجەستەتر بکاتەوە. مامۆستا کرێکار بە تەمابوو لە لایەک لە باری نێوەرۆکەوە ڕێکخراوەکە بەهێزتر بکات و لە لایەکی تریشەوە ڕەوتێکی نوێی کاری ڕێکخراوەیی و خۆ ئاساندن دەست پێ بکات. لەو کاتەدا کە ڕاگەیاندنی حزبە کوردییەکان بە تایبەت یەکیەتی بە هەموو شێوەیەک هەوڵی بەدناوکردنی جوندولئیسلامیان ئەداو ئەوانیان بە عەرەب ئەفغان و خەڵکی بیانی و نامۆ بە کوردستان ناو ئەبرد و ئەم ڕێکخراوەیان بە بەرهەم و دەستکردی وڵاتانی عەرەب دەزانی، مامۆستا کرێکار هەوڵی ئەدا لە ڕێگای ئەم گۆڕانکاریانەوە ڕێکخراوەکە بە بزاڤێکی خۆماڵی و سەربەخۆ و خاوەن هەستی بەپرسایەتی بە نیسبەت وڵاتی کوردەواریەوە بناسێنێ. هەرچەند ئەو لە هەنگاوی یەکەمی گۆڕانکارییەکان واتە لە گۆڕینی ناوی ڕێکخراوەکەدا سەرکەوتوو بوو بەڵام بەو ئاستە لە ڕاگەیاندنی هۆدنەکەدا سەرکەوتوو نەبوو. ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی ئەنسارولئیسلام هەر لە سەرەتاوە دژی ئەم هۆدنەیە بوون پابەندبوونی خۆیان بۆ ئەم بڕیارە نیشان نەئەدا.

ئەڵبەت ئەگەر بمانەوێ لە سۆنگەیەکی ترەوە بڕوانینە هۆدنەکە، ئەتوانم بڵێم ئەنسارولئیسلام لە ئەساسدا زۆری پێویست بەم هۆدنەیە بوو. بە هۆی ئەوەوە کاتی خۆی جوندولئیسلام بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو و بەدەر لەو پلان و بەرنامانەی بۆ خۆیی دانابوو، تووشی شەڕی قورس و مەیدانی هاتبوو، بۆیە ئەم هۆدنەیە دەرفەتێکی باش بوو بۆ ئەوەی سەرلەنوێ بە پلان و بەرنامەکانیدا بچێتەوەو دەست بداتە ڕاهێنان و پەروەردەی موجاهیدەکان و ئامادەی شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوەکانی دواتریان بکات. وەک دوایین بەشی ئەم وەڵامەو بە نیسبەت دیاریکردنی مامۆستا کرێکاریشەوە وەک ئەمیری ئەنسارولئیسلام، ئەگەر بەم بۆنەوە ئەم ڕێکخراوە تووشی زەرەرێک هاتبێ بێگومان بە بێ ئەژمار قازانجی کردووە. مامۆستا کرێکار کەسێک بوو کە لە ڕووبەرێکی فراواندا ناسراو بوو، ئەو لە باری شەرعی و زانستییەوە موستەوایەکی بەرزی هەبوو —ئەڵبەت چوون باسی ئەو سەردەمە ئەکەم وا ئەڵێم چوونکوو بە خۆشییەوە مامۆستا هێشتا لە ژیاندا ماوە— و هیچکام لە بەرپرسانی تری ئەنسارولئیسلام لە ئاستی ئەودا نەبوون. هەروەها بەو بە ئەمیر بوونەی ئەو ئەبوو عەبدوڵڵای شافیعی نەک نەکەوتە پەراوێزەوە بەڵکوو بە پلەی جێگری ئەمیری ئەنسارولئیسلام سەرپەرشتی کاروباری ڕێکخراوەکەی دەکرد و لە غیابی مامۆستا کرێکاریشدا ئەمیرایەتی ئەنساری دەکرد.

**چەند لایەنێکی ئەم مەسەلەیەت هێشتا بە باشی ڕوون نەکردۆتەوە؟ هەم کەمێک زیاتر باسی چۆنییەتی وەحدەتی باڵی ئیسلاحمان بۆ بکەو هەم ئەوەی کە چ کەسانێکە و لە بەر چی لەگەڵ بە ئەمیربوونی مەلا کرێکاردا نەبوون؟ هەروەها**

**هۆکاری ئەو ناکۆکییەی لە سەر تەنزیماتی بەغداد کەوتە ناو هەیئەی شەرعییەوە چی بوو و دواجار چارەنووسی ئەو هێزەی بە ناوی ئیسلاح تێکەڵی جوند بوو بەرەو کوێ ڕۆیشت و کەوتە ناو کام لایەنی پێکهاتەیی ئەنسارولئیسلامەوە؟**

لە پێوەندیی لەگەڵ وەحدەتی باڵی ئیسلاحدا ئەوەندەی زانیاریم بووە کەمتەرخەمیم نەکردووەو هەموو شتێکم وتووە تەنیا هەندێ وردە شت هەیە کە بە پێویستم نەزانیوە باسی بکەم. بۆ نموونە هۆگرەکانی مامۆستا کرێکار بە زۆری لە خەڵکانی گەنج و کەم ئەزموون پێك هاتبوون و ئەمەش بووبووە هۆی ئەوە بە هۆگرییەکی زۆرەوە بکەونە پێڕەویکردنی بیروباوەڕی سەلەفییەتەوە. بۆیە ئەوان هەم لە هۆگرییاندا بۆ مامۆستا کرێکار و هەم لە هۆگریشیاندا بۆ ئەنسارولئیسلام ئامادەی ئەزموونکردنی هەموو سەختی و دژوارییەك بوون، ئەوان زۆر جیاواز بوون لەو کەسانەی لە سەرەتای نەوەدەکاندا جەماعەت جیهادی مامۆستا کرێکاریان پێك ئەهێنا. ئەندامانی باڵی ئیسلاح بە زۆری لە خەڵکی سێ ناوچە پێکهاتبوون، دەستەیەکیان هەولێری، دەستەیەکیان خەڵکی سلێمانی و دەستەیەکی تریشیان کەلاری بوون. کەلارییەکان لە لایەن «کاك عەبدولحەمید»ەوە ئەمیرایەتی دەکران کە پێشمەرگەی کۆنی بزووتنەوەو پیاوێکی دونیا دیتوو و بە ئەزموون بوو، ئەو دواتر بووە یەکێك لە سەرکردە دڵسۆز و تێکۆشەرەکانی ئەنسارولئیسلام. لە راستیدا زۆر بوون ئەو ئەندامانەی باڵی ئیسلاح کە پاش تێکەڵبوونیان لەگەڵ جوندولئیسلام، هێز و توانای خۆیان لە ئاستە جۆراوجۆرەکاندا خستە خزمەت ڕێکخراوە تازەکەوە. هەروەها جگە لە هێزی مرۆیی ئیسلاح کە گوڕ و تینێکی نوێی بەخشییە ڕێکخراوەکە، ئەو چەك و تەقەمەنی و ئیمکانیاتە مادییەش کە ئەوان لەگەڵ خۆیان هێنایان، بووە هۆی دەوڵەمەندکردنی هەرچی زیاتری جوندولئیسلام. یەك لەو شتانە ئامێرێکی پەخشی تەلەفزیۆن بوو کە باڵی ئیسلاح لە سەر حیسابی دارایی خۆی دەستی خستبوو و لە کاتی هۆدنەکەدا لە سلێمانییەوە گواستیانەوە بۆ ناوچەی بیارە. بۆ ئاگاداری خوێنەرانی بەرێز لە کاتی لەتبوونی بزووتنەوەی یەکبووندا، جگە لەو وەفدەی لە لایەن«عەبدولڕەحمان عەبدولڕەحیم»ی بێ لایەنەوە سەرپەرشتی دەکرا، لیژنەیەکی جوندولئیسلامیش چاودێری دابەشکردنی چەك و تەقەمەنی و داراییەکانی بزووتنەوەی یەکبوونی لە نێوان باڵەکاندا دەکرد. هەڵسووکەوتی لیژنەکەی جوندولئیسلام ئەوەندە نەرم و دادپەروەرانە بوو کە سەرسووڕمانی ئەو لایەنانەی لێکەوتەوە کە لە زۆر بوارەوە لەگەڵ ئەم ڕێکخراوەدا ناکۆکییان هەبوو؛ بۆیە هەڵسووکەوتەی ئەم لیژنەیە بووە هۆی ئەوە تاکوو هەرکام لەوان بەشێك لەو شتانەی کە بەریان کەوتبوو ببەخشنە جوندولئیسلام. پاش یەکگرتنی باڵی ئیسلاح و جوندولئیسلام، لایەنگرانی سەلەفییەتی جیهادیی عالەمی بەم یەکگرتنەو بە ئەمیرایەتییەکەی مامۆستا کرێکار زۆر دڵخۆش بوون و پێگەو جێگەی سەلەفییەتی جیهادیی کوردی لە ناو کوڕ و کۆمەڵە ئیسلامخوازە جیهانییەکاندا بەهێزتر بوو و لەم ڕوەیشەوە ئەوان لە ئاستێکی بەرفراواندا کەوتنە یارمەتیدانی ماڵی و مەعنەوی ئەنسارولئیسلام و ئەمەش سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ ئەم ڕێکخراوە.

بە هۆی دژایەتیکرانی ڕەوتی سەلەفییەتی ناو بزووتنەوەی ئیسلامییەوە لە ماوەی ساڵانی ١٩٩١/١٩٩٧دا لە لایەن سەرکردەو باڵەکانی ناو ئەم ڕێکخراوەوە، کاتێك جەماعەت تەوحید و جەماعەت مەرکەز یەکیان گرت و جوندولئیسلامیان دامەزراند، یەك لە مەرجەکانی تەوحید بۆ ئەم یەکگرتنە ئەوە بوو کە هەرکەس پێشتر لە ناو بزووتنەوەدا بەرپرسایەتی هەبووبێت نابێ لە جوندولئیسلامدا بکرێتە بەرپرس و پێویستە وەك تاکێك وەربگیرێت و کاری پێ بسپێردرێ. بۆیە لە کاتی تێکەڵبوونی باڵی ئیسلاح و جوندولئیسلامدا کاتێك بڕیاردرا مامۆستا کرێکار بکرێتە ئەمیر، ژمارەیەك لە تەوحیدەکان تووشی سەرسووڕمان بوون بەڵام وەك جەماعەت تەوحید و بە کۆمەڵ، دژایەتی ئەم بڕیارەیان نەکرد. لە ڕاستیدا ئەگەر ئەوان لە ناخی دڵەوە ئەمەیان پێ‌خۆش نەبووبێ و بە پێچەوانەی ڕێکەوتنەکەی خۆیان و هێزی ٢ی سۆرانیان زانیبێت بەڵام بە هۆی بەرژەوەندی گشتی ڕێکخراوەکەوە ملکەچی ئەم بڕیارە بوون. دانانی ئەو مەرجە لە لایەن تەوحیدەکانەوە، پێوەندیی بە ناکۆکی و دژبەری چەندین ساڵەی نێوان ئەوان و بەرپرسانی

بزووتنەوەی ئیسلامییەوە بوو کە زیاتر شکڵی سەرکوتی سەلەفییەکان و گوێنەدان بە قسەی ئەوان و پێشگرتن بە کار و چالاکییەکانیان بو. ئینجا هەرچەند مامۆستا کرێکار زۆر کەمتر لە بەرپرسانی تری بزووتنەوە ئەمکارەی دەکرد یاخود بە نەرمی دەیکرد بەڵام چونکوو چاوەڕوانی ئاوەها شتێکیان تەنانەت لەو ناستەشدا لە ئەو نەدەکرد بۆیە لێی دڵگران و تووڕە بوون. تەنانەت تەوحیدەکان پێش تێکەڵبوونیان لەگەڵ جەماعەت مەرکەز، ئەم بەدگومانییەیان بە نیسبەت ئەوانیشەوە هەبوو و ئەترسان ئەگەر لە گەڵیان تێکەڵ بن بە لاڕێیاندا ببەن، بۆیە ئەو عەرەبە شامییانەی لەو سەردەمەدا لە لای مەرکەزییەکان و لە گوندی دەگاشێخان ئەمانەوە بە تایبەت ئەبوو عەبدولڕەحمانی ئەمیریان، دەورێکی بەرچاویان لە ڕەواندنەوەی ئەم بەدگومانییەدا گێڕا. ئەوان قەناعەتیان بە ئەندامانی جەماعەت تەوحید کرد کە مەرکەزییەکان جیاواز بیر ئەکەنەوەو ئامادە نین وەك باڵەکانی تری ناو بزووتنەوە بەشداریی لە حکوومەت و پارلەماندا بکەن و بە دوورن لە هەرجۆرە تایبەتمەندییەکی نەتەوەگەرایانەو باوەڕیان بە وتووێژ و دانووستان لەگەڵ لایەنە کوردی و عیلمانییەکاندا نییە. سەرباری ئەوەش دیسان کەمینەیەکی ناو جەماعەت تەوحید، ڕازی بە یەکگرتن لەگەڵ مەرکەز نەبوون بەڵام بە هۆی ئەوەی کاك ئەبووبەکری ئەمیریان و کاك عومەر بازیانی و ئەبوو بەسیری دووهەم ڕازی بەم یەکگرتنە بوون ئیتر ئەوانیش ناچار بوون پێڕەوییان لێوە بکەن. کاتێك پاش شەڕەکەی چیای شنرۆێ و کوژرانی ئەبوو عەبدولڕەحمانی شامی، لە لایەك مەسەلەی دڵساردبوونەوەو دانیشتنی عەرەبە شامییەکانی کەتیبەی ئەقسا و لە لایەکی تریشەوە دانیشتنەکانی جوندو کۆمەڵی ئیسلامی هاتە ئاراوە، دیسان ئەندامانی تەوحید و حەماس کەوتنەوە ڕەخنەگرتن و گلەییکردن و ژمارەیەکیان بڕیاری دانیشتنیان دا. ئەوان کە بە دەستەکەی «کامەران مۆریاسی» ناسرابوون پاش ماوەیەك دابڕان، بە هەوڵی بەرپرسانی جوندولئیسلام گەڕانەوە ناو ئەم ڕێکخراوە. هەرچەند ئەم گروپە بە ناوی دەستەی کامەران مۆریاسی ناوبانگی دەرکرد بەڵام لە ڕاستیدا کامەران ئەمیریان نەبوو بەڵکوو بە هۆی ئەوەی دۆستی حەسەن سۆفی بوو و یەکێك بوو لە دامەزرێنەرانی بزووتنەوەی حەماس، ناوی ئەو زیاتر بەرجەستە بوویەوەو وا لێکئەدرایەوە کە ئەو ئەمیری گروپەکەیە. لە خەڵکانی تری ناو ئەم دەستە دوازدە کەسییە ئەتوانم ئامارژە بە «جەوهەر هەولێری» ناسراو بە «ئەبوو جیهاد هەولێری/ جیهادە سوور» بکەم، ئەو لە دایکبووی ساڵی ١٩٧٤ی زایینی و یەکێك لە حەوت دامەزرێنەرەکەی ڕائەی (جماعة التوحید) بوو. هەروەها «ئۆسامەی فیتەر»یش کە خەڵکی سلێمانی و ئەندامی کۆنی تەوحید بوو ئەندامێکی تری گروپە دوازدە کەسییەکە بوو. ئەم دەستەیە لە کاتی تێکەڵبوونی جوندولئیسلام و باڵی ئیسلاحدا نیگەرانییەکی زۆر دایگرتن چونکوو ئەترسان بەم تێکەڵبوونە ئەزموونەکەیان لەبار بچێت و هۆدنەکەی مامۆستا کرێکاریشیانان بە سەرەتای ئەم لەبارچوونە ئەزانی. یەکێکی تر لە ناکۆکییەکانی ئەم دەستەیە لەگەڵ ئەندامانی تری جوندولئیسلامدا ئەوە بوو کە ئەوان هەر لە سەرەتاوە واتە لە سەرەتای دامەزرانی جوندولئیسلامەوە لەو باوەڕەدابوون کە ناوچەی شارەزوور بۆ هێزە ئیسلامییەکانی تر بەجێ بهێڵن بە تایبەت لە بەر ئەوەی کە ئەم ناوچەیە شوێنی ژیان و حەوانەی بنەماڵەکان و ژن و منداڵی ئیسلامییەکان بوو. بە گشتی ئەوان لە سەرەتادا وایان بە باش ئەزانی کە جوندولئیسلام بچێتە قەندیل و لەوێوە خۆی بە شەڕی پارتییەوە خەریك بکات، بەڵام دواتر ناچار بوون پابەندی بڕیاری زۆرینەی ڕێکخراوەکە بن.

بە نیسبەت ئەو بەشەی پرسیارەکەیشەوە کە ئەندامانی باڵی ئیسلاح پاش تێکەڵبوون بە جوندولئیسلام چییان لێهات و بەرەو کوێ ڕۆیشتن، ئەتوانم بڵێم هەرکام لە ئەوان بە پێی ئەو شارەزاییەی کە بوویان هەروەها بە پێی مەسڵەحەتی ڕێکخراوەکە، لە بەشە جۆراوجۆرەکانی جوندولئیسلامدا ڕێکخران. ئەگەرچی باڵی ئیسلاح تەنیا خاوەن یەك یەکەی سەربازی بوو بە ناوی هێزی «سید قطب» کە کاك «سەیدی» ئامۆزای مامۆستا کرێکار سەرپەرشتی ئەکرد بەڵام ژمارەی تیپەکانی ئەم باڵە لە شوێنە جیاجیاکاندا ئەوەندە زۆر بوون کە لە حاڵەتی کۆدا قەبارەی دوو هێزی تریان هەبوو، بۆیە کاتێك ئیسلاح و جوند وەحدەتیان کرد، بڕیاردرا سێ کەتیبە بە کەتیبەکانی ئەنسارولئیسلام زیاد بکرێ. کەتیبەی

سەید قوتب هەر بەو ناوەوەو بە ئەمیرایەتی کاک سەید کە پلەی سەرکردایەتی ئەنسارولئیسلامیشی پێ بەخشرابوو تێکەڵ بە هێزی عەسکەری ئەنسار بوو و بە هۆی تێکەڵکرانی تیپەکانیشەوە دوو کەتیبەی تر واتە کەتیبەی «شُهدا» بە ئەمیرایەتی کاک «عەبدولحەمید کەلاری» کە ئەویش بووبووە ئەندامی سەرکردایەتی و کەتیبەی «مُهاجرین» بە ئەمیرایەتی «کاک سوارە» دروست کران. هەروەها دوو ئەندامی تری ئیسلاحیش پلەی سەرکردایەتی ئەنسارولئیسلامیان وەرگرت کە بریتی بوون لە «دوکتۆر عومەر شارباژێڕی» و «دوکتۆر قودس کەلاری». هەروەها هەیئەی سەربازی ئەنساریش «کاک نامێق» و «کاک خەلیل» و «موحەممەد عەبدولعەزیز» کەلاری لە سەر لیستەی باڵی ئیسلاح بۆ زیاد کراو چەند کەسێکی تری ئیسلاحیش کە یەکێکیان «مەلا مەروان» بوو هەر لەم بەشەدا کاریان پێ سپێردرا.

دەربارەی ئەوەش گۆیا لە سەر تەنزیماتی بەغدا کێشە کەوتۆتە ناو ئەندامانی هەیئەی شەرعییەوە، لە راستیدا ئەم مەسەلەیە هەڵگری باسێکی زۆرە بەڵام هەوڵ ئەدەم بە کورتی لە بارەیەوە قسە بکەم. وەك لە بەشەکانی پێشوودا باسم کرد هەر لە سەردەمی بزووتنەوەوە جەماعەت مەرکەز لە شاری بەغداو چەند شوێنێکی تر دەستیان بە کاری رێکخستن کرد و توانییان خەڵکانێکی زۆری عەرەب لەگەڵ خۆیان بخەن. دواتر کە مەرکەز بەشداری لە دروستکردنی جوندولئیسلامدا کرد ئەوانیش بوون بە بەشی ناوەوەی ئەم رێکخراوەو پاشان هەندێکیشیان خۆیان گەیاندە کوردستان و تێکەڵ بە موجاهیدینی جوندولئیسلام بوون. ئەڵبەت هاتنی ئەوان پێش دروستبوونی جوندولئیسلام و لە سەردەمی بزووتنەوەی یەکبووندا دەستی پێ کرد کە لەو کاتەدا جەماعەت مەرکەز بەشێك بوو لە بزووتنەوە. هەروەها بزووتنەوەی حەماسیش توانیبووی لە ماوەی کورتی تەمەنیداو پێش وەحدەتکردنی لەگەڵ تەوحیدەکان، لەگەڵ ژمارەیەك لە ئەندامانی تەنزیماتی بەغدادا پێوەندیی بگرێت و بەرەو لای خۆی رایانبکێشێ.

سیانزە رۆژ پاش شەڕی شنرویێ یەکێك لە ئەندامانی تەنزیماتی بەغدای سەردەمی بزووتنەوەی حەماس، لە لایەن دەستەکەیانەوە رەوانەی کوردستان ئەکرێت و پێوەندیی بە کاك عومەر بازیانییەوە ئەکات کە پاش شەهیدبوونی ئەبوو عەبدولڕەحمانی شامی ئەمیرایەتی کەتیبەی ئەقسا ی کەوتبووە سەر شان. ئەو کەسەو هاوڕێکانی لە ماوەیەك پێشەوە لە زۆر بووارەوە یارمەتییان لە کاك عومەر وەرگرتبوو، ئەو ناوی «ابو زُبیر» بوو و خەڵکی بەغداو لە دایکبووی ۱۹۷۳ی زایینی بوو. ئەبوو زوبەیر شارەزاییەکی زۆری لە زانستە ئیسلامییەکاندا هەبوو و روانگەکانی سەلەفییەتی جیهادی باش خوێندبۆوەو باشیان لێ تێگەیشتبوو، بۆیە لەم بوارەشدا کەسێکی بە توانا بوو.

هەروەها ئەبوو زوبەیر لە کاتی عەسکەری کردندا لە سوپای عێراق، بە هۆی زیرەکییەوە یان واباشە بڵێین لە پێناو مەبەستێکی تایبەتدا، توانیبووی پلەی ئەفسەری بە دەست بهێنێت. تەنانەت ئەیان وت ئەو بەرنامەی دامەزراندنی رێکخراوێکی ئیسلامی هەبووە بۆیە لە بواری عەسکەرییشدا فێری زۆر شت بووەو شارەزاییەکی باشی لە ناسین و بەکارهێنانی چەکەکان و شێوازەکانی شەڕکردن و لێدان و بەرگریکردندا بە دەست هێناوە. هاتنی ئەو بۆ ناوچەکانی ئیمارەتی بیارە لەو کات و ساتەدا، پێوەندیی بە ناکۆکی و تێکگیرانەکانی تەنزیماتی بەغداوە بوو کە ماوەیەك بوو ئەم ناکۆکییانە زەق بووبووەوە، ئەبوو زوبەیر لە لایەن دەستەکەی خۆیەوە رەوانە کرابوو تاکوو وەك نوێنەری ئەوان راستییەکان بگەیەنێتە بەرپرسانی ئیمارەتی بیارە. ئەم ناکۆکیانە لە نێوان دەستەکەی سەر بە حەماس و دەستەکەی سەر بە مەرکەزدا هاتبووە ئاراوە کە پاش دروستبوونی جوندولئیسلام دەبوایە ئەوانیش لە چوارچێوەیەکی تەنزیماتیی هاوبەشدا کارەکانیان راپەڕاندایە بەڵام ئەم کارەیان نەکردبوو. ئەبوو زوبەیر لە کاتێکدا بە مەبەستی چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی ناو تەنزیماتی بەغدا رووی لە بیارە کردبوو کە خودی جوندولئیسلامیش بە دەست هەندێك کێشەو ناکۆکی نێوخۆییەوە ئەیناڵاند. بۆیە کاك عومەر بازیانی زۆر بە خێرایی ئەبوو زوبەیر لەگەڵ واقیعەکانی ئیمارەتی بیارە ئاشنا ئەکات و بە تەمابوو شوێنی ئەبوو عەبدولڕەحمانی شامی پێ پڕ بکاتەوەو بیکاتە ئەمیری کەتیبەی ئەقسا . کاك عومەر کاتێك ئاگاداری ئەوە دەبێت کە ئەبوو زوبەیر هەم لە رووی شەرعی و هەمیش لە رووی عەسکەرییەوە کەسێکی

شارەزاو بە توانایە، ئەوی کردە جێگری خۆی واتە جێگری ئامر کەتیبەی ئەقسە.. بازیانی بە تەما بوو بەرەبەرە کاروباری کەتیبەکە بخاتە سەرشانی ئەبوو زوبەیر تاکوو خۆی لە ڕێگەی هەیئەی شەرعییەوە هەوڵی ئەهێشتنی ناکۆکییەکانی بەغدا بدات. بەڵام ئەو لە کاتی بەدواداچوونی مەسەلەکەدا، شێخ ئەبوو وائیل بەرپرسی هەیئەی شەرعی جوندولئیسلام و سەرکردە کۆنەکانی مەرکەزی لە بەرامبەر خۆیدا بینییەوە کە هەم شارەزاییەکی زۆرتریان لە ناکۆکییەکان هەبوو و هەمیش ئەیانتوانی بە ئاسانی چارەسەریان بکەن بەڵام بە هۆی جیاوازی روانگەو بۆچوونەکانیانەوە، نەیانتوانی بە ئەنجامێك بگەن. ئەم جیاوازی و ناکۆکییە لەوەوە سەرچاوەی ئەگرت کە ئەبوو زوبەیر لە لایەك خۆی لە ئەبوو وائیل پێ گەورەتر بوو و لە لایەکی تریشەوە لەو باوەڕەدا بوو کە پێویستە ئەو ئەفسەرانەی پابەندبوونی خۆیان بۆ بەرنامەو بیروباوەڕی جوندولئیسلام سەلماندووە بەڵام تاکوو ئێستا لە ناو ئارتەشی بەعسدا ماونەتەوە، زوو بە زوو بێنە دەرەوە مەگەر مەسڵەحەتی موسوڵمانان یان ئەنجامدانی کارێکی تایبەتی وەك کودیتا پاساوی مانەوەیان بداتەوە. بەڵام ئەبوو وائێل و هاوڕاکانی لە ئەساسدا دژی هاتنەدەرەوەی ئەوان لە ئارتەشی عێراق بوون و ئەمەش پێچەوانەی بۆچوونەکەی ئەبوو زوبەیر بوو. ئەبوو وائێل و چەند ئەندامەکی تری هەیئەی شەرعی لە لایەك بەو هۆیەوە کە هەندێ لەو کەسانە –ئەندامانی رێکخستنی ناوەوە– لە ناو ئارتەشی عێراقدا بەرپرسایەتی بەرزیان هەبوو لە لایەکی تریشەوە بەو هۆیەوە کە بە نیسبەت شاردنەوەو ناو نەهێنانی هەندێکیانەوە سوێندیان خواردبوو، نەیان ئەتوانی دەربارەی ئەوان زانیاری تەواو بدەنە کاك عومەر. لە ئەساسیشدا بە پێویستیان نەئەزانی بە هۆی ناوبردنی ئەو کەسانەوە قەناعەت بە بازیانی بکەن و دڵی ئەوان لە خۆیان رازی بکەن. بۆیە کاك عومەر لە چەند جار دانیشتن و کۆبوونەوەی لەگەڵ ئەواندا، بە نائومێدی ئەگەڕایەوەو پاشان لە رووی دڵسافییەوە هەموو شتێکی بۆ ئەبوو زوبەیر باس دەکرد. بۆیە ئەو بە هۆی ئەو زانیارییانەوە لە رێگای عومەر بازیانییەوە پێی ئەگا، تووشی لێکدانەوەی هەڵە ئەبێ و دێتە سەر ئەو باوەڕ و قەناعەتە کە لە ماوەیەکی کورتدا نیمارەتی بیارە بە لاڕێدا ئەچێت و تووشی داڕمان ئەبێت. بۆیە لە رووی متمانە پێبوونەوە پێوەندیی بە پێنج کەس لە ئەندامانی کەتیبەی ئەقساوە دەکات و پاش راوێژکردن لەگەڵیاندا بەڵێنیان لێ ئەسێنێ تاکوو ئەگەر نیمارەتی بیارە تووشی ئەو حاڵەتان هات تەنانەت ئەگەر بڕیاری تێکەڵبوونی جوندولئیسلام و کۆمەڵی ئیسلامییش – لەو کاتەدا جوند و کۆمەڵ خەریکی دانووستان و وتووێژ بوون – درا ئەوان وەك کوتلەیەك سوور بن لە سەر رێچکەو رێبازی خۆیان و دژایەتی هەموو ئەو شتانە بکەن.

لەو سەردەمەدا خودی کاك عومەر بازیانیش تووشی ئاوەها حاڵەتێك هاتبوو و ئەویش بە هەمان شێوەی ئەبوو زوبەیر داهاتوویەکی وەك بزووتنەوەی یەکبوونی بۆ جوندولئیسلام پێشبینی ئەکرد. ئەم پێشبینیە زیاتر لە رووی بەدگومانییەوە بوو چونکوو ئەوەی دواتر رووی دا پێچەوانەی ئەم پێشبینیە بوو. لە لایەك رێکنەکەوتنی جوندولئیسلام و کۆمەڵی ئیسلامی لە دانیشتنەکانیانداو لە لایەکی تریشەوە سەرکەوتنی موجاهیدین لە شەڕی تاوێرەو ناوچەی هاوارییەکاندا، ناڕاستبوونی بۆچوونەکانی کاك عومەر و ئەبوو زوبەیری سەلماند. بۆیە پاش بە راست دەرنەچوونی پێشبینییەکانی ئەوان، یەکێك لەو ئەندامانەی کەتیبەی ئەقسە کە پێشتر ئەبوو زوبەیر قسەی لەگەڵ کردبوون، باسی پێشبینیەکەی ئەو و کاك عومەر و پلان و بەرنامەکانیان بۆ سەرکردایەتی جوندولئیسلام ئەکات. بۆیە تووڕەییەکی زۆر بە نیسبەت ئەبوو زوبەیر و بازیانییەوە لای سەرکردایەتی جوندولئیسلام دروست ئەبێ و قیادەی رێکخراوەکە ئەوان بە کوتلەبازی تاوانبار ئەکات. ئیتر ئەمە بەس بوو بۆ ئەوەی ئەبوو زوبەیر کە ماوەیەك بوو بووبووە ئەمیری کەتیبەی ئەقسە نەك بەرپرسایەتی کەتیبەکەی لێ بسەنرێتەوە بەڵکوو بە تەواوی لە رێکخراوەکە دەر بکرێ، هەروەها ئەندامانی خوارەوەی جوندولئیسلامیش ئەم کارەی ئەبوو زوبەیریان بە خیانەت وەسف دەکرد. بۆیە پاش دەرکرانی لە جوندولئیسلام، ئەبوو زوبەیر رووی لە ناوچەی تەوێڵە کرد و لە لایەن تەحسینی کوڕی مەلا عەلی عەبدولعەزیزەوە پەنا درا. لە سەردەمی مانەوەی ئەبوو زوبەیر لە ناو جوندولئیسلامدا، ئەو لە لایەن ئەبوو مەسعەبی سیلاح فرۆشەوە کە یەکێك بوو لە کۆنە

حەماسەکان و خەڵکی سەید سادق بوو خێزاندار کرا واتە ئەبوو مەسعەب خوشکێکی خۆی بە ئەبوو زوبەیر داو و کردییە زاوای خۆی. هەروەها کاک عومەر بازیانیش بەوە تاوانبار ئەکرا کە نهێنی سەرکردایەتی گێڕاوەتەوە بۆ ئەندامانی کەتیبەی فەتح و ئەبوو زوبەیر، بۆیە هەندێ کەس ئەم کارەی ئەویان بە سادەیی و نەزانکاری وەسف ئەکرد. بە رای من هۆکاری نەرم مامەڵەکردنی سەرکردایەتی جوندولئیسلام لەگەڵ عومەر بازیانیدا پێوەندیی بەوەوە بوو کە ئەگەر ئەوە بوو بە دەرکران یان جیابوونەوەی ئەو بەشێك لە ئەندامانی کەتیبەی فەتح و کۆنە حەماس و تەوحیدەکان لەگەڵیدا رێکخراوەکە بەجێ بهێڵن و ئەمەش زیانی بە رێکخراوەکە ئەگەیاند. بۆیە بڵاوکردنەوەی ئەو شتانە لە سەر کاك عومەر زیاتر بە مەبەستی شکاندنی ئەو بوو لە ناو رێکخراوەکەدا بە گشتی بە تایبەت لە ناو کەتیبەی فەتحدا نەك بە مەبەستی دەرکردنی ئەو لە جوندولئیسلام. ئەم حاڵەتەو نەخۆشی بەدگومانی بە گشتی بەرەبەرە هەموو بەشەکانی جوندولئیسلام و دواتریش ئەنسارولئیسلامی گرتەوەو تا کاتی رووخانی ئیمارەتی بیارە بەردەوام بوو.

**عەرەبە شامییەکانی ناو جوندولئیسلام ژمارەیان چەند بوو و زیاتر لە کام بەشاندا کاریان پێ سپێردرابوو، پاش شەڕی شنرویێ و ئەو ناکۆکی و دڵشکانەی هاتە ئاراوە ئەوان چیان بە سەر هات و روویان لە کوێ کرد؟**

هاتنی عەرەبە شامییەکان بۆ کوردستان ئەگەڕایەوە بۆ سەردەمی بزووتنەوەی یەکبوون و سەردەمی هێزی [2]ی سۆران واتە جەماعەت مەرکەز، لەو کاتەوە ئەبوو عەبدولڕەحمانی شامی (فەلەستینی) ئەمیرایەتی ئەوانی لە ناو جەماعەت مەرکەزدا ئەکرد. عەرەبە شامییەکان پاش دروستبوونی جوندولئیسلام بە هاوکاری عەرەبە عێراقییەکان و ژمارەیەك لە کوردەکانی کوردستانی ئێران، کەتیبەی (اقصـة )یان پێکهێنا کە تا کاتی شەهیدبوونی لە شەڕی شنرویێدا، ئەبوو عەبدولڕەحمان ئەمیرایەتی ئەم کەتیبەیەی ئەکرد. عەرەبە شامییەکان بە گەورەترین تەوژمی ناو عەرەبەکانی سەردەمی مەرکەز و جوندولئیسلام ئەژمار دەکران. ئەوان لە سەردەمی هاتنیانەوە بۆ کوردستان و چوونە ناو جماعەت مەرکەز؛ سەرەتا بە رەزامەندی بەرپرسانی مەرکەز و پاشان جوندولئیسلام، دێی دەگاشێخانیان لە ناوچەی هەورامان وەك شوێنی حەوانەوەو جێگیربوونی خۆیان دیاریی کرد. ئەوان لە سەردەمی بزووتنەوەی یەکبووندا پێوەندیی نزیك و دۆستانەیان لەگەڵ جەماعەت تەوحیددا هەبوو و ئەبوو عەبدولڕەحمان دەورێکی باشی لە دروستکردنی متمانەی نێوان سەرکردەکانی تەوحید و مەرکەزدا گێڕا. ئەو بە بەرپرسانی تەوحیدی وتبوو ئەگەرچی مەرکەزیەکان لە ناو بزووتنەوەدا وەك ئێوە دەرنەچوون بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەگەر جەماعەت مەرکەز بەڕێوەبردنی رێکخراوێکی سەلەفی جیهادی بکەوێتە دەست، ناکەوێتە چەواشەکاری و ئامادە نییە ولز لە جیهاد و شتە نەگۆڕەکان و دەقە شەرعییەکان بهێنێ و نایەوێت وەك بزووتنەوە بەشداریی لە پارلمان و حکوومەت و دانیشتنی حزبە کوردییەکاندا بکات. ئەم دەورە دڵسۆزانەیەی ئەبوو عەبدولڕەحمان و عەرەبە شامییەکان، بووە هۆی خۆشەویستبوونی ئەوان لای ئەندامانی جەماعەت تەوحید. بە هۆی زۆر بوونی ژمارەیانەوە، جوندولئیسلام ١٥٠ کەس لە عەرەبە شامییەکانی بۆ دروستکردنی (قوة الضاربە) واتە هێزی لێدان و زەبر وەشاندن بەکار هێنا. هەروەها دەستەیەکی تریشیان وەك کەسانی خۆبەختکار و (استشهادی) ئامادە کران تاکوو لە کاتی پێویستداو بە پێی پلان و بەرنامەی سەرکردایەتی جوندولئیسلام خۆیان فیدا بکەن.

عەرەبە شامییەکان بە ئاستێکی زۆر لە ژێر کاریگەری کۆنە حەماس و تەوحیدەکاندا بوون. بۆیە پاش شەهیدبوونی ئەبوو عەبدولڕەحمان، کاتێك سەرکردایەتی جوندولئیسلام بە هۆی نزیکبوون و تێکەڵبوونی عومەر بازیانی لەگەڵ ئەوانداو ئەو رەفاقەت و دۆستایەتییەی لە گەڵ ئەبوو عەبدولڕەحماندا هەیبوو، بازیانییان وەك ئەمیری خۆیان لە کەتیبەی ئەقسە هەڵبژارد. لەو کاتەدا دەنگۆو مقۆمقۆیەك لە ناو عەرەبە شامییەکان و کەتیبەی فەتح و کۆنە حەماس و

تەوحیدەکاندا پەیدا بووبوو کە پێوەندیی بەو مۆڵەتە ٢٠ ڕۆژییەوە بوو کە یەکیەتی درابوویە کۆمەڵی ئیسلامی تاکوو لەو ماوەیەدا جوندولئیسلام بێنێتە سەر ڕێگەو ڕێبازی خۆی. فەتحییەکان و عەرەبە شامییەکان لەو باوەڕەدا بوون کە ڕێکەوتنی نێوان جوند و کۆمەڵی ئیسلامی ئاکامی خراپی لێ ئەکەوێتەوەو ئەبێتە هۆی لەبارچوونی ئەزموونەکە. بۆیە شامییەکان لە ژێر کاریگەری ئەم بارودۆخەدا بە خێرایی بڕیاری خۆیان داو ڕێکخراوی جوندولئیسلام و خاکی کوردستانیان بەجێ هێشت و بە مەبەستی جیهادکردن ڕوویان لە وڵاتانی تر کرد. هەرچەند ئەندامانی کەتیبەی فەتحیش کەوتبوونە ئاوەها حاڵەتێکەوە بەڵام جگە لە هەندێ لە سریەکانیان کە دەستیان لە کار کێشایەوەو لە شارۆچکەی خورماڵی ژێر دەسەڵاتی کۆمەڵی ئیسلامیدا نیشتەجێ بوون –دواتر ئاشت کرانەوەو گەڕانەوە ناو جوندولئیسلام– زۆربەیان مانەوەیان لە ناو ڕێکخراوەکەدا هەڵبژارد.

ڕەنگە هەندێ شتی ورد بپرسین کە لای تۆو خوێنەریش سەیر بنوێنێ، بەڵام چونکوو لەم بەشەدا لە سەر وڵاتی خۆمان چڕ بووینەتەوە بە پێویستی ئەزانین هەرچی وردتر و شیکارنەتر ڕاڤەی جووڵانەوەی سیاسی ئیسلامگەراکانی کوردستان بکەین، هەندێ لەو شتە ورد و گرنگانە کە یا باس نەکراون یا خود کەمتر ڕوونکردنەوەیان بۆ کراوە ئەم شتانەن کە بە کورتی ئاماژەیان پێ ئەکەین و تکایە بۆمانی ڕاڤە بکە:

–لە ئەدەبیاتی سەلەفییەتدا «وڵاتی شام» بە کوێ دەوترێ؟

–وەك پێشتریش وتراوە «ئەبوو وائیل» و «ئەبوو عەبدولڕەحمانی شامی» ڕۆڵێکی دیاریان لە ڕێکخراوی جوندولئیسلامدا گێڕاوە. بە ئاستی یەکەم کەمێك باسی پێشینەو ڕابردووی ئەو دوو پیاوەمان بۆ بکەو بە ئاستی دووهەمیش ئایا جیا لەوان و «ئەبوو زوبەیر» عەرەبێکی بەرجەستەی دیکەمان لە نێو جونددا هەبوو؟

–ئایا ڕاستە ئەبوو زوبەیر پاش دەرکرانی لە جوندولئیسلام، گروپێکی سەلەفی جیهادیی دیکەی دامەزراند؟ ئەگەر ڕاستە ناوی ئەو گروپەو مێژۆچکەیەکیمان بۆ باس بکە.

–موجاهیدینی عەرەب زیاتر بە کام ڕێگادا خۆیان دەگەیاندە ناوچەی بیارە؟

لە جوگرافیای کۆندا شام بریتی بووە لە سووریا، ئەردەن، فەلەستین، لوبنان و بەشێك لە عێراق واتە بەغداو مووسڵ و ڕۆمادی و هەولێر و تەنانەت چەند شوێن و ناوچەیەکی سنووریی تورکیاو کوردستانی عێراق. لە ئەدەبیاتی سەلەفییەت و ئیسلامییەکانیشدا هەر ئەو مانایە ئەدات و بە هەمان ئەو شوێنانە ئەوترێت شام کە ناوم هێنان. ئێستاکەش خەڵکی دەمشق و دەوروبەری بە ناوچەکانی نیشتەجێبوونی خۆیان ئەڵێن شام.

سەبارەت بە ئەبوو وائێل و ئەبوو عەبدولڕەحمانی شامی ئەوەندەی ئاسیونم و ئاگادری دەور و چالاکییەکانیان بووم، لە بەشەکانی پێشوودا دەربارەیان قسەم کرد و تەنیا ماوەتەوە بڵێم ئەبوو وائێل لە دایکبووی چلەکان (زایینی) و ناوی ڕاستەقینەی «سعدون» بوو و شێخ سەعدوونیشیان پێ ئەوت. پاش ئێعدامکرانی ئەمیری ڕێکخراوی «جُندالرحمن» واتە «ئەبوو نازم» لە هەشتاکاندا لە لایەن ڕژێمی بەعسەوە، ئەبوو وائێل جێگای ئەوی گرتۆتەوەو بەم هۆیەشەوە چەند ساڵێك لە لایەن دەسەڵاتەکەی سەدام حسەینەوە زیندانی کراوە. کوردێکی خەڵکی هەولێر بە ناوی مام جەعفەرە شەل کە بە ناوی ڕێکخستنی یەکییەتیەوە گیرابوو، ساڵی ١٩٨٤ی زایینی لە زینداندا لە گەڵ ئەبوو وائێل ئاشنا ئەبێت و ئەکەوێتە ژێر کاریگەری بۆچوونەکانیەوەو ئەبێتە ئەندامی جوندولڕەحمەن. دەربارەی ئەبوو عەبدولڕەحمانی فەلەستینیش ئەتوانم بڵێم ئەو لە دایکبووی شەستەکان بوو و «قاعد کریسات»یشیان پێ ئەوت ئیتر نازانم ئەمە ناوی ڕاستەقینەی ئەو بوو یان نە. پاش شەهیدبوونیشی لە شەڕەکەی شنرۆێدا، پرسیارم لە براکەی کرد و پێم وت: ئەڵێن ئەبوو عەبدولڕەحمان

بەشداری جیهادی چەندین وڵاتی کردووە بۆ نموونە ئەوتری لە نەوەدەکاندا لە بۆسنە خەریکی جیهاد بووە؟ براکەی هەموو ئەمانەی رەت کردەوە و وتی: «ئەبوو عەبدولرەحمان پێش کوردستان تەنیا سەردانی ئەفغانستانی کردووەو بەس». ئەبوو عەبدولرەحمان خەڵکی وڵاتی فەڵەستین و دانیشتووی ئەردەن بوو. پێش شەهیدبوونی زەرقاوی یەکێك لە هاوەڵان و یارمەتیدەرانی ئەو بە ناوی «حمزە» یان «ابو حمزە» لە خۆرهەڵاتی شاری بەغدا کوژرا، ئەم ئەبوو حەمزەیە دۆستێکی نزیکی ئەبوو عەبدولرەحمان بوو و ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوە کە رەنگە قاعد کریسات پێوەندیی نزیك و دۆستانەی لەگەڵ زەرقاوی و ئەبوو موحەممەدی مەقدەسیدا هەبووبێ.

هەروەها لە شەڕی شنرویدا چەند عەرەبێکی تریش لەگەڵ ئەبوو عەبدولرەحماندا کوژران کە یەکێکیان ناوی «ابوو صیف» بوو و پێدەچوو کەسێکی بە ئەزموون و گەورە بێ کە بە هۆی زوو شەهید بوونیەوە مەجالی خۆ دەرخستنی پەیدا نەکرد. براکەی ئەبوو عەبدولرەحمان کەسێکی بەرجەستە نەبوو و نازانم پاش هێرشەکەی ٢٠٠٣ بەرەو کوێ رۆیشت. تا ماوەیەك پاش کوژرانی ئەبوو عەبدولرەحمان، زاوایەکی بە ناوی «قسام» کاروبارەکانی ئەوی ئەنجام ئەدا کە پاش هاتنی هێزەکانی ئەمەریکا بۆ عێراق، لە ساحەی جیهادی ئەم وڵاتەدا شەهید بوو. ژن و منداڵەکەی ئەبوو عەبدولرەحمان ماوەیەك پاش کوژرانی ئەو رەوانەی وڵاتی ئەردەن کرانەوە.

جگە لەو کەسانەی کە ناوم هێنان، هەندێ خەڵکی تریش هەبوون کە بە خەڵکانی گەورەو بەرجەستەی ناو موجاهیدە عەرەبەکان باس ئەکران. «ابو عُمر» کە دانیشتووی شاری هەولێر و شارەزای بواری (هندسە العکسریە) بوو و ئەویش وەك ئەبوو سەیف زۆر نەمایەوەو لە سەرتاکانی جیهادی جوندولئیسلامداو پاش شەڕی خێڵی حەمە، بە هۆی پریشکی گوللە هاوەنەوە شەهید بوو، «ابو طلحە»ی عێراقی، «ابو اسماعیل» و «ابو غفران»ی برای و «ابو عثمان»ی جێگری ئەبوو تەڵحە، لە عەرەبە دیار و ناسراوەکانی ناو جوندولئیسلام بوون. لە ناو کەسانی خوارتر لەوانیش ئەتوانم ئاماژە بە «ابو انس» و «ابو زُبیر»ی هاوڕێی بکەم کە هەردووکیان خەڵکی عێراق و خاوەن پلەو پێگەی باش بوون لە ئیمارەتی بیارەدا. هەر لە ئاست و مستەوای ئەواندا کەسێکی تریش هەبوو بە ناوی «عبدالرحمان الشمری» کە ژنێکی هەورامی هەبوو و لە سەردەمی مەرکەزەوە هاتبووە کوردستان. ئەو کە هاتووچووی (داخڵ)ی عێراقی ئەکرد، لە لایەن رژێمی بەعسەوە گیراو باسی ئەوە دەکرا گۆیا ئیعدام کراوە. ژن و منداڵەکەی ئەلشەمری تا کاتی هێرشەکەی ٢٠٠٣ لە ناوچەکەدا بوون و نازانم دواتر چییان بەسەر هات.

دەربارەی ئەبوو زوبەیریش کە وتووتانە پاش دەرکرانی لە جوندولئیسلام رێکخراوێکی دامەزراندووە، راستە لەو کاتەدا باسی ئەوە دەکرا گۆیا ئەو بە هاوڕێیەتی هەندێ کەسی تر رێکخراوێکی بە ناوی «جُند المنتقم» دروست کردووە. هەروەها لەو سەردەمەدا بڕێك شتی پێوەندیدار بەو رێکخراوە لە ناو کۆمپێتەری ئەندامانی ئەنساروئیسلامدا دەستاودەستی پێ دەکراو تەحسینی مەلا عەلیش بەوە تاوانبار دەکرا کە پەنای ئەوی داوەو یارمەتی ئەدات و بەشداریی لە پیلانگێڕییەکانی ئەو دژی جوندولئیسلام ئەکات. زۆربەی ئەندامانی جوندولئیسلام دامەزرانی جوندولمونتەقمیان بە دژایەتیکردنی خۆیان و رێکخراوەکەیان دەزانی. لە پێوەندیی لەگەڵ جوندولمونتەقم و پێوەندییان لەگەڵ جوندولئیسلام، ئەبوو زوبەیر شریتێکی سەوتی رەوانەی (داخڵ) کردبوو کە تیایدا «جووتیار والی عەلی» بە عەرەبییەکی کرچ و کاڵ دەربارەی جوندولمونتەقم پرسیاری لە ئەبوو زوبەیر دەکرد. -جووتیار والی عەلی خەڵکی هەڵەبجە بوو کە لە رێی کۆنە حەماس و تەوحیدەکانەوە هاتبووە ناو جوندولئیسلامەوەو لە کەتیبەکانی فەتح و بەدردا موجاهید بوو و پاشان بە هۆکارێك لەم رێکخراوە دەر کرا. ئەو بەهاری ساڵی ٢٠٠٩ ی زایینی لە گەڕەکی گرێژەی شاری سنە لە کاتی شەڕ و پێکادان لەگەڵ هێزەکانی سوپاو ئیتلاعاتی ئێراندا کوژرا. باسی ئەوە دەکرا کە ئەو لە ماوەیەك پێشترەوە خەریکی دامەزراندنی گروپێکی سەلەفی جیهادی بووە- پاشان نوسخەیەکی ئەم شریتە لە رێگای عەرەبەکانی وابەستە یان ئەندامانی (داخڵ)ی جوندولئیسلامەوە لەگەڵ سکاڵایەکی نووسراودا رەوانەی سەرکردایەتی جوند لە بیارە

کرا. ئینجا هەرچەند ئەبوو زوبەیر ڕەتی دەکردەوە کە لەم شریتەدا دژایەتی جوندولئیسلامی کردبێت و ئەیوت ئەمەم بە مەبەستی وەڵامدانەوەی پرسیاری خەڵکانی ناوەوە دەربارەی شێوازی کارکردنی جوندولمونتەقم کردووە، بەڵام سەرکردایەتی جوند ئەمەیان لێ قبوول نەدەکرد. لەو کات و ساتانەدا سەردانێکی مامۆستا ئاسۆ هەولێریم کرد کە پیاوێکی ڕەوشت بەرز و نەرم و نیانە، کاتێک باسی ئەوەم کرد کە واباشە قیادەی جوند کەمێک هەڵوێست و هەڵسووکەوتیان بەرانبەر ئەبوو زوبەیر نەرم بکەنەوە چونکوو ئەو خۆی بە دوژمنی ئەم ڕێکخراوە نازانێ و سەرباری ئەوەش کە دەرکراوە دیسان ئەم ڕێکخراوەی خۆش ئەوێ، مامۆستا ئاسۆ لە وەڵامدا وتی: «کار و کردەوی ئەم پیاوە زیانی زۆری پێ گەیاندووین. بە تایبەت لە ناوەوە (داخڵ) هەموو شتێکی لێ تێک داوین و کێشەو مقۆمقۆی خستۆتە ناو ئەندامانی ڕیخستنەکانمان و لێرەش جووتیار خۆی داوەتە پاڵی و پێکەوە خەریکی ئاژاوەگێڕین». پاش ئەم قسانە مامۆستا ئاسۆ پێی وتم ئەگەر شریتەکەت نەبینیوە ئەتوانی لای من ببینی، بزانە چۆناوچۆن جووتیار بە عەرەبیە شەق و شڕەکەی پرسیار لە ئەبوو زوبەیر ئەکات و ئەویش بانگەشە بۆ جوندولمونتەقم دەکات و لە لایەک هەوڵی سەلماندنی بێ خەتایی خۆی و گروپەکەی و لە لایەکی تریشەوە هەوڵی دروستکردنی فیتنەو دووبەرەکی لە ناو موجاهیدیندا ئەدا.

دواتر کاتێک لە نزیکەوە چاوم بە ئەبوو زوبەیر کەوت و قسەم لەگەڵ کرد، ڕەتی ئەکردەوە کە ڕێکخراوی دامەزراندبێ و ئەیوت ڕاستە ئەنسار دروشمی ڕێکخراوێکیان بە ناوی جوندولمونتەقم و هەندێ شتی تری (إعلامی)یان دەسکەوتووە گۆیا پێوەندییان بە منەوە هەیەو سەلمێنەری ئەوەن کە من بە نهێنی دەستم داوەتە ئەو کارانەو تیایاندا دژایەتی ئەوانم کردووە بەڵام هەموو ئەمانە دوورن لە ڕاستییەوە چونکوو من هەرگیز مەبەست و مەرامێکی وام نەبووە. ئەو ئەیوت: «من ناڵێم ئەو شتانەی دەستیان کەتووەو لە لایانە، پێوەندیی بە منەوە نییە بەڵکوو ئەمەوێ ئەوە بڵێم کە ڕێکخراوی جوندولمونتەقم لە لایەن خەڵکانی داخڵ و لە ژێر دەسەڵاتی بەعسدا دروست کراوەو لە بەر ئەوەی ئەوان ناتوانن لەوێ کارەکانیان ڕاپەڕێنن بۆیە منیان ڕاسپاردووە تاکوو بەشێک لەو کارانەیان لەم ناوچەیەدا بۆ ئەنجام بدەم». هەروەها ئەو ئەیوت: « کاتی خۆی بە مەبەستی ئەنجامدانی هەندێ کاری کۆمپیتر چوومە لای دووکاندارێکی سەر بە کۆمەڵی ئیسلامی لە شاری خورماڵ و پاشان ئەو دووکاندارە کە جوندولئیسلامی خۆشویستووەو لە گەڵیاندا پێوەندیی بووە وایزانیوە ئەمە کارێکی نهێنییەو بە مەبەستی دژایەتیکردنی جوندە. بۆیە خیانەتی لە ئەمانەتدا کردووەو لە هەرکام لە شتەکان نوسخەیەکی لای خۆی هێشتۆتەوەو پاشان گەیاندوویەتییە دەست ئەندامانی جوندولئیسلام. ئەوانیش بە هەمان شێوەی دووکاندارەکە وای بۆچوون ئەمە کارێکی نهێنی و بۆندارەو ئینجا بە هۆی ئەو نێوان ناخۆشییەی لەگەڵ مندا هەیانبوو، وایان لێکداوەتەوە کە ئەمە ئەخشەیەکە بۆ زەربە لێدان لە جوندولئیسلام». ئەبوو زوبەیر ئەیوت ڕاستە من ئێستاش ڕەخنەم لە جوندولئیسلام هەیە بەڵام ئەک دژایەتی ئەم ڕێکخراوە ناکەم بەڵکوو لای خواش خۆم بە مەعزوور ئەزانم کە ئەمتوانی بەشداری لە کارە خێرەکانی ئەواندا بکەم، ئەڵبەت ئەمە خەتای من ئەبوو چونکوو قیادەی جوند منیان دەرکرد و بە هۆی ئەو بەدگومانییەوە کە نیسبەت بە من بوویان، ئیزنی خزمەتکردنیان پێ ئەدام، دەنا من ئێستاش شانازی بەوەوە ئەکەم کە بۆ ماوەیەکی کەم بەشداریم لە جیهاد و کارە خێرەکانی ئەم ڕێکخراوەدا کردووە.

بە نیسبەت ئەو بەشەی پرسیارەکەیشەوە کە عەرەبە غەیرە عێراقییەکان لە کوێوەو لە چ ڕێگایەکەوە دەهاتنە ناوچەی بیارە، ئەتوانم بڵێم ڕێگا بۆ هاتنیان زۆر بوو. ئەوان لە ناوچەی یەمەنەوە کە لە شەڕدا بوو لەگەڵ جوندولئیسلام تا دەگاتە ناوچەی پارتی و وڵاتی ئێران و ڕێگای جۆراوجۆری تر، خۆیان ئەگەیاندە بیارە. هەروەها هەندێکیان بە مەبەستی شوێنە گومکێ چەند وڵاتێک ئەگەڕان و ئینجا خۆیان ئەگەیاندە کوردستانی عێراق و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمارەتی بیارە. پاش شکستی تاڵەبان و داگیرکرانی ئەفغانستان لە سەردەمی ئەنسارولئیسلامدا، ژمارەیەکی زۆری موجاهیدی عەرەب لە ڕێگای ئێرانەوە خۆیان گەیاندە بیارە کە «ئەبوو مەسعەب زەرقاوی»یەکێک لەوانە بوو.

**پێوەندیی جوند و ئەنسار لەگەڵ ڕێکخراوی ئەلقاعیدەو گروپە سەلەفییە جیهادییەکانی تری دونیای ئیسلامدا چ جۆر پێوەندییەك و لە چ ئاستێکدا بوو؟ ئایا تەنیا مەبەستی ئەم دوو ڕێکخراوە جیهاد بوو دژی حکوومەتی هەرێمی کوردستان یاخود ئامانجی جیهاد دژی دەوڵەتان و لایەنەکانی دیکەشیان هەبوو؟ بۆ نموونە ئایا خەڵکیان بە مەبەستی جیهادکردن ئەنارد بۆ ئەفغانستان و پاکستان؟**

دەربارەی پێوەندیی جوند یان ئەنسارولئیسلام لەگەڵ ئەلقاعیدە تەنیا ئەتوانم بڵێم پێوەندییەکی خراپیان پێکەوە نەبوو ئەگەرنا شاهێدی هیچ پێوەندیی و نزیکایەتیەك لە نێوانیانیادا نەبووم. ئەوەی ئەیڵێم ڕاستییەکەو ناتوانم بیشارمەوەو لەو باوەڕەشدام ئەگەر ئاوەها پێوەندییەك هەبوایە بێ گومان کارەکان باشتر ئەچوونە پێش و یەك لەو هۆکارانەیش کە جوند و ئەنسار نەیانتوانی زۆرێك لە پلان و بەرنامەکانیان بە ئەنجام بگەیەنن نەبوونی پێوەندیی بوو لەگەڵ ڕێکخراوی ئەلقاعیدەدا. هەرچەند لە شەرعدا مەسەلەی پێکەوە کارکردن و لێکنزیکبوون بایەخی زۆری پێ دراوە بەڵام قیادەی جوند و ئەنسار لەمە غافڵ بوون و هیچکات بیریان لە نزیکبوونەوە لە ڕێکخراوی ئەلقاعیدە نەکردەوەو بۆیە نەگەیشتنە ئامانج و ئەنجامێکی واش کە خێری بۆ سەرجەم موسوڵمانان لێبکەوێتەوە. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە متمانەیەکی باش لە نێوان ئەواندا دروست بووبوو و هەڵسوکەوتی ئەندامانی ئەم دوو ڕێکخراوە لەگەڵ یەکتر هەڵسووکەوتێکی برایانە بوو و هەر ئەمەیش بووبووە هۆی ئەوە تاکوو خەڵکانێکی زۆر بە تایبەت دوژمنانی ئیسلام و سەلەفییەتی جیهادی، ئەلقاعیدەو ئەنسار بە یەك ڕێکخراو و هەڵگری یەك بەرنامە بزانن.

جوندولئیسلام و ئەنسارولئیسلام لەگەڵ سەرجەم خەڵکانی سەلەفی جیهادی و ڕێکخراوە ئیسلامییەکاندا بە گشتی، پێوەندییەکی باشیان هەبوو و لە لایەك سوودیان پێ گەیاندوون و لە لایەکی تریشەوە سوودیان لێوەر گرتوون. بۆ نموونە ئەبوو مەسعەبی زەرقاوی پاش ئەوەی بڕیاریدا لە بیارە نەمێنێتەوەو چوونە داخڵ واتە ناوەوەی عێراقی هەڵبژارد، ئەنسارولئیسلام ئەرکی گواستنەوەی ئەوی خستە سەر شانی خۆی و بە لە ڕێگای چەند ئەندامێکی خۆیەوە ئەویان گەیاندە بەغدا. پاشان ئەویان بە ڕێکخستنەکانی خۆیان لە داخڵ ناساند و ئەوانیش بە دڵگەرمییەوە ئەبوو مەسعەبیان پەنا دا. لەو کاتەدا ئەو نە سەر بە ئەلقاعیدە بوو و نە سەر بە ئەنسارولئیسلام – هەرچەند لە کاتی مانەوەیدا لە ناوچەی بیارە بەیعەتی بە ئەبوو عەبدوڵڵا شافیعی دابوو– بەڵام هەندێ پلان و بەرنامەی لە سەردا بوو تاکوو بتوانێ لە ڕێگای عێراقەوە زەبر لە دەوڵەتی ئەردەن بوەشێنێت. ئەو تا کاتی ڕووخانی سەدام حسەین و هاتنی هێزەکانی ئەمەریکا بۆ عێراق –ماوەی ساڵێك زیاتر– لە لایەن حاجی مستەفای بەرپرسی تەنزیماتی بەغدای ئەنسارولئیسلامەوە میوانداری کرا. پاشان لە کاتی یەکەم گیرانی حاجی مستەفادا (حاجی عەبدولحەمید)، زەرقاوی بە هاوکاری بەشێك لە ئەندامانی ڕێکخستنی ئەنسارولئیسلام لە بەغدا کە بەیعەتی لێوەر گرتبوون، دەستیدایە دامەزراندنی ڕێکخراوێکی سەربەخۆی سەلەفی جیهادی. ئەڵبەت ئەم کارەی ئەو گلەیی و تووڕەیی قیادەی ئەنساری لێکەوتەوەو ئەوان ئەبوو مەسعەبیان بەوە تاوانبار دەکرد کە بە کەڵکوەرگرتن لە نەبوونی حاجی عەبدولحەمید بەیعەتی لە ئەندامانی ڕێکخستنەکانی ناوەوەی عێراق وەرگرتووە.

بە نیسبەت ئەوەیشەوە کە مەبەستی ئەم دوو ڕێکخراوە واتە جوند و ئەنسار جیهاد دژی حکوومەتی هەرێم بوو یان نا، وابزانم لە وەڵامی پرسیارەکانی پێشوودا ئەمەمان وەڵام داوەتەوە. بەڵام دیسان ئەیڵێمەوە کە بەرنامەو مەبەستی ئەوان داکۆکیکردن بوو لە بیروباوەڕ و خواستە ئایینییەکانیان و بە مافی خۆیانیان ئەزانی ئەك لە بەشێکی هەرێمی کوردستان و عێراقدا بەڵکوو لە ڕووبەرێکی گەورەو بەربڵاودا، ببنە خاوەن دەسەڵات و ئیمارەتێکی ڕاستەقینەی سەلەفییانە. هەروەها لە بەرنامەیاندا بوو داکۆکی لە برا موسوڵمانەکانیان لە هەر شوێنێکی ئەم دونیایە بە تایبەت لە وڵاتانی دراوسێدا بکەن

و له دابەزاندنی شەریعەت و دامەزراندنی حکوومەتی ئیسلامیدا یارمەتییان بدەن. بۆیە دژایەتیکردنێکی ئەم مەنهەج و بەرنامەیە لە لایەن حکوومەتی هەرێم و حزبە عیلمانیەکانەوەو هەوڵدانی ئەوان بۆ لەباربردنی ئیمارەتی بیارە، دژکردەوەی توندی جوندولئیسلام و ئەنسارولئیسلامی لێکەوتەوە. ئینجا ئەمە لە دونیای نوێدا زۆر رووی داوەو کەم نین ئەو دەسەڵات و دەوڵەتانەی بە مەبەستی کپکردن و لەباربردنی بووژانەوەی (صحوە) ئیسلامییەکان، هەموو جۆرەکانی سەرکوتیان بە کار هێناوە. لە دونیای ئەمڕۆدا هەریەك بە جۆرێ لە هاتنەسەرکاری کۆمەڵە ئیسلامییەکی رەسەن و (اصولی) وەك تەوژمی سەلەفیەتی جیهادی نیگەرانن و بەردەوام هەوڵی ئەوە ئەدەن پێش بە سەرکەوتنی ئەم تەوژمە بگرن. بۆیە بەو ئاستەی کە بووژانەوەی ئیسلامی بەرین و بەرفراوانە بە هەمان ئاستیش بگرە لەوەش زیاتر دوژمن و نەیاری هەیە. جا هەرچەند گروپ و رێکخراوەکانی وەك جوند و ئەنسارولئیسلام ساحەی چالاکییان بچووك و بەرتەسك بوو و بە کردەوە دوو حکوومەتی هەرێمەکەی پارتی و یەکییەتیان لە بەرامبەر خۆیاندا ئەبینی بەڵام ئەوان لە ئەساسدا هەموو دژبەران و دوژمنانی سەلەفییەتیان لە هەموو شوێنێکی ئەم دونیایەدا بە دوژمنی خۆیان فەرز دەکرد. ئەگەر ئەوان نەیانتوانیوە یان نەیانویستووە بە مەبەستی جیهادکردن موجاهید رەوانەی وڵاتانی تر بۆ نموونە ئەفغانستان و پاکستان بکەن ئەمە بەو مانایە نییە کە جوند و ئەنسار تەنیا باوەڕیان بە جیهادکردن دژی حزب و لایەنە کوردییەکان بووبێت بەڵکوو ئەوان پێویستیان بەو هێزە خۆماڵییە هەبوو و تەنانەت وەك باسیشمان کرد موجاهیدی وڵاتانی تریش بە مەبەستی یارمەتیدانی ئەوان روویان لە کوردستان کردووە. بە گشتی جیهادی کوردستان بۆ کوردەکان جیهادی (کیفایە) نەبوو کە موجاهیدینی کورد بتوانن بە تەنها خۆیان بەڕێوەی ببەن بەڵکوو پێویستیان بە یارمەتی و پشتیوانی موجاهیدینی دەرەوەی کوردستانیش بوو و هەر بەم هۆیەشەوە بوو کە جگە لە چەند جارێك کە ئەویش زیاتر حاڵەتێکی رەمزیی هەبوو، نەیانتوانی هەوڵی یارمەتیگەیاندن بە جیهادی شوێنەکانی تر بدەن. بۆ نموونە وەك پێشتر باسم کرد، کاتی خۆی دەستەیەك موجاهیدی کوردی کوردستانی عێراق ویستیان لە رێگای ئێرانەوە خۆیان بگەیەننە ناوچەی داغستان بۆ بەشداریکردن لە جیهادی ئەم ناوچەیەدا بەڵام بە هۆی خراپبوونی رێگاوە نەیانتوانی بگەنە ئەوێ و گەڕانەوە. لە سەردەمی ئەنساردا کە هاوکات بوو لەگەڵ پاشەکشێی هێزە ئیسلامییەکان لە ئەفغانستان، ژمارەیەکی زیاتر لە موجاهیدی عەرەب و کورد و توورك کە زۆربەیان لە ساحەی جیهادی ئەفغانستانەوە هاتبوون، هێزی خۆیان خستە پاڵ سەلەفییە جیهادییەکانی کوردستان و بەشدارییان لە جیهادی کوردستاندا کرد. شتێکی تر کە ئەمەوێ ئاماژەی پێ بکەم ئەوەیە کە چ جوندولئیسلام لە ماوەی سەد رۆژ تەمەنی خۆیداو چ ئەنسارولئیسلام لە ماوەی ساڵێك و چەند مانگ دەسەڵاتداریدا هەوڵیان نەدا بە کردەوە دژایەتی وڵاتان و دەسەڵاتەکانی دەوروبەری ئیمارەتی بیارە بکەن. بە پێچەوانەوە ئەوان هەوڵیان ئەدا ناوچەکانی دەوروبەریان بۆ ئەنجامدانی کاروباری خۆیان بە کار بهێنن تاکوو باشتر بە ئەرکی سەرەکی خۆیان واتە بەربڵاوترکردنی هەرێمی دەسەڵاتدارییان لە کوردستانی عێراق رابگەن و ئینجا پاش وەرگرتنی گوڕ و هێزی پێویست، ئەزموونەکەیان بگوێزنەوە بۆ ناوچەکانی دەوروبەریش. بەو هەموو کەموکوڕی و کەم ئیمکاناتییەوە کە لەگەڵی بەرەوڕوو بوو، بزووتنەوەی سەلەفییەتی جیهادی تەنیا بە پشت بەستن بە خوای گەورە، رۆژ بە رۆژ گەشەی زیاتری ئەکرد و سەرکەوتنی زیاتری بە دەست ئەهێنا. بۆیە حزبە کوردییەکان و لە سەرووی هەموویانەوە حزبەکەی مامە، لەو پەڕی زەبوونیدا پەنایان بۆ ئەمەریکا برد و بە پشتیوانی سوپای ئەم وڵاتە هەوڵی لەباربردنی ئەزموونی ئیمارەتی بیارەیان دا.

**کاتی«هۆدنەکە»جیابوونەوەیەك لە ناو ئەنساردا رووی دا کە دیارترین سیمایان «کامەران مۆریاسی» بوو، ئەم گروپە تیرۆرکردنی سەرکردەکانی یەکیەتی وەك ئامانجی خۆی دانا و لە بەناوبانگترین چالاکیشدا ساڵی ٢٠٠٢ لە شاری**

**سلێمانی هەوڵی تیرۆرکردنی «بەرهەم ئەحمەد ساڵح»یان دا کە چەند پاسەوانێکی پێوەبوون بەڵام خۆی لەو هەوڵە رزگاری بوو. کامەران مۆریاسی کێ بوو و ئەو و هاوبیرەکانی لەبەرچی لە ئەنسار جیابوونەوەو چ کەسانێکی تر ئەمیر و سەرکردە یاخود ئەندامی ئەم گروپە بوون؟**

کامەران مۆریاسی لە دایکبووی ۱۹۷۰ی زایینی و خەڵکی ناوچەی شارباژێڕ بوو، سەردەمی لاویەتی لە ئۆردووگا زۆرەملێکانی رژێمی بەعس لە زەرەیان و (نصر) و باریکە بە سەر بردبوو و پاشان بەماڵەوە روویان لە شارۆچکەی سەید سادق کردبوو. دوای شەڕەکەی ساڵی ۱۹۹۳ی نێوان بزووتنەوەی ئیسلامی و یەکییەتی، لەگەڵ موجاهیدنی بزووتنەوەدا ئاشنایەتی داخست و وازی لە پێشمەرگایەتی سۆسیالیست (حسك) هێناو و تێکەڵ بە بزووتنەوەی ئیسلامی بوو.

کامەران مۆریاسی یەکێك بوو لە دۆستانی نزیکی حەسەن سۆفی و سەرەتای ئەم دۆستایەتیەش ئەگەڕایەوە بۆ ئەوە کە کاك کامەران کاتی خۆی لەگەڵ ژمارەیەك گەنج و لاوی سەید سادقییدا پێوەندیی بە تیپەکەی حەسەن سۆفییەوە کردبوو، ئەم تیپە سەر بە هێزی گەرمیانی مەڵبەندی حەوتی گەرمیانی بزووتنەوە بوو و لەو سەردەمەدا لە شارۆچکەی خورماڵ جێگیر بوو. بۆیە ئەم نزیکایەتی و دۆستایەتییەی مۆریاسی لەگەڵ حەسەن سۆفی هەر لە سەرەتاوە جۆرە بەدبینییەکی لە دڵی ئەودا بە نیسبەت ئیسلامییەکانی کوردستان و موجاهیدینی بزووتنەوەی ئیسلامی و سەرکردایەتی ئەم رێکخراوەوە دروست کرد. کاریگەری حەسەن سۆفی لە سەر کامەران مۆریاسی لە ئاستێکدا بووە کە ئەویش وەك سۆفی هاتۆتە سەر ئەو باوەڕە کە سەرکردە ئیسلامییەکان زۆر بە کەمی لە سەر راستەڕێی ئیسلامەتین و ئەگەریش بۆ ماوەیەك ئەم راستەڕێیەیان گرتبێتە پێش نەیانتوانیوە ناشتوانن بەردەوامی بکەن و لە سەری بوەستن. بۆیە ئەو بەردەوام لە روانگەیەکی رەخنەگرانەوە ئەیڕوانییە هەڵسووکەوتی رێکخراو و سەرکردە ئیسلامییەکانی کوردستانی عێراق. هەموو ئەمانە باسیان لە هەبوونی بیروباوەڕێکی ئوسوولی سەلەفیانە لە ئەودا دەکرد کە لە رێی حەسەن سۆفییەوە پێی گەیشتبوو و لەگەڵیدا ئاشنا بووبوو. هەروەها کوژرانی مەلا ئەمینی ئەمیری ئەلجیهاد و حەسەن سۆفی، لە لایەن بزووتنەوەی ئیسلامییەوە، کاریگەرییەکی قووڵی لە سەر کامەران مۆریاسی داناو بەدگومانییەکانی ئەویان بە نیسبەت سەرکردەکانی ئەم رێکخراوەوە زیاتر کرد. ئەو لەو باوەڕەدا بوو کە پێویستە جوندولئیسلام غەنیمەتەکانی شەڕ وەك سەردەمی کۆن واتە سەردەمی دەسەڵاتداریی ئیسلام، بە سەر موجاهیدیندا دابەش بکات. بۆیە پاش شەڕی خێڵی حەمە ئەم رەخنەیەو چەند رەخنەیەکی تری رووبەڕووی قیادەی بزووتنەوە کردەوە. نارەزایەتی دەربڕین بە نیسبەت رانەگەیاندنی سەربڕینەکەی خێڵی حەمە لە لایەن جوندولئیسلامەوەو سپاردنی پلەی ئەمیری عەسکەری بە هەندێ لەو موجاهیدە عەرەبانەی شارەزای ناوچەکە نەبوون دوو رەخنەی جیدی بوون کە لە لایەن مۆریاسییەوە رووبەڕووی قیادەی جوندولئیسلام کرانەوە. کامەران شکستەکەی شەڕی شنروێ و کوژرانی ژمارەیەکی بەرچاو لە ئەمیر و موجاهیدە عەرەبەکانی بە کەمتەرخەمی سەرکردایەتی جوندولئیسلام دەزانی. ئەو جگە لەوەی لە باری باوەڕبەخۆبوونەوە گەیشتبووە ئاستێکی بەرز، لە باری شەرعی و زانستی ئیسلامییشەوە چوونەپێشێکی باشی بەخۆیەوە بینیبوو. ئەمانە هۆکار بوون بۆ ئەوە کاك کامەران لە باری مستەواییشەوە شان لە شانی سەرکردە ناسراوە ئیسلامییەکان بدات و تا ئەو کاتەی حەسەن سۆفی مابوو لەگەڵ ئەوداو پاشان لەگەڵ بازیانی و بەرپرسانی جەماعەت تەوحید و جوند و ئەنسارولئیسلامدا بەردەوام بوو و سەرەنجام لە چالاکییەکەی رۆژی ۲۰۰۲/٤/۳ی شاری سلێمانیدا گیانی لە دەست دا.

کامەران مۆریاسی لە سەرەتاکانی دەرکەوتن و دەستبەکاربوونی گروپی حەماسەوەو لە دانیشتنەکانی ئەوان و بزووتنەوەی ئیسلامیدا، یەکێك بوو لەو سەرکردانەی حەماس کە بە نیسبەت بزووتنەوەوە لە هاوبیرەکانی تری توندتر بوو. مۆریاسی ئەو روانگانەی بزووتنەوەی ئیسلامی کە باسیان لە بە گەورەزانینی خۆیان و بە کەمزانینی دەستەکەی

حەماس دەکرد، بە کارێکی نا ئیسلامیانەو جۆرێك لە خۆباییبوون بە نیسبەت خۆیانەوە (حەماسەکانەوە) وەسف دەکرد. بۆیە مژدەی ئەوەی بە بەرپرسان و سەرکردەکانی بزووتنەوە دا کە چۆناوچۆن ئەو و هاوبیرەکانی جێ پەنجەی خۆیان لە مێژووی بزاڤی ئیسلامخوازی کوردستاندا تۆمار دەکەن. لە سەردەمی هاتنی تەوحیدەکاندا بۆ ناوچەی شارەزوور و شارۆچکەی سیروان، کاتێ باسی بەجێهێشتنی ناوچەکەو رۆیشتنی سەلەفییەکان بۆ بناری قەندیل کرا، کامەران مۆریاسی دژی ئەم بڕیارە وەستایەوەو وەکوو خۆی بەلایەوە نەنگ بوو ئاوا کارێك بکات، بۆیە کاریگەری لە سەر ئەوانی تریش داناو هانی دان تاکوو ئاوەها کارێك نەکەن. ئەو لە بەر ئەوە پێی خۆش بوو لە ناوچەی شارەزووردا بمێننەوە چونکوو نەیەویست قسەی ئەو بەرپرسانەی بزووتنەوەیان لێ بێتە دی کە بەردەوام تانەو تەشەریان تێ دەگرتن و بە دەسەتەی (حەماقەکان) واتە (بێعەقڵەکان) ناویان ئەبردن.

مۆریاسی هەوڵی ئەدا لە ناوچەکانی دەرەوەی سنووری دەسەڵاتی بزووتنەوە واتە لە ناوچەکانی وەك سەید سادق، شارباژێر و قەرەداغ، هێزەکانی یەنەك بخاتە کەمینەوە تاکوو هەم گورزی گورچکبڕیان لێ بوەشێنێ و حاڵییان بکات کە ئەو سوڵحەی لە تاران لەگەڵ بزووتنەوەی ئیسلامی کردوویەتی، نەیتوانیوە دەنگی جیهاد کپ بکاو بە بێ خەم دەم بژەنێتە داهاتی کوردستان و لە رێگای دامودەزگاو راگەیاندنەکانییەوە گاڵتەو لاقرتێ بە ئیسلام و موسوڵمانان بکاو هەمیش وەڵامی فەخرفرۆشییەکانی ئەو سەکردانەی بزووتنەوەی دابێتەوە کە پێیان وابوو حەماسەکان تەنیا پیاوی دروشمی توند و تۆڵن و ئەهلی کردەوەو عەمەل نین. سەرەڕای ئەو بڕیارانەش، کاك کامەران نەیتوانی خواست و ئاواتەکانی بهێنێتە دی و لەو ناوچانەدا کە دەستنیشانی کردبوون زەبر لە هێزەکانی یەکیەتی بوەشێنێ، بۆیە دواتر بە ناچاری رووی لە بناری قەندیل کرد. رۆیشتنی ئەو و هاوڕێکانی بۆ قەندیل، لە کاتێکدا بوو کە گروپی تەوحید لە هێرشە کوتوپڕەکەی پارتیدا ئەمیرەکەی و بەشی زۆری ئەندامانی شوراکان و موجاهیدەکانی خۆی لە دەست دابوو. مۆریاسی پاش خۆ گەیاندنە قەندیل، بەیعەتی بە کاك ئەبووبەکر ئەمیری دووهەمی گروپی تەوحید دا کە یەکێك بوو لە حەوت دامەزرێنەرەکەی ئەم گروپە. پاشان ئەو باسی گەڕانەوەی تەوحیدەکان بۆ ناوچەی شارەزوور دێنێتەوە بەر باس و بە هۆی ئەوەوە کە پێنج ساڵ لە ئەمیری تەوحید گەورەتر بوو و خاوەن شارەزایی و ئەزموونێکی زۆر بوو، توانی کاریگەری لە سەر کاك ئەبووبەکر دابنێ و قەناعەتی پێ بکا تاکوو بناری قەندیل بەجێ بهێڵێت و روو لە ناوچەی شارەزوور بکات.

پاش خۆ گەیاندنە ناوچەی شارەزوور، مۆریاسی و کاك ئەبووبەکر و شورای تەوحید بڕیاریاندا تۆڵەیەکی قورس لە پارتی بکەنەوەو بەم مەبەستەش فرانسۆ حەریریان هەڵبژارد و لە ماوەیەکی کورتدا پلانی تیرۆرکردنی ئەویان داڕشت. «عەبدولجەبار هەولێری» وەك ئەمیری دەستەی بەڕێوەبەری چالاکییەکەو کامەران مۆریاسی و شێخ حسەین قادرکەرەمییش وەك ئەندامانی دەستەکە دیاری کران و کامەران شوفێری ئەو ئۆتۆمبیلە بوو کە تیرۆرەکەی پێ ئەنجام درا. بە هۆی هەستیاربوونی چالاکییەکەوە کە ئەبوایە لە ناو شاری هەولێردا بەڕێوە بچێت، پێشبینی نەگەڕانەوەی دەستەکەو شەهیدبوونی ئەوان دەکرا بۆیە ئەو سێ کەسە بە شێوەیەکی خۆبەخشانە ئەم چالاکییەیان خستبووە سەر شانی خۆیان. بەڵام پشت بە خوای گەورە ئەوان پاش ئەنجامدانی سەرکەوتووانەی تیرۆرەکەو کوشتنی فرانسۆ حەریری، بە سەلامەتی گەڕانەوە گوندی بانیشاری کۆن کە سەرکردایەتی جماعەت تەحید لەوێ جێگیر بوو. هەروەها ئەم سێ کەسە دواتریش بەشدارییان لە شەڕی خێڵی حەمەدا کرد و عەبدولجەبار هەولێری لەم شەڕەدا شەهید بوو. بۆیە وەك ئەیانگێڕایەوە کامەران و سەید حسەین دەورێکی باشیان لە شەڕەکەدا گێڕابوو و یەکەم سەربڕینیش بە دەستی ئەوان ئەنجام درابوو واتە بە دەستی سەید حسەین. ئەوان لەو رۆژەدا رقی چەندین ساڵەی خۆیان بە تایبەت رقی شەهیدبوونی عەبدولجەباری هاوڕێیان دەکەنە هەوێنی هێرش و هەڵمەت بۆ سەر هێزەکانی یەکیەتی و تۆڵەیەکی باشیان لێ ئەکەنەوە.

له سەردەمی جوندولئیسلامدا هەندێ گۆڕانکاری لە کامەران مۆریاسیدا هاتە ئاراوە، ئەو کە سەردەمانێك لەو باوەڕەدا بوو کە نابێ سەلەفیە جیهادییەکان ناوچەی شارەزوور بەجێ بهێڵن، گۆڕانێکی وای بە سەر هاتبوو کە دژی هەرجۆرە شەڕێك بوو لە ناوچەی شارەزوور و لەگەڵ هێزەکانی یەکیەتیدا. ئەو و هەندێ لە هاوڕێکانی کە ژمارەیان یازدە کەس دەبوو، ئەیانوت: «تازە ئێمە تووشی شەڕی پارتی هاتووین و پێویستە درێژە بەم شەڕە بدەین». ئەم بۆچوونەی ئەوان سەرکەوتوو نەبوو چونکوو پاش ماوەیەك یەکەم شەڕ لە نێوان جوندولئیسلام و هێزەکانی یەنەکدا روویدا. وەك باسم کرد کامەران و هاوڕێکانی سەرباری ئەو جیاوازی بۆچوونەی بە نیسبەت شەڕی لایەنە کوردییەکانەوە هەیانبوو، لە شەڕی خێڵی حەمەدا باشترین دەوریان گێڕاو ئەمەش ئاماژە بوو بۆ ئەوە کە ئەوان هەر لە سەرەتاوە نەفسی جیهاد کردنیان بەلاوە پیرۆز بوو و لە ئەساسدا قایل بە دانانی جیاوازی لە نێوان دوژمنانی ئیسلام و هێزە مورتەدەکاندا نەبوون.

بە نیسبەت ئەو بانگەواز و دەعوەتانەیشەوە لە لایەن رێبەرانی ئەلقاعیدەوە تاڵەبانەوە ئەکران و تیایاندا داوا لە موجاهیدین و گەنجانی موسوڵمان دەکرا تاکوو سەردانی دارولئیسلام یان دارولئەمانی ئەفغانستان بکەن. هەروەها بە نیسبەت ئەو بانگەشەیشەوە کە هەر بەو مەبەستە لە لایەن هەندێ لە موجاهیدینی کوردەوە دەکرا بە تایبەت پێش رووداوەکەی ١١ی سێپتامبر، کامەران مۆریاسی بە هیچ شێوەیەك باوەڕی بە رۆیشتن بۆ شوێنێکی تر و جێهێشتنی کوردستان نەبوو و جیهادی کوردستانی بۆ خۆی بە فەرزتر دەزانی. هەرچەند ئەو شێخ ئوسامە بن لادەنی بە رێبەرێکی گەورە دەزانی و زۆربەی بۆچوون و روانگەکانی ئەوی قبووڵ بوو بەڵام لە مەسەلەی جیهاد کردندا زیاتر پێڕەویی لە بۆچوونەکەی ئەبوو مەسعەب زەرقاوییەوە ئەکرد کە بریتی بوو لە جیهاد کردن دژی تەواغیت و دەسەڵاتە ناوخۆییەکانی وڵاتانی ئیسلامی. ئەم تایبەتمەندییانە بوونە هۆی ئەوە کامەران مۆریاسی و هاوڕێکانی بە نیشانەی نارەزایەتی دەربڕین بە نیسبەت راگەیاندنی هۆدنەکەی ئەنسارولئیسلامەوە، بە تەواوی لە رێکخراوەکە نائومێد بن و بڕیاری جیابوونەوە بدەن. ئەوان لەو باوەڕەدا بوون کاتێك مرۆڤ تاوی ئیسلام ئەدات، تاوی بەرنامەو پەیامێکی گەورەی داوەو نابێ خۆی بچووك بکاتەوەو ئاستی داخوازییەکانی خۆی لە بەرانبەر ئەو دوژمنانەدا کە تا سەر ئێسقان رقیان لە ئیسلام و ئیسلامەتییە بێنێتە خوارەوە. بۆیە هۆدنەکەی ئەنساریان بە جۆرێك تەسلیمبوون و ملکەچبوون دەزانی و نەیاندەویست بەشداری تیادا بکەن. ئەڵبەت درۆم نەکردووە ئەگەر بڵێم لەو هەلومەرجەدا واتە لە سەردەمی هۆدنەکەدا، مۆریاسی و هاوڕێکانی تووشی نائومێدییەکی وەها هاتبوون کە کاریگەرییەکی سەیری لە سەر جۆری بیرکردنەوەو بڕیاردانیان دانابوو. بۆیە پاش بەجێهێشتنی ریزەکانی ئەنصار، بە بێ ئەوەی بیر لە دامەزراندنی گروپ و جەماعەت بکەنەوە، پلانی تیرۆرکردنی بەرهەم ساڵحیان دارشت. گرتنەبەری ئەم جۆرە کارەش جگە لەوەی پێوەندیی بە قەدەری خوای گەورەوە بوو بە نیسبەت دەربازبوون یان دەرنەبازبوونی ئەوانەوە لە کاتی ئەنجامدانی چالاکییەکەدا، ئەگەری کوژران و شەهید بوون تیایدا زۆر لە سەرەوە بوو. کامەران و هاوڕێکانی بە باشی ئەمەیان دەزانی چونکوو ئەگەر بمانەوێ وەکوو سەبەبییش سەیری کارەکەیان بکەین، دەرچوونیان دژوار بوو و ئەمەش ئاماژە بوو بۆ ئەوە کە ئەوان بڕیاری زیندوو نەمان و نەگەڕانەوەیان دابوو. هەرچەند ئەگەر ئەوان لە تیرۆرکردنی بەرهەم ساڵحدا سەرکەوتوو بوونایەو بە سەلامەت دەرچووبانایە، دیسان کاری هاوشێوەی ئەمەیان ئەنجام ئەداو بەردەوام ئەبوون لە چالاکی خۆبەختکارانە. بە گشتی کاك کامەران بە پێی ئەو لێکدانەوەو وردبوونەوانەی بە نیسبەت کار و کردەوەی بەرپرسانی ئەنسارولئیسلام تەنانەت بە نیسبەت هەڵسووکەوتی هاوڕێ نزیکەکانی خۆیەوە واتە کاك عومەر بازیانی و کاك هێمن بانیشاری تووشی هاتبوو هەروەها پاش نائومێدبوونی لە شێوازی کارکردنی ئەنسارولئیسلام، بڕیاری جیابوونەوەی داو شێوازی جیهادی (نیکایە)ی گرتە بەر تاکوو لەم رێگایەوە ئەرکەکانی سەرشانی بەجێ بگەیەنێت. ئیتر وەك باسم کرد ئەو لەو رێگایەدا گیانی داناو سەلماندی کە لە پێناو دینەکەیدا ئامادەی ئەنجامدانی هەموو جۆرە کارێکی خۆبەختکارانە بووە. کامەران

مۆریاسی و هاوبیرەکانی لە کاتی بەجێهێشتنی ئەنسارولئیسلامدا، قیادەی ئەم ڕێکخراوەیان ئاگادار کردەوە کە بە خێرایی جیهاد دەست پێ دەکەنەوەو چالاکی گەورە دژی هێزە مورتەدەکان بەڕێوە ئەبەن. بۆیە لەو باوەڕەدا بوون کە پێویستە ئەنسار بە فەرمی باسی جیابوونەوەی ئەوان بکات و خۆی لە کار و کردەوەی ئەوان بە بەرپرسیار نەزانێ. بە نیسبەت ئەنساروالئیسلامەوە شکاندنی هۆدنەکە بە خیانەت لە ئەمانەتداو بە کارێکی ناشەرعی دادەنرا بۆیە بە هیچ شێوەیەك پێیان باش نەبوو ئەم هۆدنەیە لە لایەن ئەوانەوە بشکێت. خودی تیرۆرەکەو ئەو پلان و بەرنامەیەی بۆی دانرابوو هەروەها ئەو زانیاریانەی دواتر دەست یەکیەتی نیشتمانی کەوتن ئاماژەن بۆ راستبوونی ئیدیعاکانی من. بێ گومان بەشێك لەم زانیاریانە لە ڕێگای کەسی سێهەمی تیرۆرەکەوە دەست یەکیەتی کەوت کە ناوی (قەیس/ابوو عاصم) هەولێری و لە دایکبووی ١٩٧٦ی زایینیەو لە چالاکیەکەدا بریندار بوو و پاشان دەستگیر کراو تاکوو ئێستاش لە زینداندایە. یەکییەتی لە سەرەتاوە هەڕەشەو گوڕەشەیەکی زۆری دژی ئەنسار دەست پێ کرد بەڵام بە کردەوە هەوڵی شکاندنی هۆدنەکەی نەدا. ئەنساریش لە ڕێگای ناردنی وەفدە تایبەتەکانییەوە بۆلای ئەوان، بێ ئاگایی خۆیان لە کارەکە ڕاگەیاند و یەنەکیش کە ڕاستییەکەی دەزانی، باوەڕی بە قسەکانی ئەوان کرد و هەوڵی شکاندنی هۆدنەکەی نەدا.

خاڵێکی تری پێوەندیدار بە تیرۆرەکەی بەرهەم ساڵح ئەوە بوو کە جگە لە کامەران مۆریاسی، یەکێك لەو دوو کەسەی لەگەڵ ئەودا بوون و بەشداری ڕاستەوخۆی چالاکییەکەیان کردبوو، شەهید بوو و ئەوی تریشیان بە برینداری دەستگیر کرا. هەروەها چەند کەسێکی تریش بەشدارییان لە دانانی پلان و دابینکردنی وەسیلەی پێویستی تیرۆرەکەدا کرد کە یەکێکیان «کامیل عوسمان ڕەسووڵ» بوو کە بە «کاوەی نانەوا» ناسرابوو و دواتر لە هێرشەکەی بەهاری ٢٠٠٣ی ئەمریکادا بۆ سەر ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمارەتی بیارە شەهید بوو. بنەماڵەی کاك کاوە بە ڕەچەڵەك خەڵکی «دێگەڵی» ناوچەی شارباژێڕن بەڵام لە کۆنەوە دانیشتووی شاری سلێمانین و کاك کاوەش لە دایکبووی ساڵی ١٩٦٥ی ئەم شارەیە. برایەکی کاك کاوە لە سەردەمی شەڕی بزووتنەوەی ئیسلامی و یەکییەتیدا شەهید بووبوو و باسی ئەوە دەکرا کە شەهید کردنەکەی شێوازێکی زۆر غەریبانەی بووە، بۆیە کاوەی نانەوا ڕقێکی زۆری لە یەکییەتی بوو و هەمیشە هەم وەك تۆڵەکردنەوەی براکەی و هەمیش وەك بەجێهێنانی ئەرکی شەرعی سەر شانی خۆی ئامادەی ئەنجامدانی چالاکی بوو دژی لایەنە مورتەدەکان بە تایبەت یەکیەتی. هەروەها کاك کاوە یەکێك بوو لە هۆگرانی مامۆستا کرێکار و ئەوی لە هەموو سەرکردە ئیسلامییەکانی تر بەلاوە گەورەتر و خۆشەویست تر بوو و متمانەیەکی زۆری پێی هەبوو. بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو بە گەورە زانین و متمانە پێ بوونە، ئامادە نەبوو پێڕەوی لە بڕیاری هۆدنەکەی ئەوەوە بکات و بە بێ ئەوەی ڕاوێژی لەگەڵدا بکاو ئاگاداری بکاتەوە، ڕیزەکانی ئەنسارولئیسلامی بەجێهێشت. ئەڵبەت هۆکارێکی تری ئەم پێ نەوتن و ئاگادار نەکردنەوەیە ئەوە بوو کە کامەران مۆریاسی پێی خۆش نەبوو مامۆستا کرێکار بە کارەکەیان بزانێ و ئەگەر کاك کاوەش ئەم کارەی بکردایە ڕەنگ بوو بەشداریکردنی چالاکییەکەی لە دەست بدایە. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە دابینکردنی سەرجەم پێداویستییەکانی تیرۆرەکە وەك ئۆتۆمبیل، چەك، فیشەك و.....هتد لە سەر شانی شەهید کاوە بوو و ئەو بەو پەڕی هەست بە بەرپرسایەتی کردنەوە خەریکی ئامادە کردنی ئەم شتانە بوو. دەستەکە زۆر بە نهێنی لە ئەنجامدانی چالاکییەکە نزیك ئەبۆوەو بەشی زۆری کارەکانی لە ڕێگای ئەندامانی خۆیەوە ئەنجام ئەدا. بۆ نموونە بە هۆی ئەنجامدەری سێهەمی تیرۆرەکەوە کە کەسێکی کەم تەمەن و ڕەنگ و ڕواڵەتێکی منداڵکارانەی بوو، ئاگاداری کاتی هاتوچۆکردنی دوکتۆر بەرهەم و هەندێ لە بەرپرسانی تر بوون. کەسی سێهەم کە لە ناو ئەنساردا بە «ابو عبدالله الکوردی» ناسرابوو، ناوی ڕاستەقینەی «عبدالسلام ابوبکر»و لە دایکبووی ساڵانی ١٩٨٥ یان ١٩٨٦ی زایینی بوو. کاك ئەبووبەکری باوکی کە بە «بەکری غاز» ناسرابوو یەکێك لە گەورە لایەنگرانی مامۆستا عەلی باپیر بوو. وەك باسم کرد کاك کامەران ئەیەویست کارەکە بە شێوەیەکی زۆر نهێنی بەڕێوە ببا بۆیە کاتێ

دەورووبەرەکـەی تەنانـەت دایکـی و ژن و منداڵەکـەی لێیـان ئەپرسـی بـە تـەمای چـیت و بۆچـی خـەمێکی نەخۆشـی فەقەرلتەکەت ناخۆیت کە ئاوا ئازارت ئەدا، بۆ ئەوەی تووشی درۆکردن نەیەت، لە وەڵامدا ئەیوت: «بە هیوام لەم ماوەیەدا سەردلنی دوکتۆر بکەم و پشتم عەمەلیات بکەم». مەبەستی ئەو لە چوون بۆلای دوکتۆر (دوکتۆر بەرهەم) بوو و مەبەستی لە (عەمەلیات)یش بەڕێوەبردنی چالاکییەکە بوو!! ئەم جۆرە وەڵامدانەوەیە لە لایەك ئەوی تووشی درۆ نەدەکرد و لە لایەکی تریشەوە لایەنی بەرانبەر قەناعەتی پێ دەکرد.
(ئەبوو عاسم) پاش ئەوەی توانیبووی بە بریندارى لە شوێنی چالاکییەکە دوور بکەوێتـەوە، بە مەبەستی خۆ شاردنەوە خۆی ئەگەیەنێتە ماڵی شەماڵی برای من. کاتی خۆی من و ئەبوو عاسم لە بەندیخانەی یەنەکدا لەگەڵ یەك ئاشنا بووین و حاشای لێ ناکەم کە ئەو هەم لە رووی برایەتی و هەمیش لە رووی دینییەوە یەکێك بوو لە رەفیقە خۆشەویستەکانم.
کاتێك هێزە ئەمنییەکانی یەنەك شوێن پێی ئەو هەڵدەکەن و ئەیدۆزنەوە، هەم بنەماڵەی ئێمەو هەمیش بنەماڵەی عوسمان رەسووڵی خەزوورم تووشی دەردیسەر و گرفتێکی زۆر هاتن. شەماڵی برام و ئومێدی ژنبرام بە تاوانی پەنادان و تیمارکردنی قەیس (ئەبوو عاسم) پێنج ساڵی تەواو لە بەندیخانەدا بوون و دواتریش بە هەزار حاڵ ئازاد کران، هەروەها بە هۆی تێوەگلانی من و کاك کاوەی ژنبرامەوە لە تیرۆرەکەو ئەوەی کە گوایە ئەندێشەو پلانی کارەکە لە لایەن ئێمەوە بووە، ماڵی خەزووریشم هەموویان کەوتنە بەر ئەزیەت و ئازار و تەنانەت خەسوویشم کە ژنێکی پیری بەساڵاچوو بوو توندی زیندان کرا. لێرەدا نە ئەمەوێ پاکانەبۆ خۆم بکەم و نە ئەمەوێ گلەیی لە قەیس و کاوەی ژنبرام بکەم کە یەکەمیان چەندین ساڵە لە ژێر لێدان و ئەشکەنجەدایەو ئەوی تریشیان شەهید بووە، لە راستیدا منیش ئازار و زەحمەتێکی زۆرم بەرکەوت و باجێکی زۆرم دا بەڵام بە درێژایی چەندین ساڵ تێکۆشانم لە ناو ئیسلامییەکاندا هیچ نەبێ فێری ئەوە بووم کە هەموو شتێك قەدەری خوایەو بە بێ بڕیاری خوای گەورە هیچ شتێك روو نادات. بۆیە بە لای منەوە ئەو هەموو رەنج و دەردیسەرییەی کە بە بۆنەی ئەم رووداوەوە تووشم هات و ئێستاش هەر بەردەوامە، لە چوارچێوەی قەدەری خوای گەورە تێ ئاپەڕێ و نەك پێی نیگەران و ناڕەحەت نیم بەڵکوو شانازیشی پێوە دەکەم و پێی رەزامەندم.

**وەك جەنابیشت لە وەڵامی پرسیارەکانی پێشوودا ئاماژەت پێداوە، ئوسامە بن لادەن و ئەبوو مسعەب زەرقاوی هەندێ جیاوازییان بووەو گوایە شێخ ئوسامە زیاتر باوەڕی بە لێدانی زلهێزەکان و دەوڵەتە رۆژئاواییەکان بووەو لە بەرانبەردا ئەبوو مسعەب لە سەر جیهاد دژی حوکمڕانانی وڵاتانی ئیسلامی چڕ دەبوویەوە. زیاد لەمە هەندێ دەنگۆی دیکەیش هەیە کە دەڵێن لە بنەڕەتدا زەرقاوی لە لایەن رێکخراوی قاعیدەوە رەوانەی عێراق نەکرابوو و تەنانەت لە کاتی سەفەرەکەیدا بۆ عێراق پێوەندییەکی ئەوتۆی بە ئەلقاعیدەوە نەبووە. بە ئاستی یەکەم ئەبوو مسعەب کەی و چۆن و لە کوێوە خۆی گەیاندە بیارەو ئایا هاتنی ئەو کاریگەریی پۆزەتیڤی لە سەر ئەنصارولئیسلام دانا؟ هەروەها کەمێك زیاتر باسی ناکۆکی و جیاوازییەکانی ئەو دوو سەرکردەیەمان (زەرقاوی و بن لادەن) بۆ بکە.**

بەرواری هاتنەکەی زەرقاویم بە باشی لە بیر نەماوە بەڵام ئەو ساڵێك پێش هاتنی ئەمریکا بۆ عێراق و لە کۆتایی زستان یان سەرەتای بەهاری ٢٠٠٢دا خۆی گەیاندە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی رێکخراوی ئەنسارولئیسلام. پاشان ئەو وەك میوان و بۆ ماوەیەکی کاتی هاتبووە ئەوێ نەك بۆ تێکەڵبوون لەگەڵ ئەنسارولئیسلام و کارکردن لە ئیمارەتی بیارەدا. زەرقاوی باوەڕی بە شێوازێکی تایبەتی جیهادکردن و کاری رێکخراوەیی هەبوو کە لەگەڵ شێوازی جیهادکردن و کاری رێکخراوەیی ئەنسارولئیسلام و تاڵەبان و ئەلقاعیدەدا یەکی نەدەگرتەوە. پێش ئەوەی روو لە کوردستان بکات ماوەی چەند ساڵێك لە ئەفغانستان ژیابوو بەڵام نە بەو مانایە بەشداری لە جیهادی ئەو وڵاتەدا کردبێ. بۆیە هەرچەند هاتنەکەی

بۆ ناوچەی بیارە هەم بۆ خۆی و هەمیش بۆ موجاهیدینی ئەنسارولئیسلام خۆش و بە بایەخ بوو بەڵام کاریگەرییەکی وەهای لە سەر ئەندامانی ئەنسار دانەنا. ئەڵبەت زەرقاوی لەو کاتەدا هێشتا نەبووبووە خاوەن ناوبانگێکی وەهاو کەسێکی بەرجەستەی ناو بزاڤی سەلەفییەتی جیهادی نەبوو.

بە نیسبەت ئەو بەشەی پرسیارەکەیشەوە کە ئەبوو مەسعەب چۆن و لە کوێوە خۆی گەیاندۆتە ناوچەی بیارە، ئەتوانم بڵێم ئەوەندەی من ئاگادارم ئەو پاش هێرشی ئەمریکا بۆ سەر ئەفغانستان، لە رێگای سنوورە هاوبەشەکانی ئێران و ئەفغانستانەوە خۆی گەیاندۆتە وڵاتی ئێران و ماوەیەکیش لە لایەن دەسەڵاتدارانی ئێرانەوە دەستگیر کراوەو ماوەی مانگێك لە ژێر لێکۆڵینەوەدا بووەو پاشان بە هۆی ئەوە کە نەیانناسیوە، ئازادیان کردووە. ئەڵبەت من لەو باوەڕەدام ئەگەر بیشیانناسیبایە چونکوو لەو سەردەمەدا کەسێکی ناسراو نەبوو، دیسان ئازادیان ئەکرد. بە گشتی زەرقاوی ماوەی چەند مانگێك لە وڵاتی ئێران و ناوچە کوردنشینەکانی ئەم وڵاتەدا ماوەتەوەو پاشان بە یارمەتی کوردە سەلەفییەکانی ئەوێ رەوانەی لای ئەنسارولئیسلام کراوە.

بە نیسبەت ناکۆکی شێخ ئۆسامەو ئەبوو مەسعەب زەرقاوییشەوە وەك ئێوە باستان کردووە، ئەبێ بڵێم هەندێ جیاوازی لە نێوانیاندا هەبوو بەڵام نە بەو مانایە پێکەوە ناکۆکییان هەبووبێ. وەك خۆیشتان باستان کردووەو منیش پێشتر ئاماژەم پێدا جیاوازییەکەیان زیاتر لە چۆنیەتی جیهادکردن و رووبەڕووبوونەوەی بەرەی کوفردا بووە نەك لە سەر شتێکی تر. هەم بن لادەن و هەمیش زەرقاوی باوەڕی تەواویان بە جیهاد دژی دەسەڵاتە تاغووتییەکانی ناوچەکەو زلهێزە دژبەرەکانی ئیسلام و یەهوود و نەسارا بووە، شێخ ئۆسامە زیاتر لایەنگری ئەنجامدانی کاری گەورە دژی زلهێزەکان و لێدانی بەرژەوەندییەکانی ئەوان لە وڵاتانی خۆیان و وڵاتانی تری جیهاندا بوو بەڵام زەرقاوی جیهاد دژی دەسەڵاتە تاغووتییەکانی وڵاتانی ئیسلامی بەلاوە باشتر بوو. شێخ ئۆسامە لەو باوەڕەدا بوو کە پێویستە سوپای زلهێزەکان لە وڵاتانی ئیسلامی دەربکرێن و وایان لێ بکرێت کە نەوێرن هێز رەوانەی ئەم وڵاتانە بکەن و ئەمەش دەسەڵاتە تاغووتییەکان بەرەو لاوازی ئەبات و رووخانی ئەوان ئاسان ئەکاتەوە چونکوو ئەوان لە ئەساسدا بە پشتیوانی رۆژئاواییەکان دەسەڵاتی خۆیان بەردەوام کردووە. بە پێچەوانەی شێخ ئۆسامەوە کە پێی وابوو لێدانی بەرژەوەندی زلهێزەکان ترس لە دڵی ئەواندا دروست ئەکات و ئەبێتە هۆکارێك بۆ کشانەوەو چوونەدەرەوەی ئەوان لە وڵاتانی ئیسلامی و کۆتایی هێنان بە یارمەتیدان و پشتیوانیکردنی دەسەڵاتە تاغووتییەکانی ئەم وڵاتانە، زەرقاوی و مامۆستاکەی (ئەبوو موحەممەدی مەقدەسی) لەو باوەڕەدا بوون کە ئەم جۆرە جیهادە نەك زلهێزەکان ناترسێنێت بەڵکوو بیانوویان ئەداتە دەست تاکوو بیر لە داگیرکاری زیاتر بکەنەوەو هێزی زیاتر رەوانەی ناوچە موسوڵمان نشینەکان بکەن.

ئەڵبەت وەك خۆیشتان ئاگادارن دواتر ئەم جیاوازیانەش نەمان و ئەبوو مەسعەب بوو بە ئەمیری یەکەمی ئەلقاعیدە لە عێراق و ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە سەرباری جیاوازییەکانی نێوانیان چۆناوچۆن لە پێناو بەرژەوەندیی دینەکەیاندا ئەبوو مەسعەب ئامادە ئەبێت بەیعەت بە شێخ ئۆسامە بدات و نوێنەرایەتی ئەو و رێکخراوەکەی لە وڵاتی عێراقدا بکات.

جا ئەم کارەی زەرقاوی جێگای دڵخۆشی سەرجەم موسوڵمانان بە تایبەت لایەنگرانی سەلەفییەتی جیهادی بوو چونکوو لە ئیسلامدا هیچ شتێك بە قەد یەکییەتی و یەکدەنگی نێوان موسوڵمانان گرنگ نییەو ئەمە رەمزی سەرکەوتنی ئیسلامە. ئەم چوونە ژێر رکێفەی ئەلقاعیدە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە کەسێکی وەك ئەبوو مەسعەب بەو هەموو هێز و تواناییەوە کە هەیبوو و ئەو هەموو ناوبانگەی لە ئاستی عالەمیدا بە دەستی هێنابوو، ئامادە بوو بە دوور لە هەموو جۆرە خۆ ویستی و خۆ بە زلزانینێك ببێتە موبایەعی بن لادەن.

**هۆدنەکە چەند مانگی خایاند و وتوویژ و دانووستانەکانی نێوان یەکیەتی نیشتمانی و ئەنسارولئیسلام چ ئەنجامێکی لێکەوتەوەو دواتر کام لایەن شەڕی دەست پێ کردەوە؟**

شەش مانگەکەی تەواو کرد و بە بێ هیچ ئەنجامێك کۆتایی پێ هات، بۆیە پاش کۆتایی هاتنی هۆدنەکە زۆر بە خێرایی باروودۆخەکە بەرەو گرژی چوو. ئەنسار بۆ پێشگرتن بە هەرجۆرە هێرش و پیلانگێڕییەکی یەکیەتی، لە کۆتاییەکانی مانگی ٧ی ساڵی ٢٠٠٢دا دوای گەڕانەوەی مامۆستا کرێکار بۆ نەرویج، هەڵمەتێکی بەربڵاوی بۆ سەر ناوچەی شارەزوور دەستپێکرد و تەنانەت شارۆچکەی سیروانیشی بۆ ماوەی شەوێك کۆنترۆڵ کرد.

**بەڵام هەندێ کەس بە تایبەت ئەندامانی یەکیەتی ئەڵێن ئەنسار لە کاتی ئاگر بەسدا هێرشی کردە سەر پێشمەرگەکان و ئەمەش پێچەوانەی ئەخلاقی سیاسی بوو. جیا لەمە مەسەلەیەکی دیکەش کە ئەخلاقی سیاسی و دینی ئەخاتە ژێر پرسیارەوە مەسەلەی کوشتنی «شەوکەتی حاجی موشیر» بوو کە بە مەبەستی وتوویژ لەگەڵیدا کۆبوونەوە کراو لە ناو کۆبوونەوەکەدا کوژرا. تەنانەت دوو کەسیش کە وەك بارمتە لای ئەنسار دانرابوون ئەوانیش دواتر کوژران، ئەمە لە حاڵێکدایە ئیسلام رێگەی بە کوشتنی دیل یاخود کوشتن لە کاتی وتوویژدا نەداوە.**

راگەیاندنی یەکیەتی هەموو کات لە رێگای هاتوو هووت و درۆو دەلەسەوە هەوڵی چەواشەکاری و شێواندنی راستییەکان ئەدات و بۆ ئەوە نابێت ئەم هاتوو هووتە بکەینە بەڵگە بۆ سەلماندنی رووداوە مێژووییەکان. بە نیسبەت ئەوەوە کە وتووتانە ئەو کارانەی ئەنسار پێچەوانەی ئەخلاقی سیاسییە، پێمخۆشە پێتان بڵێم ئەمە وەکوو ئەوە وایە کە گورگێك بە بەرخێك ئەڵێ بۆچی پار قسەت پێ وتووم؟ ئەویش ئەڵێت: مام گورگ دیارە هەر بەهانەم پێ ئەگریت دەنا من کە بەرخی ئەمساڵم چۆن ئەبێ پار قسەم بە جەنابت وتبێ!!؟ یەنەکیش بە مەبەستی تاوانبارکردنی ئەنسارولئیسلام باسی خێڵی حەمەو چەند شەڕێکی تری ئەکرد کە سەردەمی جوندولئیسلام روویان دابوو و هیچ پێوەندییەکیان بە ئەنسارولئیسلام و هۆدنە شەش مانگییەکەوە نەبوو. لە پێوەندیی لەگەڵ ئەم پرسیارەدا پێم خۆشە باسی رووداوێکتان بۆ بکەم کە لە کاتی شەڕی خێڵی حەمەدا رووی داوەو کەمتر باسی لێوە کراوە. ئەو ئەندامانەی جوندولئیسلام کە بەشدارییان لە شەڕی خێڵی حەمەدا کردبوو، کاتێك باسی بڕگەیەکی شەڕەکەیان ئەکرد، هەندێکیان بە ئەسەف و ناڕەحەتییەوەو هەندێکیشیان بە مەبەستی داماڵینی شتەکە لە سەر خۆیان یان دڵخۆشکردن بەوە کە رووداوەکە لە رووی نەزانی و لە دەست دەرچوونەوە بووە، داوایان لە خوای گەورە ئەکرد لە ئەنجامدەرانی خۆش بێت. هەروەها ژمارەیەکیش سەرکردایەتی جوندیان تۆمەتبار دەکرد و ئەیانوت چۆناوچۆن حیسابی رووداوێکی وای نەکردووەو لێی نەکۆڵاوەتەوە. رووداوەکەش ئەوە بوو کە لە کاتی هێرش و هەڵمەتی هێزەکانی جوندولئیسلامدا بۆ سەر هێزەکانی یەکییەتی جێگیر لە خێڵی حەمە، شەش ئەندامی یەنەك لە ماڵێکدا خۆیان ئەشارنەوەو کاتێك هێزەکانی جوند پێیان ئەزانن و داوای تەسلیمبوونیان لێ ئەکەن داواکە قبووڵ ئەکەن و ئەپاڕێنەوە تاکوو رێگایەکیان بۆ بکرێتەوە بۆ ئەوەی شوێنی شەڕەکە بوجێ بهێڵن بە بێ ئەوەی دەست بێننە سەر رێگایان. موجاهیدین داواکەیان قبووڵ دەکەن و ئەوانیش بەرەو دەرەوەی دێیەکە ئەکەونە رێ بەڵام لەوێ لە لایەن هێزێکی تری جوندولئیسلامەوە پێش ئەوەی مەجالی روونکردنەوەیان پێ بدرێت، تەقەیان لێ ئەکرێت و ئەکوژرێن. دواتر کاتێك هێزەکانی جوند بە یەك ئەگەنەوەو باسی شەڕەکە دەکەن، دەرئەکەوێ چۆناوچۆن ئەو شەش ئەندامەی یەنەکیان کوشتووە. بۆیە کوژرانی ئەم شەش کەسە ئەمان دراوە هەندێ ناخۆشی و پرسیاری لێکەوتەوە چونکوو ئەم کارە لە روانگەی ئیسلامەوە حەرامەو نەهی لێ کراوە. بەم

هۆیەشەوە بوو کە لەو سەردەمەدا جوندولئیسلام پێی خۆش نەبوو باسی ئەم رووداوە بکاتە دەرەوەی رێکخراوەکە بە تایبەت بکاتە یەکییەتی نیشتمانی. ئەگەر ئەوان شتێکی وایان دەست بکەوتایە ئەوا بەزمێکی تری پروپاگەندەیان دەست پێ دەکرد و لە رووی شەرعییشەوە هەوڵی تاوانبارکردنی جوندولئیسلامیان ئەدا. بێ گومان ئەوان کە درۆیان نەکردە راست و بەردەوام خەریکی چەواشەکاری بوون، ئەگەر ئاگاداری ئەم شتە بوونایە، یە بێ ئەوەی باسی هەموو لایەنەکانی و چۆنییەتی رووداوەکە بکەن، ئەیانکردە خەتاو تاوانی هەموو رێکخراوەکە. هەروەها باسکردنی ئەم شتە ئەبوو هۆی ئەوە کە چیتر هیچ ئەندامێکی یەنەك ئامادە نەدەبوو خۆی تەسلیم بکات چونکوو متمانەیان بە موجاهیدین نەدەکرد و وەعدەو بەڵێنەکانی ئەوانیان بە درۆ دەزانی. ئەندامانی جوندولئیسلام یەکدەنگ بوون لە سەر ئەوە کە ئەم کارە هەڵە بووەو رووداوانەکەیشی بە هۆی نەزانی و نا هەماهەنگی نێوان موجاهیدینەوە بووە، بەڵام بە پێچەوانەوە کوژرانەکەی شەوکەتی حاجی موشیر ئەوەندە باس و خواسی لێ نەکەوتەوەو زۆربەی ئەندامان و بەرپرسانی ئەنساروئیسلام هەرچەند ئاگاداری وردەکارییەکانیشی نەبوون بەڵام بە کارێکی رەوایان ئەزانی.

کوژرانەکەی شەوکەتی حاجی موشیر دوو مانگ دوای شەری تەپەکورەو گردەدرۆزنە و کەمێك پێش جەژنی قوربانی ساڵی ٢٠٠٢ بوو. پێش ئەم رووداوە کاتێك «کۆسرەت رەسوول»ی گەورە بەرپرسی یەنەك ئاگاداری ناکۆکی و نێوان ناخۆشییەکانی کەتیبەی فەتح و سەرکردایەتی ئەنساروئیسلام دەبێ، لە رێگای کەسێکەوە کە لەگەڵ ئەندامانی فەتحدا نزیکایەتی و هاتووچۆی بووە، پێشنیار بە بەرپرسانی ئەم کەتیبەیە ئەکات تاکوو بە بێ ئاگادار کردنەوەی قیادەی ئەنسار، لەگەڵ یەکیەتیدا وتوویژ و دانووستان بکەن. بەرپرسانی فەتح ئەم پێشنیارەی کۆسرەت رەت دەکەنەوەو زۆریشیان بەلاوە ناخۆش ئەبێ کە ئەبینن هەندێ ناکۆکی بچووکی نێوان ئەوان و سەرکردایەتی ئەنسار ئاوا دڵی دوژمنی خۆش کردووە. بەڵام سەرباری رەتکرانەوەی داواکەی لە لایەن کەتیبەی فەتحەوە، کۆسرەت واز ناهێنێ و چەند جاری تریش ئەم پێشنیارەی ناردۆتەوە بۆ ئەوان.

ئەندامانی کەتیبەی فەتح کاتێك ئەیانبینی -وەك خۆیان ئەیانوت- هەولێرییەکان باڵیان بە سەر رێکخراوەکەدا کێشاوەو نانی ئازایەتی کۆنە حەماس و تەوحیدەکان ئەخۆن بە بێ ئەوەی لە کوولەکەی تەریشدا ناوی ئەوان بهێنن، تووشی دڵساردی و نائومێدی ئەبوون و ئەمەش دڵی دوژمنێکی وەك یەکیەتی پێ خۆش ئەبوو. لەو کاتەدا هێمن بانیشاری ئەمیری کەتیبەی فەتح بوو کە ئەندامی سەرکردایەتی ئەنساروئیسلامیش بوو، ئەو سەرباری ناکۆکییەکانی نێوان کەتیبەی فەتح و قیادەی ئەنسار، باسی کۆسرەت رەسووڵ و ناردنی پەیام لە لایەن ئەوەوە ئەگەیەنێتە ئەبوو عەبدوڵڵای شافیعی جێگری ئەمیری گشتی ئەنساروئیسلام. بۆیە پاش تاووتوێکردنی وردی مەسەلەکە، قیادەی ئەنسار دێتە سەر ئەو باوەرە تاکوو لە رێگای هێمن بانیشارییەوە کە متمانەیەکی زۆریان پێی هەبوو، دوای مەسەلەکە بکەون تاکوو بزانن کۆسرەت چ پیلان و بەرنامەیەکی لە سەردایەو ئەیەوێ چی بکا. کاك هێمن لەو باوەرەدا بوو کاتێك کۆسرەت خەریکی پیلانگێرییە دژی ئەنساروئیسلام، بۆچی ئەم رێکخراوە هێلکەکە لە سەر خۆیدا نەشکێنێتەوەو کەسێکی بۆ نەنێرێ خۆی پیا بتەقێنێتەوە. بۆیە ئەو ئەمەی وەك پێشنیار رووبەرووی سەرکردایەتی ئەنسار کردەوەو ئەوانیش قبووڵیان کرد. پاشان سەرکردە سیاسییەکانی ئەنسار دەستبەکار بوون و بریار درا ئەم جارەیان کەمێك نەرمتر لە جاران وەڵامی پێشنیارەکی کۆسرەت بدەنەوە. هەروەها بە پێی ئەو بەرنامەیەی کە بۆیان دانرابوو ئەبوایە ئەندامانی کەتیبەی فەتح لای نێردراوەکان -ئەوانەی پەیامی کۆسرەت رەسووڵیان ئەهێنا- دەستیان بدایەتە گلەیی و گازەندە لە سەرکردە هەولێرییەکانی ناو ئەنسار بۆ ئەوەی کۆسرەت بە گوڕوتینێکی زیاترەوە دوای مەوزووعەکە بکەوتایە. پاشان ئەنساریش وردە وردە کار ئەگەیەنێتە ئەوە گوایە هێمن بانیشاری ئامادەیە نوێنەرێکی خۆی بنێرێتە لای کۆسرەت رەسووڵ بە مەرجێك ئەویش کەسێکی نزیکی خۆی وەك بارمتە رەوانەی لای ئەنساروئیسلام بکات تاکوو ئەمانیش بە بێ خەم نوێنەری خۆیان رەوانەی لای ئەو بکەن. ئەمە تاقیکارییەك بوو بۆ ئەوەی بزانن نێردراوەکەی ئەنسار چۆن مامەڵەی

لەگەڵدا ئەکرێ و تا چەند لەگەڵ پشکنین و تەفتیشدا رووبەڕوو ئەبێتەوە. پاش گەڕانەوەی نێردراوەکەی ئەنسار و گێڕانەوەی وردەکارییەکان و ئەوەی کە چۆناوچۆن تەفتیشیان کردووەو پشکنیویانەو تەنانەت سەعاتەکەی دەستیشیان دەرهێناوە، ئیتر کاک هێمن نائومێد ئەبێ و لە باتی ناردنی لیستەی خەڵات و داخوازییەکانی کەتیبەی فەتح، پەیامی داخستنی دۆسییەکە بۆ کۆسرەت رەسووڵ ئەنێرێ.

پاش ماوەیەك یەنەك بۆ جارێکی تر پێوەندیی بە بەرپرسانی کەتیبەی فەتحەوە ئەکات بەڵام ئەم جارەیان نەك لە رێگای کۆسرەتەوە بەڵکوو بە هۆی شەوکەتی حاجی موشیرەوە کە یەکێك بوو لە کۆنە بەرپرسانی ئەوان و بەرجەستەترین سەرکردەیان بوو لە ناوچەی شارەزوور دەست بە ناردنی پەیام ئەکات. شەوکەتیش بە هەمان شێوەی کۆسرەت رەسووڵ ئەکەوێتە پەیام ناردن بۆ بەرپرسانی کەتیبەی فەتح تاکوو بتوانێ هەمان ئەو پیلانگێڕییە بەردەوام بکات کە پێشتر کۆسرەتی برا گەورەی لێی نا نومێد بووبوو. ئەوان دڵخۆش بوون بەوەی کە بە رێکەوتن لەگەڵ کەتیبەی فەتح هەم موجاهید و شەرکەرانی ئەم کەتیبە لە ئەنسار دابڕن کە جەنگاوەرترین موجاهیدینی ناو رێکخراوەکە بوون و هەمیش زنجیرە چیای دۆڵی تاوێرەو هاوارییەکان و شاخەکانی «بەنەن»یان خستبێتەوە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە کە لە سەردەمی جوندولئیسلامەوە موجاهیدینی کەتیبەی فەتحیان تیادا جێگیر کرابوو. بۆیە ئەوان لە پەیامەکانیاندا ئەمانەیان کردبووە مەرجی خۆیان و داوای جێبەجێکردنی ئەم مەرجانەیان لە کەتیبەی فەتح ئەکرد. سەرەنجام پاش ماوەیەك هاتووچۆو دانیشتن، بانیشاری بۆی دەرئەکەوێت کە شەوکەتی حاجی موشیر ئەوەندە خۆشبینانە ئەڕوانێتە پیلانەکەو دڵی پێ خۆش کردووە کە ئاگای لە پاراستنی خۆی نەماوە. لە راستیدا شەوکەت باوەڕی کردبوو کە خەریکە مەبدەئی ترین هێزی ناو ئەنسارولئیسلام لە بەرانبەر هەندێ ئیمتیازی دونیایی و هیچ و پووچدا تووشی پاشگەزبوونەوەو دابڕان بکا، بێ خەبەر لەوەی کە ئەوان بە هیچ شێوەیەك مەرام و مەبەستی ئیسلامییانەی خۆیان ناگۆڕن و واز لە جیهاد و دژایەتیکردنی بەرەی کوفر ناهێنن. لە ناوەها کاتێکدا بوو کە بانیشاری بڕیاری کۆتایی خۆی داو بە سەرکردایەتی ئەنساری وت کە کاتی کوشتنی شەوکەت هاتووە، سەرکردایەتیش بۆ ئەوەی چالاکییەکە بە ناوی کەتیبەی فەتحەوە تەواو نەبێ وئەوان نەیکەنە فەخر بۆ دوارۆژی خۆیان، ئەندامێکی کۆنی جەماعەت مەرکەزیان بە ناوی «سەربازە»هەولێری ئامادە کرد تاکوو لەگەڵ ئەندامێکی کەتیبەی فەتحدا پێکەوە چالاکییەکە بەڕێوە ببەن. بە پێی بەرنامەکەی هێمن بانیشاری، دەبوایە چالاکییەکە لە لایەن دوو کەسی (استشهادی)یەوە ئەنجام بدرایە، بۆیە لە سەر پێشنیاری قیادەی ئەنسار، سەربازی ناتەواو ئەندامێکی کەتیبەی فەتح بەڕێوەبردنی چالاکییەکەیان کەوتە سەرشان و ئەوان لە رواڵەتدا وەك نوێنەرانی کەتیبەی فەتح رەوانەی شوێنی مەبەست کران. لە بەرامبەردا یەنەکیش دوو بارمتەی رەوانەی لای کەتیبەی فەتح کرد کە یەکێکیان خەڵکی گوندی بەڵخی ژێر دەسەڵاتی بزووتنەوەی ئیسلامی خاڵی یەك لە ئەندامانی کەتیبەی فەتح بوو. چالاکییەکە لە هەمان شوێنی کۆبوونەوەکە واتە لە دێی «گامێش تەپە» بەڕێوە چوو و قەدەری خوای گەورە وابوو کە دوو نێردراوەکەی ئەنسارولئیسلام پاش کوشتنی شەوکەتی حاجی موشیر و چەند بەرپرس و پێشمەرگەیەکی تری یەکیەتی نیشتمانی، بە سەلامەت رزگاریان بوو گەڕانەوە لای هاوڕێ موجاهیدەکانیان. شایانی باسە چەند ئەندامێکی ئەو ماڵەش کۆبوونەوەکەی تیادا بەڕێوەچوو، پێوە بوون و کوژران یان بریندار بوون. بەڕێوەچوونی سەرکەوتووانەی چالاکییەکە بە تایبەت گەڕانەوەی دوو موجاهیدەکەی ئەنسار، لە لایەك خۆشحاڵییەکی زۆری لێکەوتەوەو لە لایەکی ترەوە کۆتایی بە هەوڵی فیتنە ئەنگێزانەو خیانەتکارانەی یەنەك هێناو گەورە بەرپرسانی ئەم حزبەی تووشی دڵەڕان و نائومێدی کرد. بۆیە ئەم چالاکییە لە هیچ لایەنێکەوە جێگای رەخنە نەبوو و کەسیش پێی ناخۆش و دڵگران نەبوو، تەنیا یەکیەتییەکان بوون کە نەیاندەزانی چۆناوچۆن پینەی شکستەکەیان بکەن و هێرشێکی بەربڵاوی ئێعلامییان بۆ سەر ئەنسار دەست پێ کردەوە.

بە نیسبەت دوو بارمتەکەی یەکیەتیشەوە کە دەربارەیان پرسیارتان کردووە، ئەوان تا دوایین رۆژەکانی تەمەنی ئیمارەتی بیارە لە زیندانی ئەنساردا بوون و لە کاتی هێرشەکانی بەهاری ۲۰۰۳س ئەمریکادا، لە لایەن موجاهیندی ئەنسارەوە کوژران. ئینجا کوژرانی ئەوان چەند سەحیح و شەرعی بووبێ ئەمە پێوەندیی بە هەیئەی شەرعییەوە هەیە کە چۆناوچۆن و بە پشتبەستن بە کامە هۆکاری شەرعی ئەوانیان بە تاوانبار و شیاوی کوشتن زانیوە. بێ گومان کوژرانی ئەوان هۆکارێکی شەرعی لە پشتەوە بووە بە تایبەت ئەوەی کە ئەوان سەر بە لایەنێکی کوفری بوون و وەك نوێنەری ئەو لایەنە نێردرابوونە لای ئەنسارولئیسلام. هەروەها خەڵکانێکی مورتەد بوون و بە مەبەستی تێکدانی ریزەکانی ئەنسارولئیسلام بەشدارییان لە پیلانی خیانەتکارانەی یەکیەتیدا. وەك باسم کرد یەك لەو بارمتانە خوشکەزای موجاهیدێکی کەتیبەی فەتح بوو بە ناوی رەمزا. بۆیە رەمزا پێچەوانەی ئەمە بیری ئەکردەوەو کوژرانی ئەوانی بەلاوە باش نەبوو. ئەو لەو باوەڕەدابوو کە نەدەبووا ئەنسار کارێکی وای بکردایەو ئەیوت لە لایەك خاڵم کەسێکی ناموسوڵمان و دژە دین نەبوو و شیاوی عەفوکردن بوو و لە لایەکی تریشەوە ئەنسار بە کوشتنی ئەو، هەموو بنەماڵەکەمانی لە خۆی تووڕە کردووە. هەروەها ئەو ئەیوت بنەماڵەکەمان زۆر لە منیش تووڕەن و بەشێکی زۆری خەتاکە بە منەوە ئەلکێنن و لەو باوەڕەدان کە خاڵم بە هۆی منەوە کێشراوەتە ناو کایەکەوە.

**ئایا «ناشەرعیبوون» یاخود شێوازی داڕشتن و بەڕێوەبردنی ئەو تیرۆرە کە پێڕەوییەکی تەواوی لە دەستووورە ئیسلامییەکانەوە نەدەکرد، نەبووە هۆی کەوتنەوەی ناکۆکییەکی عەقیدەتی و دروستبوونی ناتەبایی لە ریزەکانی رێکخستنی ئەنساردا؟**

نازانم بۆ ئەڵێن ناشەرعی. نازانم لە سەر چ ئەساسێك ئەڵێن پێڕەوی لە دەستووورە ئیسلامییەکانەوە نەدەکرد؟ باشە ئەگەر بەڵگەیەکتان بۆ ناشەرعیبوونی ئەو تیرۆرە هەیە بۆ باسی ناکەن؟ لە وەڵامی پرسیاری پێشوودا بە ئاستی پێویست وەڵامم دایەوەو باسی روانگەو بۆچوونی بەرپرسان و ئەندامانی ئەنساریشم بۆ کردن. کوشتنی گەورە بەرپرسێکی حزبێکی مورتەد کە خەریکی پیلانگێڕییەکی گەورە بوو دژی رێکخراوی ئەنسارولئیسلام، نەك نەبووە هۆی ناکۆکی عەقیدەتی و ناتەبایی رێکخراوەیی لە ناو ئەنساردا بەڵکوو بە پێچەوانەوە هەم لە بواری عەقیدەتی و هەمیش لە بواری رێکخراوەییدا زۆر بە قازانجی ئەم رێکخراوە تەواو بوو و هەمووان تیرۆرکرانی شەوکەتیان بە دەسکەوتی گەورە بۆ خۆیان و رێکخراوەکە ئەزانی.

**با ئاوڕێکی کورت لە دوو کەسایەتی کاریگەری دیکەی ساحەی سەلەفییەتی جیهادخوازی کوردستان بدەینەوەو لە رێژەی کاریگەری و دەوری ئەو دوو کەسە لە پەرەپێدانی ئەو جۆرە سەلەفییەتە تێبگەین. هەرچەند پێشتر کەمێك باسیت کردبوو بەڵام کەمێك وردتر باسی رۆڵی«عەلی وەلی» و«عەلی تیژە»مان بۆ بکە.**

عەلی وەلی ناسراو بە «نەبوو دەرێط » خەڵکی شاری هەولێر و لە دایکبووی ۱۹۶۸ی زایینی بوو، ئەوەندەی ئاگادارم لە ساڵانی کۆتایی جیهادی ئەفغانستان (ایام الروس)دا سەردانی ئەم وڵاتەی کردووەو بە هۆی هۆگری زۆری بە کاری عەسکەری، لە ماوەی مانەوەیدا لە ئەفغانستان بەشداری خولی جۆراوجۆری پەروەردەی کردووەو ئەزموونێکی زۆری لەم بوارەدا بە دەست هێناوە. پاش گەڕانەوەی بۆ کوردستان پێوەندیی بە بزووتنەوەی ئیسلامییەوە کردووەو یەکێك بووە لە

دامەزرێنەرانی «المرکز الاسلامیە» واتە هەمان جەماعەت مەرکەز یان هێزی ٢ی سۆران. لە سەردەمی تاڵەباندا چۆتەوە ئەفغانستان و چەندین جار لە ڕێگای وڵاتی ئێرانەوە هاتوچۆی ئەم وڵاتەی کردووەو دەورێکی کاریگەری لە هاندانی موجاهیدە عەرەبەکان بۆ درێژەدانی جیهاد و ڕاهێنانی ئەوان بە کاری عەسکەری و بەکارهێنانی چەك و تەکنۆلۆژیای سەردەمەوە بوو. هەروەها ئەو یەکێك لەو موجاهیدە کوردانە بوو کە بەشداری خولی کۆماندۆی «معسکر فاروق»ی ئەلقاعیدەی کرد و بە هۆی دەرچوونی بە پلەی بەرز، لە لایەن شێخ ئوسامەوە خەڵات کراوە.

عەلی وەلی شارەزاییەکی کەموێنەی لە (سیاسة الشرعیە)و فیقهی جیهاددا هەبوو و بە یەکێك لە کاراترین سیاسەتمەدارە سەلەفی جیهادییەکانی کوردستان ئەژمار دەکرا. ئەو کەسێکی ڕەوشت بەرز و ئاکار جوان بوو و لە هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵك و موجاهیدیندا سادەو ساکار ئەجوولایەوە، لە سەردەمی جوند و ئەنسارولئیسلامدا یەکێك لە سەرکردە بەرجەستەکانی هاوڕێی ئەبوو عەبدوڵڵا شافیعی بوو. عەلی وەلی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکان و لە ناو عەرەبەکان و موجاهیدینی دەرەوەی کوردستاندا بە ئەبوو دەرداء الکوردی ناسرابوو، ئەو لە جیهادی عێراقی پاش ڕووخانی سەدام حسەیندا دەورێکی بەرچاوی گێڕاو زەبری قورسی لە لەشکری ئەمریکاو هێزە مورتەدەکان وەشاند و یەکێك بوو لە سەرکردە بە تواناکانی جیهادی عێراق. پاش ئەوەی چەند جارێك بە سەختی بریندار بوو، هاوکات لەگەڵ شەهیدبوونی زەرقاویدا –مانگێك پێش یان پاش شەهیدبوونی ئەبوو مسعەب– لە شاری بەغدا تیرۆر کرا. ئەو تا کاتی شەهیدبوونی یەکێك بوو لە ئەندامانی بەرجەستەی ڕێکخراوی ئەنسارولئیسلام.

عەلی تیژە ساڵی ١٩٨٠ی زایینی لە دێی «تیژە»ی ناوچەی چەمچەماڵ لە دایك بووەو بەو هۆیەوە کە باوکی پێشمەرگەی کۆنی پارتی بوو، لە ساڵانی نەوەدەکانداماڵیان چۆتە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەم حزبەو لە بنەسڵاوە نیشتەجێ بوون. ئەو یەکەمجار بە هۆی عەبدولستاری برایەوە کە پێشمەرگەی بزووتنەوەی ئیسلامی بوو، فێری دینداری بووە. عەبدولستار یەکێك لەو کەسانە بوو کە کاتی خۆی لە لایەن لیژنەی حەل و عەقدی ناو بزووتنەوەوە وەك ئیمام و مامۆستای مزگەوتی «تەپی سەفا»ی ناوچەی شارەزوور دیاری کرا. ئەو کەسێکی خوێندەوار و پابەندی نوسووڵە دینییەکان بوو و ئەمەش کاریگەرییەکی زۆری لە سەر عەلی تیژە داناو ئەوی تێکەڵ بە دەستەکەی حەسەن سۆفی کرد. ئەو پاش کوژرانی سۆفی و دەستگیرکرانی حەماسەکان لە لایەن بزووتنەوەی ئیسلامییەوە، گەڕایەوە بنەسڵاوەو دەورێکی بەرچاوی هەبوو لە گەیاندنی بیروباوەڕی سەلەفییەتی جیهادی بەو حەوت کەسەی کە دواتر جەماعەت تەوحیدیان دامەزراند. هەروەها بۆخۆیشی لە سەرەتای دروستبوونی تەوحیدەوە یەکێك بوو لە ئەندامانی ئەم گروپەو بە هۆی لێهاتوویی و جیدی بوونیەوە هەمیشە وەك کادیرێکی بەرجستە ئەم جەماعەیە حیسابی بۆ دەکرا.

عەلی تیژە لەگەڵ «عەبدوڵڵای بەڵەك»دا ژن و ژنخوازیی کردبوو کە یەکێك بوو لە کادێرە کاریگەرەکانی ناو جەماعەت تەوحید و دواتریش جوند و ئەنسارولئیسلام، ئەوان خوشکی یەکتریان هێنابوو بەڵام نەك بە مانای ژن بە ژن چونکوو لە ناو سەلەفییەکاندا نەك ژن بە ژن ناکرێت بەڵکوو ئەم شتە مەنع کراوە. عەلی تیژەو عەبدوڵڵای بەڵەك پاش لەشکرکێشی ئەمریکا بۆ سەر عێراق، لەگەڵ موسوڵمانە بەرهەڵستکارەکانی پارێزگای ئەنبار و ئۆردووگای ڕۆمادی ئاشناو تێکەڵاو بوون و بە هاوکاری ئەوان دەستیان بە جیهادکردن دژی سوپای ئەمریکاو هێزە مورتەدەکان کرد. هەرچەند ئەوان لە کاروباری خۆیاندا زۆر جیدی و بە توانا بوون بەڵام وەك پلەی کاری ڕێکخراوەی لە ئاستی کادێرێکی مامناوەندیدا بوون. ئەوان تا دوو ساڵ پاش داگیرکرانی عێراق بە ناوی ئەنسارولئیسلامەوە جیهادیان ئەکرد و پاشان پێوەندییان بە ڕیزەکانی قاعیدەوە کرد. بە پێی ئەو زانیارییانەی لە عێراقەوە دەهاتن، عەبدولستار و عومەری برا بچووکی عەلی تیژە لە جیهادی ناوەوەی عێراقدا شەهید بوون و خۆیشی چەند جارێك بریندار بووە بەڵام نازانم ماوە یان نەماوە یان ئەگەر ماوە لە کوێیە. عەبدوڵڵای بەڵەکیش چەند ساڵێك لەمەو پێش بە برینداری لە دەوروبەری مووسڵ دەستگیر کراوەو ئیتر نازانم کوژراوە یان هەر لە زینداندایە یان ڕزگاری بووەو خەریکی جیهادە.

با دیسان بچینەوە سەر کردەوە نا ئاساییەکانی سەلەفییەکانی کوردستان، چونکوو ئەو کۆمەڵە کارەی ئەوان ئەنجامیان دا، لای بیروڕای گشتیی کوردستان بوو بە جێی سەرسووڕمان و تەنانەت لە هەندێ نموونەدا کاردانەوەو ناڕەزایەتیی جەماوەریشی لێ کەوتەوە، بۆ نموونە هەڵکەندنی مەزارگەی شێخەکانی بیارە و باخەکۆن. ئەگەرچی هەندێ دەنگی ناو ئەنسار باسیان لەوە دەکرد گوایە ئەمەش یەکێکی تر بووە لە تاکڕەوییەکانی کەتیبەی فەتح و ئیجازەی سەرکردایەتی ئەنساری لەگەڵ نەبووە بەڵام کەسانی وەک ئەبوو وائیل و ئەیووب ئەفغانی بەشدارییان لەو ڕێوڕەسمەدا کردبوو و ئەمەش وای کردبوو گومان بکەوێتە سەر ئەو هەڵوێستەی ئەنسار گوایە بۆ خۆ ڕزگارکردن لە دەنگدانەوەی نیگەتیڤی ئەو کارە حاشای لە ئەنجامدانی کردووە، ئەگینا کارەکە بە ئیزنی قیادەی خودی ئەنسار ئەنجام دراوە. لەم بارەیەوە چی دەڵێن؟

نا ئاساییبوونی کار و کردەوەی سەرکردە سەلەفییەکانی کوردستان شتێکی ئاساییە چونکوو سەرهەڵدانی سەلەفییەتێکی ئاوا چڕوپڕی ئاوێتە بە جیهاد و دامەزرانی ئیمارەتێک بە مەبەستی چەسپاندنی حوکم و یاسای ئیسلام ئەویش لە هەلومەرجێکداو لە شوێنێکدا کە پڕە لە فیرقەو فیکرەی جۆراوجۆری دوور لە ئیسلام و دژی ئیسلام، کاردانەوەی جۆراوجۆری لێ ئەکەوێتەوە. دیارە لە کەش و هەوایەکی ئاوادا کردەوە رادیکاڵەکانی کۆمەڵێکی وەک جوند یان ئەنسارولئیسلام ناڕەزایەتی و سەرسووڕمانی ئەوانەی لێ ئەکەوێتەوە کە ئەم بیروباوەڕ و دەسەڵاتە بە مەترسی بۆ سەر خۆیان ئەزانن. ئەڵبەت بەڵگەشمان بۆ ئەمە زۆرێک لەو ئایەتانەیە کە ئیشارە بەوە دەکەن زۆرینەی خەڵک یان تێ ناگەن و کەم هەست و نەزانن یان ناسوپاسن و.....هتد، بۆیە ناڕەزایەتییەکانی جەماوەر تەنانەت ئەگەر قەبارەو بارستای زۆر گەورەش بە خۆیەوە بگرێت شتێکی سادەو ئاسایی و چاوەڕوان کراوە.
بە نیسبەت هەڵکەندنی گۆڕی شێخەکان و گواستنەوەیانەوە بۆ شوێنێکی نادیار، ئەتوانم بڵێم هەموو مەزهەبەکان لە رووی فیقهی و شەرعییەوە بە شێوەیەکی گشتی رێگەیان بە هەڵکەندن و گواستنەوەی گۆڕ داوە بە مەرجێک بەرژەوەندیی شەرعی تیادا بێت. بۆ نموونە گواستنەوەی گۆڕێک یان چەند گۆڕ بە بۆنەی پرۆژەیەکی خزمەتگوزارییەوە شتێکی پێویست و شەرعییە. بەڵام ئەوەی پێوەندیی بە باسەکەی ئێمەوە هەیە بەدەرە لەم حاڵەتەو باسی کۆمەڵە گۆڕێکی ناسراو و مێژوویییە کە ساڵەهای ساڵ لە لایەن خەڵکێکی زۆرەوە وەک پەرستشگە کەڵکیان لێوەر گیراوەو بوونەتە شوێنی نزاو پاڕانەوەیەک کە لە روانگەی سەلەفییەت و ئیسلامی راستەقینەوە مانای شیرک و بوتپەرستی ئەدا، بۆیە هەڵکەندن و گواستنەوەی ئەم جۆرە گۆڕ و پەرستشگەیانە لە هەر کوێیەک بێت ئەرکێکی شەرعییەو بێ گومان جەماعەیەکی وەک ئەنسارولئیسلامیش بە هەمان مەبەستەوە دەستی داوەتە هەڵکەندنی گۆڕی شێخەکان و کارەکەیان بە تەواوی شەرعی و یاسایی بووە. تەنیا ئەتوانین بڵێین ئەنسار بە نیسبەت کات و شێوازی هەڵکەندنی ئەو گۆڕانەوە تووشی هەڵە بوو و ئەمەش بۆچوونی زۆرکەس بوو لە ئەندامانی ئەم رێکخراوە لەو سەردەمەدا، هۆکاری هاتنە ئارای ئاوەها بۆچوونێکیش ئەگەڕایەوە بۆ ئەوە کە بە پلەی یەکەم هێشتا کاتی ئەوە نەهاتبوو سەلەفییەکانی کوردستان دەست بدەنە ئەم کارە چونکوو لە پێشدا زەمینەیان بۆ ئەنجامدانی ئاوەها کارێک فەراهەم نەکردبوو. بە پلەی دووهەمیش، لەو سەردەمەدا رێکخراوێکی وەک ئەنسار پێویستی بە ئەنجامدانی ئەم شتە نەبوو و مادام کە گۆڕەکان لە ژێر دەسەڵاتی ئیمارەتی بیارەدا بوون ئەیتوانی بە ئاگاکردنەوەی خەڵک دیاردەی سەردان و پەنابردن بۆ ئەم قەبرانە کاڵ بکاتەوەو وەک قەبرێکی ئاساییان لێ بکات.

ئەوەی ئێوە دەربارەی هەڵکەندنی قەبرەکان وتووتانە گۆیا کەتیبەی فەتح بێ پرسکردن بە قیادەی ئەنسار گۆڕی شێخەکانی هەڵداوەتەوە، ڕاستەو ئەوان بێ ڕاوێژکردن لەگەڵ سەرکردایەتی ڕێکخراوەکەو بە دزی ئەوانەوە ئەم کارەیان کرد. بەڵام با کەمێك بە وردی باسی ئەم ڕووداوەتان بۆ بکەم تاکوو خوێنەریش بە باشی لە وردەکارییەکان بگات. یەکەم جار چەند گۆڕ و زیارەتگایەکی شێخەکان لە شارۆچکەی توێڵەی ژێر دەسەڵاتی بزووتنەوەی ئیسلامی، لە لایەن تەحسینی کوڕی مەلا عەلییەوە هەڵدرایەوەو ئێسك و پرووسکەکانیان گوازرایەوە بۆ شوێنێکی نادیار، دەوترا ئەبوو زوبەیر یەکێك لەو کەسانە بووە هانی حاجی تەحسینی داوە تاکوو ئەو قەبرانە هەڵبداتەوە. بەڵام ئەوان کارەکەیان بە جۆرێك کردبوو کە کەمتر پێی زانراو کەمتریش باسی لێوە کرا. ئەمە کاریگەری زۆری لە سەر ئەندامانی کەتیبەی فەتحی ئەنسارولئیسلام داناو هانیدان تاکوو کارێکی هاوشێوەی ئەوان بکەن. بۆیە لەو سەردەمەدا دەنگۆی ئەوە هەبوو کە ئەندامانی فەتح بە پێشنیاری ئەبوو زوبەیر و وەرگرتنی ڕای ئەو دەستیان داوەتە هەڵکەندنی گۆڕی شێخەکان.
فەتحییەکان پێشبینیان کردبوو کە سەرکردایەتی ئەنسار ڕێگەی ئاوەها کارێکیان پێ نادات بۆیە خۆیان لیژنەیەکیان پێك هێناو بە دزیی سەرکردایەتییەوە لە شەوێکدا قەبرەکانی باخەکۆنیان هەڵکەند و ئێسك و پرووسکەکانیان گواستنەوە بۆ شوێنێکی نادیار. هەواڵی ئەم کارە بە هۆی کەسێکەوە کە هەر بەم بۆنەیەوە خۆی گەیاندەوە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی یەنەك، گەیشتە بەرپرسانی ئەم حزبەو ئەوانیش زۆر بە خێرایی باسەکەیان بردە سەر کەناڵە تەلەفزیۆنییەکانیان و هات و هەڵایەکی زۆریان پێوە ساز کرد. قیادەی ئەنساریش یەکەم جار لە ڕێگای کەناڵەکانی یەکییەتییەوە ئاگاداری ئەم شتە بوو.
سەرکردایەتی ئەنسار زۆر بە خێرایی لێکۆڵینەوەکانی خۆی دەستپێکرد بەڵام زۆر توندی نەگرت و بە شێوەیەکی جیدی بەدواداچوونی بۆ نەکرد چونکوو دیسان ترسی ئەوەیان بوو کەتیبەی فەتحیان لێ جیابێتەوە، بۆیە تەنیا سزایەکی سووکیان بۆ ئەمیری کەتیبەی فەتح و جێگرەکەی بڕییەوە. لە لایەکی تریشەوە سەرکردایەتی ڕێکخراوەکە پاش دانیشتن و لێکۆڵینەوەی کۆتایی گەیشتە ئەو ئەنجامە کە نەك بەرپرسایەتی کارەکە بگرێتە ئەستۆ بەڵکوو بڕیاریدا خۆیشی بەشداری تیادا بکات و بە سەرپەرشتی هەیئەی شەرعی هەوڵی هەڵکەندنی گۆڕ و قەبرە نیوە هەڵکەنراو یان هەڵنەکەنراوەکان لە ناوەڕاستی ئیمارەتەکەدا بدات. بۆیە ئەمە پێچەوانەی قسەکەی ئێوەیە کە وتووتانە گۆیا قیادەی ئەنسار لە ژێری دەرچووەو خۆی نەکردۆتە ساحێبی. هەروەها بە پێچەوانەی جاری پێشوو کە کارەکە بە نهێنی و شارەوەیی ئەنجام درا، ئەم جارەیان بە شێوەیەکی ڕەسمی و بە ئاشکرا دەست کرا بە هەڵکەندن و هەڵدانەوەی گۆڕی شێخەکان و کارەکەش بە ڤیدیۆش تەسویر کرا. هەروەها لە کاتی ئەنجامدانی کارەکەدا وتارێك لە پێوەندیی لەگەڵ هۆکاری هەڵکەندنی گۆڕەکاندا خوێندرایەوە کە تیایدا ئەم گۆڕانەو سەردان و پاڕانەوە لێیان بە شیرك و بوتپەرەستی و هەڵکەنرانیشیان بە کارێکی شەرعی و لە پێناو بنبڕکردنی دیاردەی شیرکی قبووردا باسی لێوە کرابوو. هەرچەند هەڵکەندن و گواستنەوەی ئەم قەبرانە لە گەڵ بیروباوەڕ و فیکرەی هەموو ئەندامانی ئەنساردا یەکی نەگرتەوە بەڵام ئەنجامدانی کارەکە لەو سەردەمەدا ویستی سەرکردایەتی ڕێکخراوەکە نەبوو و هۆکاری خۆ تێکەڵکردنی سەرکردایەتی ئەنساریش ئەوە بوو کە تازە بەشێك لە کارەکە ئەنجام درابوو و بە ناوی ئەنساریشەوە تەواو ببووبوو و ئیمکانی لە ژێر دەرچوونی نەبوو و لە لایەکی تریشەوە ئەنسار دەترسا ئەگەر بەشداری لە کارەکەدا نەکات ئەوا کەتیبەی فەتح ئەیکا بە بیانوویەك بۆ لە ڕێبازی شەرع دەرچوونی قیادەی ئەنسار و جیابوونەوەی خۆی لە ڕێکخراوەکە. بۆیە قیادە ناچاربوو هەڵکەندنی قەبری شێخەکان بخاتە سەرشانی خۆی و بەشداری لە کارەکەدا بکات، بەشداری کردنەکەش بە جۆرێك بوو کە شێخ ئەبوو وائیلی بەرپرسی هەیئەی شەرعی و کاك ئەیووب ئەفغانی و کاك هەڵگوردی ئەندامانی سەرکردایەتی و ژمارەیەك لە ئەندامانی بەشی ئاسایش بە هاوڕێیەتی لیژنەکەی کەتیبەی فەتح، هەستان بە هەڵکەندنی پاشماوەی گۆڕی شێخەکان و کارەکەیان گەیاندە کۆتایی. هەروەها لە وێنە ڤیدیۆییەکاندا وەفدەکەی سەرکردایەتی زیاتر زەق کراونەتەوە

تاكوو بەشداریكردنیان لە كارەكەدا بە بەڵگەوە بسەلمێنن و نەهێڵن فەتحییەكان بە ناوی خۆیانەوە تەواوی بكەن. ئیتر ئەنسار هەموو كات و لە بەڕێوەبردنی زۆربەی كارەكاندا ئەبوایە بە شێوازێكی گونجاو ئەندامانی كەتیبەی فەتحیان بەشداری بدایە بۆ ئەوەی بڕ و بیانووەكانی ئەوانیان كەم بكردایەتەوە. بۆ نموونە قیادەی ئەنسارولئیسلام لە كاتی دانیشتنەكانی نێوان خۆیان و یەنەك لە سەردەمی هۆدنە شەش مانگییەكەدا، بڕیاریان دا بە بێ كەسێكی وەك عومەر بازیانی دانیشتن ناكەن و ئەمەش بۆ ڕێگرتن بوو لە كەڵكوەرگرتنی پێچەوانەی كەتیبەی فەتح لەم دانیشتنانە. قیادەی ئەنسار ترسی ئەوەیان بوو كە فەتحییەكان دواتر بە مەبەستی بە ناشەرعی ناساندنی هۆدنەكە كەڵك لەم دانیشتنانە وەرگرن بۆیە ئەوانیشی لە دانیشتنەكاندا بەشداریدا.

**هەر لە سەردەمی «ئیمارەتی بیارە»دا هەندێ چالاكیی خۆ تەقاندنەوە (استشهادی) بەڕێوە چوو. ئەنسار تا چەند بایەخی بەم شێوە چالاكییە ئەدا، ئەو ١٥٠عەرەبە خۆبەخشەی بە مەبەستی ئەنجامدانی كردەوەی (استشهادی) هاتبوونە نێو ریزەكانی ئەنسارەوە تا چەند مەجالی بەڕێوەبردنی ئەو مەبەستەیان پەیدا كرد؟**

ڕێكخراوی ئەنسارولئیسلام چالاكی خۆ تەقاندنەوەی وەك شێوازێكی كارای جەنگی نوێی موسوڵمانان دژی بەرەی كوفر بە گرنگ زانیوەو لە كردەوەشدا تا پێش هاتنی سوپای ئەمریكا، بە ئاستێكی مام ناوەندی هانگاوی بۆ هەڵگرتووە. چالاكیە ئیستشهادییەكەی «زەمەقی» كە بە هۆی موجاهیدێكی خەڵكی «وڵاغلوو»ی ناوچەی شارباژێر بە ناوی «عبدالغنی» بەڕێوە چوو، ناردنی كەسێكی ئیستشهادی بە ناوی «ئاری» بۆ خۆ تەقاندنەوە لە مۆڵگەیەكی هێزەكانی یەكییەتی لە شارۆچكەی سەیدسادق ( ئاری كە خەڵكی هەولێر بوو، پێش خۆ تەقاندنەوە دەستگیر كراو پاشان لە زینداندا ئاڵوگۆڕی بە سەردا هات)، خۆ تەقاندنەوەی ئیستشهادییەكی ئەنسار لە بارگەیەكی هێزەكانی یەكییەتیدا كە ڕۆژنامەنووسێكی بیانیشی تیادا كوژرا، چالاكیە ئیستشهادییەكەی «گردی .....» لە دووهەم ڕۆژی هێرشە مووشەكییەكەی ئەمریكادا كە ئەنجامدەرەكەی موجاهیدێكی عەرەب بوو بە ناوی «ئەبوو حوڕ»، هەر لەو سەردەمەدا چالاكییەكی تریش لە دەورووبەری «عەبابەیلێ»ی سەر بە شارۆچكەی هەڵەبجە لە لایەن موجاهیدێكی عەرەبەوە ئەنجام دراو هەروەها چەند هەوڵێكی تری هاوشێوەش كە ناسەركەوتوو بوون، بەشێكن لە چالاكیە ئیستشهادییەكانی گرووپی ئەنسارولئیسلام لە سەردەمی ئیمارەتی بیارەدا. بەنیسبەت ئەو عەرەبە ئیستشهادییانەیشەوە كە هاتبوونە كوردستان، وەك پێشتر باسم كرد ئەوان لە سەردەمی جوندولئیسلامدا پاش كوژرانی ئەبوو عەبدولرەحمانی شامی، زۆربەیان كوردستانیان بەجێ هێشت و ژمارەیەكی تریشیان وازیان لە كاری ڕێكخراوەیی هێناو تا دوواین ساتەكانی ئیمارەتی بیارە لە ناوچەكەدا مانەوەو كەسیشیان خۆی نەتەقاندەوە. لە سەردەمی ئەنساردا ژمارەیەكی تری عەرەب كە بە هانای ئەم ڕێكخراوەوە هاتبوون، كەتیبەی (الغربة )یان دروستكرد. ئەوان بە زۆری خەڵكی وڵاتی سعوودییە بوون و كەسی بەرجەستەی ناویان «یاسین البحر» بوو كە لە ناو موجاهیدەكاندا بە یاسینە ڕەش ناسرابوو، ئەو كاتی هێرشی هێزەكانی ئەمریكاو یەكییەتی بۆ سەر بنكەو بارەگاكانی ئەنسارولئیسلام لە بەهاری ٢٠٠٣دا، شەهید بوو. هەروەها ئەنسار خاوەن دەستەیەكی كورد و عەرەبی ئیستشهادی بوو كە ژمارەیان ٢٠ تا ٤٠ كەس دەبوو و كەسێكی عەرەب بە ناوی «ئەبوو تەیر» یا خود «ئەبوو موحەممەد»ی هاوڕێی ئەبوو مەسعەب زەرقاوی ئەمیریان بوو. ئەبوو تەیر لە كاتی هێرشەكانی بەهاری ٢٠٠٣دا، بێ گوێدانە قسەی ئەندامانی ئەنسار كە داوایان لێ كرد لەگەڵ ئەواندا خۆی دەربكات، لە ناوچەكەدا مایەوەو پاشان بە شێوەی (انغماس) شەهید بوو و تەرمەكەی لەگەڵ تەرمی ٣٨ عەرەبی تردا لە گۆڕستانی شێخ ئەحمەدی شاری سلێمانی كرا بەژێر خاكەوە. بەڵام لە كاتی چوونە داخڵەوە واتە پاش لەشكركێشی ئەمریكا بۆ

سەر عێراق، ئەنسارولئیسلام هەم لە سەردەمی «ئەنسارولسوننە»داو هەمیش دواتر بە شێوەیەکی دیار و بەرچاو و بە پێی توانا کاری کردووەو چەندین چالاکی ئیستشهادیی بەڕێوە بردووە.

**هێز و لایەنە ئیسلامییەکانی کوردستان هەمیشە پێوەندییەکی پتەو و گەرمیان لەگەڵ کۆماری ئیسلامیی ئێراندا هەبووەو هەندێ جار ئەو پێوەندییانە هێند چڕوپڕ دەبوویەوە تۆمەتی ئەوەیان دەدرایە پاڵ گوایە راستەوخۆ پیاوی ئێرانن و بە فیتی ئەو ئەجووڵێنەوە. ئەنسار و جوندیش ئاوا تۆمەتێکیان لە سەر بوو و زۆر جار وەك پیاوی ئێران ناویان لێ دەبرا، بە تایبەت کە سنووری ئیمارەتی بیارە لکابوو بە سنووری کوردستانی ژێر دەسەڵاتی ئێرانەوەو ئەمەش وەك بەڵگەی یارمەتیدانی ئێران بۆ ئەو ئیمارەتە چاوی لێ دەکرا. ئاست و چۆنیەتیی پێوەندییەکانی ئێران لەگەڵ ئەو دوو گروپەدا بە چ شێوەیەك بوو؟**

ئەبێ من هەموو جارێك پێش وەڵامدانەوەی پرسیارەکەتان کاتێکی زۆر تەرخان بکەم بۆ راستکردنەوەی پرسیارەکەتان، ئاخر کام بەڵگەو سەنەد باسی ئەوە دەکات کە لایەنە ئیسلامییەکانی کوردستانی عێراق وەك ئێوە وتووتانە، پێوەندییەکی هەمیشە پتەو و گەرمیان لەگەڵ کۆماری ئیسلامیی ئێراندا بووەو وەك وتووتانە: هەندێ جار ئەو پێوەندییە هێند چڕوپڕ بۆتەوە کە بە هۆیەوە تۆمەتی ئەوە دراوەتە پاڵ ئیسلامییەکان گوایە راستەوخۆ پیاوی ئێرانن و بە فیتی ئەو ئەجووڵێنەوە. باشە من لە خۆتان ئەپرسم کاتێك لایەنە ئیسلامییەکان ئەم شێوە پرسیار کردنەی ئێوە ئەبینن ئایا ئێوەیان وەك خەڵکانی بێ لایەن دێتە بەرچاو و پۆلاندنەکەتان بە پۆلاندنێکی بێلایەنانە وەسف ئەکەن؟
باشە ئەگەر منی ئیسلامی بۆ سەلماندنی ئەو ئیدیعایانە داوای بەڵگەتان لێ بکەم ، چ بەڵگەو سەنەدێکتان بە دەستەوەیە؟
بە هەر حاڵ رەنگە لەم بەندیخانەیەدا داوای بەڵگە کردن و بەڵگە هێنانەوە شتێکی نەگونجاو بێت بەڵام پێمخۆشە لەم بارەیەوە چەند پرسیارێکتان لێ بکەم. باشە یەکگرتووی ئیسلامی و سەلەفییە لاجەماعییەکانی کوردستانی عێراق کام کار و کردەوەیان ئەوەی لێ ئەفامرێتەوە کە پێوەندیی گەرم و پتەویان لەگەڵ حکوومەتی ئێراندا هەبووبێت یان هەبێت؟ بزووتنەوەی راپەڕینی ئیسلامی (ئەهزە) تا کاتی کۆتایی هاتنی تەمەنی چ پێوەندییەکی لەگەڵ کۆماری ئیسلامیدا هەبوو؟ ئایا ئەو یارمەتییانەی دەسەڵاتی ئێرانی بە بزووتنەوەی ئیسلامی داوە بە ئەندازەی دڵۆپێکی ئەو یارمەتییانە ئەبێت کە بە حزبە کوردی و عیلمانییەکان بۆ نموونە یەکییەتی نیشتمانی داوە؟ رەنگە بڵێن ئەم شتانە لە رووی تووڕەیی و دەمارگرژییەوە ئەڵێم بەڵام خۆ وەڵامەکانی پێشووم پێچەوانەی ئەمە دەسەلمێنن، هەم ئێوەو هەمیش خوێنەر ئەبێ لە بیرتان بێ لە کاتی باسکردنی لەشکری ئیسلامییدا چۆناوچۆن باسی یارمەتیدرانی ئەم لەشکرەم لە لایەن سێ وڵاتی ئێران و سووریاو لیبیاوە کرد و بۆ خۆیشم ئەمەم هورووژاند نەك ئەوەی ئێوە پرسیبێتتان و منیش وەڵامم دابێتەوە. بۆیە نە دەمارگرژانە هەڵوێست ئەگرم و نە ئەمهەوێ راستییەکان بشارمەوە. لە راستیدا ئێمەی ئیسلامی بە پێچەوانەی خەڵکانی تر بە لامانەوە ئەتك و عەیب نییە باسی پێوەندیی خۆمان لەگەڵ کەسێك و لایەنێکدا بکەین تەنانەت ئەگەر ئەو باسکردنە زەرەری دونیایی زۆری بۆمان هەبێ. من وەکوو خۆم و وەك کەسێکی ئیسلامی کە ئامادە بووم ئەم وتووێژەتان لەگەڵدا بکەم لە سەرم پێویستە وەك بیرخستنەوە یاخود ئامۆژگاری پێتان بڵێم ئەو قسانەتان نەك نیشانەی بێ لایەنیتان نییە بەڵکوو ئینسافیشی پێوە دیار نییە. بە هەر حاڵ ئەمە بۆچوونی منەو ئێوە خۆتان بەرپرسی بیروڕای خۆتانن و خۆتان باشتر ئەزانن چۆن بن و چی بکەن، لەگەڵ رێزمدا من ئەوەندەم لە سەرە ئەو شتانەتان پێ بڵێم.
ئێستا با بێمە سەر وەڵامدانەوەی پرسیارەکان. دوای شەڕە توند و قورسەکانی جوندولئیسلام و یەنەك، ئێران لە رێی نوێنەرێکی خۆیەوە نامەیەکی بۆ سەرکردایەتی ئیمارەتی بیارە ناردبوو کە هەندێ باس و خواس و داواکاری لە خۆ

گرتبوو، بەڵام ئیمارەتی بیارە ئامادە نەبوو وەڵامی ئەرێ بە داواکارییەکانی ئەوان بداتەوەو لە وەڵامدانەوەی ئەوانیشدا بۆ ئەوەی رەسمییەتی بە ئیسلامیبوونی دەسەڵاتی ئێرانی نەدابێ، وشەی ئیسلامی نەخستبووە پاڵ وشەکانی تر و لە باتی کۆماری ئیسلامیی ئێران، (کۆماری ئێران)ی نووسیبوو و ئەمەش داخێکی گەورەی لە دڵی ئێرانییەکاندا دروست کردبوو و هەرکات ئەندامێکی جوند یان ئەنساریان دەست بکەوتایە ئەمەیان بە روودا ئەدایەوە. جا لە کاتی هەبوونی ناوەها هەڵوێستێکی توندوتۆڵدا ئەویش لە وەڵامی یەکەم نامەی ئەواندا، ئەگەری دروستبوونی چ پێوەندییەك لە نێوان ئیمارەتی بیارەو حکوومەتی ئێراندا هەیە. هەر لەم پێوەندییەدا پێمخۆشە باسی شتێکی ترتان بۆ بکەم، لە کۆتاییەکانی تەمەنی جوند و بەراییەکانی دامەزرانی ئەنساروليئیسلامدا کۆمەڵی ئیسلامی، بزووتنەوەی ئیسلامی و یەکییەتی نیشتمانی لە لایەن حکوومەتی ئێرانەوە بانگهێشتی تاران کران و نوێنەرانی ئەم سێ لایەنەو نوێنەرانی لایەنی ئێرانی کۆبوونەوەیەکی چوارقۆڵییان پێك هێنا. پاش گەڕانەوەی وەفدەکان، مامۆستا کرێکار لە شارۆچکەی تەوێڵە چاوی بە مامۆستا مەلا عەلی رابەری بزووتنەوەی ئیسلامی ئەکەوێت و هەم لە رووی ئەو متمانەیەوە لە نێوانیاندا دروست بووبوو بە تایبەت لە کۆتاییەکانی تەمەنی بزووتنەوەی یەکبووندراو هەمیش لە رووی ئەو زیرەکییانەوە کە مامۆستا کرێکار هەیبوو، دەربارەی سەفەر و کۆبوونەوەکەی تاران لەگەڵ مەلا عەلیدا قسە ئەکات. کۆبوونەوەیەك کە ئیمارەتی بیارە هەر لە سەرەتاوە بە چاوی گومانەوە سەیری دەکرد و ترسی ئەوەی بوو ئەم کۆبوونەوەی لە دژی ئەو ساز کرابێت. بۆیە مامۆستا کرێکار لە کاتی قسەکردن لەگەڵ رابەری بزووتنەوەدا کە یەکێك بوو لە بەشداربووانی کۆبوونەوەکەی تاران، بە شێوەیەکی زۆر زیرەکانە مەوزووعەکەی پێ ئەگەیەنێت و هاوکات لەگەڵ جۆرێك گلەیی کردن باسی ئەوەی بۆ ئەکات کە چۆناوچۆن لە کاتی جیابوونەوەی کۆمەڵی ئیسلامییدا ئەو گەنجە سەلەفییانە بوونە ناوبژیوانی ئەوان و بزووتنەوەی ئیسلامی و هەروەها هەمان ئەو گەنجانە چۆناوچۆن ئەوان لە کاتی دەست لەسەر دەست دانانی کۆمەڵ و بزووتنەوەدا کەوتنە بەرگریکردن لە ناوچەکەو پێشیان بە تەراتێنی هێزەکانی یەکییەتی گرت و..... هتد. بۆیە مامۆستا مەلا عەلی کە پیاوێکی بە جەرگ و چاونەترس بوو ئەم گلەیی و قسانەی مامۆستا کرێکار ناخاتە پشت گوێ و وەسفی دانیشتنەکەی تارانی بۆ باس ئەکات. ئەڵبەت رەنگە مامۆستا مەلا عەلی ویستبێتی هەڵوێستی ئیسلامییانەی خۆی و رێکخراوەکەی بۆ مامۆستا کرێکار روون بکاتەوە. بۆیە لە سەرەتادا باسی ئەوە ئەکات کە دانیشتنەکە بەلای ئەمانەوە درێژەی هەمان دانیشتنەکانی پێشووی نێوان چەند حزبێکی کوردستانی عێراق بووە ئەوان بە هەمان مەبەست و روانگە پێشووەکانەوە بەشدارییان تیادا کردووەو نە دەکرا بە دەنگ بە دەعوەت و بانگهێشتەکەوە نەچن. مامۆستا مەلا عەلی لەم بارەیەوە ئەڵێت: «لایەنی ئێرانی ئەم سێ لایەنە دژ بە یەکەی دەعوەت کردبوو تاکوو گۆڕانکارییەکانی هەرێمی کوردستان بە تایبەت ناوچەی هەڵەبجەو هەورامانیان لەگەڵدا تاووتوێ بکات. بە پێی ئەوە کە لایەنی ئێرانی گرنگییەکی زۆری بە مەسەلەی جوندولئیسلام ئەدا بۆیە باسکردن لە سەر ئەم مەسەلەیە جیدی ترین بابەتی کۆبوونەوەکە بوو کە تا ئەو کاتە بە حەلنەکراوی مابووەوەو لە روانگەی ئێرانییەکانەوە پێویست بوو رێگا چارەیەکی بۆ بدۆزرێتەوە، هەر بۆیە لە ئەنجامدا پەیماننامەیەك بۆ حەلی ئەم مەسەلەیەو بە مەبەستی لە ناوبردنی جوندولئیسلام ئیمزا کرا. یەکییەتی کە دژی جوندولئیسلام بوو و لەگەڵ ئەم رێکخراوە لە شەڕدا بوو ئیمزاکردنی پەیماننامەکەی بە ئەرکی خۆی دەزانی بەڵام ئێمەو کۆمەڵی ئیسلامی زیاتر لە رووی ناچارییەوە ئەم کارەمان کرد چونکوو ئەمانزانی جوندولئیسلام هەرگیز گوێڕایەڵی قسەی ئێمە نابن و ئامادە نین لە سەر داوای ئێمە واز لە خواست و داواکارییەکانی خۆیان بهێنن، بۆیە نەمانئەتوانی نە بەرگری لە پەیماننامەکە بکەین و نە دژیشی بوەستین. بەڵام کاتێك نەمانتوانی بەڵێنی ئەوە بدەین کە لە رێگای دانووستان و وتووێژەوە مەسەلەکە چارەسەر بکەین، ناچار بووین پەیماننامەکە ئیمزا بکەین». هەروەها جگە لەم گێڕانەوەیە مامۆستا مەلا عەلی نوسخەیەکی پەیماننامەکە پیشانی مامۆستا کرێکار ئەدات بەڵام لە دانی نوسخەیەك بە ئەو خۆی ئەبوێرێت چونکوو ئەترسا دواجار جگە لە گلەیی درکاندنی نهێنییەکانی کۆبوونەوەکەی تاران و پەیماننامەکە

به هاوکاریکردنی جوندولئیسلامیش تاوانباری بکەن. هەروەها رابەری بزووتنەوە بەڵێنی ئەوەش بە مامۆستا کرێکار نەدات کە ئەوان وەك بزووتنەوەی ئیسلامی هیچکات لە پشتەوە خەنجەر لەو کەسانە نادەن کە ساڵەهای ساڵ پێکەوە کاریان کردووەو بەشێك بوون لە وەفادارترین ئەندامانی بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامی.

ئەڵبەت مامۆستا کرێکار لەو کاتانەدا ئەمیرایەتی باڵی ئیسلاحی ئەکرد و هێشتا تێکەڵ بە جوندولئیسلام نەبووبوو بەڵام کەمێك دواتر ئەم کارەی کرد و بەرزترین پلەی ئەنسارولئیسلام واتە ئەمیرایەتی ئەم رێکخراوەی پێ سپێردرا. ئەو دەستبەجێ پاش چاوپێکەوتنی لەگەڵ رابەری بزووتنەوە، نووسراوێکی هاوشێوەی پەیماننامەکە کە لە بەری کردبوو بە کۆمپیوتر ئەنووسێتەوەو ئیمزای هاوشێوەی ئیمزای ولژۆکەرەکانیشی لە بن دائەنێت و لە رێگای چەند کەسێکی نزیکی خۆیەوە پیشانی ئەندامانی کۆمەڵی ئیسلامی ئەدات و ئەمەش بەزم و هەرایەکی نێوخۆیی لە ناو کۆمەڵدا لێکەوتەوە. بۆیە سەرکردایەتی کۆمەڵ بە بێ ئەوەی حاشا لە کارەکەی بکات، هەوڵی هێورکردنەوەی وەزعەکەی داو ئاشکرای کرد کە ئیمزاکردنی ئەو پەیماننامەیە مانای ئەوە نادا کە ئەوان بە کردەوە دژایەتی جوندولئیسلام بکەن.

ئیتر بەم شێوەیە پیلانەکەی تاران بە تەواوی ئاشکرا بوو و دوولایەنی ئیمزاکەر واتە بزووتنەوەو کۆمەڵ پابەندنەبوونی خۆیان بەم پەیماننامەیە راگەیاند، دواتریش بە هۆی هۆدنە شەش مانگییەکەوە یەکییەتی نیشتمانییش ئەم پەیماننامەیەی فەرامۆش کرد. جا ئەمە هەر لە ئەساسدا پیلانێك بوو کە لە لایەن دەسەڵاتدارانی ئێرانەوە دژی ئیمارەتی بیارە دارێژرابوو، ئەوان کاتێك زانییان سەلەفییە جیهادییەکان ناکەونە ژێر رکێفیانەوەو ئامادە نین بە دەسەڵاتێکی ئیسلامییان ناو ببەن، کەوتنە پیلانگێڕی دژی ئەوان. هەروەها بینیمان کاتێ مامۆستا کرێکاری ئەمیری ئەنساروئیسلام لە ئەورویجەوە سەفەری ئێرانی کرد و ویستی لە رێگای ئەم وڵاتەوە بگەڕێتەوە کوردستانی عێراق، چۆناوچۆن لە لایەن دەسەڵاتدارانی ئێرانەوە دیپۆرتی وڵاتانی ئەورووپایی کرایەوەو تووشی ئەو هەموو گیر و گرفت و ناخۆشییانە بوویەوە.

وەك بەشی کۆتایی وەڵامی ئەم پرسیارە، پێمخۆشە باسی دوواییێن رووداوەکانی ئیمارەتی بیارەتان بۆ بکەم واتە ئەو کاتەی سوپای ئەمەریکا بە مووشەکی قارەبەقارە هێرشی کردە سەر بنکەو بارەگاکانی ئەنساروئیسلام، لە یەکەم شەوی هێرشەکاندا ئەنسار تەنیا ئەندامێکی خۆی بە ناوی دوکتۆر موبارەك لە دەست دا بەڵام بە هۆی پێکرانی نووسینگەی سەربازیی کۆمەڵی ئیسلامییەوە کە هاوسنووری ئیمارەتی بیارە بوون، ٥٠ تا ٧٠ ئەندامی کۆمەڵ شەهید بوون و ژمارەیەکی زۆریشیان بریندار بوون. بەداخەوە شەوی دواتر بە هۆی چڕبوونەوەی مووشەکبارانەکەوە چەندین سەرکردەو موجاهیدی ئەنساریش شەهید بوون و ئیتر هیچ ئومێدێك بە مانەوە لە ناوچەکەدا نەما، بۆیە ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی ئەنسار بە ناچار روویان لە سنوورەکانی ئێران کرد و هەر لەو کاتەشدا بەشێك لە ئەندامانی کۆمەڵ رێگای ئێرانیان گرتبووە بەر بەڵام ئەوەی راستی بێت بەو ئاستەی لە لایەن حکوومەتی ئێرانەوە پێش بە چوونە ناو ئێرانی ئەندامانی کۆمەڵ ئەگیرا بە نیوەی ئەوەش رێگایان لە ئەنسارەکان نەدەگرت و ئەگەر ئەمە ناو بنێن هاوکاری ئەوا ئەوە یەکەم جار بوو دەسەڵاتی ئێرانی هاوکاری موجاهیدینی ئەنساروئیسلامی دەکرد. ئەڵبەت بە بەراوەردکردنی ئەو هەڵسووکەوتەی لەگەڵ ئەندامانی ئەم دوو رێکخراوە ئەیانکرد، ئەتوانین بڵێین هەڵسووکەوتی ئەوان لەگەڵ ئەنسارەکان هەندێ جیاواز بوو بەڵام من خۆم ئەمە بە هاوکاری نازانم چونکوو چەندین بەرپرس و سەرکردەی ئەنسار بە هۆی زەخت و زۆری سوپای پاسدارانەوە ناچار بوون روو لە کوردستانی عێراق بکەنەوە کە بەشێکیان شەهید بوون و بەشێکیشیان دەستگیر کران. هەروەها چەندین سەرکردەو ئەندامی ئەم رێکخراوەش لە لایەن سوپای پاسدارانەوە راپێچی زیندان و گرتووخانە کرانەوەو ئێرانییەکان ئامادە نەبوون بە یارمەتی بریندارەکان بدەن و لە نەخۆشخانەکانیاندا چارەسەریان بۆ بکەن. سەرەنجام کۆمەك و یارمەتی برا موسوڵمانەکانی کوردستانی ئێران بوو کە دۆخەکەی لێ ئارام کردینەوەو بریندارەکانیش هەر لە لایەن ئەوانەوەو لە سەر ئەرکی ئەوان چارەسەریان بۆ کرا.

**با سەرەتا تێبینییەکی بچووک لە سەر گلەو گازەندەکانی جەنابت بڵێین، هەرچەند تا ئێستا چەند جار جەختمان لە سەر کردووە کە ئێمە تەنیا پرسیار ئەکەین و بە هیچ شێوەیەك نامانەوێ داوەری لە سەر ناوەرۆکی پرسیارەکان بکەین، بەڵام با بۆ جارێکی دیکەیش بیڵێینەوە کە ئێمە بێلایەنین. ئەگەر باسی پێوەندیی ئیسلامییەکان لەگەڵ ئێران ئەکەین ئەو شتەمان خستۆتە بەرباس کە لە کۆمەڵگای کوردستاندا بە شێوەیەکی بەربڵاو باسی لێ ئەکرێ و گومانێکی گەورەیە لە سەر کۆی بزاڤی ئیسلامیی لە کوردستان. رای گشتیی کوردستان (بە تایبەت کوردستانی ئێران) گومانێکی جیدییان دەربارەی سەرجەم حیزبە ئیسلامییەکان هەیەو پێم وا نییە خۆیشت حاشا لە بوونی ئەو گومانە چڕوپڕە لە ناو خەڵکدا بکەیت، جا ئەگەر جەنابت ئەو گومانە بە ناڕاست و هەڵە ئەزانیت با ئێمە پرسیاری لێ بکەین و تۆیش وەڵام بدەرەوە، بێگومان ئەگەر بەڵگەی باوەڕپێکراو بۆ رەواندنەوەی ئەو شك و گومانانە بخەیتە روو خوێنەر بە قەناعەت ئەگاو ئەمەش سوودی ئێوەی ئیسلامیی پێوەیە. کەوابوو نابێ لە پرسینی ئەو گومانانە زیز بیت و بە پێچەوانەوە ئەبێ ئەمە بکەیتە دەرفەتێك بۆ وەڵامدانەوە بە شوبهەو گومانەکان.**

**بێینەوە سەر درێژەی باسەکەمان. پێش ئەوەی لە دوا قۆناغی ژیانی ئەنسار و ئیمارەتی بیارەو هێرشی ئامریکا بکۆڵینەوە با ئاوڕێك بدەینەوە لە پێوەندی نێوان جوند و ئەنسار و دراوسێکانیان هەروەها با بزانین سەرەنجامی ناکۆکییەکانی نێوان ئەنسار و ئەبوو زوبەیر و کۆمەڵ و.....هتد بە کوێ گەیشت و ئەم ناکۆکییانە چۆن کاریگەرییەکیان لە سەر هێڵکاری و نەخشەکێشکردنی داهاتووی ئیسلامی جیهادیی کوردستان بەجێ هێشت؟**

لە سەرەتادا پێم خۆشە بە نیسبەت گلەیی یان باشتر وایە بڵێم بە نیسبەت زویر بوونەکەتانەوە ئەوەتان عەرز بکەم کە مەبەستی من ئەوە نییە ئێوەی سەربەخۆو بێلایەن وەك من و ئیسلامییەکان بیر بکەنەوەو چاوەڕوانی ئەوە بم هەموو شتێکتان بە دڵی ئێمەی ئیسلامی بێت. جا ئەگەر وابێت ئیتر وتووێژ و پرسیارکردن و وەڵامدانەوەکەمان تام و چێژی خۆی لە دەست ئەدات و ناشتوانێت زانیارییەکی زۆر بداتە خوێنەر. من لەو باوەڕەدام گومانی خەڵك ناتوانێت ببێتە هەوێنی پرسیار لە سەر دیاردەیەکی مێژوویی و رەوتێکی فیکری چونکوو ئەگەر لە رووی گومانی خەڵکەوە بڕوانینە رووداوەکان رەنگە تووشی سادەبینی و تەنانەت تووشی هەڵەش بین. بەداخەوە خەڵك پێش هەر روونکردنەوەو تێگەیشتنێکی واقیعییانە لە فڵان مەسەلەو فڵان رووداو، حوکمی ناحەقی خۆی ئەدات و ئیتر (راستییش) با هەر لە شاراوەیی و نادیاریدا بمێنێتەوە. بەداخەوە پرسیارەکەی ئێوەش جۆرێك حوکمدانی پێوە دیارەو هەندێ دەستەواژەی تیادا بەکار براوە کە بە قەناعەتی من بەکاربردنیان سەربەخۆیی ئێوە ئەخاتە گومانەوە، بۆ نموونە وتووتانە (جوند و ئەنسار گومانی ئەوەیان لە سەر بوو پیاوای ئێرانن). بۆیە هەبوونی پێوەندیی یان هاوکاریکردنی یەکتر و..... لەگەڵ پیاوی ئەوی تردا بوون جیاوازیی زۆری هەیەو ئەمە دەقاودەق ئەوەی لێ ئەفامرێتەوە کە گۆیا رێکخراوێکی وەك جوند یان ئەنسار لە ئەساسدا بە دەستی ئێران و بە مەبەستی جێبەجێکردنی نەخشەو پیلانەکانی ئەوان دامەزراوە. بۆیە هەرچەند بە مافی خۆمی ئەزانم ئەمجۆرە داکۆکییانە بکەم کە بە داکۆکیکردن لە خوێن و رێگەو رێبازی هەزاران شەهیدی ئەزانم، بەڵام بە هیچ جۆر مەبەستم زویرکردنی ئێوەی بەڕێز نەبووەو دیسانەوە ئەیڵێمەوە ئەو ئەرکەی ئێوە کێشاوتانە جێگای رێز و حورمەتە بە تایبەت ئەوەی کە بە تایبەتی مەجال و دەرفەتێکی واتان بەخشییە من تاکوو لە ئاستی توانامدا هەوڵی روونکردنەوەی دیاردەیەکی گرنگی کۆمەڵگای کوردستان و بەشێك لە مێژووی ئیسلامخوازیی کوردستان بدەمەوە.

دەربارەی پرسیارەکەش پێم وایە لە بەشەکانی پێشوودا زانیاری پێویستمان داوەتە خوێنەر بۆیە تەنیا وەك بیرخستنەوە ئەیڵێمەوە کە ئیمارەتی بیارە هەم لە سەردەمی جوند و هەمیش لە سەردەمی ئەنساردا چەند دراوسێیەکی هەبووکە

بریتی بوون له وڵاتی ئێران، حزبی سۆسیالیست، کۆمەڵی ئیسلامی، بزووتنەوی ئیسلامی و یەکییەتی نیشتمانی. بە نیسبەت ئێرانەوە لە وەڵامی پرسیاری پێشوودا بە تێروتەسەلی وەڵامم داوەتەوەو وتوومە کە هیچ پێوەندییەك لە نێوان ئیمارەتی بیارەو ئێرانییەکاندا نەبووەو هەرچەند ئێران پێشنیاری هەبوونی پێوەندیی داوەتە جوندولئیسلام بەڵام وەڵامی ئەرێی وەرنەگرتۆتەوەو پاشان بەم هۆیەوەو بە هۆی ئەو ناکۆکییە فیکری و مەنهەجییەی نێوانیانەوە، ئێران نەخشەو پلانی بۆ لە ناوبردنی ئیمارەتی بیارە کێشاوە کە تیایدا سەرنەکەوتووە. لەگەڵ یەکییەتیدا جگە لە سەردەمی هۆدنە شەش مانگییەکە هەمیشە لە شەڕ و دوژمنایەتیدا بووە. لەگەڵ حزبی سۆسیالیستدا هەندێ پێوەندیی و تەنسیق هەبوو بەڵام نە بە مانای هاوکاری کردنی یەکتر، هەرچەند ئەوانیش لە روانگەی جوند و ئەنسارەوە مورتەد بوون بەڵام بەرنامەی ئیمارەتی بیارە ئەوە نەبوو هاوکات لەگەڵ یەکییەتیدا شەڕی ئەوانیش بکات بۆیە جگە لەو تاقە شەڕ و تێکهەڵچوونەی سەردەمی جەماعەت تەوحید شەڕێکی تر لە نێوان ئیمارەتی بیارەو سۆسیالیستدا نەهاتە ئاراوە. پێوەندیی جوند و ئەنسار لەگەڵ بزووتنەوەی ئیسلامیدا دۆستانەو برایانە بوو و ئەتوانم بڵێم باشترین پێوەندیی ئیمارەتی بیارە لە ماوەی تەمەنیدا، لەگەڵ بزووتنەوەی ئیسلامییدا بوو. هەرچەند تەحسینی مەلا عەلی بە فەرمی پێشنیاری هاوکاریکردن و تەنانەت نزیکبوونەوەشی دایە سەرکردەکانی ئیمارەتی بیارە بەڵام ئەوان ئاوەها نزیکبوونەوەیەکیان پێ خۆش نەبوو و پێوەندییەکانی خۆیان لەگەڵ بزووتنەوەدا لە ئاستی هاوکاری و تەنسیقدا هێشتەوە. ئەگەرچی جاروبار هەندێ ناکۆکیش دروست دەبوو بۆ نموونە بە هۆی پەنادانی کەسێکی وەك ئەبوو زوبەیرەوەو هاندرانی ئەندامانی کەتیبەی فەتح لە لایەن ئەوەوەو ئەو شتانەی پێشتر ئاماژەم پێدان، بەڵام هەموو ئەمانە لە خراپ ترین حاڵەتدا تەنیا هەندێ گلەیی و گازەندەیان لێ کەوتەوە. هەرچەند بزووتنەوە لەگەڵ یەکییەتیدا پێوەندیی هەبوو و رابەری ئەم رێکخراوە لە شاری هەڵبجەی ژێر دەسەڵاتی یەنەك دادەنیشت بەڵام ئەم پێوەندییە هیچ کات کاریگەری لە سەر پێوەندیی نێوان بزووتنەوەو ئیمارەتی بیارە دانەنا. موجاهیدینی ئەنسار بە بێ هیچ رێگرییەك هاتوچۆی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بزووتنەوەیان ئەکرد و ماڵ و منداڵی بەشێکی زۆر لە ئەندامان و سەرکردەکانی ئەم رێکخراوە لە شارۆچکەی تەوێڵە نیشتەجێ بوون. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە کۆمەڵی ئیسلامی کە خۆیشی لە بزووتنەوە بە ئیسلامی تر و بە جیهادی تر ئەزانی، ئامادە نەبوو پێوەندییەکی ئاوای لەگەڵ ئیمارەتی بیارەدا هەبێت و زۆرجار لە ژێر زەخت و گوشاری یەکییەتیدا رێگری لە هاتووچۆی موجاهیدینی جوند و ئەنسار ئەکرد و ئەمەش هەندێ جار شەڕە قسەو تووڕەبوونی هەردوولای لێ ئەکەوتەوە. بۆ نموونە پێشگرتن بە رۆیشتنی موجاهیدینی چەکداری ئەنسارولئیسلام بۆ شارۆچکەی خورماڵ، پێشنیارێك بوو کە لە ئەساسدا لە لایەن یەنەکەوە درابووە بەرپرسانی کۆمەڵ. جیاوازی نێوان خورماڵ و تەوێڵە بۆ جوند یان ئەنسار ئەوە بوو کە تەوێڵە ئیمکانیاتێکی وەهای تیا نەبوو کە ئەوان هەموو پێداویستییەکانی خۆیانی لێ دابین بکەن بۆیە لەم بارەیەوە ئیمارەتی بیارە بەستراوەییەکی زیاتری بە خورماڵ و ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی کۆمەڵەوە بوو و ئەمش بووبووە هۆی ئەوە لە لایەن یەکییەتییەوە زۆرترین کێشەو گرفت تووشی مامۆستا عەلی باپیر و جەماعەتەکەی بێت. هەروەها ئەمە لە کاتێکدا بوو کە مودیر ناحیەی خورماڵ ئەندامێکی یەکییەتی نیشتمانی بوو –ناوی دانا بوو– کە رۆژانە سەردانی بەڕێوەبەرایەتییەکەی لە شارۆچکەی خورماڵ ئەکرد. جیاوازییەکی تری تەوێڵەو خورماڵ ئەوە بوو کە تەوێڵەو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بزووتنەوە هاوسنووری یەنەك نەبوون و ئیمارەتی بیارە راست لە نێوان ئەوان و یەنەکدا هەڵکەوتبوو بۆیە یەنەك نەیدەتوانی بیانووی ئەوەیان پێ بگرێ کە هاوکاری ئەنسارولئیسلام دەکەن. لە لایەن ئیمارەتی بیارەوە کەسێك بە ناوی «حاجی بێستوون» هەولێری وەك بەرپرسی پێوەندییەکانی ئەنسار و بزووتنەوەو کۆمەڵی ئیسلامی دیاری کرابوو.

کاتێ خۆی لە سەر چۆنییەتی دابەزاندنی حوکمی شەرع و بەڕێوەبردنی خەڵك لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیاندا کۆمەڵ و جوند رەخنەی زۆریان لە یەك دەگرت و بەم هۆیەشەوە کۆبوونەوەیەك لە نێوان هەیئەی شەرعی جوند و لیژنەی باڵای

فتوای کۆمەڵی ئیسلامیدا هاتە ئاراوە. وەفدەکەی کۆمەڵ بریتیبوون لە دلێر سەلەفی و یووسف سەلەفی برای و ژمارەیەک شەرعزانی تری ئەم ڕێکخراوەو لە لایەن جوندولئیسلامیشەوە ئەبوو عەبدولڕەحمان شامی و چەند کەسێکی تر بەشداریی کۆبوونەوەکەیان کرد. لەم کۆبوونەوەیەدا وەفدەکەی کۆمەڵ بە تواناییەکی وەهاوە داکۆکی لە شێوازی دەسەڵات و بەڕێوەبەریی ڕێکخراوەکەیان ئەکات کە بۆچوونی خۆی بە سەر بۆچوونی نوێنەرانی جوندولئیسلامدا زاڵ دەکات و لە بەرامبەردا نێردراوانی جوندولئیسلام ناتوانن وەکوو ئەوان داکۆکی لە ئیمارەتی بیارەوە بکەن و هۆکاری ئەمەش ئەوە بوو کە لە باری شەرعییەوە لە ئاست نوێنەرانی کۆمەڵدا نەبوون. ئەمە کاردانەوەیەکی باشی بۆ کۆمەڵی ئیسلامی بەدواوە بوو و لە لایەک بووە هۆی ڕەوینەوەی هەندێ لە گومانەکان و لە لایەکی تریشەوە بووە هۆی زیاتر سووربوونی ئەندامانی کۆمەڵ لە سەر ڕێڕەو و ڕێبازی ڕێکخراوەکەیان. هەروەها ئەوەی لێ ئەفامرایەوە کە سەلەفییەکانی ناو کۆمەڵی ئیسلامی لە باری شەرعییەوە بە تواناتر و شارەزاترن لە کادیرەکانی جوندولئیسلام، بۆیە لەو کاتە بە دواوە شارەزایی شەرعزانانی کۆمەڵ و توانای ئەوان لە ڕووبەڕووبوونەوە شەرعییەکاندا باس و خواسی هەموو لایەک بوو و ئەندامانی کۆمەڵیش شانازییان پێوە دەکرد. بەڵام ئەم شانازی کردنەی ئەندامانی کۆمەڵ نەیتوانی بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوام بێت و شەرعزانبوونی چەند ئەندامێکی ئەم ڕێکخراوە نەیتوانی بۆچوونی ئەوان لە هاوکاریکردنی لایەنە عیلمانییەکان و بەشداری کردنیان لە پارلمان و دەسەڵاتی کوردی هەروەها وازهێنانیان لە جیهادی (في سبيل الله) بشارێتەوە. بۆیە ئەم حاڵەتانە بەرەبەرە ئەندامانی کۆمەڵی تووشی نائومێدی کرد و زۆر بوون ئەو کەسانەی بەمەبەستی جیهادکردن ڕوویان لە ڕیزەکانی ئەنسارولئیسلام دەکرد. بە نیسبەت ئەو لە ڕێگا دەرچوونانەی کۆمەڵی ئیسلامییەوە جوند و ئەنسار بە گرتنەبەری ڕێچکەیەکی جیهادیی توند و تۆڵ، بوونە ڕکابەرێکی جیدی بۆ ئەو ڕێکخراوە کە تا ئەو کاتەش ئیدیعای سەلەفی بوون و جیهادی بوونی ئەهات و بە پێی ئەم ئیدیعایەش تەشەر و توانجی دەگرتە ڕێکخراوێکی وەک بزووتنەوەی ئیسلامی. وازهێنانی کۆمەڵ لە جیهاد گەیشتبووە ئاستێک کە کاتێک لە سەرەتاکانی ساڵی ٢٠٠٣دا «مامۆستا عەبدوڵڵای قەسری» ئەندامی مەکتەبی سیاسی ئەم ڕێکخراوەو ژمارەیەک لە کادێر و ئەندامانی تری کۆمەڵ لە بازگەی تاسڵووجەی نزیک شاری سلێمانی لە لایەن هێزەکانی ئاسایش و دژە تیرۆری یەکێتییەوە شەهید کران، سەرکردایەتی کۆمەڵ نەک هەوڵی تۆڵە کردنەوەی خوێنی بە ناحەق ڕژاوی مامۆستا عەبدوڵڵای قەسریّ و هاوڕێکانی نەدا تەنانەت سەرکۆنەی ئەو ئەندامانەی ڕێکخراوەکەیشی ئەکرد کە باسی تۆڵە کردنەوەیان دەکرد. جا بە درێژایی تەمەنی ئیمارەتی بیارە ئەگەر زیرەکی و سیاسەتبازی کەسێکی وەک دڵشاد کەلاری نەبووایە ئەوا کۆمەڵ هیچی پێوە نەدەماو بەشی زۆری ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە پەیوەندییان بە ئەنسارولئیسلامەوە دەکرد. ڕەنگە هەر بەم هۆیەشەوە بێت کە «مەروان»ی نووسەری کتێبی«مێژووی جیهاد لە کوردستان» دڵشاد کەلاری بە کەسێکی خائن و لە خوا دوور ناو ئەبات. من نامەوێ ئەوەی مەروان دەربارەی حاجی دڵشاد وتوویەتی تەئید بکەم بەڵام لەو باوەڕەدام کە کاک دڵشاد بەو نیسبەتەکی لە بواری تیۆریدا خۆی بە سیاسەتوان و کەسێکی پابەند ئەزانی، نەیتوانی لە بواری کردەوەدا سەرکەوتوو بێت و بە پێچەوانەوە تووشی چەند هەڵەیەک بوو کە کاریگەرییان لە سەر کەسایەتی و ئیعتیباری ئەو داناو هەر لەم ڕووەیشەوە بوو کە ئەنسارەکان بۆچوونەکانی ئەویان ڕەت ئەکردەوەو لێی بە گلەیی بوون و خۆیشی لەمە گەیشتبوو. دڵشاد کەلاری جارێکیان ئاوای بە من وت: «پاش هاتنی سوپای ئەمریکا بۆ عێراق بە کەسێکدا پەیامێکم بۆ مامۆستا حەمە ڕەشید بەرپرسی تەنزیماتی ئەنسارولسوننە لە شاری مووسڵ نارد بەڵام هەرچەند پەیامەکەی پێ گەیشتبوو ئامادە نەبوو وەڵامم بداتەوەو ئیتر دواتریش شەهید بوو».

لە دوا ساتیشدا بینیمان سەرباری ئەو هەموو خۆ لادانەی کۆمەڵ، لە یەکەم شەوی مووشەکبارانی ناوچەکەدا نزیک بە ٧٠ ئەندامی ئەم ڕێکخراوە شەهید بوون و ژمارەیەکی زۆریشیان بریندار بوون. سەرەڕای ئەوەش ئەوان ڕۆژی ٢٠٠٣/٣/٢٤ ڕایانگەیاند کە مۆڵەتیان لە یەکییەتی وەرگرتووە تاکوو پاشەکشە بە هێزەکانیان بکەن و داوایان لە

ئەندامانی خۆیان و تەنانەت ژن و منداڵ و خێزانی ئەنسارەکان و بزووتنەوەی ئیسلامییش کرد ئەگەر پێیان خۆشە ئەتوانن لەگەڵ ئەواندا ناوچەکە بەجێ بهێڵن. سەعات یەکی پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە پاش خاڵیبوونی بنکەو بارەگاکانی بزووتنەوەو کۆمەڵ و پاشەکشەی جەماوەر و هێزەکانی ئەوان، تەنیا موجاهیدینی ئەنسارولئیسلام لە ناوچەکەدا مانەوەو سەرەنجام پاش دە ڕۆژ شەڕی قارەمانانەو نابەرانبەر و پاش شەهیدبوونی ١١٠ موجاهیدی ئەنسارولئیسلام، ناوچەکە لە کۆنترۆڵی ئەنسار دەرهێنراو کۆتایی بە تەمەنی ئیمارەتی بیارە هات.

کۆتایی هاتنی ئیمارەتی بیارە کۆتایی هاتنی ناکۆکییە نێوخۆییەکانی ناو ئەم ئیمارەتەو ڕێکخراوی ئەنسارولئیسلام بوو چونکوو ناکۆکییە نێوخۆییەکان تا دواین ڕۆژەکان درێژەیان هەبوو و وەك لە بەشەکانی پێشووتریشدا ئاماژەم پێدا ناکۆکییەکە زیاتر لە نێوان کەتیبەی فەتح و قیادەی ئەنسارولئیسلامدا بوو. ئەم ناکۆکییانە جاروبار ئەگەیشتە ئاستی جیابوونەوە بەڵام سەرکردایەتی ئەنسار هەرجارەو بە شێوازێك پێشی پێ دەگرت. ئەڵبەت ناکۆکییەکان ئاسەواری خراپی تریشیان لێکەوتەوە بۆ نموونە کەسێکی وەك کاك عومەر بازیانی پاش وازهێنانی لە ئەندامەتی سەرکردایەتی و بەرپرسایەتییەکانی تری ناو ڕێکخراوەکە ئامادە نەبوو هیچ بەرپرسایەتییەك بگرێتە دەست. هەروەها زۆرجار بە بێ هۆ لە لایەن ئەندامانی تری ڕێکخراوەکەوە شتی جۆراوجۆر بە کەتیبەی فەتحەوە نیسبەت ئەدراو ئەندامانی ئەم کەتیبەیەی پێ لۆمە دەکراو ئەمەش زۆرجار تووڕەبوونی فەتحییەکانی لێ ئەکەوتەوە ئەبووە هۆی ئاڵۆزبوونی کەش و هەوای گشتی ڕێکخراوەکە. جا ئەگەر مەبەستی ئەوان دروستکردنی بشێوی و ئاڵۆزیش نەبووبێت بەڵام چونکوو لە سەرەتاوە بێ متمانەییەك لە نێوان ئەوان و بەشەکانی تری ئەنساردا دروست بووبوو، بۆیە لایەنی بەرامبەر بە چاوی گومانەوە بۆی ئەڕوانی. کاتێ کەتیبەی فەتح دەورەیەکی عەسکەرییان کردەوە دڵەڕاوکەیەك لە دڵی بەرپرسانی ئەنساردا دروست بوو بەڵام کاتێ بەرپرسانی فەتح بەمەیان زانی ئەوانیان دڵنیا کردەوە کە کردنەوەی ئەم دەورەیە شتێکی ئاساییەو هیچ مەبەستێکی لە پشتەوە نییە، هۆکاری ئەمەشیان بە دووربوونی فێرگەی عەسکەریی باخەکۆن وەسف دەکرد و ئەوەی کە گوایە موجاهیدنی کەتیبەی فەتح ناتوانن بگەنە ئەوێ و بەشداری لە خولەکانی پەروەردەدا بکەن. بۆیە جاروبار ڕوودانی شتی لەم چەشنە دۆخەکەی بەرەو ئاڵۆزی ئەبرد و پاش ماندووبوون و سەرئێشەیەکی زۆر دۆخەکە هێور ئەبووەوە. بۆ نموونە لە پێوەندیی لەگەڵ کردنەوەی دەورە عەسکەرییەکەدا قیادەی ئەنسار ئەبوو عەبدوڵڵای شافیعی ڕاسپارد تاکوو لەگەڵ فەتحییەکاندا قسە بکات و لە لایەن ئەوانیشەوە کاك عومەر بازیانی و چەند سەرکردەیەکی تر ئامادەی کۆبوونەوەکە بوون، ئاکامی ئەم کۆبوونەوەیە بڕیاردان بوو لە سەر هەوڵدان بۆ ڕەواندەوەی گومانەکان، ڕێکخستنەوەی ڕیزەکانی ئەنسار و هەماهەنگی و هاوکاری زیاتری نێوان ئۆرگان و کەتیبە جۆراوجۆرەکان. بۆیە کەتیبەکانی تریش بڕیاریاندا بە دەم ئەم ئاشتەواییەوە بچن و بەشداریی لە دروستکردنی ئەم هاوئاهەنگییەدا بکەن کە بڕیاری لە سەر درابوو. هەر بە پێی ئەم ڕێکەوتنە بڕیاردرا ئەو دەورە شەرعییەی کەتیبەی فەتح لە شارۆچکەی خورماڵ بۆ ئافرەتانی کردبووەوەو لە لایەن جێگری کەتیبەکەوە بەڕێوە دەبرا، بخرێتەوە ژێر ڕکێفی سەرکردایەتی و هەیئەی شەرعی ئەنسارولئیسلامەوە. هەروەها لە سەر ئەوەش ڕێککەوتن تاکوو کەتیبەی فەتح واز لەو داواکارییەیان بهێنن کە بریتی بوو لە دانانی ژمارەیەك لە کەسانی بەرجەستەی ئەم کەتیبەیە لە سەرکردایەتی و هەیئەی شەرعی ئەنساردا، لەم بارەیەوە تەنیا موافقەت کرا ئەمیری کەتیبەکە واتە کاك هێمن بانیشاری پلەی سەرکردایەتی وەربگرێت و دواتر کەسێکی تریشیان بۆ ئەم پۆستە زیاد بکرێت بە مەرجێك خۆیان کەسێکی شیاو دەستنیشان بکەن. هەر لەم کۆبوونەوەیەدا بە پێچەوانەی تێگەیشتنەکانی هەموو لایەك، کاك عومەر بازیانی ڕای ئەگەیەنێت کە بە تەمایە واز لە سەرکردایەتی بهێنێت و سەرەڕای ئەوەی داوای لێ ئەکرێت ئەم کارە نەکات، واز ئەهێنێت و وەك ئەندامێکی سادە لە ناو کەتیبەی فەتحدا ئەمێنێتەوە کە خودی ئەم وازهێنانەش کە کاك عومەر ئەیوت مەبەست لێی خوێندن و خوێندنەوەو خۆ پێگەیاندنە، جۆرێك گومان و دوو دڵی هێنایە ئاراوە.

دوای ماوەیەك و پاش چارەسەركرانی ئەم كێشانە، ئەم جار ناكۆكی نێوان كەتیبەی فەتح و مامۆستا كرێكار خۆی زەق كردەوە. مامۆستا كرێكار لە سەرەتای تێكەڵبوونی لەگەڵ جوندولئیسلام و وەرگرتنی پلەی ئەمیرایەتی ئەنسارولئیسلام چەند سەیارەیەكی تایبەتیی خۆی و حیمایەكانی بە كەتیبەی فەتح هەدیە كرد و ئەمەش تووڕەیی و ناڕەزایەتی كەتیبەكانی تر بە تایبەت كەتیبەكانی سەید قوتب و موهاجرین و شوهەدای لێ كەوتەوە كە لە ئەندامانی باڵی ئیسلاح پێك هاتبوون. بەڵام ئەم ناڕەزایەتییانە نەبوونە هۆی پاشگەزبوونەوەی مامۆستا كرێكار لە كارەكەی. هەروەها ئەم كارەی مامۆستا كرێكار نەك نەبووە هۆی ئەوە كە فەتحییەكان بكەونە ژێر ركێفی ئەوەوە بەڵكوو ئەوان پاش ماوەیەك لە رێگای «ئەبوو تەیمییە» ناوێكەوە كە خەڵكی هەولێر و یەك لە شەرعزانە بەرجەستەكانی كەتیبەكە بوو، یەكەم رەخنەی خۆیان ئاڕاستەی مامۆستا كرێكار كرد. ئەبوو تەیمییە بە بەرچاوی مامۆستا ئاسۆ هەولێری و ئەبوو عەبدوڵڵای شافیعییەوە بە مامۆستا كرێكار ئەڵێت: «ئێمە لە پێشەوەی جەبهەكان و بەرەكانی شەڕداین و تۆیش كە هۆدنەت داوە پێویستە بزانیت كە بە پلەی یەكەم ئەمیری ئێمەیت و بە پلەی دووهەمیش سەردەمی بزووتنەوەی ئیسلامی بە سەر چووەو ئێستا سەردەمی ئەنسارولئیسلامە». ئەم قسانەی ئەبوو تەیمییە مامۆستا كرێكار تووڕە دەكات و لە وەڵامدا ئەڵێ كەوایە من ئەمیری ئێوە نیم و ئێوە ئەمیری منن و......

ماوەیەك دواتر و هەر لە سەردەمی هۆدنەكەدا كاتێك مامۆستا كرێكار بە مەبەستی كۆبوونەوە لەگەڵ یەكییەتیدا سەردانی شاری سلێمانی ئەكات، جاری یەكەم لە بەر ئەوەی بە جاكەت و پانتۆڵەوە چووبوو و جاری دووهەمیش بەو هۆیەوە ژمارەیەك لە كۆنە ئیسلاحەكان وەك حیمایەو پاسەوان لەگەڵ خۆی ئەبات، ئەكەوێتە بەر رەخنەی توندی ئەندامانی كەتیبەكانی نەسر و فەتح و ئەقساوە. فەتحییەكان سەردانی مامۆستا كرێكاریان بە جاكەت و پانتۆڵەوە بۆلای یەكییەتی بە خۆ جیاكردنەوە لەو زاهیر و رواڵەتە حیساب ئەكرد كە بووبووە تایبەتمەندیی ئەندامانی ئەنسارولئیسلام. ئەوان ئەیانوت مەبەستی مامۆستا كرێكار لەم كارە رازی كردنی لایەنی بەرانبەر و خۆ هاوڕەنگ كردن بووە لەگەڵ یەكییەتییەكانداو ئەمەش مەترسییەكە بۆ سەر رێكخراوەكەو ئاماژەیە بۆ ئەوەی رێڕەوی رێكخراوەكە بەرەو گۆڕان ئەبات. ئینجا هەرچی هەیئەی شەرعی ئەنسارولئیسلام جەختی لە سەر ئەوە ئەكردەوە كە مامۆستا كرێكار كارێكی ناشەرعی نەكردووە بەڵام ئەندامانی فەتح سوور بوون لە سەر رایەكانی خۆیان و هەر بەم هۆیەشەوە مامۆستا كرێكار تووڕە ئەبێ و زلەیەك لە «ئەبوو موهاجیر»ی هەولێری ئەدات و پاش ئەوەی ئامادەیی خۆی بۆ لێدرانەوەی زلەكە رائەگەیەنێت كارەكە كۆتایی پێ دێت و هەیئەی شەرعیشی پێ رازی ئەبێت. بە نیسبەت هەڵبژاردنی كۆنە ئیسلاحەكانیشەوە بۆ هاوڕێیەتی خۆی لە سەفەری لای یەكییەتیدا، ئەندامانی كەتیبەی فەتح لەو باوەڕەدا بوون كە مامۆستا ئەمەی بۆ وەزامەندیی یەنەك كردووە. هۆكارەكەشی ئەوە بوو كە ئەوان واتە كۆنە ئیسلاحەكان بە هەمان شێوازی سەردەمی بزووتنەوە رەفتاریان ئەكرد و ئەمەش زیاتر لەگەڵ كەش و هەوای كۆبوونەوەكەدا رێك دەهاتەوە. مامۆستا كرێكار دەیزانی ئەندامانی كەتیبەكانی فەتح و نەسر و ئەقسە بە هۆی پابەندبوونیان بە واجبە شەرعییەكانەوە بۆ نموونە بە بیانووی نا ئیسلامیبوونی زبحی گۆشتەكەیانەوە، ئامادە نابن خواردنەكانی لایەنی میواندار بخۆن و لەگەڵ ئەواندا نەرم و دۆستانە هەڵسووكەوت بكەن، بۆیە ئەم رەفتارانەی ئەوانی بە گونجاو نەدەزانی و بەم هۆیەوە ژمارەیەك لە كۆنە ئیسلاحەكانی لەگەڵ خۆیدا بردبوو.

خاڵێكی تری ناكۆكی مامۆستا كرێكار و كەتیبەی فەتح ئەوە بوو كە ئەو لە نێوان ئەبوو وائیل و ئەبوو زوبەیردا كە هەردووكیان خەڵكی ناوەوەی عێراق بوون و دوو كەسی دیاری ناو عەرەبە عێراقییەكان بوون، زیاتر لایەنی ئەبوو وائیلی ئەگرت و داكۆكی لە روانگەو بۆچوونەكانی ئەو دەكرد كە بە كەسێكی میانەڕەو ناسرابوو، بەڵام بە پێچەوانەوە فەتحییەكان زیاتر لە ژێر كاریگەری بۆچوونەكانی ئەبوو زوبەیردا بوون و تەنانەت پاش دەركرانیشی لە جوندولئیسلام هەر خۆیان بە هۆگر و لایەنگری ئەو دەزانی و لەگەڵیدا پێوەندییان هەبوو. لە بەرانبەر ئەو تەشەر و توانج و تۆمەتانەشدا

لە لایەن هەندێ لە ئەندامانی ئەنسارولئیسلامەوە بەرەوڕووی ئەبوو زوبەیر ئەکرایەوە، ئەویش زۆربەی وەڵامەکانی ئاڕاستەی مامۆستا کرێکار ئەکردەوە. ئەبوو زوبەیر لە یەکێك لەو وەڵامانەدا وتبووی: «ئایا ئەنسار ئەتوانێ هەمان ئەو عەبایەی بە سەر خەڵکی ناو ئیمارەتەکەیدا داوە بە سەر ماڵ و منداڵ و کچ و ژنی ئەمیرەکەیدا بدا؟ هەم من و هەم خۆیشتان ئەزانین ماڵ و منداڵی مامۆستا کرێکار پابەندی ئاوەها شتێك نابن و ئامادە نین ئاوەها عەبایەك لە سەر بکەن. ئایا هەست بەوە ناکەن ئەوەی لە سەر خەڵکی دادەنێن و فەرز دەکەن پێویستە لە سەر خۆیشتانی فەرز کەن؟» ناکۆکییەکانی نێوان کەتیبەی فەتح و مامۆستا کرێکار لە سەردەمی هۆدنەکەدا زۆر زەق بووبوویەوەو پاش کۆتایی هاتنی هۆدنەکەو سەفەری ئەو بۆ دەرەوەی وڵات، بەرەو کەمبوونەوەو دامرکان ڕۆیشت.

سواجار ژیانی ئیمارەتی بیارە بە هێرشی ئامریکا بۆ سەر ئێراق لە نەورۆزی ۲۰۰۳دا کۆتایی پێ هات. لە سەر خودی ئەو هێرشەو ڕووخانی ئیمارەتی بیارەو هەڵاتنی ئەنسارەکان هێشتا زۆر شتی نادیار ماوەتەوە. لە کاتێکدا بەشێکی زۆری ئەنسارەکان ڕێگای کۆچکردنی بە کۆمەڵیان بەرەو ئێران گرتە بەر، دەوترێ سوپای پاسدارانی ئێران هەم گواستنیەوەو هەم شوێنی حەوانەوەو دەواو دەرمانی بۆ تەرخان کردن. هەروەها دەنگۆی ئەوە هەیە کە ئیسلامییەکانی کوردستانی ئێران بریتی لە مەکتەبی قورئانی حەسەنی ئەمینی، ئیخوانەکان و سەلەفییەکان لە گواستنەوەو پەنادانی ئەنسارەکاندا دەورێکی بەرچاویان هەبووە. جا هەرچەند لە دووتوێی وەڵامەکانی پێشوودا ئاماژەت بە هەندێ لەم شتان کردووە بەڵام دیسان ئاوڕدانەوەیەکی کورتی جەنابت لەو قۆناغەو ڕوونکردنەوەو لابردنی پەردەکان لە سەر ئەو ڕووداوانە ئەتوانێ لە ڕەواندنەوە یاخود پشتڕاستکردنەوەی ئەو شوبهانەدا زۆر کاریگەر بێت.

وابزانم نەك لە ئاستی ئاماژەدا بەڵکوو بە شێوەی پێویست لە وەڵامی پرسیارەکانی پێشوودا باسی ئەم شتانەم کردووە تەنها ئەوە نەبێت کە پێویستە ئاماژە بەوە بکەم هاوکاریکردنی موسوڵمانانی ئێران بەشێکی زۆری لە ڕێگەی ئەو کوردانەی کوردستانی ئێرانەوە بوو کە پێشتر بە مەبەستی جیهادکردن پێوەندییان بە ئەنسارەوە کردبوو. ئەنسار ئەم کەسانەی لە ئێراندا هێشتبوووەوە بۆ ئەنجامدانی کاروباری تایبەت کە یەك لەو شتانەی ماوەیەك بوو پێشبینییان کردبوو، کۆچ و هیجرەتکردنی ئەوان بوو بۆ ئەم وڵاتە.
سەبارەت بە مەسەلەی مەکتەب قورئان یان ڕێکخراوە ئیسلامییەکانی تریش ئەتوانم بڵێم باڵی حەسەن ئەمینی مەکتەب قورئان لە کاتی هیجرەتەکەدا یارمەتی ئەنساری داوەو ئەم یارمەتییە زیاتر لە شکڵی گواستنەوەو دابینکردنی شوێنی حەوانەوەدا بووە. ئەوان بۆ ئەم کارەیان ئیجازەیان لە دەسەڵاتی ئێرانی وەرگرتبوو بە مەرجێك بە ئارامی و بە شێوەی پەنامەکی کارەکە بکرێت واتە گواستنەوەکە بە نهێنی ئەنجام بدرێت و موجاهیدەکان لەو ماڵانەدا جێگیر بکرێن کە لە شوێنە چۆڵەکان و لە قەراغ شارەکاندا هەڵکەوتوون ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە خەڵك پێیان نەزانێت. هەروەها لە لایەن بەرپرسانی ئێرانییەوە بە برادەرانی مەکتەب قورئان (باڵی حەسەنی ئەمینی) وترابوو پێویستە ئەنسارەکان بەملاولادا بڵاوە نەکەن و بە شێوەی بە کۆمەڵ بە ناو شاردا نەسووڕێنەوە چونکوو لەو حاڵەتەدا ناچارین بیانگرین و سنووریداشیان بکەینەوە. هەروەها دابینکردنی هەموو مەسروفات و پێداویستییەکانیش لە شوێنی حەوانەوەو سەیارەوە بگرە تا دەگاتە خواردن و جلوبەرگ و کەلوپەلی شەخسی هەمووی لە سەرشانی مەکتەب قورئان و لایەنەکانی تری خانەخوێ بوو. ئەمانەو کۆمەڵێك شتی تر مەرجەکانی دەسەڵاتدارانی ئێران بوون بۆ ئەوەی ئێزن بە چوونە ناو ئێرانی موجاهیدینی ئەنسارولئیسلام بدەن. چارەسەرکردنی بریندارەکان و دابینکردنی پزیشك و دەرمانیش بە هاوکاری برایانی موسوڵمانی کوردستانی ئێران و لە ماڵی ئەواندا و بە مەسرەفی ئەوان بەڕێوە چوو. ئەڵبەت بە هۆی ئەو شپرزەیی و پەرتەوازەیی و

دابڕانانەوە لە کاتی پەڕینەوە بە ناوچە سنوورییەکاندا هاتبووە ئاراوە، چەندین موجاهید لە لایەن هێزەکانی سوپای پاسداران و هێزە ئینتزامییەکانی ئێرانەوە دەستگیر و ڕەوانەی سەر سنوورەکان کرابوونەوە کە ژمارەیەکیان پاش چوونەوە ناو خاکی عێراق تووشی گرتن هاتبوون.

پێم خۆشە سەبارەت بەوەش کە بۆچی لە مووشەکبارانەکاندا بە تایبەت لە شەوی یەکەمدا ژمارەیەکی کەمتر لە ئەندامانی ئەنسارولئیسلام گیانیان لە دەست دا ئەوەتان پێ بڵێم کە ئەنسار لە ماوەیەك پێشترەوە پێشبینی ئەم شتەی کردبوو بۆیە هەموو ئەو شوێن و خاڵانەی چۆڵ کردبوون کە گومانی لێدان و پێکانیان لە سەر بوو. بەڵام کۆمەڵی ئیسلامی کە چاوەڕوانی ئاوەها هێرشێك نەبوو ئیحتیاتی پێویستیشی نەکردبوو و وەك خۆیان ئەیانوت، بە هۆی سێ مووشەکی هەڵەوە ژمارەیەکی زۆریان لێ شەهید و بریندار بوو.

**دوو گومانی دیکە لە نێو هەواڵ و دەنگوباسەکاندا دەربارەی ڕەوتی ئیسلامییەتی سەلەفی و ئیمارەتی بیارە بڵاو کرایەوە. یەکیان باسی لەوەوە دەکرد گوایە بەرنامەیەك بۆ دروستکردنی چەکی بایلۆژی و کیمیاوی لە بیارە لە ئارادا بووەو لە نموونەیەکی دیکەشدا ئەنسارولئیسلام دوو بەرپرسی سەر بە یەکیەتی نیشتمانی بە ناوەکانی «جمال جمیل» و«احمد بچکۆل» بە دیل گرت و لە بەرانبەر وەرگرتنی پارەیەکدا لە یەکیەتی ئازادی کردن. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە ئەم جۆرە کارانە کێشەی شەرعییان لە سەرەو هەندێ لە ڕەخنەگرانی ئیسلامی جیهادی ئەیانوت ئیسلام ئیجازەی دروستکردنی چەکی کۆمەڵکوژ نادات و دەستەیەکی تریش لەو باوەڕەدان ئیسلام ئیجازەی بە گۆڕینەوەی دیلی مورتەد بە پارە نادات. ئەم مەسەلانە تا چەند ڕاست بوون و ئایا لە سەردەمی ئیمارەتی بیارەدا جیا لەو دوو ئەندامەی یەکیەتی نموونەی دیکەی دیل گۆڕینەوەی لەو چەشنە ڕووی داوە؟**

لە ڕاستیدا جەنگ و کێبەرکێ بەشێکی بریتییە لە ڕاگەیاندن و لە کۆنەوە تاکوو ئێستا ڕاگەیاندن بەشێك بووە لە شەڕ و کێبەرکێی نێوان لایەنە ناکۆك و دژبەرەکان. لە کۆنەوە باو بووە کە دوو لایەنی شەڕکەر لە بواری ڕاگەیاندنیشدا هەوڵی تاوانبارکردنی یەکتریان داوەو هەر یەك خۆی بە لایەنی حەق زانیوەو ئەوی تری بە ناحەق و ناڕاست ناو بردووە. بۆیە پێویستە کەسی ڕاڤەکار بە زیرەکی و وردبینییەوە تاووتوێی ڕاگەیاندن و هەواڵەکان بکات بە تایبەت لە کاتێکدا کە ڕاگەیاندنەکان سەر بە خودی لایەنە دژبەرەکان بن و سەربەخۆ نەبن جا ئەگەر دوو لایەنی موسوڵمانیش لە شەڕی یەکدا بن و دژایەتی یەکتر بکەن دیسان پێویست بەو کارە دەکات چونکوو لەوانەیە لایەنێکیان هەواڵ و زانیاری پێچەوانە بڵاو بکاتەوە ئیتر چ بگات بەوەی کە لایەنێکیان موسوڵمان و ئەوی تریان ناموسوڵمان بێت. بۆیە باسکردنی مەسەلەیەکی وەك ئەوەی گۆیا ئەنسارولئیسلام خەریکی دروستکردنی چەکی کیمیاوی بووە، ئەویش لە ڕاگەیاندنەکانی لایەنی نەیاری ئەم ڕێکخراوەوە، ناتوانێت سەرچاوەیەکی ڕاست و دروستی هەبێت. جا ئەو ڕاگەیاندنانە لە سەردەمی ئیمارەتی بیارەدا درۆو دەلەسەی زۆریان بڵاو ئەکردەوەو یەك لەوان ئەو ئیدیعا درۆینە بوو کە گوایە عێراق لە ڕێگای چەند ئەفسەرێکەوە پێوەندیی بە ڕێکخراوی قاعیدەوە کردووە. ئەڵبەت شتەکە زیاتر لەوەی پێوەندیی بە ئەلقاعیدەوە بێت پێوەندیی بە ئەنسارولئیسلامەوە بوو و مەبەست لەو چەند ئەفسەرەش ئەبوو زوبەیر و چەند کۆنە ئەندامێکی ئارتەشی بەعس بوو کە بە هۆی دژایەتیکردنی سەدام حسەین و ڕژێمەکەیەوە ڕوویان لە کوردستان کردبوو و وەك پێشتریش باسم کرد کەسێکی وەك ئەبوو زوبەیر تەنیا ماوەیەك لە ناو جوندولئیسلامدا مایەوەو دواتر پاش دەرکرانی لەم ڕێکخراوە لە لایەن تەحسین عەبدولعەزیز و بزووتنەوەی ئیسلامییەوە پەنا درا.

بەدەر لە پڕوپاگەندەی ڕاگەیاندن بە تایبەت ڕاگەیاندنی یەنەك كە بە شێوەی گۆترەو بێ بەڵگە بە نیسبەت جوند و ئەنسار و ئیمارەتی بیارەوە باسی بابەت و مەسەلەی جۆراوجۆری ئەكرد، ئەوەندەی من بزانم لە پێوەندیی لەگەڵ چەك و مادەی كیمیاویدا پێشتر لە سەردەمی بزووتنەوەی ئیسلامیدا هەندێ شت لە ئارادا بووە. ساڵەكانی ١٩٩١/١٩٩٢ بزووتنەوەی ئیسلامی لە ڕێگەی فێرگەی سەربازیی دیاناوەو بە كەڵكوەرگرتن لە پاشماوەكانی ڕژێمی بەعس چەند (قومبەلە) بۆمبێكی بچووكی كیمیاوی دروست كرد و تەنانەت دانەیەكیشیانی تاقی كردەوە. هەرچەند هەندێ ئەندام و سەركردەی جوند و ئەنساریش بیرۆكەیەكی وایان هەبوو بەڵام هیچكات بە كردەوە لە لایەن ئیمارەتی بیارەوە هەوڵی دروستكردنی بۆمب و مادەی كیمیاوی و ژەهراوی نەدراوە. ئەڵبەت لە چەند مانگی كۆتایی تەمەنی ئەم ئیمارەتەدا مەسەلەیە بایەخێكی زیاتری پەیدا كرد و خەریك بوو بەدواداچوونی بۆ بكرێت بەڵام بە هۆی هێرشەكەی ئەمەریكاو ڕووخانی ئیمارەتەكەوە بەرەو فەرامۆشی ڕۆیشت. هۆكاری ئەوەش كە ڕاگەیاندنی حزبە كوردییەكان بە تایبەت یەنەك ئەم شتەیان زۆر زەق كردبووەوە، ئەوە بوو كە مەسەلەكە بیگەیەننە ئاستێكی هەستیار تاكوو سوپای ئەمریكا لە كاتی هێرش كردنە سەر عێراقدا لێدانی ئیمارەتی بیارەش بكاتە بەشێك لە پرۆسەی بە ناو ڕزگاركردنی عێراق.

بە نیسبەت گۆڕینەوە یان كوژرانی دیل و بارمتەیشەوە، لە ماوەی تەمەنی ئیمارەتی بیارەدا تەنها چەند كەسێك بە هۆكار و تاوانی جۆراوجۆر حوكمی كوژراویان لە سەر بەرێوە چوو. دووانیان بارمتەكانی ڕووداوی كوژرانی شەوكەتی حاجی موشیر بوون كە پێشتر باسی چۆنییەتی كوژرانی ئەوانم بۆ كردن، هەروەها «شێركۆ جەبار هەورامی» كە ویستبووی بۆمبێك بۆ هێمن بانیشاری دابنێت و لە كاتی دانانیدا بۆمبەكە بە خۆیدا تەقییەوەو بریندار كرد. پاش چاكبوونەوەو ئێعترافكردن بە تاوانەكە، حوكمی كوشتنی لە سەر بەرێوە چوو. «ئیبراهیم بیارەیی» و «ئیسمائیل»ی برای پاش ئەوەی بڕێك مادەی تەقینەوەیان پێوە گیراو دیانیان بەوەدا نا كە مادەكەیان لە یەكییەتی وەرگرتووە بۆ ئەوەی لە بازاڕی بیارەدا بیتەقێننەوە، حوكمی كوشتنیان بۆ بڕایەوە. مەبەستی ئەوان لە تەقاندنەوەی بازاڕی بیارە جگە لە شێواندن و تێكدانی ئاسایشی ناوەندی دەسەڵاتی ئەنسارولئیسلام، كوشتنی بەرپرسانی ئەم ڕێكخراوەش بوو. «ئەبووبەكری هەولێری» كە هەر لە سەرەتاوە ئەندامی مەركەز بوو و لە شەڕی شنروێدا بریندار بووبوو، پاش پێوەندیی كردنی بە یەكییەتییەوە «هێرش»ی برای فریو ئەدات كە لاوێكی خوێن گەرم و بە ئیمان بوو. پاشان ئەو بڕێك ژەهر ئەدا بە هێرشی برای بۆ ئەوەی بیكاتە ناو خواردنی ئەندامانی دەورەی عەسكەری ئەنسارولئیسلام كە ژمارەیان حەفتا كەس دەبوو و هێرش (تەباخ)یان بوو. پاش ئەوەی بە هۆی هەندێ هۆكارەوە كارەكەیان دوا ئەخەن، ئەنسار لێیان بە گومان ئەكەوێت و لە ناكاو دەیانگرێت و لێكۆڵینەوەیان لەگەڵ دەكات. پاش ئێعترافكردن، بە تاوانی پاشگەزبوونەوە لە دین (ارتداد) و دوژمنایەتیكردنی موسوڵمانان لە ئاستێكی گەورەدا، لە لایەن ئەنسارەوە حوكمی كوشتنیان لە سەر بەرێوە ئەچێت. هەروەها ئەبووبەكر لە لایەن تەنزیماتی كۆسرەت ڕەسووڵەوە پارەیەكی زۆر و هەندێ ئامێری سیخوڕیكردن لەوانە كامێرایەكی پێ درابوو تاكوو وێنەی بنكەو بارەگاكانی ئەنساری پێ بگرێت.

بە نیسبەت ئەو دوو ئەندامەی یەكییەتیشەوە واتە ئەحمەد بچكۆل و جەلال جەمیل كە ئەنسار لە ناوچەی سەید سادقەوە ڕفاندبوونی، ڕاستە ئەوان لە بەرانبەر وەرگرتنی ٦٠٠ هەزار دیناری سویسریدا ئازاد كران. هەرچەند ئەوان لە ڕوانگەی شەرعەوە مورتەد بوون و سەر بە لایەنێك بوون كە لەگەڵ ئەنساردا لە شەڕدا بوو و دەبوایە حوكمی كوشتنیان لە سەر بەرێوە بچێت بەڵام چونكوو لە لایەك لە ناوچەی شەڕدا نەگیرابوون و دژایەتی ڕاستەوخۆی ئەنسار و موسوڵمانانیان نەكردبوو و لە لایەكی ترەوە گۆڕینەوەی ئەوان بەو بڕە پارەیە هەندێ لە گرفتە ماڵییەكانی ئەنسار و ئیمارەتی بیارەی چارەسەر دەكرد بۆیە سەرباری ئەوەی كە كوشتنەكەیان شەرعی بوو ئازاد كران. ئەڵبەت هۆكارێكی تری گۆڕینەوەی ئەوان بەو بڕە پارەیە ئەوە بوو كە ڕەنگ بوو كوشتنی ئەوان كاریگەری خراپ لە سەر ئێعتیباری ئەنسار و ئیمارەتی بیارە لە ناو خەڵكی ناوچەكەدا دابنێت. بۆیە پاش ئامۆژگاری و قسە بۆ كردن و وەرگرتنی بەڵێنی ئەوەی كە

ئەگەڕێنەوە ناو حزبێکی مورتەدی وەك یەکییەتی، هەیئەی شەرعی ئەنسار لە باتی کوشتن بڕیاری گۆڕینەوەی ئەوانی دەرکرد. لە ڕاستیدا ئەم کارە زۆر پێویست بوو و هەیئەی شەرعییش ئەمەی تەئید کردبوو و ئەگەریش ڕەخنەی لە سەر بێت ئەوە پێوەندیی بەوانەوە هەیە. لەو کاتەدا باری ئابووری ئەنسار زۆر خراپ بوو و ئەم ڕێکخراوە کەوتبووە ژێر باری قەرزێکی زۆری دووکاندارەکانەوەو خەریك بوو گلەییەکی زۆرمان ئەهاتە سەر. ئەنسار ئەیتوانی بەم بڕە پارەیە بەشێکی زۆر لە قەرزەکانی بداتەوە.

وەك ئێوەش وتووتانە ئەم کارەی ئەنسار ڕەخنەی هەندێ لایەنی لێکەوتەوەو لە ناو خودی ڕێکخراوەکەشدا ناڕەزایەتی ئەندامانی کەتیبەی فەتحی لێکەوتەوە. بە تایبەت ئەوان لەوە نیگەران بوون کە ئەم دوو کەسە لە لایەن مەفرەزەیەکی کەتیبەکەیانەوە فڕێندرابوون. هەروەها فەتحییەکان لە ئازادکرانی ژمارەیەك گیراوی تر کە هەندێکیان تەنانەت بە بێ وەرگرتنی پارە ئازاد کرابوون یان لە وازهێنانی ئەنسار لە ٧٠ نوێژنەکەری بیارەیی هەندێ شتی تری هاوشێوەی ئەمانە نەك ناڕازی بەڵکوو تووڕە بوون. هەرچەند لە سەردەمی ئیمارەتی بیارەدا هەندێ لەم ڕەخنەو گلەییانە ئاستێکی بچووك و سادەیان هەبوو بەڵام دواتر و لە کاتی جیابوونەوەی کەتیبەی فەتحدا، ئەندامانی ئەم کەتیبەیە هەموو ئەم شتانەیان هێنایەوە بەر باس و گەورەیان کردنەوەو بەرپرسانی ئەنساریان پێ مەحکووم دەکردن. ئەوان ئەیانوت ئێمە هەمیشە ئەم شتانەمان وتووەو ئەم ڕەخنانەمان گرتووە بەڵام بە قسەمانیان نەکردووە بۆیە ناتوانین لەمە زیاتر لە گەڵیاندا بین و چاوپۆشی لە کەم کارییەکانیان بکەین.

وەك دوایین پرسیاری ئەم بەشە یەك دوو شتێك هەیە کە پێویستە لە بارەیانەوە بپرسین. یەکەم لە سەردەمی ئیمارەتی بیارەدا حوکمی دیاردەگەلی وەك «مەشروب خواردن»، «زینا»، «قەتڵ» و «ڕدە» چی بوو، ئایا دەقاودەق بە پێی یاسا ئیسلامییەکان لە سەر ئەم جۆرە شتانە حوکم ئەدرا؟ دووهەم لە پێوەندیی لەگەڵ «ئیعلان» و ڕاگەیاندنیشدا بۆمان ڕوون بکەوە تاکوو بزانین لە سەردەمی ئیمارەتی بیارەدا لەم بوارانەدا چ کارگەلێك کراوەو بە گشتی بەرهەم و بڵاوکراوەکانی بواری ئیعلان و ڕاگەیاندنمان بۆ باس بکە.

سەبارەت بە تەتبیقکردنی حوکمەکان لەو بوارانەدا کە ئێوە باستان کردووە، ئەوەندەی من بزانم و لە بیرم مابێ لە سەردەمی ئیمارەتی بیارەدا تەنیا یەك حوکمی مەشروب خواردن لە سەر کەسێکی مەشروب خۆر بەڕێوە چوو و لە بەرانبەر ئەو کارەدا کە کردبووی چل (سووت)یان لێ دا. هەروەها حوکمێکی زیناش جێبەجێ کراو ڕێوڕەسمی بەڕێوەچوونی ئەم حوکمانە لە سیدیدا بڵاو کراوەتەوە. بە هۆی ئەوە کەسە زیناکارەکە کوڕ بوو و ژنی نەهێنابوو تەنیا سەد (سووت)یان لێ دا. وەك شاهێد حاڵێك ئەتوانم بڵێم هەردووکی ئەم حوکمانە دەقاودەق بە شێوەی شەرعی بەڕێوە چوون، تەنیا شتێك کە ڕەنگە بۆ هەندێ کەس جێگای پرسیار بووبێت ئەوە بوو لە باتی (سووت) کە لە کۆندا قامچییەك بووە کە لە قامیش دروست کراوە، (نعل) یان (سۆل)یان بۆ لێدانی ئەو دوو کەسە بە کار هێنا. لە بارەی قەتڵ و قەسایشەوە شتێکی وا ڕووی نەداوەو بە هۆی نەکوژرانی کەسەوە کەسیش قەساس نەکراوە. سەبارەت بە (ڕێدە) واتە پاشگەزبوونەوە لە دینیش، ئەبووبەکر هەولێری و هێرشی برای بەو تاوانە حوکمی شەرعیان لە سەر بەڕێوە چوو و کوژران. ئەو دوو کەسەش مادەی تەقینەوەیان پێوە گیراو قەرار بوو بازاڕی بیارە بتەقێننەوە بە حوکمی (مەناسری تاغووت) و وەك (جاسووس و مەحارەبە) لە لایەن ئیمارەتی بیارەوە کوژران.

بە نیسبەت چالاکییەکانی ئەنسارولئیسلام لە بواری ڕاگەیاندنیشدا ئەتوانم ئاماژە بەو بەرنامە تەلەفزۆنیانە بکەم کە ئامادە کرابوون تاکوو بە هۆی ئامێرەکانی پەخشەوە کە لە مامۆستا کرێکارەوە گەیشتبوو بە ئەنسار، بڵاو بکرێنەوە

بەڵام بە هۆی نەبوونی مەجال و دەرفەتی لەبار و شەڕە یەك لە دوای یەکەکانەوە ئەم کارە نەکرا. رادیۆ کورت و کەم مەوداکەی ئەنصار واتە (رادیۆی دەنگی ئیسلام) کە دەنگەکەی تاکوو دەورووبەری سەید سادق و هەڵەبجە ئەبیسترا تەنیا وەسیلەی بڵاوبوونەوەی دەنگی ئیمارەتی بیارە بوو لەو ناوچە بەرتەسکەدا. وەکوو شتی تری لەم چەشنەش، لە سەردەمی جونددا دوو سیدی بە ناوەکانی «نصرالمُبین»ی یەك و «نصر المُبین»ی دوو و لە سەردەمی ئەنساریشدا چەند سیدییەك بڵاو کرایەوە کە بریتی بوون لە: «معرکة خێڵی حەمە»، «واقع أمل»، «صمود و محن».

**دوابەدوای هێرشەکەی ساڵی ٢٠٠٣ی ئامریکا و رووخانی ئیمارەتی بیارەوە، پاشماوەکانی ئەنسارولئیسلام بەرەو رۆژهەڵاتی کوردستان هەڵاتن، بە پێی ئەو وردە زانیارییانەی دواتر بڵاو بوویەوە وادیارە ناکۆکییەکی گەورە لە نێو ریزەکانی ئەنساردا رووی داو بەشێکی زۆر لە ئەندامانی کەتیبەی فەتح جیابوونەوەو هەندێکیان دوای ماوەیەك گەڕانەوە عێراق و ئەم جارە پێوەندییان لەگەڵ ئەبوو مەسعەب زەرقاوی گرت. هۆکاری ناکۆکییەکان و سەرەنجامی ئەو کەرتبوونەو هەروەها ئاکامی گەڕانەوەکە چۆناوچۆن بوو؟**

لە راستیدا پێشتر کێشەی کەتیبەی فەتحمان لەگەڵ سەرکردایەتی ئەنساردا تا کاتی هاتنی ئەمریکا لە بەهاری ٢٠٠٣دا روون کردەوە بەڵام پاش رووخانی ئیمارەتی بیارەو هیجرەتی ئەندامانی ئەنسار بۆ وڵاتی ئێران یان بە واتایەکی تر بۆ کوردستانی ئێران کە بە هاوکاریی ئەندامانی ئیحتیاتی ئەم رێکخراوە لە کوردستانی ئێران و باڵی مەکتەب قورئانی حەسەنی ئەمینی و ژمارەیەکی تر لە موسوڵمانانی ئەم بەشە بەڕێوە چوو، ئەو ئەندامانەی ئەنسار کە بە دزییەوە یاخود بە چاوپۆشی حکوومەتی ئێران خۆیان گەیاندبووە ئەوێ، تا چەند مانگێك ماتەیان لێ کرد و نەیاندەوێرا خۆیان دەربخەن. لەو ماوەیەدا ئەندامانی کەتیبەی فەتح کەوتنە سەرزەنشتکردن و لۆمەی سەرکردەکانی ئەنسار و هەم رەخنەیان لە کاروباری رابردووی ئەوان دەگرت و هەمیش بەو نەخشەو بەرنامانە بێباوەڕ بوون کە ئەوان بۆ داهاتووی رێکخراوەکەیان دادەنا. بۆیە سەرکردەکانی ئەنسار سەرەتا هەوڵیان دا لە رێگای هێمن بانیشاری کۆنە ئەمیری فەتح و ئەندامی سەرکردایەتی ئەنسارەوە ئەم دەنگی لۆمەو سەرزەنشتە کپ بکەنەوەو کاك هێمنیش بە سەردان و چاوپێکەوتن لەگەڵ فەتحییەکان کە لەملاولا خۆیان مت کردبوو، توانی بە سەر کێشەکەدا سەر بکەوێت و کۆتایی بە گلەیی و گازندەکانی ئەوان بهێنێت کە لە کاتی بەڕێوەبردنی ئەم راسپاردەیەدا واتە لە کۆتاییەکانی کارەکەدا، بانیشاری و چەند هاوڕێیەکی تری لە لایەن حکوومەتی ئێرانەوە دەستگیر کران. دەسەڵاتی ئێرانی پاش دوومانگ راگرتنیان لە زیندان بە بێ ئەوەی تەسلیمی یەکییەتیان بکاتەوە، لە یەکێك لە ناوچە سنوورییەکانەوە ئەوانی رەوانەی عێراق کردەوە بەڵام کاك هێمن و هاوڕێکانی دواتر پێچی لێ ئەکەنەوەو بە دزییەوە دێنەوە ناو خاکی ئێران. لە ماوەی زیندانیکرانەکەی هێمن بانیشاریدا، عومەر بازیانی بە دژی سەرکردایەتی ئەنسارەوە ئەکەوێتە هاندان و پاڵپێوەنانی فەتحییەکان بۆ جیابوونەوە لە ئەنسار و تا رادەیەك ئەوانی ئامادەی ئەنجامدانی ئەم کارە ئەکات. هەرچەند هەندێ لە سەرکردەکان لە جووڵەجووڵەکانی بازیانی و ئەندامانی فەتح کەوتبوونە گومانەوە بەڵام بازیانی نەیدەویست کارەکە ئاشکرا بکات و چاوەڕوانی ئازادکرانی هێمن بانیشاری بوو.

کاك هێمن پاش گەڕانەوەی بۆ لای هاوڕێکانی، ئاگاداری ئەوە ئەبێ کە ئەوان گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی بە شێوەی ئێجگارەکی لە رێکخراوی ئەنسارولئیسلام جیاببنەوە. هاوڕێکانی ماوەیەك بۆ قەناعەت پێ کردنی ئەو دائەنێن و ئەڵێن پێمانخۆشە لە گەڵماندا بیت بەڵام ئەگەر سەرەنجام قەناعەت نەکەیت و بڕیاری مانەوە لەگەڵ ئەنساردا بدەیت ئەوا ئێمە بۆ خۆمان کارەکە دەکەین و جیا ئەبینەوە. سەرەنجام پاش نزیك بە ٢٠ رۆژ باس و خواس و مانەوە لای ئەوان لە

شارۆچکەی «کانی دینار»ی سەر بە قەزای مەریوان، بە بێ ئەوەی لەو ماوەیەدا چاوی بە سەرکردایەتی ئەنسار بکەوێت، کاک هێمن بڕیاری مانەوە لە گەڵ ئەوان و جیابوونەوە لە ئەنسار ئەدات. بۆیە لە ڕێگای نامەیەکەوە سەرکردایەتی ئەنسار ئاگادار ئەکاتەوەو هەواڵی هەڵوێست و بڕیارەکەی خۆیانیان پێ ڕادەگەیەنێ، ئەوانیش داوای لێ دەکەن لە هەڵوێستەکەی پاشگەز بێتەوەو نەکەوێتە داوی ئەو قسەو باسانەی کە بە دەستکردی عومەر بازیانی و ئەبوو زوبەیریان دەزانین. بانیشاری لە وەڵامدا ئاوایان بۆ ئەنووسێت: «ئێمەوە وەك کۆمەڵە خەمخۆرێکی ڕێبازی سەلەفییەتی جیهادی، تاکوو ئێستا لە ناو ئەنساردا خزمەتمان بەم ڕێبازە کردووەو ئێستایش گەیشتووینەتە ئەو قەناعەتە کە ناتوانین لەم کەش و هەوا گوماناوییەدا لەگەڵتان کار بکەین بۆیە لەگەڵ ڕێزماندا بۆتان، بڕیاری وازهێنان و جیابوونەوەمان داوە». ئەوان کە بریتی بوون لە زۆرینەی ئەندامانی کەتیبەی فەتح، پاش جیابوونەوەیان لە ئەنسار، بە سەرکردایەتی عومەر بازیانی پێوەندییان بە ئەبوومەسعەب زەرقاوییەوە کرد و لەگەڵ دەستەکەی ئەودا ڕێکخراوی «التوحید و الجهاد»یان پێك هێناو زەرقاوییان وەك ئەمیری خۆیان قبووڵ کرد.

لە لایەکی ترەوە ئەنسارەکانیش پاش ماوەیەك حەوانەوە بە مەبەستی دەستپێکردنی جیهادی (نیکایە) واتە جیهادی زەربەلێدان لە ئەمریکا و هاوپەیمانان دەستیان کرد بە ناردنی ئەندامانی خۆیان بۆ (داخل) ناوەوەی عێراق. لە سەرەتادا زۆربەی سەرکردەکانی ئەنسار لەو باوەڕەدا بوون نابێ لە کوردستانی ئێراندا بمێننەوەو دەست بخەنە سەر دەست و تێکەڵ بە ژیانی دونیایی بن، بۆیە بڕیاریان دا ئەوانەی نەیانەوێ لەگەڵ ئەنساردا بمێننەوە پێویستە بگەڕێنەوە عێراق مەگەر ئەوانەی کە خودی ڕێکخراوەکە بە مەبەستی کارکردن لە ئێراندا، دەسنیشانیان ئەکاو دایان ئەنێ. پاش ئەمە بەرە بەرە هەموو کەتیبەکان گەڕانەوە عێراق و لە ناوچەکانی ناوەوەی ئەم وڵاتە دەستیان بە جیهاد کرد. خولی نوێی جیهادی ئەم ڕێکخراوە بە خۆ تەقاندنەوەی موجاهیدێك بە ناوی «بڕوا هەولێری» کە ئەندامی پێشووی ئاسایشی ئەنسار بوو دەستی پێ کرد. ئەو مانگی ٥ی ساڵی ٢٠٠٣ لە مووسڵ خۆی بە قافڵەیەکی سوپای ئەمریکادا تەقاندەوەو چەندین کەسی لێ کوشتن.

پاش جیابوونەوەی کەتیبەی فەتح، لە لایەك بەو هۆیەوە کە لە سەرەتادا ئەنسار بەرنامەی دروستکردنی ڕێکخراوی لە ئێراندا نەبوو و لە لایەکی تریشەوە بە هۆی بەربڵاوبوونی ئەو قسەو باس و چالاکیانەی کۆنە فەتحییەکان دژی ئەنسار ئەیان کرد، زۆربەی سەلەفییەکانی کوردستانی ئێران پاڵیان بەوانەوە داو بە هاوکاری یەکتر دەستیان دایە دامەزراندنی ڕێکخراوێکی سەلەفی جیهادی و کەوتنە تەبلیغ و بانگەشەی بیروباوەڕی سەلەفییەت لە هەموو ناوچەکانی کوردستانی ئێراندا. بۆیە ماوەیەك دواتر، ئەنساریش لە ڕێگای ئەندامانی خۆیەوە بە تایبەت ئەو چەند ئەندامەی کەتیبەی فەتح کە لەگەڵی مابوون، لە پێشدا دەستی کرد بە ڕەتدانەوەی ئەو قسەو باسانەی دژی ئەم ڕێکخراوە دەکران و پاشان گەیشتە ئەو ئەنجامە کە پێویستە لە ئێراندا زەمینە بۆ دروستکردنی باڵێکی ڕێکخراوەکە فەراهەم بکات ودەست بکات بە ڕێکخستنی سەلەفییەکانی کوردستانی ئێران. جا هەرچەند هەندێ سەرکردەی ئەنسار لەو قۆناغەدا دژی ئەم کارە بوون و باوەڕیان بە دروستکردنی ڕێکخراو لە ئێراندا نەبوو بەڵام ڕای گشتی ئەندامان پێچەوانەی ئەمە بوو و دروستکردنی باڵێکی سەر بە ئەنسارولئیسلامی لە وڵاتی ئێراندا بە پێویست ئەزانی. بۆیە ئەم ڕێکخراوە شان بە شانی تەوحید و جیهادی ئەو کات لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی کوردستانی ئێران و بگرە لە تێکڕای وڵاتی ئێرانیشدا دەستی کرد بە وەرگرتنی ئەندام. هەرچەند ئەنسارەکان لە سەرەتادا نەیانتوانی بە ئاستی تەوحید و جیهادەکەی ئەبوو مەسعەب زەرقاوی (لقی ئێران) دەست بدەنە وەرگرتنی ئەندام بەڵام دواتر ڕێژەی ئەندامانی ئەنسار بەرزبوونەوەیەکی باشی بە خۆیەوە بینی و گەیشتە ئاستی تەوحید و جیهاد.

کەتیبەی کوردەکانی تەوحید و جیهاد لە عێراق پاش ساڵێك توانییان بەشداری ڕاستەوخۆی جیهاد بکەن و ئەمەش هاوکات بوو لەگەڵ تووشبوونی ئەم ڕێکخراوە (تەوحید و جیهاد) بە غەزای فەلووجە. هەرچەند جیهادی فەلووجە بە

شێوەی (تمكين) بەڕێوە چوو بەڵام بە هۆی نابەرابەری و هاوسەنگنەبوونی هێزەکانەوە هەروەها ئەو ئیمکاناتە زۆرە نیزامییەی دژی موجاهیدین بە کاریان هێنا، بە داخەوە ژمارەیەکی زۆر موجاهید شەهید بوون. لە ناو شەهیدەکاندا نزیك بە دوو هەزار کەسیان عێراقی و زۆربەیان خەڵکی شاری فەلووجە بوون و نزیك بە ٦٠٠ کەسیشیان بریتی بوون لە موجاهیدە کوردەکان و موجاهیدینی دەرەوەی عێراق. ناوی ژمارەیەك لەو موجاهیدە کوردانەی لە شەڕی فەلووجەدا یان پاش ئەم شەڕە لە ساحەی جیهادی عێراقدا شەهید بوون بەم شێوەی خوارەوەیە:

١-هێمن بانیشاری ئەمیری پێشووی کەتیبەی فەتح ٢-فەرمان هەولێری ناسراو بە جوندوڵڵا ٣-بەرزان مۆریاسی برای کامەران مۆریاسی ٤-فریاد خەمزەیی ناسراو بە عەبدولعەزیز. مێقدادی برای فریاد کە بە عەبدولڕەحمان ناسرابوو، لەو شەڕەدا ئەسیر کراو دوو ساڵ دواتر لە ژێر ئەشکەنجەدا شەهید بوو. ٥-چالاك قەرەداغی ناسراو بە موحەممەد قەرەداغی ٦-تارق قەرەداغی ٧-خوبەیب قەرەداغی برای شەهید زاناو مەلا موستەفا ٨-مەعروف ئەستێرە ناس ناسراو بە شاملی کارێزە وشك ٩-فاخر یان تارق هەولێری ناسراو بە زریان کە پێشتر لە ناو پەکەکەدا بە هەژار ناسرابوو ١٠-ئەبوو تۆراب خەڵکی گەڕەکی بەختیاریی شاری سلێمانی، ئەو بەشداری جیهادی ئەفغانستان و شەڕی تۆرابۆرای کردبوو ١١-هیوا ناسراو بە عەلی باینجانی کە کاتی خۆی پێشمەرگەی هێزی لێدانی بزووتنەوەی ئیسلامی بوو و پاشان بوو بە ئەندامی جەماعەت تەوحید و دواتریش جوند و ئەنسار. ئەڵبەت عەلی دوای شەڕی فەلووجەو لە کاتێکدا شەهید کرا کە پێوەندیی بە تەوحید و جیهادەوە نەمابوو و پێوەندیی بە جەماعەتی ئەبوو زوبەیرەوە کردبوو، ئەبوو زوبەیر پاش گەڕانەوەی بۆ عێراق لەگەڵ جوندولموئتەزەمدا کەوتبووەوە کار. ١٢-یوسف کارێزە وشکی خەڵکی سلێمانی ١٣-ئەبووزەڕ کەلاری کە لە ئەنسارەوە چووە ناو تەوحید و جیهاد، ئەو لە سەردەمی بزووتنەوەی ئیسلامیدا ناوی (رەعد) بوو و ئەندامی هێزی لێدان بوو. ١٤-باسام پاڵانیی ناسراو بە باسم هەورامی، برای ئەبووبەکر و یاسین هەورامی، ئەبووبەکریش ساڵێك پاش غەزاکەی فەلووجە شەهید بوو.

**کەوابوو گرووپی «جەیش موحەممەد» کە پێشتر لە لایەن ئەبوو مەسعەب زەرقاوییەوە دامەزرابوو پاش پەیوەستبوونی ئەندامانی کەتیبەی فەتح ناوی خۆی گۆڕی بۆ «تەوحید و جیهاد». ئەی ئەو تەنزیماتەی لە ژێر ناوی «تەوحید و جیهاد»دا لە رۆژهەڵاتی کوردستان دامەزرا چ پێوەندییەکی بە گرووپەکەی زەرقاوییەوە هەبوو و لەبەرچی دواتر ناوی خۆی گۆڕی بۆ «کتائب القاعده فی الکردستان»؟**

وابزانم جەیش موحەممەد هەمان ئەو گرووپە بوو کە ساڵێك پێش هاتنی ئەمریکا بۆ عێراق، لە لایەن زەرقاوییەوە دامەزرابوو. پاش جیابوونەوەی ئەندامانی کەتیبەی فەتح لە رێکخراوی ئەنسارولئیسلام ئەوان بە تەمابوون بە هەمان ناوە کۆنەکەوە واتە بە ناوی «جماعة التوحید»ەوە رێکخراوێکی نوێی سەلەفی جیهادی رابگەیەنن و دەست بە کاری جیهاد بکەن. لەو کاتانەدا کە ئەوان خەریکی خۆ ئامادەکردن و بە تەمای راگەیاندنی رێکخراوەکە بوون، لە لایەکی ترەوە لەگەڵ ئەبوو مەسعەبیشدا لە گفتوگۆدا بوون و خەریکی تاووتوێکردنی یەکگرتن و یەکخستنی ریزەکانیان بوون لەگەڵ ئەودا. بۆیە پاش رێکەوتن و بڕیاری یەکگرتن، هەم ئەوان و هەمیش جەیشی موحەممەد لە سەر ئەوە ساقبوونەوە کە ناوی تەوحید و جیهاد بۆ رێکخراوە تازەکەیان هەڵبژێرن. ئەم ناوە هەم هاوشێوەی جەماعەت تەوحید بوو و هەمیش ناوی ئەو رێکخراوە سەلەفی جیهادییە بوو کە لە کاتی مانەوەیدا لە ئەفغانستان، لە لایەن زەرقاوییەوە دامەزرابوو و بەڕێوە ئەبرا. ماوەیەك بەم ناوەوە بە کاری جیهادەوە خەریکبوون و لەو ماوەیەدا لە سەرەکی ترین چالاکیدا ٤٠٠ نەفەریان لێ شەهید بوو. ئەوەندەی من بیستوومە، چالاکییەکە بەو جۆرە بووە کە زەرقاوی بە هۆی نامە یان هەواڵێکەوە

که لە لایەن ئافرەتە موسوڵمانە گیراوەکانی ناو بەندیخانەی ئەبوو غرێبەوە پێی ئەگات، داوای لێ ئەکرێت فریایان بکەوێت و پێی ئەڵێن ئەگەر بەندیخانەکەشتان بە سەرماندا رووخاندووە بەڵکوو لەو ئازار و ئەشکەنجەو ئەو هەموو دەستدرێژییەی ئەکرێتە سەرمان رزگارمان بکەن. بۆیە ئەمە کاریگەرییەکی زۆر لە سەر زەرقاوی دائەنێت و تووشی حەماسێکی وەهای ئەکات کە زۆر بە خێرایی بە دەم داواکەیانەوە بچێت. بە وەمەبەستە دە ئەفەری خۆبەخش بە سەیارەی پڕ لە تەقینەوەو زیاتر لە ٤٠٠ موجاهیدی شەڕکەر ئامادە ئەکات بۆ هێرشکردنە سەر بەندیخانەی ئەبوو غرێب. بە پێی بەرنامەکە ئەبووایە لە سەرەتادا دە ئەفەرە خۆبەخشەکە بە سەیارەکانیانەوە خۆیان بە لایەکی دیواری بەندیخانەکەدا بکێشایەو پاشان موجاهیدە شەڕکەرەکان لە رێگای ئەو کەلەبەرەوە کە تەقینەوەکە دروستی دەکرد دزەیان بکردایەتە ناو بەندیخانەکەو کۆنترۆڵیان بکردایە. بە داخەوە کاتێ کە موجاهیدین بە نهێنی خەریکی خۆ ئامادەکردن بوون، سوپای ئەمریکا بە شێوەیەکی کوتوپڕ فڕۆکە شەڕکەرەکانی خۆی ناردە سەریان و چوارسەد کەسی لێ شەهید کردن. بەڵام تاکوو ئێستاش نازانم چۆناوچۆن ئەبوو مەسعەب رزگاری بووەو نەکوژراوە.

چالاکییە جیهادییەکانی ئەبوو مەسعەب لە عێراقدا بە چەند قۆناغ دابەش ئەبێت. یەکەم، قۆناغی (جەیش موحەممەد)ە کە لە ساڵێك یان ساڵێك و چەند مانگ پێش رووخانی سەدام حسەینەوە دەست پێ ئەکات. دووهەم، قۆناغی (توحید و جیهاد) کە تیایدا زەرقاوی و هاوڕێکانی بەیعەتیان دایە رێکخراوی ئەلقاعیدەدا. لەم قۆناغەدا کوردەکان و ئەندامانی پێشووی تەوحید و جیهاد بوونە کەتیبەیەك لەناو رێکخراوە تازەکەدا. هەروەها ئەلقاعیدە بەشێك لەوانی ناردە ناوچەکانی کوردستان و رێکخراوی (کتائب قاعده ڤ الکردستان)ی پێ دروست کردن کە بەشی زۆری موبایەعەکانی ئەم رێکخراوە سەلەفییەکانی کوردستانی ئێران بوون. سێهەم، ئەو قۆناغە بوو کە زەرقاوی وەك ئەمیری ئەلقاعیدە لە عێراق بە هاوکاری رێکخراوە جیهادییەکانی تری ناوساحەی جیهادی ئەم وڵاتە جگە لە ئەنسارولئیسلام، شۆرایەکی بە ناوی «شۆرای موجاهیدین» پێکهێنا. شۆرای موجاهیدین جگە لە بەردەوامکردنی جیهاد بە شێوەیەکی چڕوپڕ، زەمینەی بۆ دامەزراندنی «دەوڵەتی ئیسلامیی عێراق»یش فەراهەم کرد. ئەڵبەت لەم قۆناغەداو پێش راگەیاندنی دەوڵەتی ئیسلامی، ئەبوو مەسعەب شەهید بوو و «ئەبوو ئەیووب میسری / ئەبوو حەمزەی موهاجیر» جێگای ئەوی گرتەوە. پاشان ئەبوو ئەیووب بە هاوکاری گرووپ و رێکخراوەکانی تری ناو شۆرای موجاهیدین، دەوڵەتی ئیسلامیی عێراقی دامەزراند.

زەرقاوی ماوەیەك پێش شەهید کرانی لە سیدییەکدا ئاوا باسی خۆی ئەکات: «وابزانم ئەوەی دژی دوژمنانی دینی ئیسلامم کردووە بەسە بۆ گەڕانەوەم بۆلای خوای خۆم، خۆشحاڵم بەوە کە توانیومە ٥٠٠ ئۆتۆمۆبیلی پڕ لە تەقینەوە بە ریمۆت یان بە هۆی موجاهیدی خۆبەخش و ئیستشهادییەوە، بە کافر و مورتەدەکاندا بتەقێنمەوە». هەر بەو بۆنەیەوە بوو ناویان نابوو «امیر الاستشهادیون». ئەتوانم وەك دوابەشی وەڵامەکەم ئەوەتان پێ بڵێم کە دروستبوونی کەتیبەکانی کوردستان هاوکات بوو لەگەڵ بەیعەتدانی گرووپی تەوحید و جیهاد بە رێکخراوی ئەلقاعیدە بۆیە کەتائب لە یەکەم رۆژی دامەزران و دەستبەکاربوونیەوە خۆی لە ژێر ئەمری ئەلقاعیدەدا بینیوەتەوەو راستەوخۆ پێوەندیی بەم رێکخراوەوە بووە.

بەڵام زەرقاوی دوای بەیعەتدان بە قاعیدە ناوی تەوحید و جیهادی گۆڕی بۆ «التنظیم القاعده ڤ البلاد الرافدین»، هەروەها خۆیشی زیاتر لەوەی بە «امیر الاستشهادیین» ناسرابێ بە «امیر الذباحین» دەناسراو ناوبانگی دەرکردبوو، چونکوو یەکەم سەربڕین لە عێراقی پاش رووخانی سەدام حسەیندا بە دەستی ئەو ئەنجام درابوو. لە لایەکی ترەوە هەندێ کەس ئەیانوت بەیعەتدانی زەرقاوی بە ئەلقاعیدە بەیعەتدانێکی تاکتیکی بووە نەك شتێکی بنەمایی و ستراتیژیك، واتە لە بەر ئەوەی کە ئەگەر خۆی بە ئەلقاعیدەوە ببەستایەتەوە لایەنگر و «موجاهیدی» زیاتری کۆ

ئەكردەوە هەر بۆیە بەشێوەی تاكتیكی بەیعەتی بە قاعیدە دا. ئەم دەنگوباس و بابەتانە كەمێك جیاوازە لەوەی تۆ دەیڵێی.

نەخێر ئەوەی ئێوە وتووتانە راست نییە چونكوو (التنظيم القاعده في البلاد الرافدين) پێش بەیعەتدانی زەرقاوی بە ئەلقاعیدە دامەزراوەو نوێنەرایەتی ئەم رێكخراوەی لە عێراقدا كردووە. لەو سەردەمەدا خەڵكێكی زۆری سەر بە خێڵ و هۆزە جۆراوجۆرەكان بە شێوەیەكی گشتی پابەندی منهج و بەرنامەكانی رێكخراوی قاعیدە دەبوون، ئەو هۆزانە لە باری قەبارەوە ئەوەندە گەورە بوون كە توانای دروستكردنی چەندین رێكخراویان هەبوو و هەروەها ئەیانتوانی پێداویستی مرۆیی چەندین رێكخراو دابین بكەن. ماوەیەكی كەم پاش پێوەندیی گرتنی (جماعة التوحيد و الجهاد) بە رێكخراوی ئەلقاعیدەوە واتە لە سێهەم رۆژی مانگی موبارەكی رەمەزانی ساڵی ٢٠٠٥ دا بە فەرمی باسی ئەم پێوەندیی و تێكەڵبوونە كرا. پاشان ئەندامانی تەوحید و جیهاد بە موجاهیدە كوردەكانیشەوە كەتیبەیەكیان لە ناو تەنزیم قاعیدە في.....دا دامەزراند و زەرقاویش ئەمیرایەتی تەنزیماتەكەی كەوتە سەر شان. كەوایە ئەم تەنزیماتەی قاعیدە پێش بەیعەتدانی جەماعەتی تەوحید و جیهاد بە رێكخراوی قاعیدە دروست بووە. دەربارەی خودی زەرقاویش من لە چەندین سیدیدا بینیومە كە بە «امیر الاستشهادیین» ناویان بردووە نەك «أمیر الذباحین» واتە ئەمیری سەربڕەكان، بەڵام ئەگەر وایشی پێ وترابێ ئەوا یان بە هۆی ئەو شێلگیری و جیدییەتەوە بووە كە لە بەرامبەر دوژمنانی دیندا بوویەتی كە لەم حاڵەتەدا هۆگرانی زەرقاوی ئەو سیفەتەیان بەخشیوەتە ئەمیرەكەیان یان لە لایەن ئەو جیهادییانەوە وای پێ وتراوە كە دژی ئەو سەربڕینانە بوون كە بە هۆی ئەو و گروپەكەیەوە ئەنجام ئەدران. زەرقاوی یەكەم سەركردەی سوننەكان بوو كە شەڕی دژی ئەهلی شیعە راگەیاند و بەرەیەكی نوێی دژایەتیكردنی شیعەكانی لە رێگای شەڕ و جیهادەوە كردەوەو یەكێك لە دیارترین رێبەرانی ئەوانی بە ناوی «شیخ باقر الحکیم» لە رێگای تەقینەوەی خۆبەخشانەوە كوشت كە دەوترا یەكێك لە خۆبەخشەكانی ئەو چالاكییە ژنبرا یان خەزووری زەرقاوی بووە.
بەڵام بە نیسبەت ئەو بەشەی پرسیارەكەتانەوە كە وتووتانە زەرقاوی بە شێوەی تاكتیكی بەیعەتی بە ئەلقاعیدە داوە نەك بە راستی نازانم بەڵكوو بەڵكوو بە بەڵگەیشەوە رەتی دەكەمەوە. ئینجا نەك من بەڵكوو هەموو ئەو كەسانەش كەمێ شارەزای سەلەفییەت و خوو و رەوشتی سەركردە جیهادییەكان بن، ئەمە رەت ئەكەنەوە. بەستنی پەیمان و بەیعەتی تاكتیكی لای سەركردە سەلەفی جیهادییەكان بێ مانایەو ئەوان بە هیچ شێوەیەك شتی وا لەگەڵ یەك ناكەن بە تایبەت كاتێ كە مەبەست لە ناوەها شتێك كۆ كردنەوەی خەڵكانێكی زۆرتر بێت لە دەوری جەماعەیە یاخود رێخراوێك. لە راستیدا سەلەفییە جیهادییەكان لە ئەساسدا باوەڕیان بە ناوەها شتێك نییە چونكوو ئەوان گوێ بە لۆمەو سەرزەنشتی خەڵك نادەن و گوێ بەوەش نادەن خەڵكی كەمیان لەگەڵ بێت یان زۆر. ئینجا بە نیسبەت زەرقاوییشەوە شتێكی ئاوا هەر ناگونجێت و توندوتیژییەكانی ئەو لە بەرامبەر سوپای ئەمەریكاو شیعەكانی عێراق و ئەو چالاكییانەی دژی بەرەی كوفر بە گشتی بەڕێوەی برد، سەلمێنەری ئەوەن كە پیاوێكی وەك ئەو ئەیتوانی بە تەنیا خۆی و بە بێ بەیعەتدان بە ئەلقاعیدە هەمان ئەو كار و چالاكییانە بەڕێوە ببات كە لە سایەی ئەلقاعیدەدا ئەنجامی دان. بەڵام ئەو بە مەبەستی یەكخستنی ریزی موسوڵمانان و بەرەی سەلەفی جیهادی، ئامادە بوو ببێتە موبایەعی ئەم رێكخراوەو بچێتە ژێر سێبەر و سەیتەرەی ئەوانەوە. هەروەها بەڵگەیەكی تر بۆ رەتكردنەوەی ئەو ئیدیعایە ئەوەیە كە ئەبوو مەسعەب پێش بەیعەتدانی بە ئەلقاعیدە، ئەوەندە موجاهیدی لەگەڵ بووە كە زۆرجار نەیتوانیوە كۆنترۆڵیان بكات و بەم هۆیەشەوە جاروبار رێكخراوەكەی تووشی شپرزەكاری ئەبوو. بۆیە ئەو هێزەی لە دەوری ئەو كۆبووبۆوە بەس بوو بۆ ئەوەی بە تەنیا درێژە بە جیهاد بدات و زەمینەش فەراهەم بوو بۆ بەهێزبوونی زیاتری ئەو و پەیوەستبوونی خەڵكانێكی زۆرتر بە رێكخراوەكەیەوە. سەرباری ئەوەش، تێكەڵبوونی ئەو لەگەڵ تەنزیماتی قاعیدە لە عێراق هەوڵ و هەواڵێكی دڵخۆشكەر

بوو بۆ موسوڵمانان و ئەمەش بووە هۆی چەند بەرابەر بوونەوەی ژمارەی ئەو کەسانەی پێوەندییان بە ڕێکخراوەکەی ئەوەوە دەکرد. لە بەرانبەریشدا زەرقاوی ناوبانگی ئەلقاعیدەی هەم لە ئاستی عێراق و هەمیش لە ئاستی جیهانییدا بەرزتر کردەوە. هەرچەند بە بەیعەتدانی ئەو بە ئەلقاعیدە، چالاکییەکانی ئەم ڕێکخراوە لە عێراقدا بەرەوپێشچوونێکی زۆری بە خۆیەوە بینی بەڵام لە لایەکی تریشەوە هەموو هەڵەو شپرزەکارییەکانی زەرقاوی کەوتە سەرشانی ئەلقاعیدەو ئەمەش تووڕەبوونی خەڵکانێکی زۆری لێ کەوتەوەو بوو بە هۆی بە شپرزەو هەڵەکار ناسرانی ئەلقاعیدە لە عێراق.

ئەگەرچی تۆ پێداگریت لەسەر ئەوەی گوایە (التنظیم القاعده في البلاد الرافدين) لە لایەن کەسانی جیا لە زەرقاوییەوە دامەزراوە، بەڵام لە هەندێ بەڵگەنامەی باوەڕپێکراودا پێچەوانەی ئەم شتە وتراوە. لە بەڵگەنامەی وەک (اعلام الانام بميلاد دولة الاسلام في العراق)، بيانية اعلام بيعه ابومصعب الزرقاوي مع تنظيم القاعده في افغانستان بزعامة اسامه بن لادن، موقع فتيديات الفلوجه في قسم لرشيف بيانات الجامه و..... بە ڕاشکاوی باس لەوە دەکرێ کە (التنظيم القاعده في البلاد الرافدين) لە لایەن ئەبوو مەسعەبەوەو دوای بەیعەتدانی ئەو بە ئەلقاعیدە دامەزراوە.

ئەو کتێبەی وەک بەڵگەنامە باستان کردووە من پێش گیرانم لە ئەنترنێت ڕامکێشاوەو چەند جار خوێندوومەتەوەو بیرم نایە ئەوەی ئێوە وتووتانە، لەم کتێبەدا باس کرابێ و بوونی هەبێ. لە ڕاستیدا ئەم کتێبە شتێکی وای تیا نییە تاکوو ئەوەی لێ بفامرێتەوە کە ئێوە باستان کردووە. ئەوەش کە وتوومە تەوحید و جیهاد پاش تێکەڵبوونی لەگەڵ ئەلقاعیدە بۆتە کەتیبەیەکی ناو ئەم ڕێکخراوە بەو مانایە نییە ئەوانم بچووک کردبێتەوە، ئەوان خۆیان ئەیانوت ڕێکخراوی ئەلقاعیدە لە عێراقدا خاوەن قەبارەو بارستاییەکی ئەوەندە گەورەو بەربڵاوە کە ڕێکخراوێکی وەک تەوحید و جیهادی کردۆتە یەکێک لە کەتیبەکانی خۆی. ئەو کتێبانەی تریشم نەدیوە کە ناوتان بردوون بۆیە ناتوانم لە بارەیانەوە قسە بکەم و قبووڵیان بکەم یان ڕەتیان بدەمەوە. تەنیا ئەتوانم ئەوە بڵێم کە بە پێی باس و بابەتەکانی ناو ئەو کتێبەو ئەو هەواڵ و زانیاریانەی تر کە بیستوونم و پێم گەیشتوون، دیسان ڕەتی ئەوە ئەدەمەوە کە یەکەم ڕێکخراوی سەر بە ئەلقاعیدە لە عێراق لە لایەن ئەبوو مەسعەب زەرقاوییەوە دامەزرابێت. بە داخەوە لەم بەند و زیندانەدا نە من مەجالی ئەوەم هەیە بەڵگەنامەی پێویست بخەمە بەردەستی ئێوەو نە ئێوەش دەرەتانی ئەو کارەتان هەیە بۆیە خوێنەران ئەتوانن لە ڕێگای کتێب و نووسراوەو بەڵگەنامەکانەوە لە حەقیقەتی باسەکە بگەن.

ئەو شێوازە جیهادییەی بە «جیهادی تەمکین» دەناسرێ و لە لایەن تەوحید و جیهادەوە کەڵکی لێ وەرئەگیرا، لە رووی سیاسی و نیزامییەوە هەڵە بوو و نەیتوانی ئامانجەکانی بپێکێ. لە جیهادی تەمکیندا دەسەلاتی ناوچەیەک کۆنترۆڵ دەکرێ و هێزەکان لەو ناوچە دیاریکراوەدا کۆ ئەکرێنەوە، بۆ نموونە تەوحید و جیهاد لە فەلووجە، قائیم و حەدیسە ئەم شێوازەی پێڕەو کرد یاخود ئەزموونەکانی بیارە، تۆرابۆراو گرۆزنی هەر لەم ڕێڕەوەوە سەرچاوەیان دەگرت کە سەرجەم گشتیان شکستیان هێنا. وێڕای ئەو هەموو نموونە شکستخواردووانەو سەرەڕای ئەوەی هەندێ کەسی ناو تەوحید و جیهادیش دژی ئەم شێوازە بوون، کەچی زەرقاوی و ئەمیرەکانی تری ئەم ڕێکخراوە دووبارە تووشی ئەو هەڵە کوشندەیە بوونەوە. هۆکاری ئەمە چی بوو؟

جیهادی تەمکین لەم سەردەمەدا لە دوو حاڵەتدا بەڕێوە دەچێت. یەکەمیان بە هەمان ئەو شێوازە کە ئێوەش ئیشارەتتان پێ داوە واتە جیهادی ئەفغانستانی سەردەمی تاڵەبان، چیچان، بیارە، فەلووجە، قائیم و تەلعەفەر و حەدیسە. دووهەمیش ئەو شێوازەی کە ئێستاکە تاڵەبان کەڵکی لێوەر ئەگرێت و بە هۆیەوە گوشارێکی زۆری خشتۆتە سەر دەوڵەتی ئەفغانستان و هێزەکانی ناتۆ. جا ئەوان سەرەڕای ئەو حوزوورە بەرچاوەی لە زۆربەی ویلایەت و ناوچەکانی ئەفغانستاندا هەیانە بەڵام شوێنێکی دیاریکراویشیان نییە واتە لە هەموو شوێنێکدا هەن و لە هیچ شوێنێکیشدا نین. هەروەها نموونەیەکی تریش دەوڵەتی ئیسلامیی عێراقە کە تاکوو ئێستاش لە ئاستێکی بەرین و بەربڵاودا دژی دەوڵەتی عێراق و داگیرکەران چالاکی بەڕێوە ئەبات بەڵام وەك ئاگادارن موجاهیدینی ئەم دەوڵەتە هیچ شوێن و جێگەیەکی ئاشکراو دیاریکراویان نییە. هەروەها ڕێکخراوی ئەنسارولئیسلامیش چەند ساڵێکە بە هەمان شێواز خەریکی بەڕێوەبردنی چالاکییە جیهادییەکانی خۆیەتی و لەگەڵ ئەو هەموو نفوزەدا لە ناو سوننەکانی عێراقدا هەیەتی بەڵام موجاهیدینی ئەم ڕێکخراوە لە هیچ شوێنێکدا نابینرێن و نا دۆزرێنەوە.

دەربارەی تەمکینەکەی فەلووجەش ئەتوانم بڵێم مانەوەو جێگیربوونی زەرقاوی لە فەلووجە پاش تێکشکاندنی هێرشی یەکەمی ئەمریکا بۆ سەر ئەم شارە، پێوەندیی بەو هەموو موجاهیدە خوێنگەرمەوە بوو کە بە مەبەستی بەشداریکردن لە جیهادی عێراقدا، لە وڵاتانی دراوسێوە سەفەری ئەم وڵاتەیان کردبوو و بەشێکی زۆریان لە شاری فەلووجە تەمکینیان کردبوو. پاش شکانی سوپای ئەمریکا لە هێرشی یەکەمدا بۆ سەر ئەم شارە، موجاهیدین تووشی جۆرێك لە خۆباییبوون بووبوون و هەر لەم ڕووەیشەوە بوو کە هێزی دوژمنیان بە کەم ئەزانی. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە زۆربەی ئەو موجاهیدانە ئامادەی ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیە نەبوون چونکوو لە باری عەسکەری و پەروەردەوە خاوەن شارەزایی و ئەزموونێکی وەها نەبوون. ئەوان تەنیا لە ڕوانگە شەرعییەکەوە ئەیانڕوانییە جەنگەکەو ئەمەش بەو مانایە بوو کە چ بکوژرێت و چ بکوژێت هەردووکیان خێرە، بە تایبەت بەدەستهێنانی پلەی بەرزی شەهادەت بەلای ئەوانەوە زۆر گرنگ بوو و خێری زۆرتری تیادا بوو. بۆیە ڕەنگ بوو ئەوان لە پێناو گەیشتن بەم پلەیە گوێ بە قسەی ئەمیرەکانیشیان نەکەن و ئامادەی پاشەکشە نەبن. لەو سەردەمەدا ئەیان گێڕایەوە کاتێ فڕۆکەکانی ئەمریکا بە مەبەستی قەسفکردن دەهاتە سەریان، ئەگەر موجاهیدێك بەوانی تری بوتایە خۆتان بشارنەوە ئەوەك بپێکرێن، کەسانێك بە عەمد ئەم کارەیان نەکردووەو هەوڵی خۆ پاراستنیان نەداوە چونکوو پێیان خۆش بووە شەهید بن. جا ئەم جۆرە شەهید بوون و خۆ بە کوشتدانە کەمێك قسەی لە سەرە چونکوو نەك خێرێکی وای بۆ ئیسلام تیادا نەبووە بەڵکوو زەرەر و زیانیشی بووە. ئینجا ڕێژەی ئەم جۆرە کەسانە لە ساحەی جیهادی فەلووجەدا ئەوەندە زۆر بووە کە ڕاو بۆچوونی ئەوان زاڵ بووە بە سەر ئەبوو مەسعەب و ئەمیر و فەرمانەکانی تردا. بۆیە کاتێك هەندێ لە کەسانی دەورووبەری زەرقاوی باسی مەترسیداربوونی کارەکەیان بۆ ئەو کردووە، لە وەڵامدا وتوویەتی: «ئەگەر بمانەوێ پاشەکشەش بکەین دیسان ئەبێ خۆم و ژمارەیەك موجاهید لەم شارەدا بمێنینەوە چونکوو ناتوانم قەناعەت بە هەموو موجاهیدەکان بکەم تاکوو پاشەکشە بکەن. بۆیە وای بە باش ئەزانم ئاکامم وەك ئەو هەموو موجاهیدەو خەڵکی فەلووجە بێت». ئەڵبەت ئەم جارەش ئاکامی ئەبوو مەسعەب ئەوە نەبوو کە خۆی پێی خۆش بوو چونکوو سەرباری کوژرانی ژمارەیەکی زۆری موجاهید و دانیشتوانی شاری فەلوجە لە هێرشەکەی ئەمریکادا بۆ سەر ئەم شارە، ئەبوو مەسعەب پێوە ئەبوو توانی خۆی ڕزگار بکات. بەرجەستەترینی ناو کوژراوەکان کەسێکی نزیکی زەرقاوی و یەکێك لە باشترین یارمەتیدەرانی ئەو بوو بە ناوی «عمر حدید» کە بەرپرسی تێکشکاندنی هوجوومی یەکەمی ئەمریکا بوو بۆ سەر فەلووجە.

بە نیسبەت جیهادی تەمکینیشەوە، جەیشی «انصار السُنە» هەر لە سەرەتاوە دژی ئەم جۆرە جیهادەو کۆبوونەوەی ئەو هەموو موجاهیدە بوو لە فەلووجەدا، بۆیە بەشدارییان تیادا نەکرد و تاقە یەك موجاهیدیشیان لەم شەڕەدا نەکوژرا. ئەم جۆرە کارانە هەر لە سەرەتاوە هۆکاری بە هەڵەکار زانینی ڕێکخراوی قاعیدە بوو لە عێراقدا بە تایبەت لە لایەن

سەرکردەکانی ئەنسارولسوننە یان ئەنسارولئیسلامەوە. هەرچەند ئەنساریش خەریک بوو لە سەردەمانێکدا خۆی تووشی جیهادی تەمکین بکات بەڵام زۆر زوو بە هەڵەکەی خۆی زانی و شێوازی جیهادی شاراوەو نهێنی گرتەوە بەر. ئەنسار بۆ ماوەیەك کۆنترۆڵی ناوچەی تەلعەفەری بە دەستەوە بوو کە لەو کاتەدا بەرپرسی هەیئەی شەرعی ئەم رێکخراوە «ئەبوو عەلا » تەلعەفەری بوو. ئەم پیاوە پاش ئەوەی ئەنسار بە بیانووی دووپات نەبوونەوەی رووداوەکەی فەلووجە بریاری چۆڵکردنی تەلعەفەر و وازهێنانی لە جیهادی تەمکین دا، بە نیشانەی نارەزایەتی دەربرین بە نیسبەت ئەو بریارەی سەرکردایەتی ئەنسارەوە، بە خۆی و چوارسەد موجاهیدەوە ریزەکانی ئەم رێکخراوەی بەجێ هێشت و بریاریدا لە ژێر سێبەری قاعیدەداو بە ناوی ئەم رێکخراوەوە بەرگری لە تەلعەفەر بکات. بۆیە لە کاتی هێرشی سوپای ئەمریکادا موجاهیدەکانی ژێر فەرمانی ئەو یان شەهید بوون یان بە دیل گیران و خودی ئەبوو عەلائیش یەکێك بوو لە گیراوەکان. ئەم حاڵەتە لە ناوچەی (حەدیسە)یش ئەزموون کرا کە گروپێکی سەلەفی جیهادی خیلافەتی ئیسلامییان تیادا راگەیاندبوو، بەڵام لەوێشدا شکستی خوارد.

**ئەلبەت ئەوەی کە تاڵەبان لە ئەفغانستان و قاعیدە لە عێراق دەسەڵاتیان بە دەستەوەیەو حکوومەتی ئیسلامییان راگەیاندووە تەنیا ئیدیعای ئەم گروپانەیە، چونکوو هەموو جۆرە ئامادەبوونێك مانای حکوومەتکردن نادات. بە واتایەکی تر ئەگەر تەنانەت هێزێکی گەورەو بەرچاویشیان هەبێت قەت لەگەڵ مانای دەوڵەت و حکوومەتکردندا تەبا نایەتەوە. با بێینەوە رۆژهەڵاتی کوردستان، تەنزیماتی تەوحید و جیهاد کێ ئەمیرایەتی دەکرد و کەی دامەزراو پێوەندیی لەگەڵ گروپەکەی زەرقاویدا چۆناوچۆن بوو و چ ئەرك و بەرپرسایەتییەکی بۆ دیاری کرابوو؟**

پرسیارەکەتان دوو بەشە کە بەشی یەکەمی رای خۆتانەو پێوەندیی بە وەڵامی پرسیارەکەی پێشووەوە هەیە. بەڵام رای من پێچەوانەی راکەی ئێوەیەو نەك من بەڵکوو بەڵگە مێژووییەکان راکەی ئێوە رەت دەکەنەوە. هەر ئەو کتێبەی لە پرسیاری پێشوودا ئاماژەتان پێ دابوو و وەك بەڵگە هێنابووتانەوە واتە کتێبی (اعلام الانام بمیلاد دولة الاسلام فی العراق) کاتێك باس لە حکوومەتەکانی هاوشێوەی دەوڵەتی ئیسلامیی عێراق دەکا، وەك یەکەم نموونە ئاماژە بە دەوڵەتی مەدینە ئەدات کە لە لایەن پێغەمبەری ئیسلامەوە (سڵاو و دروودی خوای لێ بێ) سەرپەرشتی دەکرا. ئەم دەوڵەتە کە بە یەکەم دەوڵەتی ئیسلام لە مێژوودا دادەنرێت، لەگەڵ هەبوونی چەند هۆزێکی گەورەی یەهوودیدا لە مەدینە (یەسرب)، دیسان بەردەوام بوو و ئەم هۆزانە نەیانتوانی ببنە لەمپەر لە بەردەم دامەزرانیدا. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە موسوڵمانەکان بە موهاجیر و دوو هۆزە ئەنسارەکەیشەوە ژمارەیان زۆر کەم بوو. بەڵام دیسان بەو ژمارە کەمەو بەو هەموو کێشەو گرفتەوە کە هەیانبوو، توانییان سەرکەوتنی گەورەی وەك «بدر» و «اُحُد» تۆمار بکەن و لە هەلومەرجێکی دژواری تردا غەزای پیرۆزی «خندق»یشیان بە سەرکەوتوویی ئەنجام دا. بە گشتی لەو سەردەمەدا ئیسلام تووشی دەیان کێشەو گرفت بووبوو بەڵام هەموو ئەمانە نەیانتوانی پێش بە بەدەسەڵات گەیشتنی موسوڵمانان و راگەیاندنی حکوومەتی ئیسلامی بگرن و نەبوونە هۆی پاشگەزبوونەوەی موسوڵمانان لەو بریارەی کە دابوویان.

ئەگەر مەبەستتان بەرتەسکبوون و بچووکی رووبەر و ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئەم دەوڵەتە ئیسلامیانەشە، خۆ لە دونیادا چەندین دەوڵەت هەیە کە لە باری قەبارەی خاك و ژمارەی دانیشتوانەوە زۆر زۆر بچووکن بەڵام خاوەن دەسەڵات و حکوومەتی خۆیشیانن. مالت، کومۆر، موریس، گامبیا، دومینیکا، کۆزۆۆ، مونتنەگرۆ و بەحرەین ئەو دەوڵەتانەن کە لە رووبەرێکی تەسك و بچووکدا دەسەڵات بەرێوە ئەبەن کە بە قەدەر چارەکێکی سنووری دەسەڵاتداریی ئەنسارولئیسلام نابن چ بگات بە رووبەری چالاکی تاڵەبان و دەوڵەتی ئیسلامیی عێراق. هەروەها لە رووی ئابووریشەوە رێکخراوێکی وەك

ئەنسار یاخود دەوڵەتی ئیسلامیی عێراقی توانای بەخێوکردنی هەندێ لەم وڵاتانەیشی هەیە بە مەرجێك دەرامەت و سامانەکەیان خەرجی جەنگ و جیهاد نەکەن. ئەگەر لە رووی سیاسەت و بەرنامەو هەستی باوەڕبەخۆبوونیشەوە سەیر بکەین ئەبینین ئەگەر هەموو دونیا بە موسوڵمان و ناموسوڵمانەوە بە لایەکدا چووبن کە پێچەوانەی بیروباوەڕی ئەوان بێت، ئەوا بزاڤی ئیسلامخوازی بە تایبەت سەلەفییەتی جیهادی بە بێ دڵەڕاوکە بە لایەکی تردا ڕۆیشتووەو سووربووە لە سەر ئەو شتەی باوەڕی پێی بووەو بە سەدان و بگرە هەزاران کەس لەم پێناوەدا کوژراون یان تووشی زیندان و ئەشکەنجەو هیجرەت هاتوون. جا هەرچەند دەسەلاتەکەی ئەنسار و دەوڵەتەکەی ئەلقاعیدە لە عێراقدا زیاتر وەك دەسەڵات و دەوڵەتی سێبەر وابوون و بە شاراوەیی کاریان کردووە بەڵام ئەمە بەو مانایە نییە دەسەڵاتیان نەبووبێ یان دەسەڵاتیان نەبێ. وەك ئاگادارین، هەیمەنەو هەیبەت و چالاکی ئەنسار و ئەلقاعیدە لە عێراق و تاڵەبان لە ئەفغانستان، بە رادەیەك بووەو بە رادەیەکە کە کاریگەری لە سەر هەموو بوار و بەرنامەکانی ئەم وڵاتانەو کار و کردەوەی دەسەڵاتە ناشەرعییەکانیان داناوە. هەرچەند ئەوان واتە ئەنسار و ئەلقاعیدە نەیانتوانیوە حوکمی شەرع لەم وڵاتانەدا پیادە بکەن بەڵام زیاتر لە دەسەڵاتە ناشەرعییەکان کاریگەرییان لە سەر دەسەڵات و دانیشتوانی ئەم وڵاتانە داناوە. زۆرجار رووی داوە دانیشتوانی شارێك یان ناوچەیەکی عێراق و ئەفغانستان زیاتر لەوەی گوێڕایەڵی دەسەڵاتە ناشەرعییەکان بن پەنایان بۆ دەسەڵاتی شەرعی ڕێکخراوە ئیسلامییەکان بردووەو کاروباری خۆیان بە پێی بەرنامەی ئەوان ڕاپەڕاندووە. هەروەها لەو ناوچانەشدا کە دەسەڵاتی موجاهیدین زۆرتر بووە، هێزەکانی سەر بە دەسەڵات نەك نەیانتوانیوە حوکم بە دەستوورات و بەرنامەکانی خۆیان بکەن بەڵکوو زۆرجار نەیانتوانیوە خۆیان لە قەرەی ئەو شوێنانەش بدەن و ئەمەش ئاماژەیە بۆ زاڵبوونی ئەو دەسەڵاتە شەرعییەی کە ئێوە حاشاتان لە بوونی کردووەو وتووتانە ئەمە مانای حکوومەتکردن نادات.

بابەتێکی گرنگی تر کە باسکردنی بە پێویست ئەزانم ئەوەیە کە هەم بزووتنەوەی تاڵەبان و هەمیش ڕێکخراوی قاعیدەو ئەنسارولئیسلام و دەوڵەتی ئیسلامیی عێراق خۆیان لەو حاڵەتە کۆنەی کاری ڕێکخراوەییدا قەتیس نەهێشتۆتەوەو بەردەوام هەوڵیان داوە لە بوارەکانی عەسکەری و ئەلکترۆنی و تەکنۆلۆجیادا خۆیان بە ئەزموونتر و دەوڵەمەندتر بکەن. بۆیە هاوکات لەگەڵ پێشکەوتنەکانی بەرەی کوفردا ئەوانیش هەوڵی بەرەوپێشچوونیان داوەو ئەمەش لە لایەك چۆنایەتی کار و چالاکییەکانی ئەوانی بردۆتە سەرەوەو لە لایەکی تریشەوە بۆتە هۆی پووچەڵکردنەوەی پیلان و بەرنامەکانی دوژمنان لە لایەن ئەوانەوە.

بە نیسبەت ڕۆژهەڵاتی کوردستانیشەوەو دروستبوونی ڕێکخراو یاخود کەتیبەیەکی سەر بە تەوحید و جیهاد لەوێ، ئەتوانم بڵێم ئەم ڕێکخراوە یان ئەم کەتیبەیە سەرەتا وەك لقێکی ڕێکخراوی تەوحید و جیهاد دامەزراو دەستی بە کار کرد. ئەڵبەت فەتحییەکان پاش جیابوونەوەیان لە ئەنسار، بوونە بەشێك لەو هێزەی کە بە تێکەڵبوون لەگەڵ گروپەکەی ئەبوو مەسعەب ڕێکخراوی تەوحید و جیهادیان پێك هێناو هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا لقێکی ئەم ڕێکخراوە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە هەمان ناوەوە واتە بە ناوی تەوحید و جیهادەوە دامەزرا. پاش پەیوەستبوونی تەوحید و جیهاد بە ڕێکخراوی ئەلقاعیدە، تەوحید و جیهادی کوردستانی ئێرانیش ناوی خۆی گۆڕی بۆ (كتائب القاعده فى الكردستان).
ئەم دەستەیە سەرەتا لە لایەن کاك عومەر بازیانییەوە سەرپەرشتی دەکران و پاشان هێمن بانیشاری وەك ئەمیری ئەوان دیاری کرا، دواتر «ئەبوو ئەحمەد»ناوێك کە خەڵکی دەوروبەری سلێمانی بوو و پاشانیش «ئەبوو ئەسعد »ی سلێمانی و «حاجی عارف / سوارە موحەممەد» شارباژێڕی ئەمیرایەتی ئەم گروپەیان کردووەو دوای ئەوانیش کەسێکی تری خەڵکی کوردستانی عێراق بۆتە ئەمیری گروپەکە. فەتحییەکان سەرەتا لە مانگی ٦ی ساڵی ٢٠٠٣دا مەسەلەی جیابوونەوەیان لە ئەنسار خستە بەرباس و لە مانگی ٩ی ٢٠٠٣دا بە تەواوی جیابوونەوەی خۆیان ڕاگەیاند و دواتریش ناوی گروپەکەی خۆیانیان ئاشکرا کرد.

بە نیسبەت پێوەندیی ئەوانیشەوە لەگەڵ زەرقاوی، هیچ گومانی تیادا نییە ئەم پێوەندییە پێوەندیی بەیعەت و ئەمیر و مەئموور بووەو ئەوان بە هەموو شێوەیەك رازی بەم کارەیان بوون و ئەبوو مەسعەبیان بە ئەمیری خۆیان زانیوە. ئەوان بە ئاستێکی زۆر لەوەدا سەربەست بوون کە چۆناوچۆن بە گوێرەی راوێژ لەگەڵ ئەمیر و بەرپرسانی خۆیان، کارەکانیان بە ئەنجام بگەیەنن و سیاسەت و بەرنامەکانی ئەلقاعیدە پیادە بکەن.

**ئەو ئەمیرانەی ناوت هێناون هەر کامەو ماوەیەك ئەمیرایەتی رێکخراوەکەیان کرد و ئینجا وازیان هێنا یان لە سەر کار لابران. لە لایەکی ترەوە هەندێ لەوان دواتر لە لایەن ئێرانەوە دەستگیر کران و حوکمی قورسیان بەسەردا سەپا. ئەو ئەمیرانە هەر کامە بە ماوەی چەند مانگ یان چەند ساڵ ئەمیرایەتییان کرد و لە بەرچی لە سەر کاری ئەمیرایەتی نەمان؟ جیا لەمە کەمێك بە وردی ئەرك و کردەوەکانی ئەم گروپەمان لەم چەند ساڵەی رابردوودا بۆ شی بکەرەوە.**

سەبارەت بە ئەمیرایەتیکردنی ئەو کەسانەو ماوەی ئەمیرایەتی کردنیان و هۆکاری لە سەر کار لاچوونیان ئەتوانم بڵێم هەموو ئەم شتانە پێوەندییان بە کاروباری ناوخۆی رێکخراوەکەوە بووەو بە نیسبەت لاچوونیشیانەوە لە ئەمیرایەتی، جگە لەوانەیان کە لە لایەن حکوومەتی ئێرانەوە دەستگیر و رەوانەی زیندان کراون ئەوانی تر بە پێی کاروبار و بریاراتی رێکخراوەکە وازیان لە ئەمیرایەتی هێناوە. وەك ئەرك و بەرپرسایەتیش ئەوەندەی پێوەندیی بە کوردستانی ئێران و وڵاتی ئێرانەوە بە گشتی هەیە، ئەوان هەر لە سەرەتاوە بانگەوازێکی بەربڵاویان لەم ناوچەیەدا دەست پێ کرد و توانیویانە لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا خەڵکێکی زۆر بە رێکخراوەکەیانەوە پەیوەست بکەن. هەر لەم رووەیشەوە توانیویانە بە شێوەی نهێنی و پەنامەکی ژمارەیەکی زۆر موجاهید رەوانەی بەرەکانی جیهادی عێراق و ئەفغانستان بکەن و جگە لەوەش لە ساڵانی یەکەمی دروستبوونیشیدا، موجاهیدینی کەتائب لە سنوورەکانی نێوان کوردستانی عێراق و کوردستانی ئێران چەندین چالاکییان بەرێوە برد کە ئەتوانین وەك نموونە ئاماژە بە چالاکییەکانی: هەڵاڵاوا، کانی خان، سیاگوێز، گومرکی باشماخ، ئالیاواو ناوچەی تاوگۆزی بکەین. بە نیسبەت مەجالی کارکردنیشیانەوە لە کوردستانی ئێران، ئەوان لە لایەك لە هەندێ بواردا لە لایەن حکوومەتی ئێرانەوە بەربەستیان بۆ دانراوەو سەرکردەکانیان راپێچی زیندان کراون و لە لایەکی تریشەوە ئەندام و کادێرەکانیان لەگەڵ مەترسی تیرۆری حزبە عیلمانییەکان رووبەڕوو بوونەتەوە کە وەك نموونە ئەتوانم ئیشارەت بە تیرۆری «موحەممەد عارف کوردستانی» و «بێستوون»ی برای عوبەید سەید سادقی و «سوهەیب هەورامی» و «مادێحی عەلی مەلا» کە بریندار بوو و «تەیب»ی کوڕی مەحموود پیرسەفایی و «ئەنوەری ئەشکاوەند»ی ژنبرای و پاشان کوژرانی «حاجی سەعدی شیرزاد» کوڕی ئیمام جومعەی مەریوان، «کەریم کۆنەپۆشی» کوڕی شێخ رەزای بابەوەو «هادی شیرزاد» بدەم کە هەموو ئەمانە لە ماوەی چەند ساڵدا لە شاری مەریوان تیرۆر کراون. جا هەرچەند باش ئاگاداری کاری رێکخراوەیی ئەم کەسانە نیم جگە لە بێستوون کە یەکێك بوو لە کادێرەکانی کەتائب، بەڵام بێگومان هەموویان لە سەر حیسابی رێکخراوە سەلەفییەکان و لە لایەن حزبە عیلمانییەکانەوە تیرۆر کراون.

کەتیبەکانی کوردستان لە ماوەی ساڵانی رابردوودا تووشی چەند لەتبوون و جیابوونەوەیەك هاتووەو هەر بەم هۆیەشەوە هەندێ لە جیابووەکان کە سیاسەتی دژایەتیکردنی ئێرانیان گرتبووە پێش، لەم یەك دوو ساڵەی دواییدا تووشی گرتن و راونان هاتوون و پاشان لە نێوان ئەوان و هێزەکانی ئێراندا شەڕ و پێکادانی عەسکەریش هاتۆتە ئاراوەو جگە لە کوژرانی ژمارەیەك لە هەردوولا، ژمارەیەك لە ئەندامە گیراوەکانی ئەم گروپانەش لە لایەن دادگاکانی ئێرانەوە سزای ئێعدامیان بەسەردا سەپاوەو تەنانەت کەسیشیان لێ ئێعدام کراوە. سەرباری ئەم جیابوونەوەو کوژران و پێکادان و

گیرانانه به تایبەت چاودێریکرانی وردی ئەوان لە لایەن دەزگا ئەمنییەکانی ئێرانەوە، کەتیبەکانی کوردستان ڕۆژ بە ڕۆژ پێشکەوتنی زیاتری بەخۆیەوە بینیوەو زیاتر گەشەی کردووە. ماوەتەوە بڵێم بە پێچەوانەی هەندێ گروپی جیابۆوەوە کە ڕاستەوخۆ جیهادیان دژی ئێران ڕاگەیاندووە، کەتیبەکانی کوردستان حاڵەتی خۆ متکردنی بەخۆوە گرتووەو درێژەی بە کاری دەعوەت و بانگەواز داوە لە ناو سوننەکانی ئێراندا. کەتائب وەك موبایەعی ڕێکخراوی قاعیدە لەو باوەڕەدان نابێ شەڕ لەگەڵ حکوومەتی ئێراندا بکرێت و لانی کەم لە هەلومەرجی ئێستادا جیهاد کردن دژی ئەم دەسەڵاتە بە پێویست نازانێت و باوەڕی بە دواخستنی ئەم جیهادە هەیە. سەرەڕای ئەمەش کردەوەی گروپە جیابووەکان کاریگەری لە سەر کار و چالاکی ئەمانیش داناوە بەڵام بە هۆی زۆربوونی ڕێژەی ئەندامان و گەورەبوونی قەبارەکەیانەوە هەموو ئەم بەربەست و چاودێریانە نەیتوانیوە دایان بمرکێنن.

**کەوایە ئەتوانین بڵێین ئەرکی سەرەکی (کتائب) جیهادکردن بوو یاخود جیهادکردنە دژی حکوومەتی کوردیی باشووری کوردستان و وەك خۆیشت ئاماژەت پێکردووە لە هەمان سەرەتای دامەزرانییەوە چەندەها چالاکی و کاری جۆراوجۆری چەکدارانەی لەو بەشەی کوردستاندا ڕاپەڕاندووە کە ڕەنگە گرنگترینیان تیرۆری ئاتاکامی مەلا بەختیار - ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکیەتی نیشتمانی- لە ساڵی ٢٠٠٥دا بووبێ کە بە دیارترین چالاکیی کەتائب لە باشووری کوردستان ئەژمار دەکرێت. بە گشتی شێوازی چالاکییەکانی کاتایب چۆن بوو و بۆچی دواتر ئەمجۆری چالاکیانە ڕاگیرا؟ هەروەها بەڕای جەنابت ئەو هۆکارەکانەی بوونە هۆی تیرۆرکرانی مەلا بەختیار کامانە بوون؟**

ڕاستە، ماوەیەکە کەمتر لە ناوچە سنوورییەکانی کوردستانی عێراقدا چالاکی بەڕێوە ئەبەن بەڵام ئەمە مانای ڕاگرتنی چالاکییەکانی ئەوان دژی حکوومەتی هەرێم نادات. من لەو باوەڕەدام کەتیبەکانی کوردستان ئێستاش جیهاد دژی دەسەڵاتی کوردی لە کوردستانی عێراق بە گرنگترین ئەرکی خۆی ئەزانێ و یەکێك لە هۆکارەکانی ڕاوەستان یان کەمبوونەوەی چالاکییەکانی ئەم ڕێکخراوە لە کوردستانی عێراق، داخرانی سنوورەکانە هەم لە لایەن ئێرانەوەو هەمیش لە لایەن حکوومەتی هەرێمەوە. جا ئەوەندەی من بیستوومەو ئاگادارم ئێستاکە هاتووچۆکردن بەم سنوورانەدا نەك سەخت و دژوار بەڵکوو ئاومکینەو ئامێرەکانی چاودێری و کامێراکان بە ڕۆشنی و تاریکیدا هەموو جموجوولێکی سەرسنوور تەنانەت جموجوولی حەیواناتیش تەجیل دەکەن. بۆیە لەم ساڵانەی دواییدا زیاتر جیهادی ئەفغانستانیان بەلاوە گرنگ بووەو بەشدارییان تیادا کردووە چونکوو ناردنی موجاهید بۆ ئەفغانستان و گەڕانەوەی موجاهیدەکان لەم وڵاتە زۆر ئاسانەو جگە لە سنوورەکانی ڕۆژهەڵاتی ئێران کە هاتووچۆکردن پیایاندا ئاسانە وڵاتی پاکستانیش توانای کۆنترۆڵکردنی سنوورەکانی خۆی هەم لەگەڵ ئێران و هەمیش لەگەڵ ئەفغانستاندا نییە. هەروەها جیهادییەکانی کەتائب ئەتوانن بۆ ماوەیەکی زۆر لە خاکی ئەفغانستان و لە ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی تاڵەباندا بمێننەوە.

لە پێوەندیی لەگەڵ شێوازی چالاکییەکانی کەتائبیشدا لە کوردستانی عێراق ئەتوانم بڵێم شێوازی جیهادکردنی ئەوان بە شێوەیەك بووە کە ڕەبایەو کاروانی هێزەکانی پێشمەرگەو پۆلیس و حەرەس حودوود بکەنە ئامانج و ئەم کارەشیان زیاتر لە ڕێگای بۆسە نانەوەو هوجووم کردن یاخود بە هۆی دانانی مین و بۆمبەوە ئەنجام داوە. هەروەها هەندێ جاریش پەنایان بۆ کردەوەی ئێستشهادی بردووە کە جگە لە تیرۆرە ناسەرکەوتووەکەی مەلا بەختیار ئەتوانم ئاماژە بە تیرۆری ئەنوەری حاجی عوسمان بەرپرسی ئاسایشی هەڵەبجە بکەم کە لە لایەن سریەی شەهید هێمن بانیشاری کەتائبەوە ئەنجام درا. مەبەست لە گرتنەبەری ئەم شێوازی کارکردنەش ئەوە بووە کە خەڵکانی ئاسایی پێوە نەبن و زیانیان بەر نەکەوێت.

به نیسبەت هەوڵی تیرۆرکردنەکەی مەلا بەختیارەوە کە بە هۆی تەقینەوەی ئیستیشهادییەوە ئەنجام درا، ئەوەندەی ئاگادارم و بەدواداچوونم بۆ کردووە، کەتائب بە شێوەیەکی زۆر تایبەت ئەویان لە ناو ئەو هەموو بەرپرس و سەرکردەیەی یەکێتیدا هەڵبژاردبوو. مەلا بەختیار لە ناو حزبێکی سیکۆلار و عیلمانیی وەك یەکێتی نیشتمانیدا کە بە دژە ئیسلام ناسراوە، زیاتر لە بەرپرسانی تری ئەم حزبە دژایەتی ئیسلامی کردووەو بە ئاشکراش ئەم کارەی کردووە نەك بە شاراوەیی. ئەو هەم وەك ئەندامی مەکتەب سیاسی و گەورە بەرپرسێکی یەنەك و هەم وەك نووسەرێك و هەمیش وەك بەرپرس و بەڕێوەبەری دەزگایەکی وەك رێکخراوە دیموکراتییەکان ، زۆرترین توانای خۆی بۆ دژایەتیکردنی بیروباوەڕی ئیسلامی بەکار هێناوەو بە هەموو شێوەیەك هەوڵی کپکردنی ئیسلامییەکان تەنانەت ئیسلامییە میانڕەوەکانیشی داوە. ئەو هەمیشە زیاتر لە هاوحزبیەکانی خۆی و بەرپرسانی تری یەنەك، پشتگیری سیاسەتە دژە ئیسلامییەکانی یەکێتی نیشتمانی کردووەو تەنانەت بەشی زۆری ئەو سیاسەت و بەرنامانە پێشنیاری ئەم پیاوە ناموبارەکەن. تەنانەت زیادەڕۆیی مەلا بەختیار لە دژایەتیکردنی سەرسەختانەی بیروباوەڕی ئیسلامیدا، بۆتە هۆی ریسوابوونی ئەو لەناو جەماوەردا تەنانەت لەناو خودی ئەندامان و لایەنگرانی یەکێتیشدا. ئەو بە هۆی رێکخراوە دیموکراتییەکانەوەو بە ناوی چەسپاندنی کەلتووری دیموکراسییەت لە کۆمەڵگای کوردیدا، ئەوەی ناوی دژایەتیکردنی ئیسلام بووە کردوویەتی و کتێب و گۆڤار و رۆژنامەکانی ئەم دەزگایەی بۆ ناشیرینکردنی سیمای ئیسلام و موسوڵمانان و شێواندنی مێژووی ئیسلام تەرخان کردووە. بۆ نموونە کتێبە قیزەون و پڕچنێوەکەی مەریوان هەڵەبجەیی مورتەد بە پشتیوانی ملا بەختیار و لە لایەن دەزگاکەی ئەوەوە لە چاپ دراوەو تەنانەت باسی ئەوەش ئەکرێ گۆیا مەریوان ئەم کتێبەی بە پێشنیاری مەلا بەختیار نووسیوە. هەروەها بینیمان پاش بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبە کاتێ کە جەماوەری موسوڵمان رژانە سەر شەقامەکان و خوازیاری سزادرانی مەریوان هەڵەبجەیی بوون، چۆناوچۆن مەلا بەختیار ئەوی رەوانەی وڵاتێکی ئەورووپایی کرد. ئەمە تەنیا یەك لەو هەزاران هەوڵە دوژمنکارانەیەی مەلا بەختیار و دەزگاکەی و چڵکاوخۆرەکانی دەورووبەریەتی دژ بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام و موسوڵمانان. هەروەها مەلا بەختیار کەسێکی نزیك لە رۆژئاواو گرێدراوی کەلتووری رۆژئاوایەو لە هەوڵدایە تاکوو ئەم کەلتوورە بێنێتە کوردستانەوە، کەلتوورێك کە پڕە لە بەرەڵایی و رووت و قووتی و دیاردەی دژە ئیسلامی. بۆیە ئەمانە هەموو هۆکار بوون بۆ ئەوەی رێکخراوێکی سەلەفی جیهادی وەك کەتائب هەوڵی تیرۆرکردنی ئەو بدات. ئەڵبەت ئەنجامدانی ئەو چالاکییە لە شاری سلێمانی کە سەنتەری دەسەلاتی یەکێتی و دووهەم شاری گەورەی کوردستانە، هەڵگری ئەو پەیامە بوو کە پاش نەمانی ئیمارەتی بیارەش ئیسلامییەکان لە توانایاندایە لە ناوەندەکانی دەسەلاتی پارتی و یەکێتیدا چالاکی گەورە بەڕێوە ببەن هەروەك چۆن پێشتر لە شاری هەولێریش ئەم کارەیان کردبوو. ئەمە لە لایەك نیشانەی لاوازی دەسەلاتەکەی ئەوان و لە لایەکی تریشەوە نیشانەی زاڵبوونی ئیرادەی خۆ بەخشانەی رۆڵەکانی ئیسلامە بە سەر دوژمنانی ئیسلامدا. ئەڵبەت تیرۆرکردنی مەلا بەختیار لە کۆنەوە واتە لە سەردەمی جوندولئیسلامەوەو تەنانەت پێش تیرۆرکردنی دوکتور بەرهەم، باس و خواسی لە سەر بووەو بیری لێ کراوەتەوە بەڵام بە هۆکاری جۆراوجۆر کوشتنەکەی دوا کەوتووەو بە داخەوە چالاکییەکەی کەتائبیش نەبۆتە هۆی کوژرانی ناوبراو.

مەسەلەی راگرتنی جیهادی کەتایب لە باشووری کوردستان کە تۆ رەدی دەکەیتەوە جێی سەرسووڕمانە، چونکوو ئەم رێکخراوە لەساڵی ۲۰۰۷ و لە دوای شەڕەکەی کانی خانەوە هەموو چالاکییە نیزامییەکانی خۆی راگرت و ئەمەش هاوکات بوو لەگەڵ گیرانی حاجی عارف لە لایەن دەسەلاتی ئێرانییەوەو دەستبەکاربوونی «کەمال قادرکەرەمی» ئەمیری نوێی کەتایب. ئەوەندەی ئێمە ئاگادارین دوای ئەو بەروارەو لە کۆتایی ساڵی ۲۰۱۰دا گەنجێکی سەلەفیی خەڵکی

**گەڕەکی فەیزاوای شاری سنە، لە شاری قەلادزێ چالاکییەکی خۆبەخشانەی ئەنجام داوەو ئیتر دوای ئەمە هیچ چالاکییەکی تر بەڕێوە نەچووە. ئەگەر لەمبارانەوە ڕوونکردنەوەیەکتان هەیە بفەرموون.**

پێم خۆشە سەرەتا دەربارەی چالاکیەکەی کانی خان ئەوەتان پێ بڵێم کە ئەم چالاکییە بریتی بوو لە دانانی کەمین بۆ هێزە عەسکەرییەکانی یەنەك و تیایدا ئۆتۆمۆبیلێکی هێزی «مارینز» یان «حەرەس حودوود» کەوتۆتە بەر تەقەی موجاهیدەکانی کەتائب و سەرجەم سەرنشینەکانی کە وابزانم ژمارەیان شەش یان حەوت کەس بوون، کوژراون. پاشان ئەنجامدەرانی چالاکییەکە لە کاتی خۆ دەربازکردندا لەگەڵ هێزەکانی یەکییەتی تووشی شەڕە تەقە بوون بەڵام سەرەنجام بە سەرکەوتوویی شوێنەکەیان بەجێ هێشتووە. ئینجا بۆیە وتوومە ئەوان تووشی شەڕە تەقە بوون چونکوو مەفرەزەکانی کەتائب تەنیا توانای بەڕێوەبردنی چالاکی کەمین دانان یان هێرشی کوتوپڕ و بە پەلەیان بۆسەر بنکەو ڕەبایەکان بوو نەك جیهادی تەمکین و شەڕی جەبهەیی. هەروەها پێویستە وەك ڕوونکردنەوەش باسی شەڕی ئاڵیاوا بکەم کە لە وەڵامی پرسیاری پێشوودا وەك یەکێك لە چالاکییەکانی کەتائب باسم کردووە. لە ڕاستیدا ئەم شەڕە نەك لە لایەن کەتیبەکانی کوردستانەوە بەڵکوو لە لایەن گروپێکی سەلەفی جیهادیی جیابۆوە لە کاتائب واتە لە لایەن «جیش الصلاحدین»ەوە ئەنجام دراوە، ئەم گروپە لە ڕێنەیەکی ڤیدیۆییدا ئەنجامدەرانی چالاکییەکەی ئاڵیاوای بە سریەی حەسەن سۆفی ناو بردووە. هەروەها گروپی جەیش سەلاحەدین خاوەن چەند چالاکییەکی تریشە وەك چالاکییەکەی گەرمك و چالاکی ناسەرکەوتووانەی دانانەوەی مین لە سەر ڕێگای هێزەکانی یەنەك لە سیاگوێز کە بە هۆی هەڵەیەکەوە مینەکە بە موجاهیدەکاندا ئەتەقێتەوەو دووانیان شەهید دەکات. «سەید ئەنوەر» خەڵکی شاری سەقز و کاك «ڕەزا» خەڵکی کوردستانی عێراق – ڕەزا خوشکەزای یەکێك لەو بارمتانە بوو کە لە کاتی کوشتنەکەی شەوکەتی حاجی موشیردا یەنەك ڕەوانەی لای ئەنسارولئیسلامی کردبوون و لە کاتی هێرشەکانی ئەمریکا بۆ سەر ئیمارەتی بیارە، لە لایەن موجاهیدینی ئەنسارەوە کوژران– پێنج کەس لە موجاهیدەکانی جەیش سەلاحەدینیش لە کاتی گەڕانەوەیاندا بۆ ئێران، لە لایەن هێزە ئینتزامییەکانی ئەم وڵاتەوە دەستگیر کران و دوای حەوت مانگ مانەوە لە زیندان، بە کەفالەت ئازاد کران. پاشان دوو کەسیان بە ناوەکانی کاك «موحەممەد ئەحمەدی» ناسراو بە موحەممەد «سی ان جی» و کاك «موحەممەد زەند کەریمی» ناسراو بە «هێمن» کە هەردووکیان خەڵکی شاری سنە بوون ، بە هۆی ئەگەری دووبارە گیرانەوە خۆیان گەیاندە ئەفغانستان و لە بەرەکانی جیهادی ئەم وڵاتەدا شەهید بوون. هەروەها گروپی جەیش سەلاحەدینیش بە هۆی تێکەڵبوونی بە گروپێکی جیابۆوەی ترەوە، کەوتە ناو شەڕی حکوومەتی ئێران و ئەمیری یەکەمیشیان بە ناوی «ئیسماعیل بادینانی» کە بە ئیسماعیل شکاك ناسرابوو، پاییزی ساڵی ٢٠١٠ بە هۆی تەقەی هێزە ئەمنییەکانەوە لە شاری سنە لەگەڵ موجاهیدێکی خەڵکی ئەم شارەدا بە ناوی «شاهۆ بەستەنی» کوژرا. بۆیە ئەم گروپە فریای ئەوە نەکەوتووە چالاکی زیاتر دژی حکوومەتی هەرێمی کوردستان بەڕێوە ببات.

خاڵی سەیر و جێگای سەرنج ئەوەیە کە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی یەکییەتی هەموو ئەم چالاکیانەیان بە کاری (پاشماوەکانی ئەنسارولئیسلام) ناو دەبرد و نازانم ئەمەیان لە ڕووی نەزانی و نەبوونی زانیارییەوە ئەوت یان بە مەبەستی چەواشەکردنی خەڵك و ئیعتراف نەکردن بەو هێزە تازانە بە تایبەت ئەوەی کە ڕێکخراوی قاعیدە توانیبووی لە ڕێی کەتیبەکانی کوردستانەوە بگاتە سنوورەکانی کوردستان. کاتێك هەواڵی تیرۆرەکەی مەلا بەختیار و تەقینەوە خۆبەخشانەکەی بەردەم وەزارەتی ناوخۆی سلێمانی یاخود لە کاتی تیرۆرکرانی ئەنوەری حاجی عوسمان و چەندین چالاکی تری کەتائب لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی یەکییەتییەوە بڵاو ئەکرایەوە، بەرپرسان و ئەندامانی کتائب زۆریان پێ سەیر بوو ئەنسارولئیسلام وەك بەرپرسیار و ئەنجامدەری ئەم چالاکیانە ناو ئەبرا.

لە پێوەندیی لەگەڵ چالاکییەکەی کانی خانیشدا کە حەوت ئەندامی هێزەکانی مارینزی تیادا کوژرا کە چواریان کادێر و بەرپرس و کەسانی خاوەن پێشینەی ناو یەنەک بوون و دژایەتی راستەوخۆی ئیمارەتی بیارەو هێزە ئیسلامییەکان کردبوو، پێویستە بڵێم راستە ئەمە دوایین چالاکی موجاهیدینی کەتائب لە ناوچە سنوورییەکانی هەرێمی کوردستان بوو بەڵام ئەم چالاکییە پاش دەستگیرکرانی حاجی عارف بەڕێوە چوو نەك پێش دەستگیرکرانی ئەو. ئەنجامدانی ئەم چالاکییەش وەڵامدانەوەیەك بوو بە قسەیەکی جەلال تاڵەبانی کە موژدەی گیرانی سەرکردە سەلەفییەکانی لە لایەن دەسەڵاتی ئێرانییەوە هەروەها موژدەی کۆتایی هاتنی چالاکییە سنوورییەکانی ئەوانی بە ئەندامانی حزبەکەی دابوو.
بۆیە ئەگەر دواتر سستییەك کەوتبێتە جیهادی کەتیبەکانی کوردستانی ئەلقاعیدە دژی حکوومەتی هەرێمی کوردستان و حزبە عیلمانییەکان، ئەمە پێوەندیی بە هەندێ هۆکار و فاکتەری ترەوە هەیە. بۆ نموونە وەك پێشتریش ئاماژەم پێ کرد داخرانی سنوورەکان یەکێك لەو هۆکارانە بوو. هەروەها جیابوونەوەی چەندین گروپ لەم رێکخراوە بە قەبارەی گەورەو ئەندامانێکی زۆر و چەك و چۆڵ و مادەی تەقینەوەوە، کەتائبیان هەم لە باری مرۆیی و هەمیش لە باری ئیمکاناتەوە بەرەو لاوازی برد. ئینجا وەستانەوەی ئەوان (گروپە جیابووەکان) لە بەرانبەر کەتیبەکانی کوردستان داو ئەو کێشەو گرفتانەی لە نێوان ئەوان و کەتائبدا هاتە ئاراوە هەروەها حەساسبوونەوەی حکوومەتی ئێران بە سەلەفییەکان پاش دژایەتیکرانی ئەم دەسەڵاتە لە لایەن ئەو گروپە جیابووانەوە، کاریگەری نیگەتیڤیان لە سەر کەتیبەکانی کوردستانی ئەلقاعیدە بە تایبەت جیهادی ئەوان دژی دەسەڵاتی کوردی باشووری کوردستان دانا. لە کۆتاییدا ماوەتەوە بڵێم تاکوو ئێستا لە سەر رووداوەکەی شاری قەڵادزێ کە وتووتانە گەنجێکی سنەیی بە شێوەی ئیستشهادی بەڕێوەی بردووە شتێکم نەبیستووەو ئەمە یەکەم جارە هەواڵێکی ئاوام پێ ئەگات و ئەمەش دیسان پێوەندیی بەم هەلومەرجە نالەبارەی بەندیخانەوە هەیەو نەبوونی پێوەندیی لەگەڵ دونیای دەرەوەدا.

چالاکییە ناسەرکەوتووەکەی پاییزی ساڵی ۲۰۱۰ی شاری قەڵادزێ لە لایەن گروپێکی دابڕاو لە کەتیبەکانی کوردستانەوە بەڕێوە چوو کە لە لایەن کەسێکەوە بە ناوی «عوسمان شەفیق» ئەمیرایەتی دەکرا. ئەمە یەکەم چالاکی ئەم گروپە بوو بۆ دەسپێکردنی جیهاد دژی حکوومەتی هەرێمی کوردستان کە ئەنجامدەرەکەی گەنجێکی خەڵکی شاری سنە بوو. بەڵام ئەو پێش ئەوەی بگاتە شوێنی مەبەست، لە لایەن پۆلیسەوە تەقەی لێ دەکرێت و پشتێنە تی ئێن تی رێژەکەی دەتەقێتەوەو دەکوژرێت. بڕیار بوو ئەم گروپە بە ناوی «التوحید و الجهاد فی الکردستان»ەوە دەست بداتە جیهاد دژی حکوومەتی هەرێم و حیزبە کوردییەکانی باشووری کوردستان و بەو مەبەستەش بەرنامەی پێوەندیکردنیان بە دەوڵەتی ئیسلامیی عێراقەوە دانابوو. لە کاتێکدا ئەوان خۆیان ئامادە دەکرد تاکوو مەفەرەزە چەکدارەکانیان رەوانەی خاکی هەرێمی کوردستان بکەن، لە مانگی ۱۲ی ۲۰۱۰دا بەشێك لە ئەمیر و فەرماندەکانیان لە شارۆچکەی جووجەسازی مەریوان لە لایەن هێزەکانی وەزارەتی ئیتلاعاتەوە دەستگیر کران و پاشان دەست بە سەر حەشارگەیەکی چەك و تەقەمەنی ئەواندا گیرا کە لە ناوچە سنوورییەکانی مەریوان و هەرێمی کوردستان. عوسمان شەفیق، «حەسەن چەمچەماڵی» و «ئەرکان سەرپێلی» سیان لە گیراوەکان بوون و دواتریش «مەلا عەلی کەرەمی» خەڵکی سەقز – مەلا عەلی ئەندامی پێشووی کەتایب و جەیش سەلاحەدین – و چەند کەسێکی تریان لێ دەستگیر کرا. بەڵام «مادێحی عەلی مەلا» واتە مادێح خورماڵی یەکەم کەسی سەر بەم گروپە بوو کە کۆتاییەکانی هاوینی ۲۰۱۰ ی زایینی لە شاری سنە دەستگیر کرابوو. ئەمانە بوونە هۆی ئەوە کە ئەم گروپە هەر لە سەرەتاوە پەکی بکەوێت و جگە لەو چالاکییەی ئاماژەمان پێدا نەتوانی چالاکیی تر بەڕێوە ببات. چەند ئەندامێکی ئەم گروپە بە ئێمەیان وت ئەوان بە تەمابوون مەفرەزەی چەکدار

رەوانەی قوڵاییەکانی هەرێمی کوردستان بکەن تاکوو لەوێوە چالاکی دژی هێزە کوردییەکان و دەسەڵاتی کوردی بەڕێوە ببەن و تەنانەت باسی ئەوەیان دەکرد گۆیا بەرنامەی دابەزینە ناو شارو شارۆچکەو گوندەکانیشیان بووە.

**با بێینەوە سەر باسەکە، کەتایب بەشێك بوو یان بەشێکە لە دەوڵەتی ئیسلامیی عێراق، ئەم وابەستە بوونە تا چەند لە سەربەخۆیی بڕیار و کارکردنی کەتایبدا دەوری گێڕاوە؟ بە گشتی شێوازی کارکردنی ئەم گروپە بە چ شێوەیەکە؟**

سەرەتا سوپاستان ئەکەم بۆ ئەو زانیاریانەی لە سەرەتای پرسیارەکەدا دەربارەی ئەو گروپە باستان کردووە. کەتائب لە پۆلێنکردنی دەستەو گروپەکانی سەر بە رێکخراوی ئەلقاعیدەدا لەو گروپانەیە کە زیاتر وەك ویلایەتێکی سەربەخۆ کاروباری خۆی رائەپەڕێنێت و ئەمەش لە ئیسلامدا تازە نییەو شتێکی کۆنە. بۆ نموونە خەلیفەمان عومەر (خوای لێ رازی بێ) کاتی خۆی بە مەبەستی بەرامبەرکێ کردنی رۆمییەکان دەسەڵات و ئیختیاری تەواوی داوەتە عەمری کوڕی عاص (خوای لێ رازی بێ) لە میسر. بۆیە عەمر بۆ کارێکی گرنگ نەبوایە سەردانی لای خەلیفەی موسوڵمانانی نەدەکرد و ئەوی سەرقاڵ نەئەکرد. ئەو بە پێی ئەو دەسەلات و ئیختیارانەی کە پێی درابوو و بە شێوەی سەربەخۆ جەنگی رۆمییەکانی دەکرد و کاروباری کۆمەڵایەتی ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆی بەڕێوە ئەبرد. ئەڵبەت رەنگە خودی کەتائب باوەڕی بە راگەیاندنی ئەم شتە نەبێت بەڵام من وەك کەسێکی نزیك لە رووداوەکان و بە پێی ئەو ئاشنایەتییەی لەگەڵ ئەوان و شێوازی کارکردنیاندا هەمە، پێوەندیی کەتائب و ئەلقاعیدە ئاوا ئەبینم.

لە ناو رێکخراوە سەلەفی جیهادییەکاندا کاتێ مەسەلەی بەیعەت دێتە ئاراوەو گروپێك ئەبێتە موبایەعی گروپێکی تر ئیتر ئەوان لە رووی ئەو مەنهەج و بیروباوەڕە هاوبەشەوە کە هەیانە ئەکەونە هاوکاری کردنی یەکتر و گروپی موبایەع لە چوارچێوەی ئەو مەنهەجە هاوبەشەو سیاسەت و بەرنامەکانی گروپی گەورەترداو بە پێی هەلومەرجی ئەو شوێنەی کە تیایدایە، کار و ئەرکەکانی خۆی بەڕێوە ئەبات. هەروەها گروپی گەورەتریش لە هەمان رووەوە دەسەڵات و ئیختیاری پێویست ئەداتە گروپە بچووکەکە. بێگومان لە نێوان کەتیبەکانی کوردستان و رێکخراوی ئەلقاعیدەشدا ئاوەها پێوەندییەك هەیە.

هەروەها کتائب بۆخۆیشی خاوەن هەندێ دەزگاو لیژنەی تایبەتە کە پێکهاتوون لە خەڵکانی دونیادیتوو و بە ئەزموون و شەرعزان و ئەوان لە سەرەوە چاودێری کاروباری ئەندام و کادیرەکانی رێکخراوەکە دەکەن و بە پێی هەلوومەرجی کوردستان پلان و بەرنامەکانی خۆیان دائەرێژن. بۆ نموونە ئەوان لەو باوەڕەدان لە هەلومەرجی ئێستادا نابێ دژایەتی حکوومەتی ئێران بکەن، لەو باوەڕەدان پێویستە لە کوردستانی ئێراندا لە رێگای بانگەشەو دەعوەتەوە کار بۆ گشتگیرکردنی بیروباوەڕی سەلەفییەتی جیهادی بکەن و.....هتد. بۆیە کاتێك گروپەکانی جووتیار والی عەلی، جەیش سەلاحەدین و جەیش سەحابە پاش جیابوونەوەیان لە کەتائب، جیهادیان لە دژی ئێران راگەیاند، بەرپرسان و ئەندامانی ئەم رێکخراوە بە هەموو شێوەیەك هەوڵی پاشگەزکردنەوەی ئەوانیان ئەداو داوایان لێ ئەکردن هەلومەرجەکە لە خۆیان و لە ئەوانیش تێك نەدەن.

**بە پێی ئەوەی کە ئەم بەشەی باسەکەمان هەم بۆ ئێمەو هەم بۆ تۆو هەم بۆ خوێنەران هەڵگری گرنگایەتییەکی تایبەتە، ئەخوازێت بە شێوەیەکی وردتر وەڵامی پرسیارەکان بدەیتەوە. چونکوو ئاشکرایە لە رووی زەمەنەوە ئەم رێکخراو و رووداوانە نزیکترین مەودایان بە ئێستای ئێمەوە هەیەو تا ئێستایش ئامادەی ساحەی کۆمەڵایەتیی ئێمەن. بۆ نموونە خوێنەر پێویستی بەوەیە زانیاریی و وردەکارییەکی زیاتر دەربارەی شکڵی رێکخراوەیی و بەش و لق و کۆمیتەکانی کەتایب بزانێت. دیارە لە سەرەتای دروستبوونی کەتایبەوە هەوڵێکی چڕوپڕی تەبلیغییان دەست پێکرد و ئەمەش بووە**

**هۆی پەیوەستبوونی دەیان کەس بە ڕیزەکانی لقی ئەلقاعیدەی ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە. بە ڕای تۆ ئەو فاکتەر و هۆکارانە چی بوون کە سەلەفییەتیان لەم بەشەی کوردستاندا پەرە پێ داوە؟**

لە سەرەتادا ئەمەوێ باسی ئەوە بکەم کە گەشەسەندنی سەلەفییەت لە کوردستانی ئێران تەنها پەیوەست بە ئەلقاعیدەو کەتائیبەوە نییەو خەڵکانی تر بۆ نموونە ڕێکخراوی ئەنسارولئیسلامیش دەورێکی بەرچاویان لە گەشەکردنی سەلەفییەت لە وڵاتی ئێران بە تایبەت لە ناوچە کوردییەکەیدا هەبووە. ئینجا ئەگەر لەم کارەدا دەوری ئەنسار زیاتر لە کەتائیب نەبووبێ ئەوا هیچی لەو کەمتر نەبووە. بە نیسبەت ئەوەیشەوە کە وتووتانە ئەلقاعیدە لە کوردستانی ئێراندا چوونەپێشکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیوە، ڕاستەو تەئیدی قسەکەتان دەکەم بەڵام بە پێچەوانەی ئێوە کە وتووتانە (دەیان کەس بە ڕیزەکانی لقی ئەلقاعیدەی ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە پەیوەست بوون) من ئەڵێم نەك دەیان کەس بەڵکوو سەدان و هەزاران کەس لە کوردستانی ئێران بوونەتە موبایەعی ئەلقاعیدە. من ئەو قسەیە بە بەرپرسایەتییەوە دەکەم و مەبەستم ئەوە نییە کەتائیب لە بەرانبەر لایەنێکی تر بۆ نموونە لە بەرانبەر ئەنسارولئیسلامی ئێراندا گەورەتر و پڕ لایەنگرتر نیشان بدەم چونکوو ئەم ڕێکخراوەش خاوەن ئەندام و لایەنگرێکی زۆرەو وەك باسم کرد لەمبارەوە شتێکی لە کەتائیب کەمتر نییە. ئەڵبەت کەتائیب لە سەرەتادا خاوەن ئەم ڕێژە زۆرەی ئەندام و لایەنگر نەبوو، لە سەرەتاکانی دامەزرانی ئەم ڕێکخراوەدا ئەبوو عومەر بەغدادی سەرۆکی یەکەمی دەوڵەتی ئیسلامیی عێراق، عەبدولجەبار هەولێری (دووهەم) وەك نوێنەری خۆی ڕەوانەی کوردستانی ئێران کرد تاکوو لە نزیکەوە چاوی بە بەرپرسانی کەتائیب بکەوێ و پاشان دەربارەی کێشەو گرفتەکانی ئەوان و ژمارەی موجاهیدە ئامادەکانیان ڕاپۆرتێکی بۆ بباتەوە. جا بە هەر هۆیەك بوو بەرپرسانی کەتائیب وایان بە باش زانیبوو ژمارەی موجاهیدە ئامادەکانیان بە زیاتر لە هەزار نەفەر باس بکەن. بۆیە پاش ئەوەی ئاگاداری ئەم کارەیان بوو، ئەنسار ڕەخنەی توندی لە سەرکردایەتی کەتائیب گرت و پێی وابوو ئەبوایە لە باتی هەزار نەفەر، سەد نەفەریان بوتایە. هەر بە پشتبەستن بەم ئامارە نادروستەوە بوو سەرۆکی دەوڵەتی ئیسلامیی عێراقی لە سەر تۆڕە ئەنتەرنێتییەکان هەڕەشەی لە حکوومەتی ئێران کرد. ئەبوو عومەر بەغدادی لە کاتی هەڕەشە کردنەکەیدا دوو مانگ کاتی بۆ دەسەڵاتدارانی ئێران دانا تاکوو واز لە هەڵسووکەوتی خراپ لەگەڵ سەلەفییەکان بهێنن دەنا هەم لە ناوخۆی ئێران و هەمیش لە وڵاتی عێراق تۆڵەیان لێ ئەکەینەوە. ئینجا خەریکبوو ئەم هەڕەشەیە ڕەوشی سەلەفییەکانی ئێرانی بەرەو خراپبوون ببات و پاش کۆتایی هاتنی مۆڵەتە دوو مانگییەکەی ئەبوو عومەر، خودی کەتائیب یەك لەو گروپانە بوو کە چاوەڕوانی سەرکوتکرانی سەلەفییەکان بوو لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە بەڵام ئێران کارێکی وای نەکرد و دیار بوو هەر لە سەرەتاوە هەڕەشەکەی ئەبوو عومەری بەلاوە گرنگ نەبووەو بایەخێکی وای پێ نەداوە. هەموو ئەم کێشەو سەرئێشەیە ئەگەڕایەوە بۆ ئەو ئامارە هەڵەیەی سەرکردەکانی کەتائیب لە ڕێگای عەبدولجەبار هەولێرییەوە بۆ ئەمیری دەوڵەتی ئیسلامیی عێراقیان ناردبوو. ئەڵبەت پاش کار و چالاکییەکی زۆر و بانگەشەی بێوچانی ئەندامانی کەتائیب، ئەم ڕێکخراوە بووە خاوەن ڕێژەیەکی زۆری موجاهید تەنانەت زیاتر لەوەی لە سەرەتاوە بۆ ئەبوو عومەریان ناردبوو.

بە نیسبەت ئەوەیشەوە کامە فاکتەر و هۆکار بوونەتە هۆی سەرهەڵدان و گەشەکردنی سەلەفییەتی جیهادی لە کوردستانی ئێران، ئەتوانم هۆکاری ئەمە ببەستمەوە بە چەند فاکتەرێکەوە کە بریتین لە: یەکەم: سەرهەڵدانی بزووتنەوەی سەلەفیەتی جیهادی لە ئاستی ناوچەیی و جیهانییدا بە تایبەت لە سەرەتای نەوەدەکانەوە. دووهەم: دروستبوون و دەستبەکاربوونی ڕێکخراوی ئەلقاعید. سێهەم: دامەزرانی ئیمارەتی ئیسلامیی ئەفغانستان لە لایەن تاڵەبانەوە. چوارەم: دەستدرێژیی زلهێزەکان بۆ ناوچە موسوڵمان نشینەکان بە بیانووی شەڕی تیرۆر و لەناوبردنی تیرۆریزم. پێنجەم: دروستبوونی ڕێکخراوەکانی جوندولئیسلام و ئەنسارولئیسلام و دامەزرانی ئیمارەتی بیارە لە

دراوسێیەتی کوردستانی ئێراندا. شەشەم: دەستپێکرانی جیهادی موسوڵمانان لە عێراق و ئەفغانستان پاش داگیرکرانی ئەم وڵاتانە لە لایەن ئەمریکاو هاوپەیمانانییەوە. شەشەم: هیجرەتی موجاهیدینی ئەنسارولئیسلام بۆ کوردستانی ئێران، پاش هێرشی بەهاری ٢٠٠٣ی ئەمریکاو رووخانی ئیمارەتی بیارە. حەوتەم: مەسەلەی راگەیاندن و بانگەشەو بانگەوازی تەبلیغیی گروپ و رێکخراوە سەلەفییەکان بە تایبەت سایت و پالتۆک و تۆڕە ئەنترنێتییەکان. هەشتەم: دامەزرانی لق و رێکخراوەکانی سەر بە ئەلقاعیدەو ئەنسارولئیسلام لە کوردستانی ئێران و دروستبوونی بەشی بانگەشەو رێکخستنەکانی کوردستانی ئێران لە لایەن ئەوانەوە. نۆهەم: چالاک نەمان و سستی نواندنی حزبە کوردی و عیلمانییەکانی کوردستانی ئێران. کۆمەڵەو دیموکرات بەو پێشینە زۆرەی خەباتی سیاسی و چەکدارییەوە هەروەها پژاکیش کە وەک باڵی یەکەکە هەوڵی پڕکردنەوەی جێگای بەتاڵی ئەوانی داوە، نەیانتوانیوە بیروباوەڕی ئیسلامییانەی خەڵکی کوردستانی ئێران کوێر بکەنەوەو لایەنی کوردایەتی و نەتەوەخوازی بە سەر لایەنی دینی و ئیسلامخوازی خەڵکدا زاڵ بکەن. بۆیە سەرەڕای هەوڵی چەند ساڵەی کۆمەڵەو دیموکرات و سەرباری هەبوونی پژاک لە مەیدانی کوردایەتیدا، زەمینە بۆ سەرهەڵدان و بەرەوپێشچوونی سەلەفییەت فەراهەم بووە. ئینجا نموونەی زۆرمان هەیە کە پێشتر دێیەک و ناوچەیەک وەک بنکەی سەرەکی فلان حزبی عیلمانی و نەتەوەیی ناسراوە بەڵام ئێستاکە پێچەوانە بۆتەوەو رێکخراوێکی سەلەفی جیهادی جێگای حزبە کوردییەکەی گرتۆتەوە. دەیەم: موسوڵمان بوونی خەڵکی کوردستانی ئێران، کە ئەمە یەکەم زەمینە بووە بۆ سەرهەڵدانی سەلەفییەت لەم ناوچەیەدا. ئینجا هەرچەند بەشێکی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە، کوردی شیعە مەزهەبن بەڵام لە بەرانبەردا بەشە سوننەکە لە لایەن دەسەڵاتی شیعەی ئێرانەوە سەرکوت کراوەو دەسەڵات نەیهێشتوو ئەوان بە ئارەزووی خۆیان بە دوای رێگەو رێبازە ئیسلامیەکەیاندا بڕۆن تاکوو زیاتر لە راستیەکان و لە ئەسڵی بیروباوەڕەکەیان نزیک ببینەوە. هەروەها هەندێ دیاردەی تری وەک سۆفیگەری، دەروێش، تەکیە، خانەقاو دیاردەی شێخایەتی و شتی تری لەم بابەتانە، بەردەوام خەڵکی کوردستانی ئێرانیان چەواشە کردووەو لە راستییەکان دووریان خستوونەتەوە بۆیە رووخاندنی ئەم دیوارە دروێینانەش کاریگەرییەکی زۆریان لە سەر خەڵکەکە دانا تاکوو لە بیروباوەڕی سەلەفییەت نزیک ببنەوە. سەلەفییەکان لەو بانگەشەو تەبلیغاتە یان و بەرینەدا کە دەستیان پێ کردووە، هەوڵی ئاشناکردنی خەڵکیان بە ئەسڵی بیروباوەڕی ئیسلامی داوەو بە بێ پێچ و پەنا هەموو باس و خواستە ئاینییەکانیان بۆ روون کردبوونەتەوەو ئەمەش پاڵی پێوە ناون تاکوو بە تامەزرۆیی و جیدیەتەوە باوەش بۆ سەلەفییە جیهادییەکان بکەنەوە. هەروەها بەشێکی زۆری ئەو خەڵکەش کە ساڵانێکی دوورودرێژ بوو لە رووی نا ئاگاییەوەو بە هۆی حزبە کوردی و عیلمانییەکانەوە کەوتبوونە دوای نەتەوەگەری و خۆشەویستی خاک و نیشتمانیان بەلاوە گرنگ بوو، ئەوانیش بە هۆی ئەم هەوڵی بانگەشەیەی سەلەفییەکانەوە زۆر شتیان بۆ روون بووەوەو بەشێکی زۆریان بەرەو ئیسلام گەڕانەوەو تەنانەت بوونە خەڵکانێکی زۆر لێهاتووی ناو رێکخراوە سەلەفی جیهادییەکان. کەم نین ئەو کەسانەی پێشتر ئەندامی حزبە عیلمانییەکانی کوردستانی ئێران بوون و ئێستا کەسانی بەرجەستەی ناو رێکخراوە سەلەفی جیهادییەکانن.

دەربارەی شکڵ و هەیکەلی رێکخراوەیی کەتائیبیش کە پرسیارتان لەبارەوە کردووە، ئەوەندەی ئاگادارم ئەم رێکخراوە لەم بەشانەی خوارەوە پێک هاتووە: یەکەم: ئەمیر. ئەمیری کەتائب بەرپرس و سەرپەرشتیاری رێکخراوەکەیە لە وڵاتی ئێران و کوردستانی ئێران و کوردستانی عێراقدا. دووهەم: جێگری ئەمیر، لە کاتی نەبوون واتە غەیبەتی ئەمیردا کارەکان بەڕێوە ئەبات و لە کاتی نەمانی ئەمیریشدا لە لایەن دەستەی شوراکانەوە وەک ئەمیر دیاری ئەکرێت. تا ئەو کاتەی ئەمیر لە ژیاندا مابێت سەرپشکە ئەمیری دوای خۆی دیاری بکات. سێیەم: قیادە یان شورای سەرکردایەتی، پێکهاتووە لە ئەندامانی بەرجەستەو بەرپرسی بەشەکانی ناو رێکخراوەکە. چوارەم: هەیئەی شەرعی، بەرپرسی ئەم بەشە لە ناو ئەندامانی شورای سەرکردایەتییەوە هەڵدەبژێردرێت. سنووری دەسەڵاتی بەرپرسی هەیئەی شەرعی زۆر

بەرفراوانەو ئەو جێگای ڕێزی هەموو ئەندامانی کەتائیبە. هەرچەند بەجێهێنان و بەڕێوەبردنی فەرمانەکانی ئەو بە پێی هەیکەلی ڕێکخراوەکەو بە بەراوەرد لەگەڵ ئەمیر و جێگرەکەیدا حەتمی و (مُلزم) نییە بەڵام لە رووی ڕێز و حورمەت و بە گەورە زانینی پلەو پایەوە، هەموو کەس ئامادەی بەڕێوەبردنی فەرمانەکانی ئەوەو هەر لەم ڕوەیشەوە ئەمیر و جێگرەکەی دژایەتی فەرمانەکانی ئەو ناکەن مەگەر ئەوە پێچەوانەی بەرنامەو مەنهەجی گشتی ڕێکخراوەکە بێت کە شتێکی ئاواش مەحاڵە. ئەگەر هاتوو ئەمیری هەیئەی شەرعی بە نیسبەت مەسەلەیەکەوە بەڵگەی بەهێزتر لە ئەمیر و جێگری ئەمیری ڕێکخراوەکەی بە دەستەوە بوو ئەوا شۆرا یاخود ئەندام و کادێرە بڵندپایەکان پابەندی قسەی ئەو دەبن چونکوو بە پشتبەستن بەو بەڵگەیەی بە دەستیەوەیە دروستبوونی بۆچوون و قسەکانی خۆی ئەسەلمێنێ. هەیئەی شەرعی بە شێوەی تایبەت جێبەجێکردن و تاووتوێکردنی مەسەلە شەرعییەکانی لە سەر شانەو بەشی زۆری کارەکانی ئەم هەیئەیە پێوەندیی بە بابەتە شەرعیەکانەوە هەیە. پێنجەم: هەیئەی سەربازی، ئەم هەیئەیە ئەمیری تایبەتی خۆی هەیە کە لە لایەن ئەمیری گشتییەوە دیاری ئەکرێت. هەروەها جێگری ئەمیری سەربازی و ئەندامانی هەیئەکە لە لایەن ئەمیری هەیئەوە دیاری ئەکرێن. ئەرکی سەرەکی ئەم هەیئەیە بەڕێوەبردنی کاروباری عەسکەری و خۆ ئامادەکردنە بۆ جیهاد و بەم هۆیەشەوە ئەندامانی هەیئەکە بە دوو دەستە دابەش دەبن. دەستەیەک ئەو کەسانەن کە خاوەن شارەزایی و ئەزموونن لە بواری عەسکەریداو دەستەکەی تریش ئەو کەسانەن کە پێویستە پەروەردە بکرێن و بە کاروباری عەسکەری و فیقهی جیهاد و پێوەندیی نێوان ئەمیر و مەئموور و زۆری شتی تری هاوشێوەی ئەمانە ئاشنا بکرێن. ئەم کارە پێویستی بە دروستکردنی فێرگەو کەلوپەل و کەرەستەی تایبەت هەیەو بە گشتی کاروباری هەیئەی سەربازی پێویستی بە بوارێکی باشی ماڵی و پارەیەکی زۆر هەیە. شەشەم: ئەمیری شار و شارۆچکەکان یاخود شارستانەکان، کەتائیب ئەم ئەمیرانە لە ناو خەڵکی ئەو شوێنانەدا هەڵدەبژێرێت کە لق و کەتیبەیان تیادا دائەمەزرێت بەڵام هەندێ جار ئەگەر شار و شارستانێک کەسی شیاوای بۆ ئەمیرایەتی تیادا نەبێ یان کەسە شیاوەکانی شار و شارستانێک بە مەبەستی جیهادکردن سەفەری شوێنێکی تریان کردبوو، ئەوا لە شوێنێکی نزیکی ئەو شار و شارستانەوە ئەمیریان بۆ دیاری ئەکرێ. هەرچەند ئەم ئەمیرانە پلەی ڕاوێژکار و ئەندامەتی شۆرایان پێ نادرێت بەڵام حیسابی بریکاری شۆرای کەتائیبیان بۆ ئەکرێت. کاروباری ئەم ئەمیرانە گرنگایەتی تایبەتی خۆی هەیە چونکوو ئەوان لەگەڵ خەڵکی کۆمەڵگاو ئەندامانی خوارەوەی کەتائبدا پێوەندییان هەیەو ڕاستەوخۆ پەیامی ڕێکخراوەکەیان پێ ئەگەیەنن. بۆیە پێویستە ئەم ئەمیرانە لە لایەک بە شێوەیەکی ئیسلامیانەو (مُلتزم) لەگەڵ چین و توێژەکانی کۆمەڵگادا ڕووبەڕوو ببنەوەو لە لایەکی تریشەوە بە هەستیاری و دڵنیاییەوە دەست بدەنە وەرگرتنی ئەندام چونکوو دواتر لە ناو ئەم ئەندامە وەرگیراوانەو بە ڕاوێژکردن لەگەڵ ئەمیری شار و شارستانەکان، ئەفەرات بۆ بەشداریکردنی خولی سەربازی و شەرعی و جیهاد هەڵدەبژێردرێن. هەروەها بە هۆی ئەم ئەمیرانەوەیە کە کەتائب ئاگاداری توانایی ئەندامانی کەتیبەی شار و شارستانەکان ئەبێت و کار و ئەرکیان بۆ دیاری ئەکات و تاقییان ئەکاتەوەو پێیان ئەڵێ چۆناوچۆن لە ناو بنەماڵەو گەڕەک و شوێنی کار و کۆبوونەوەیاندا بانگەشە بۆ بیروباوەڕەکەیان بکەن و سەرنجی خەڵک بۆلای ئیسلام و کەتائب رابکێشن.

هەر لە سەرەتاوە بانگەشەو تەبلیغات یەکێک بووە لە سەرەکی ترین کارەکانی کەتائب لە کوردستانی ئێران و ناوچە سوننەنشینەکانی تری ئەم وڵاتەو ئەم ڕێکخراوە لەم ڕێگایەوە بەرەوپێشچوونێکی زۆری بە خۆیەوە بینیوە. شێوازەکانی بانگەشەی کەتائب بەم شێوەی خوارەوەیە: یەکەم: پێوەندیی گرتنی ئەندامانی کەتائب لەگەڵ کەسانی نزیکی خۆیان و خزم و هاوگەڕەکی و هاوکارەکانیان و گەیاندنی پەیامی ئیسلامخوازیی کەتائب بەوان. دووهەم: بانگەشەی بیروباوەڕی سەلەفییەت و مەنهەجی کەتائب لە ڕێگای مینبەری مزگەوتەکانەوە بە هۆی مامۆستا یاخود مەلای سەر مینبەری مزگەوتەکانەوە. سێهەم: بڵاوکردنەوەی سیدی و نامیلکە بە ناو خەڵکیدا لە لایەن ئەندامانی کەتائبەوە یاخود فرۆشتنیان لە بازاڕی شار و شارۆچکەکاندا. ئەم سیدیانە باس و بابەتی عەقیدەتی و شەرعی و باسی لایەنەکانی

ژیانیان لە روانگەی ئیسلامەوە، لە خۆ گرتووە. چوارەم: کۆبوونەوەی سەلەفییەکان لەو مزگەوتانەدا کە خەتیب و پێشنوێژەکەیان ئەندامی کەتائبە. ئەوان لە هەموو شوێنەکانی شار و شارستانەوە بە مەبەستی کۆبوونەوەو نوێژی جەماعەت خۆیان ئەگەیەنن ئەو مزگەوتانە. هەروەها ئێواران لە نێوان فوێژی مەغریب و نوێژی عیشادا لە دەوری یەك کۆ ئەبنەوەو باس و خواسی شەرعی دەکەن و شارەزاو شەرعزانەکان وەڵامی پرسیاری ئەوانی تریان ئەدەنەوە. هەروەها لەم مزگەوتانەدا خولی تایبەت بە وتنەوەی وانەی ئایینی بەڕێوە دەچێت.

ئەو کەسانەی بە هەر شێوەیەك بە ریزەکانی کەتائبەوە پەیوەست ئەبن، چەند قۆناغێك تێئەپەڕێنن. یەکەم: ئاشنابوون لەگەڵ مەنهەجی سەلەفییەت لە رێگای قسە بۆ کران و پرسیار و وەڵام وەرگرتنەوەو گوێگرتن لە کاسێت و چاولێکردنی سیدی و خوێندنەوەی ئامیلکەو بەشداریکردن لە مەراسماتی سەلەفییەکاندا. بەو هۆیەوە کە زۆربەی ئەو کەسانەی لە وڵاتی ئێران و ناوچە کوردنشینەکەیدا پێوەندییان بە کەتائبەوە دەکرد (یان دەکەن)، کوردی و عەرەبییان نەدەزانی بۆیە دەبوایە رێکخراو ئامیلکەو کتێبی فارسی بۆ ئەوان ئامادەو دابین بکرفایە. دووهەم: بەشداریکردن لە خولی سەرەتایی وانە ئیسلامییەکاندا. سێهەم: بەشداریکردن لە خولی تایبەتی مەنهەج و عەقیدەدا. چوارەم: بەشداریکردن لە خولی پەروەردەی جەستەیی (باشگاە) یاخود سالۆن و یانە وەرزشیەکاندا. هەروەها بەشداریکردن لە بەرنامەی شاخەوانیدا کە بە شێوەی حەفتانە لە لایەن ئەندامانی کەتائبەوە بەڕێوە دەچێت و ئەندامانی ئەم گروپە لە شکڵی گروپی چەند کەسیدا ئەم کارە دەکەن. پێنجەم: بەشداریکردن لە خولی پەروەردەی سەربازی لە ماڵە تیمییەکانی کەتائب یان لەو شوێنە چۆڵەوانیانەدا کە لە لایەن رێکخراوەوە بۆ ئەم کارە دیاری کراوە.

ئەو ئەرك و بەرپرسایەتیانەی لە رووی سەربازییەوە کەتۆتە سەرشانی رێکخراوێکی وەك کەتیبەکانی کوردستانی ئەلقاعیدە، بەم شێوەی خوارەوەیە. یەکەم: جیهاد دژی حکوومەتی هەرێمی کوردستانی عێراق و هێزە کوردی و عیلمانییەکان. کەتائب لەم پێوەندییەدا بە تایبەت لە ساڵانی سەرەتای دامەزرانیدا چەندین چالاکی بەڕێوە بردووە. بۆ نموونە چالاکییەکانی ناوچەی پێنجوێن و هەڵڵاواو سیاگوێز و کانی خان و ناوچەی تاوگۆزییەکان و.....هتد. هەروەها ناردنی موجاهید بۆ پاکستان و ئەفغانستان و عێراق. بە شێوەیەکی گشتی کەتائب و رێکخراوە سەلەفی جیهادییەکانی تری کوردستانی ئێران لە پاش داگیرکرانی عێراقەوە، چەندین گەنج و لاویان بە مەبەستی جیهادکردن و ئەنجامدانی کردەوەی ئیستشهادی رەوانەی ئەم ولاتە کردووە. هەروەها ژمارەیەکی زۆرتریشیان بە هەمان مەبەست رەوانەی وڵاتانی پاکستان و ئەفغانستان بە تایبەت ناوچەیەکی بچووکی باشووری ویلایەتی هیلمەندی ئەفغانستان بە ناوی ناوچەی (بارابچە) کردووە. تاکوو ئێستا چەندین گەنجی کوردی کوردستانی ئێران و ناوچە سوننەنشینەکانی تری ئەم وڵاتە، لە جیهاد دژی هێزەکانی ناتۆو ئەفغانـدا شەهید بوون کە بەشی زۆریان ئەندامی کەتائب و ژمارەیەکیشیان ئەندامی ئەنساروئیسلام و جەیش سەحابە بوون. بەڕای من هەرچەند کەتائب نەیتوانیوە لە ئاستێکی بەرین و بەربڵاودا چالاکی جیهادییانە دژی دەسەڵاتی کوردی و حزبە عیلمانییەکان بەڕێوە ببات بەڵام ئەو برە چالاکییەش تاکوو ئێستا لە ناوچە سنوورییەکاندا دژی ئەم دەسەڵاتە بەڕێوەی بردووە، ئەگەر دەستکەوتی گەورەی سەربازیشی بۆ ئەم رێکخراوە نەبووبێ ئەوا لە رووی سیاسییەوە دەستکەوتی گەورەی بۆ کەتائب بەدواوە بووە. ئینجا ئەم چالاکییانە لە کاتێکدا بەڕێوە دەچوون کە دەسەلاتی کوردی پێی وابوو بۆ هەمیشە سەلەفییەتی جیهادی سەرکوت کردووەو ئیتر بەرەو ئەوە دەچێت ئیسرائیلێکی تر لە ناوچەکەدا دروست بکات.

دوورەپەرێزی و ئامادەنەبوونی حیزبە کوردییە ناسیۆنالیستەکان کە بەجۆرێك لە جۆرەکان بە عیلمانیش دێنە ئەژمار، وەك یەك لە هۆکارەکانی گەشەسەندنی سەلەفییەت لە رۆژهەڵاتی کوردستاندا لە قەڵەم ئەدرێت. ئەو حیزبانە پاساو و

وەڵامی خۆیان بۆ ئەم ئامادە نەبوونە هەیەو لە راستیشدا نەهاتنەوەو ئامادە نەبوونیان پێوەندیی بە باشووری کوردستانەوە هەیە وەك چۆن راگرتنی چالاکییەکانی کەتائب پێوەندیی بە پێوەندییەکانی هەرێمی کوردستان و دەسەڵاتی ئێرانییەوە هەیە. بەڵام ئایا بەرای تۆ دوورکەوتنەوەی حیزبە کوردییەکان لە مەیدانەکە دەرفەتێك بوو بۆ سەلەفییەکان کە پێی سەلەفییەت بە سەر هەستی نەتەوەییی لاوانی ئەم پارچەیەدا زاڵ بکەن؟ بە گشتی سەلەفییەت چەند توانیویەتی لە رۆژهەڵاتی کوردستاندا گەشە بکات؟

ئەوەی کە پاساوی کۆمەڵەو دیمۆکرات چییە بۆ نەهاتنەوەو ئامادە نەبوون و لەمبارەیەوە چی ئەڵێن ئەوە پێوەندیی بە خۆیانەوە هەیە. بەڵام ئەتوانم بڵێم بە نیسبەت ساڵانی پێشتریشەوە واتە ئەو چەندین ساڵەی ئامادە بوون و بە حیسابی خۆیان خەباتیان کردووە، ئەوان نەبوونەتە خاوەن دەسکەوتێکی وەهای سیاسی و دونیایی و سەربازی و ئەگەر بە وردی سەیری پێکهاتەی دانیشتوانی کوردستانی ئێران بکەین هیچ مۆرك و هێمایەك نابینین کە باس لە پێوەندیی خەڵك بە تایبەت جیلی گەنج بە حزبە کوردییەکانەوە بکات. ئەڵبەت ئەو کاریگەرییە پۆزەتیڤەش کە کاتی خۆی بەدەسەڵات گەیشتنی کورد لە کوردستانی عێراق لە سەر کوردەکانی ئێران دایناوو لەم ساڵانەی دواییدا هیچ ئاسەوارێکی لێ نەماوەتەوە چونکوو ئەم دەسەڵاتە کوردییە نەك نەیتوانی خواستەکانی کورد دەستەبەر بکات بەڵکوو بە هۆی ئەو دزی و گەندەڵی و فەسادە زۆرەوە کە تووشی کۆمەڵگای کوردستانی عێراقی کردووە، کاریگەری لە سەر کوردەکانی بەشەکانی تریش داناوەو وای لێ کردون کە دڵ بە دەسەڵاتی کوردی خۆش نەکەن. بە نیسبەت سەرکوتکردنی سەلەفییەکانیش لە لایەن حکوومەتی ئێرانەوە، ئەگەر ئەم حکوومەتە پێشتر بە بیانووی کوفر و بێ ئیمانی و پیاوی بێگانەبوون و جودایی خوازیی و...... لایەنگرانی کۆمەڵەو دیمۆکرات یان رێکخراوە شلەوە ئیسلامییەکانی سەرکوت دەکرد، ئێستاکە ناتوانێ بەم بیانووانەوە سەلەفییەکان سەرکوت بکاو پێش بە چالاکییان بگرێت. هەروەها ئەگەر ئەم دەسەلاتە بێەوێ بە ناوی سەرکوتی سوننەیشەوە ئەم کارە بکات ئەوا تووشی کێشەو گرفتی گەورە ئەبێتەوە. بۆیە حکوومەتی ئێران هەر لە سەرەتاوە نەیویستووە خۆی تووشی ئەم کێشەو گرفتانە بکات بە تایبەت لەگەڵ سەلەفییەکاندا کە لە هیچ شوێنێکی ئەم دونیایەدا ژیانی ژێر دەستەییان قبووڵ نەکردووەو زوڵم و سەرکوتکاری هیچ دەسەڵاتێکیان بێ وەڵام نەهێشتۆتەوە. خودی ئەم دەسەڵاتە واتە حکوومەتی ئێرانیش نموونەیەکەی ناوای تەجرەبە کردووە و بینیمان کاتێ ساڵی ۲۰۰۹ یەکێك لە سەلەفییەکان لەم بەندیخانەیەی کە ئێمەی تیادایە لە سێدارە درا، چۆناوچۆن گەنجە هاوبیرەکانی ئەو تۆڵەیان کردەوەو چەند گەورە بەرپرس و قازییەکیش لەم شاری سنەیەدا تیرۆر کرد. جا هەرچەند دواتر ئەم گەنجانەو چەندین کەسی تر لە سەلەفییەکان راپێچی گرتووخانەکان کران و حوکمی قورس و ئاوەوای زیندان و ئێعدامیان بە سەردا سەپاو ژمارەیەکیشیان لە کاتی شەڕ و تێکهەڵچوونەکاندا شەهید بوون بەڵام ئەوان کێشەیەکی وەهایان بۆ حکوومەتی ئێران دروست کرد کە تاکوو ئێستاش نەیتوانیوە بەسەریدا زاڵ بێت و بنبڕی بکات. تەنانەت خودی ئەو گیراوانەش کە ژمارەیان دەگاتە سەد و چەند کەسێك و رۆژ بە رۆژ ژمارەیان زیاد دەکات، لە ناو زیندانیشدا بوونەتە کێشە بۆ دەسەڵاتدارانی ئێران.

بۆیە بە بوێرییەوە ئەڵێم ئەمڕۆ سەلەفیەت نەك لە کوردستاندا جێی خۆی کردۆتەوەو هەنگاوی گەورەی بەرەوپێش ناوەو بۆتە هێزێکی گەورەی جەماوەری و رێکخراوەیی بەڵکوو تەشەنەیشی کردووە بۆ ناوچە عەرەب و تورکمان و بەلووچ و تەنانەت فارس نشینەکانی ئێرانیش و بێگومان لە داهاتووشدا زیاتر بەرەوپێش دەڕوات. جا ئەگەر حکوومەتی ئێران بێەوێ بە زۆر و لە رێگای سەرکوتەوە پێشی پێ بگرێت ئەوا ئەم بیروباوەڕە زیاتر لای خەڵك خۆشەویست ئەبێ و لە بەرانبەریشدا توندوتیژی زیاتر لە خۆی نیشان ئەدات. هەروەها ئەگەر بیانەوێ بە نەرمی و ئارامی رێی لێ بگرن دیسان واز ناهێنێ و درێژە بە کارو چالاکی خۆی ئەدات. ئینجا رەنگە هەندێ کەس بە تایبەت خەڵکانی نەتەوەپەرەست و

عیلمانی ئەم قسانەی من بە زیادەڕۆیی بزانن و زیاتر وەك تەبلیغ و بانگەشە سەیری بکەن بەلام ئەی چی لە خوێنی ئەو هەموو گەنجەی کوردستانی ئێران دەکەی کە لە پێناو بیروباوەڕی سەلەفییەت لە ساحە جۆراوجۆرەکانی جیهاددا ڕژاوە. من لەو باوەڕەدام نە حکوومەتی ئێران ئەتوانێ پێش بە ڕەوتی سەلەفیەت بگرێ و نە بە پێی ئەو پێشکەوتنەی سەلەفییەت بەخۆیەوە بینیویەتی، هێزە کوردی و عیلمانییەکان پلەو پایەی جارانی خۆیان بە دەست بهێننەوە. بە تایبەت ئەوانەیان کە ئافرەت بۆ کاری چەکداری بەکار ئەهێنن زیاتر لەوانی تر ڕووبەڕووی دۆڕان و شکست ئەبنەوە چونکوو ئەم کارەیان هەم پێچەوانەی عورف و عادەتی کوردانەو هەمیش پێچەوانەی بیروباوەڕی ئیسلامیانەی کۆمەڵگای کوردستانە.

**بەهەرحاڵ ئەوەی جەنابت باست کرد ڕوانگەو باوەڕی خۆتانەو ئەگەر ئەمە بە ڕوانگەو باوەڕی هەموو سەلەفیەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و وڵاتی ئێرانیش بزانین دیسان ئەم ڕوانگەیە لە لایەن خەڵکانێکی ترەوە ڕەت دەکرێتەوە. حیزبە کوردییەکان، ڕەوتە ڕۆشنبیری و سیکۆلارەکان، سۆفی و دەروێش و ئیسلامییە سوننەتییەکان، ئیسلامییە میانەڕەوەکان و زۆر خەڵك و ڕەوتی تری ناو کۆمەڵگای کوردی ئەم ڕوانگەیە ڕەت دەکەنەوە. بۆیە تێپەڕینی زەمەن وەڵامی ڕاست و دروستمان پێ دەداتەوەو دواجار ڕەوتی ڕووداوەکان پێمان دەڵێن کامە ڕوانگە ڕاست و دروست بووە. بەڵام مەسەلەیەکی تر جۆری هەڵسووکەوتی حکوومەتی ئێرانە لەگەڵ سەلەفییەتدا. زۆر کەس لە سەر ئەو باوەڕەن دەوڵەتی ئێران سەرەتا مەیدانی بۆ سەلەفییەکان ئاوەڵا کردبوو و ئەوان تا ڕادەیەکی زۆر لە کارەکانیاندا ئازاد و سەربەست بوون و ئەمەش هۆکارێکی جیدی بووە لە گەشەکردنی سەلەفییەتدا. ئەم ئیدیعایە تا چەند بە ڕاست ئەزانیت و ئەگەر وابووە هۆکاری بێدەنگبوونی کۆماری ئیسلامی بەرانبەر سەلەفییەت لە چیدا ئەبینی؟**

بە پێچەوانەوە دەسەڵاتی ئێرانی نەك ڕێگای بۆ سەلەفییەت ئاوەڵا نەکردووە بەڵکوو هەر لە سەرەتاوە بە شێوەیەکی گشتی بە سەرکوتکردنی سوننەکانی کوردستان و ئێرانەوە خەریك بووە، بە تایبەت ڕێکخراوە ئیسلامییەکانی وەك بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستانی ئێران بە ڕابەرایەتی مامۆستا عەبدولقادر تەوحیدی، مەکتەبی قورئانی ئەحمەدی موفتی زادەو شۆرای شەمس بە شێوەیەکی زۆر جیدی لە لایەن ئەم دەسەڵاتەوە سەرکوت کراون و ئاسەواری ئەم سەرکوتەش تاکوو ئێستا ئەبینرێت. ئینجا کاتێ حکوومەتی ئێران ئیجازەی کارکردن و جموجووڵی بەم ڕەوتە ئیسلامییە میانەڕەو و شلوەوانە نەدابێ چۆن مەیدان بۆ ڕەوتێك ئاوەڵا ئەکات کە بە توندڕەوی و تەنانەت دژە شیعەش ناسراوە؟؟!! بۆیە ئەم ڕوانگەیە واتە ئەوەی کە ئێوە باستان کردووە بە تەواوی لە لایەن منەوە ڕەتکراوەیە.
تەنیا ئەتوانم ئیعتراف بەوە بکەم بە هەر هۆیەکی سیاسی و ناوچەییەوە بووبێ حکوومەتی ئێران هەندێ چاوپۆشی لە جموجووڵی سەلەفیەکان و چالاکی و بڵاوبوونەوەیان لە کوردستانی ئێران و ناوچە سوننەنشینەکانی تری ئەم وڵاتەدا کردووەو بێگومان ئەمەی لە بەرژەوەندیی خۆیدا کردووە نەك لە بەرژەوەندیی سەلەفییەکاندا. ئەڵبەت وەك ئێوە وتووتانە، هەندێ کەس ئەمەیان کردۆتە بیانوو بۆ ئەوەی بێنە سەر ئەو باوەڕەو ئیدیعا بکەن کە دەسەڵاتی ئێرانی مەیدانی بۆ سەلەفییەکان ئاوەڵا کردووە. ئەگەر بڵێین ئەم جۆرە مامەڵەکردنەی ئێران لەگەڵ سەلەفییەکاندا تا ڕادەیەکیش لە ڕووی ناچارییەوە بووە هەڵەمان نەکردووە چونکوو لە سەرەتادا سەلەفییەکان تەنیا لەو خەڵکە موهاجیرانە پێکهاتبوون کە پاش ڕووخانی ئیمارەتی ئیمارەتی بیارە ڕوویان لە ئێران کردبوو دەسەڵاتی ئێرانیش ئیزنی مانەوەی پێدان وەك چۆن لە کۆنەوە ئەمە باو بووەو حکوومەتی ئێران هەموو کات پەنای ئاوارەکانی کوردستانی عێراقی داوە. تا ئەو کاتەی دەستە دابڕاوەکان لە کەتیبەکانی کوردستانی ئەلقاعیدەش جیهادیان دژی ئێران ڕانەگەیاند تەنیا شاهیدی چەند

نموونەیەکی گرتن و زیندانیکردنی سەرکردە سەلەفییەکان بووین لە لایەن دەسەڵاتی ئێرانییەوە کە دوانیان واتە حاجی عارف و ئەبوو ئەسمە ئەمیری کەتائب بوون. ئەوەش کە وتم ڕەنگە بێدەنگە کردنی ئێران لە ئاست سەلەفییەکانی ئەم وڵاتەدا لە ڕووی ناچارییەوە لەو ڕوانگەیەوە ئەمەم وت کە دەسەڵاتی ئێرانی هەمیشە هەوڵی داوەو هەوڵ ئەدا لە بچووکترین شتەکانی دەوروبەری شتێك بۆ خۆی دەستەبەر بکات بۆیە ڕەنگە لە سەرەتاشدا ئاوا ڕوانگەیەکی بۆ ڕێکخراوە سەلەفییەکانی کوردستانی ئێران بووبێ و ویستبێتی سوودیان لێوەر بگرێ. بەڵام کاتێ بینییان سەلەفییەتی جیهادی خەریکە ئەبێتە هەڕەشە بۆسەر خۆیان، بە شێوەیەکی زۆر جیدی و بێ ڕەحمانە کەوتنە سەرکوتکردنی و ئێستا ئیتر پێش بە هەرچەشنە چالاکییەکی ئەوان دەگرن. دەسەڵاتی ئێرانی لەم حاڵەتەشدا بە دوای قازانجی خۆیەوەیەو ئەیەوێت وا نیشان بدا کە نەك یارمەتی تیرۆریزم نادات بەڵکوو بۆ خۆیشی بۆتە قوربانی تیرۆریزم و مەبەست لەم کارەش لە لایەك مەزڵووم پیشاندانی خۆیەتی لای بیروڕای گشتی و لە لایەکی تریشەوە مەشرووعییەت بەخشینە بە سەرکوت و ئێعدامی ئەو سەلەفیانەی لە دژی جیهاد ئەکەن.

**جەنابت ئەڵێی ئەوەی کە حیزبە عیلمانی و نەتەوەییەکان لە ڕووی سیاسییەوە دەسکەوتێکی بەرچاو و ئەوتۆیان دەست نەکەوتووە هۆکارێك بووە بۆ گەشەکردنی سەلەفییەت لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا. هۆکاری سەرکەوتووبوون یان سەرکەوتوونەبوونی ئەو حیزبانەو شیکردنەوەی باروودۆخی کارو چالاکیی ئەوان ئەهێڵینەوە بۆ خوێنەر. بەڵام پرسیارێك کە ئەم ئیدیعایە ئەیوروژێنێ ئەوەیە کە چۆناوچۆن سەلەفییەت ئەتوانێ ببێتە ئەلتەرناتیڤی حیزبی عیلمانی و نەتەوەخوازی کورد لە حاڵێکدا کە ئێستاشی لەگەڵدا بێ نەتەوەخوازیی یەکێکە لە فاکتەر و تایبەتمەندییە هەرە بەرجەستەکانی پێکهاتی کۆمەڵایەتیی ئەم کۆمەڵگایە؟**

ئەو وڵامەی بە پرسیاری پێشووترم دایەوە تا ڕادەیەك وەڵامی ئەم پرسیارەشی لەخۆ گرتووە. لەوێدا باسم کرد کە بە پێی ئەو پێشکەوتنانەی سەلەفییەتی جهادی لە کوردستانی ئێراندا لێی بەهرەمەند بووە ئەگەری لەناوبردن و پێشگرتن بە گەشەکردنی مەحاڵە. بۆیە نە کۆماری ئیسلامی و نە هێزە کوردی و عیلمانییەکان ناتوانن پێش بە گەشەکردنی ئەم ڕەوتە بگرن. هەرچەند لەم چەند ساڵەی دواییدا حکوومەتی ئێران دەستی داوەتە سەرکوت و زیندانیکردنی سەلەفییەکان بەڵام ئەمە زیاتر لەوەی کاریگەری نیگەتیڤ لەسەر کار و چالاکی ئەوان دابنێ، ئەوان لە دڵی خەڵکدا خۆشەویست دەکا. ئینجا بەدەر لەو ناکۆکییەی بە نیسبەت هەندێ مەسەلەوە بۆ نموونە چۆن مامەڵەکردن لەگەڵ دەسەڵاتی ئێرانیدا هەیانە، سەلەفییەکانی کوردستانی ئێران بە عام و بە شێوەیەکی گشتی لە هەلومەرجێکی باش دان و زەمینە بۆ بەرەوپێشچوونی زیاتری ئەوان فەراهەمە. ئەوان لە نەبوونی حیزبە عیلمانییەکانداو لە کاتێکدا کە خەباتی نەتەوەخوازیی لە کوردستانی ئێراندا لەوپەڕی لاوازیدایە بە هەموو شێوەیەك هەوڵی بەرەوپێشچوون و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکەیان ئەدەن. ئینجا ئەگەر جاران کۆمەڵەو دیموکرات خەڵکیان لێ ئەکۆڕاو ئەگیرا ئێستا سەلەفییەکان جێگای ئەوانیان گرتۆتەوە، ئێستا جگە لە کوردستانی ئێران، زیندانەکانی حکوومەتی ئێران و ساحەکانی جیهادی عێراق و ئەفغانستان و پاکستان بوونەتە شوێنی چالاکی و فیداکاری گەنجانی کوردی کوردستانی ئێران و هەموو ئەمانە ئاماژەن بۆ ئەوە کە سەلەفییەت بە هەموو توانایەوە باج ئەدات و خوێن ئەدات و خۆی ماندوو ئەکات تاکوو ببێتە تاقە هێزی مەیدانەکە.

بەڵام ئەمە لە کاتێکدایە کە ئەم ڕەوتە ئیسلامییە ڕادیکاڵ و شۆڕشگێڕە لە کوردستانی ئێراندا چەندین دوژمن و ناحەزی هەیە کە هەرکام لەوانە خاوەن مێژوو و پێشینەیەکی دووروودرێژن لە ناو خەڵکی ئەم ناوچەیەدا. حزبە کوردی و

عیلمانییەکان سەرباری ئەوەی چەندین ساڵە دوورن لە واقیعی کوردستانی ئێران بەڵام هێشتا خاوەن هەندێ ئیعتیبار و خۆشەویستین، بۆ نموونە حزبێکی وەك دیمۆکرات کە وابزانم تەمەنی دەگاتە حەفتا ساڵ ئێستاش لە هەندێ ناوچەدا خۆشەویستەو بە هێمای کوردایەتی دادەنرێ. یان ئیسلامی سوننەتی وەك سۆق و دەروێش و هەندێ فیرقەو بیروبۆچوونی تر خاوەن پێڕەو و لایەنگری خۆیانن و.....هتد. ئینجا بەو ئاستەش سەلەفییەت دژی ئەم بیروباوەڕ و حزب و ڕێکخراوانەیە ئەوانیش دژی ئەم ڕێچکەو ڕێبازە ئیسلامییەن. بۆیە سەرکەوتن و زاڵبوونی ئەم دوانە بە سەر یەکتردا پێوەندیی بە فاکتەر و هۆکاری جۆراوجۆرەوە هەیەو وەك ئێوە وتووتانە ئەبێ چاوەڕوان بین بزانین تێپەڕینی زەمەن ڕەوتی ڕووداوەکان بەرەوکوێ ئەبات. بە بێ ئەوەی بمەوێ ئەم دەرفەتە بکەم بە بانگەشە بۆ بیروباوەڕی سەلەفییەت و سەلەفییەکان، ئەتوانم بڵێم ئەگەر زەمینەو زەمەن هەر ئاوا بە قازانجی سەلەفییەکانی کوردستانی ئێران بێت و بڕواتە پێش ئەوا لە داهاتوودا ئەگەر سەلەفییەکان نەبنە هێزی سەرەکی بێگومان ئەبنە هێزێکی گەورەی ناو گۆڕەپانەکە. وەك پێشتر باسم کرد تاکوو ئێستا خەڵکێکی زۆری نەتەوەگەراو ئەندامان و لایەنگرانی حزبە کوردی و عیلمانییەکان خوای گەورە هیدایەتی داون و پەیوەست بە ڕەوتی سەلەفییەت بوون. ئینجا بە پێی ئەوە کە بەشێك لە بانگەشەی سەلەفییەکان ڕەتکردنەوەی بیروباوەڕی نەتەوەگەرایی و کار و کردەوەی حزبە کوردی و عیلمانییەکان و ڕەتکردنەوەی ئەو بۆنەو موناسیبەتانەیە کە ئەوان نانی پێوە دەخۆن و خەڵکی پێ فریو ئەدەن، بۆیە ئەگەری ئەوە زۆرە لە داهاتوودا خەڵکانێکی زۆرتر پێوەندیی بە بەرەی سەلەفییەتەوە بکەن. ئەمە ئەو کەسانەش لەخۆ ئەگرێ کە تاکوو ئێستا پێڕەوییان لە فیرقەو دەستە چەواشەکانی وەك تەریقەتی قادری و نەقشبەندییەوە کردووە.

بەڵام شتێکی جێگای سەرنج کە پێویستە ئەیشارمەوەو باسی بکەم ناکۆکی و ناتەبایی نێوان سەلەفییەکانە. ئەمە یەك لەو خاڵە لاوازانەیە کە لە ماوەی ساڵانی ڕابردوودا زەرەر و زیانی زۆری بە بیروباوەڕی سەلەفییەت و ڕێکخراوە سەلەفییەکان گەیاندووەو بە داخەوە خەریکە لە کوردستانی ئێرانیشدا دووپات ئەبێتەوە. ئەمە تەنیا خاڵێکە کە لە لایەك سەلەفییەکان دوو کەرت و چەند کەرت دەکاو لە لایەکی تریشەوە بە قازانجی هێزە دژبەرەکان تەواو ئەبێ. بۆیە ئەگەر سەلەفییەکان بیانەوێ لە داهاتووی کوردستانی ئێراندا ببنە هێزی سەرەکی و نوێنەرایەتی زۆربەی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بکەن پێویستە هەر لە ئێستاوە ناکۆکییەکانیان بنێنە لاوە. من ناڵێم هەموویان ببنە ڕێکخراوێك و موبایەعی یەك شوێن بەڵام خۆ ئەتوانن لە دەوری خاڵە هاوبەشە فیکری و مەنهەجییەکان کۆ ببنەوەو لە سەر ئەم ئەساسە پێوەندیی نێوانیان قایمتر بکەن.

**پێکهاتەی گروپە سەلەفییەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان نیشاندەری ئەوەیە کە زیاترین ئەندامەکانی ئەم گروپانە لە توێژی هەژار و کەمداهاتی کۆمەڵگان، تۆ هۆکاری ئەم شتە ئەگەڕێنیتەوە بۆچی؟ هەروەها سەلەفییەت بە گشتی و بە تایبەت کەتایب زیاتر لە کام ناوچەی ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا هۆگرو لایەنگریان هەیە؟**

من پێم وایە نەك لە کوردستانی ئێران بەڵکوو لە هەموو جیهاندا سەلەفییەتی جیهادی زیاتر لەناو وڵات و نەتەوە هەژارەکاندا جێگای خۆی کردۆتەوە نەك لەناو وڵات و نەتەوە دەوڵەمەندەکاندا. ئەمە سوننەتێکە لە کۆنەوە هاتووەو لە سەرەتای بە دەسەڵات گەیشتن و بڵاوبوونەوەی ئیسلامیشدا هەروا بووە. لەو سەردەمەشدا زیاتر کەسانی وەك بیلالی حەبەشی و سوهەیب و..... ئیسلامیان قبووڵ دەکرد و بە پێچەوانەیشەوە کەسانی وەك ئەبوو جەهل و گەورەکانی قورەیش دژایەتی ئەم دینەیان دەکرد. بۆیە لەو سەردەمەوە تاکوو ئێستا لە بەرانبەر کەسێکی دەوڵەمەندا کە لەگەڵ ڕەوتە ڕاستەقینە ئیسلامییەکان کەوتبێ، سەدان کەسی هەژار پێوەندییان بەم ڕەوتەوە کردووەو هەژارەکان زۆرترین

هێزی مرۆیی ڕەوتە ئیسلامییەکان بە تایبەت ڕەوتە سەلەفییەکانیان پێك هێناوە. جا ئەوە کە من ئەیڵێم بە عام وایە دەنا دەوڵەمەندی واشمان هەیە کە لە هەموو کەس زیاتر سەرکەوتنی ڕەوتە ڕاستەقینە ئیسلامییەکانی پێ خۆشەو لەم پێناوەشدا ئامادەی هەموو جۆرە هاوکاریکردن و پشتیوانییەکە. لە ناو سەلەفییەکاندا نموونەی ئەو کەسانە زۆرن کە بێگومان خودی شێخ ئۆسامە بن لادەن یەکێکیانە کە بە داخەوە ماوەیەك پێش ئێستا شەهید بوو. هەروەها کەم نین ئەو شێخە عەرەبانەی ئامادەن لەباری ماڵییەوە یارمەتی گروپ و ڕێکخراوە سەلەفی جیهادییەکان بدەن تاکوو توانیبێتیان بەشداری لە پێشخستنی ڕاستەقینەترین ڕەوتی ئیسلامخوازیی ئەم سەردەمەدا بکەن.
بۆیە لە کوردستانی ئێرانیشدا هەرچەند زۆرن ئەو خەڵکە دەوڵەمەندانەی پشتیوانی لە ڕەوتی سەلەفییەتی جیهادییەوە دەکەن بەڵام زۆرترین ڕێژەی سەلەفییەکان و ئەندامانی ڕێکخراوە سەلەفییەکان سەر بە توێژی هەژاری کۆمەڵگای کوردستان و دانیشتووی ناوچەو ناوایی و گەڕەکە هەژارنشینەکان، بۆیە ئەتوانین بڵێین ڕێکخراوێکی وەك کەتائب خاوەن زۆرترین لایەنگرە لە ناو توێژی هەژاری کوردستانی ئێراندا. بەڵام بە نیسبەت ئەوەوە کە پرسیوتانە کەتیبەکانی کوردستانی ئەلقاعیدە لە کامە شوێن و ناوچەدا هۆگر و لایەنگری زۆرە، ئەتوانم بڵێم هەرچەند ئەم ڕێکخراوە لە هەموو شار و ناوچەکاندا جەماوەر و لایەنگری هەیە بەڵام بە هۆی ئەوەوە کە شاری سنە سەنتەری چالاکی ئەم ڕێکخراوەیە، بۆیە لەم شارەو ناوچەکانی دەوروبەریدا زۆرترین ئەندام و لایەنگری هەیەو پاشانیش بە پلەی دووهەم لە شاری سەقزدا گەشەی کردووەو خەڵکی لەگەڵ کەوتووە.

دیسان بابێینەوە سەر باسی کەتایب و کێشە ناوخۆییەکانی ئەم ڕێکخراوە، لە ماوەی چەند ساڵی ڕابردوودا ئەم ڕێکخراوە چەند جارێك تووشی دیاردەی جیابوونەوەو (انشعاب) بووەو دابەش بووە بە سەر چەندها لایەن و کەرتی جیاجیادا کە هەندێکیان ڕەنگە دان بە موسوڵمانبوونی یەکتریشدا نەنێن. بە ئاستی یەکەم هۆکاری ئەم لێکترازانە لە چیدا ئەبینی و بە ئاستی دووهەم بە وردی ناو و ساتەوەختی دامەزران و شێوازی کار و چالاکیی ئەو ڕێکخراوانەمان بۆ ڕوون بکەرەوە.

لە بەشەکانی پێشوودا تا ڕادەیەك وەڵامی ئەم پرسیارەم داوەتەوەو هەوڵ ئەدەم لێرەدا لایەنە باسنەکراوەکان بخەمە بەردەست. بە داخەوە نەك لە کوردستانی ئێران بەڵکوو لە ئاستی ناوچەیی و جیهانیدا هەندێ ناکۆکی لە نێوان ڕەوت و ڕێکخراوە سەلەفی جیهادییەکاندا هەیە. پێشتر وەك نموونە باسی ناکۆکی و ناهەماهەنگی ئەنساروئیسلام و لقی ئەلقاعیدەی عێراق و زیان و خەسارەکانیم کرد. هەروەها باسی هەمان ناکۆکیمان کرد کە لە وڵاتی ئێران و ناوچە کوردنشینەکەیدا لە نێوان ئەنسار و کەتائبدا هاتە ئاراوە. دواتریش هەندێ ناکۆکی لەناو خودی ئەم ڕێکخراوانەدا هاتە ئاراوە کە چەند دابڕان و جیابوونەوەیەکی لێ کەوتەوە بەڵام ئەم حاڵەتە زیاتر لەناو کەتائبدا بەرجەستە بۆوەو بە واتایەکی تر جیابوونەوەکان زیاتر لە ناو ئەم ڕێکخراوەدا ڕوویاندا. من هۆکاری سەرەکی ئەم ناکۆکی و جیابوونەوەیە بە هەبوونی نەخۆشییەکی کوشندە لە ناو سەلەفییەکاندا دەزانم و ئەگەریش بمانەوێ هەموو لایەنەکانی ئەم نەخۆشییە بخەینە بەرباس و شرۆڤەیان بکەین ئەوا پێویستمان بە کاتێکی زۆرەو ئەمەش لە مەجالی وتووێژەکەی ئێمەدا نییە. هەروەها وەك هۆکاری گشتی و سەرەکی بە تایبەت بە نیسبەت کەتیبەکانی کوردستانی قاعیدەوە، ناکۆکییەکانی ناو ئەم ڕێکخراوە ئەگێڕمەوە بۆ ساوابوون و کەم ئەزموون بوونی و بێگومان ئەمە دایکی هەموو ناکۆکییەکانی ناو کەتائبە. لە ناو ڕێکخراوێکی سەلەفی جیهادیدا کە جگە لە بیروباوەڕی ئیسلامیانەو هەوڵدان بۆ دابەزاندنی شەریعەت هیچ شتێك گرنگ و پیرۆز و خۆشەویست نییەو کاری بۆ ناکرێت، ئەگەر ئەزموون و تەجرەبە نەبێ ئەوا مەترسی زەقبوونەوەی

هەندێ شتی لاوەکی دێتە ئاراوە کە هیچ پێوەندییەکیان بە بیروباوەڕ و مەنهەجی ڕێکخراوەکەوە نییە. پێشتر بۆم باسکردن لە سەردەمی ئیمارەتی بیارەدا چۆناوچۆن هەندێ شتی لاوەکی ئەبووە هۆی دروستبوونی ناکۆکی لە نێوان موجاهیدینی جوند و ئەنساروئیسلامداو بەمەش هەموو ڕێکخراوەکە تووشی گرفت و سەرئێشە ئەبوو.

وا دیارە جەنابت ئامادە نیت باسی ناکۆکییەکانی نێوان گروپ و ڕێکخراوە سەلەفی جیهادییەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و ولاتی ئێران بکەیت، بۆیە بە پێویستی دەزانین لەمبارەیەوە هەندێ زانیاری بدرکێنین و خوێنەر لە هۆکارەکانی ئەم ناکۆکییانە ئاگادار بکەینەوە. بە نیسبەت ناکۆکی نێوان لقی ئەنساروئیسلامی ئێران و کەتیبەکانی کوردستانی قاعیدەوە، دەتوانین بڵێین ئەم ناکۆکییانە درێژەی ناکۆکییەکانی ئەنساروئیسلامی دایك واتە ئەنساروئیسلامی عێراق و لقی عێراقی ڕێکخراوی قاعیدەیە کە ماوەی چەند ساڵێکە بەردەوامە. ئەنساری ئێران لەو باوەڕەدایە وەك چۆن قاعیدە لە عێراق بە شەڕەکاری و بێ بەرنامەیی جیهادی ئەم وڵاتەی تێك و پێك دابوو، لقی ئێرانی ئەم ڕێکخراوەش واتە کەتایب بە هەمان شێواز لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا خەریکی شەڕەکارییە. ئەنسار لەوباوەڕەدان شێوازی تەبلیغ و بانگەشەو پەروەردەی کەتایب نەیتوانیوە ئەندامگەلێکی شارەزاو تێگەیشتوو بار بهێنێت و ستراتیژ و بەرنامەی ڕێکخراوەکەش بۆ ئەوە نابێ کە نوێنەرایەتی ڕەوتی سەلەفییەتی جیهادی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا بکات. بە گشتی ئەنسارەکان کەتایب بە بانگەشەی نادروست و چەواشەکردنی بیروباوەڕی سەلەفییەت تاوانبار دەکەن و ئەمەش دەگێڕنەوە بۆ نەخوێندەواربوونی ئەوان و ناشارەزابوونیان بە چەمکە شەرعی و ئیسلامییەکان و هەروەها بە بنەماکانی بیروباوەڕی سەلەفییەت. هەرچەند پێکهاتەی ئەندامانی ئەنسار هاوشێوەی هەمان پێکهاتەی کەتایبە بەڵام کەیفییەتی ئەندامانی ئەنسار لە سەرترەو ئەمەش پێوەندیی بە شێوازی پەروەردەو ڕاهێنانی ئەوانەوە هەیە. لە ڕاستیدا ئەنسار لە باتی ئەوەی بیەوێ بە پەلەپەل و خێرایی قەبارەی خۆی گەورە بکاتەوە گرنگی بە کەیفییەتی ئەندامانی خۆی داوەو هەوڵ ئەدا بەشێك لە ئەندامانی خۆی لەناو جیلی خوێندەوار و ئاکادیمیدا جەزب بکات. ئەمە لە حاڵێکدایە کە کەتایب و ڕێکخراوەکانی تر بەم هەستیارییەوە کار و چالاکییەکانیان ڕاناپەڕێنن و گرنگییەکی ئەوتۆ بە کەیفییەتی ئەندامانیان نادەن. هەروەها لە قۆناغی پەروەردەشدا حەساسیەتێکی ئەوتۆ بە خەرج نادەن. دەرکردنی چەند ژمارەی گۆڤاری (امت) بە زمانی فارسی، دامەزراندنی چەندین سایت و ماڵپەڕی ئەنتەرنێتی، تەرجەمەکردنەوەی دەیان کتێب و نامیلکەو بابەت لە عەرەبییەوە بۆ فارسی، بەشێکی بچووکن لە چالاکییەکانی لقی ئەنساروئیسلامی ئێران. بە نیسبەت ناکۆکییە نیوخۆییەکانی کەتایب و هۆکاری ئەو دابڕان و جیابوونەوانەش کە لەناو ئەم ڕێکخراوەدا ڕوویان داوە، دەتوانین بڵێین ناکۆکیی نێوان باشووری و ڕۆژهەڵاتییەکان، وازهێنان لە ئەرکی سەرەکیی کەتایب واتە جیهاد دژی حکوومەتی هەرێمی کوردستان، هەبوونی پێوەندیی لەگەڵ دەسەڵاتی ئێرانی و بەشداری نەدانی سەلەفییەکانی ڕۆژهەلات لە پۆست و بەرپرسیایەتییەکاندا، هۆکارە سەرەکییەکانی ئەم دابڕان و ناکۆکییانە بوون. ئەوەی ئێمە لە ئەندامە دابڕاوەکانمان بیستووە گلەیی و ناڕەزایەتی ئەوان بووە لە بەپرسانی کەتایب بە تایبەت لە ناسەربەخۆیی ئەوان لە بڕیاردان و دانانی پلان و بەرنامە بۆ ڕێکخراوەکەو گلەمەندبوون لەوەی کە ئەوان لە ژێر کاریگەری دەسەڵاتی ئێرانیدا ئەم کارە دەکەن واتە پلان و بەرنامە بۆ ڕێکخراوەکە دائەڕێژن. بۆ نموونە ئەوان دەڵێن کەتایب لە ژێر گوشاری ئێراندا جیهاد دژی دەسەڵاتی کوردیی لە باشووری کوردستان ڕاگرتووە یاخود باسی ئەوە دەکەن کە کتایب لە لایەن سوپای پاسدارانەوە پارەی وەرگرتووەو یارمەتی دراوە. هەروەها ئەندامە دابڕاوەکان لەوباوەڕەدان کە کوردەکانی باشوور دەستیان بە سەر هەموو بەشەکانی کەتایبدا گرتووەو بە بێ ئەوەی خۆیان تووشی زەحمەت بکەن، تیجارەت بە خوێنی گیانبەختکردووانی ڕێکخراوەکەوە دەکەن و ئەوەی کە بە دەستی ئەهێنن سەرفی ژیانی دونایی خۆیانی دەکەن. جیابوونەوەی مەلا

**عەبدولحەمیدی عالی و ژمارەیەك لە لایەنگرەكانی، جیابوونەوەی گروپی جەیش سەلاحەدین، دابڕانی گروپی جەیش سەحابە، جیابوونەوەی جەماعەتی جووتیار والی عەلی، ولازهێنانی ژمارەیەك لە گەنجە سەلەفییەكانی سەقز و.....هتد، دەرەنجامی ئەو ناكۆكییە نێوخۆییانەن كە لە سەرەوە ئاماژەمان پێكردن. شایانی ئاماژەیە لە سەرەتای دامەزرانیدا ئاوەها ناكۆكییەك لەناو باڵی ئەنسارولئیسلامی كوردستانی ئێرانیشدا هاتە ئاراوە كە جیابوونەوە یاخود دەركرانی ژمارەیەك لە ئەندامانی خەڵكی باشووری كوردستانی ئەم ڕێكخراوەی لێ كەوتەوە. پاش ئەم جیابوونەوەیە بەرەبەرە سەلەفییەكانی ڕۆژهەڵات هەموو پۆست و بەرپرسایەتییەكانی ئەنساریان گرتە دەست و بەمەش كۆتایی بە ناكۆكی باشووری و ڕۆژهەڵاتییەكان لە ناو ئەم ڕێكخراوەدا هات.**

**ئێستا بابێینەوە سەر باسەكەی خۆمان و بزانین لە دواڕۆژی ڕۆژهەڵاتی كوردستاندا سەلەفییەكان و حیزبە نەتەوەییەكان چۆن موعامەلەیەكیان پێكەوە ئەبێت؟ ئەم پرسیارە زۆر بەربڵاوە و ڕەنگە لێرەدا هەمووی وەڵام نەدرێتەوە، هەر بۆیە با پرسیارەكە ئاوا لێ بكەین كە ئەگەر تەیاری سەلەفییەتی جیهادی هەر لەم ئاستەدا كە هەیە بمێنێتەوە، بە پێی تایبەتمەندی و خەسڵەتەكانی لە داهاتوودا چ شێوازێكی كاركردن بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ. ئەگەر بە پێچەوانەیشەوە بێ و تا ئەوكات گەشەیەكی فرەتر بكاو ئەندام و لایەنگرێكی زیاتر پەیدا بكات، ئەم گەشە كردنە چ كاریگەرییەك لە سەر شێواز و جۆری كاركردنی لەم بەشەی كوردستاندا بەجێ ئەهێڵێ؟ بە گشتی بەرنامەی سەلەفییەكان بۆ داهاتووی ڕۆژهەڵاتی كوردستان چییەو چ پێشبینییەكی بۆ دەكەن؟**

پێشبینیكردنی ئاوەها حاڵەتێك لە ئێستادا كارێكی دژوارەو پێوەندیی بە هۆكار و لایەنەی جۆراوجۆرەوە هەیە بەڵام وەك ئێوە وتووتانە ئەگەر چەندین حاڵەتی بۆ دابنێین باشترە چونكوو داهاتووش لەم چەند حاڵەتە بەدەر نییە. بۆیە ئەگەر تا كاتی ئاڵوگۆڕی سیاسی لە ئێراندا، سەلەفییەتی جیهادی لە كوردستانی ئێران هەر لەم ئاستەدا بمێنێتەوە كە ئێستا هەیە بێگومان تێكگیرانی لەگەڵ حزب و ڕێكخراوە كوردی و عیلمانی و سیكۆلارەكاندا دوور لە چاوەڕوانی نییە. ئینجا ئەگەر لە خۆشبینانەترین و ناوازەترین حاڵەتدا دوولایەنی سەلەفی و عیلمانی لە سەر ئەو قەناعەتە بن كە پێكەوە شەڕ نەكەن ئەمە نابێتە چارەسەر چونكوو لە لایەن گروپ و ڕێكخراوەكانی ترەوە واتە عیلمانییەكانی تر و سەلەفییەكانی ترەوە ئەمەیان لێ قبووڵ ناكرێ و ئەم شەڕ و تێكگیرانە هەر ڕوو ئەدا. لە لایەك لایەنە كوردییەكان بەرنامەیان بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتێك هەیە كە سیكۆلاریزم یەك لە تایبەتمەندییەكانیەتی و لە لایەكی تریشەوە سەلەفییەكان هەوڵی دابەزاندنی شەریعەتی ئیسلام ئەدەن و باوەڕیان بە بەشداریكردن لە هیچ دەسەڵاتێكی كوفری و نائیسلامیدا نییە. بۆیە هیچكام لەوان ئامادە نین لایەنی بەرانبەر بێتە دەسەڵاتداری كوردستان و ئەوەی كە هێزی زیاتری هەبێ، سەركەوتووی مەیدانەكەیە. ئینجا ئەگەر لایەنی كوردی و عیلمانی ببێتە دەسەڵاتدار ئەوا سەلەفییەكان ئەگەرچی بە ژمارەش كەم بن، ڕازی نابن بچنە ژێر سێبەری ئاوەها دەسەڵاتێكەوەو بێگومان لە دژی جیهاد دەكەن.

ئینجا وەك ئاگادارن هەر لە ئێستاوە ئەم شەڕە دەستی پێكردووە، دەستپێكردنەكە لەگەڵ دیموكراتدا شەڕی تەبلیغییەو یەكەم جار لە لایەن دیموكراتەوە یان لە لایەن چەند كەسانێكی ناو ئەم حزبەوە دوو سیدی دژی سەلەفییەكان بڵاو كرایەوە كە یەكیان باسی مەترسیداربوونی دەسەڵاتی سەلەفییەكان دەكات و ئەنسار و ئیمارەتی بیارە بە نموونە دێنێتەوەو ئەوی تریشیان تێكەڵاوێكی هەندێ لە سەربڕینەكانی ئەنسارولسوننە –ئەم تەسویرانە لە بڵاوكراوەیەكی ئەنسارولسوننە بە ناوی (نصر من الله و فتح القريب) وەرگیرابوون كە سەربڕینی ژمارەیەك لە هێزەكانی نیپاڵ و چەند سەربڕینێكی تری لەخۆ گرتبوو– و هەندێ تەسویری تایبەت بە ئەشكەنجەی سەردەمی بەعس بوو. دیموكرات لە ئاستێكی بەرین و بەربڵاودا ئەم سیدیانەیان بڵاو كردەوەو مەبەست لەم كارەش ناشیرینكردنی سیمای سەلەفییەت و ئیسلامییەكان بوو. پاشان لە لایەن سەلەفییەكانەوە چەند جارێك باسی ئەم حزبە كراوەو ئەم باسانە لە سیدی و شریتە

قیدیۆییەکاندا مەوجوودە. جارێکیش مەلا عەبدولهادی سەقز (هەرمێدۆڵ) لە وتارێکیدا بە تایبەتی باسی دیمۆکرات و هەلومەرجی ئەم حزبەو مەنهەج و بەرنامەیان ئەکات کە ئەویش سیدییەکەی بڵاو بووەوەو وابزانم ئێستاش بە ئاسانی دەست بکەوێ. هەروەها کاتی خۆی باسی ئەوە دەکرا کە تەقەکردن لە «مەلا حسەینی قەیتەرانی» کە ناسەرکەوتوو بوو و نەبووە هۆی کوژرانی ئەو، لە لایەن حزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانەوە بووە بەڵام تاکوو ئێستاش بە تەواوی روون نەبۆتەوە کە ئەوان ئەم کارەیان کردووە یان نە. بەڵام بە نیسبەت کۆمەڵەوە شەڕەکە لە حاڵەتی تەبلیغ دەرچووەو ئەوان دەستیان بە خوێنی سەلەفییەکان سوور بووە، ئەندامانی کۆمەڵە ماوەیەك پاش هیجرەتی ئەندامانی ئەنساروئیسلام بۆ کوردستانی ئێران، لە لایەن دەزگا ئەمنییەکانی یەکیەتییەوە راسپێردران بۆ تیرۆرکردنی سەلەفییەکان. دەزگاکانی یەکیەتی بە دانی پارەو ئیمکانات و دەسنیشانکردنی کەسانێکی تایبەت بۆ ئەندامانی کۆمەڵەو ژمارەیەك خەڵکی تر، بە هۆی ئەوانەوە چەند ئەندامێکی رێکخراوە سەلەفییەکانیان تیرۆر کردووە کە وەك نموونە ئەتوانم ئاماژە بە تیرۆری ئەنوەر ئەشکاوەند، تەییب ئێراندووست، حاجی سەعدی شیرزاد، هادی شیرزاد و کەریم کۆنەپۆشی بکەم کە لە دوو کاری تیرۆریستیدا لە شاری مەریوان شەهید کران. ئینجا من خۆم لەو باوەڕەدام دیمۆکرات بە حەدی کۆمەڵە ئامەزرۆی شەڕی سەلەفییەکان نەبێ، وەك پێشینەش کۆمەڵە خاوەن پێشینەی دژایەتیکردنی ئیسلامییەکانەو کاتی خۆی بەرانبەر مەکتەب قورئان و تەنانەت دژی سوپای رزگاری کە گروپێکی سەر بە تەریقەی نەقشبەندی بوو و لە لایەن شێخ عوسمان سیراجەدینییەوە رێبەرایەتی دەکرا، ئەم کارەی کردووە. بە نیسبەت پەکەکەیشەوە هەرچەند بیروباوەڕ و مەنهەجی ئەوان زیاتر لە حزبەکانی تریش دژە ئیسلامییە بەڵام تاکوو ئێستا ئەم دیوەو ئەم بیستووە دژایەتی ئیسلامییەکان و سەلەفییەکان بکەن. جا ئەمانە روانگەی خودی خۆمەو رەنگە هەم سەلەفییەکان و هەم حزبە کوردییەکانیش زۆر دژی ئەم قسانە بن بەڵام من بە پێی هەڵسەنگاندن و تێگەیشتنی خۆم ئەم قسانەم کردووە.

ئەگەر سەلەفییەت لە کوردستانی ئێراندا گەشەیەکی زۆرتر بکات و زۆرینەی خەڵکی کۆمەڵگای کوردستانی لەگەڵ بکەوێت، زۆر ئاساییە لە ئاوەها حاڵەتێکدا لە لایەن سەلەفییەکانەوە حوکم بە شەرعی ئیسلام ئەکرێت و ئیمارەتێکی ئیسلامی دائەمەزرێت هەروەك چۆن ئەگەر نەتەوەیی و عیلمانییەکان زۆرینە بن، دەست ئەدەن دامەزراندنی دەسەڵاتێك بە مۆدێل و شێوازی خۆیان. ماوەتەوە بڵێم بەدەر لەم حاڵەتانەو بە پێچەوانەی ئەو روانگە نادروستەی کە بە نیسبەت سەلەفییەکانەوە دروست بووە، ئەوان چەندە ئامادەی جیهاد و فیداکارین لە رێی خواو دینەکەیاندا، ئەوەندەش ئامادەی ئاشتی و ئاسایش و ژیانی ئاسوودەن بە مەرجێك لەناو کۆمەڵگادا هەست بە سەربەرزی بکەن و دەسەڵات واز لە سەرکوت کردنیان بهێنێ و سووکایەتیان پێ نەکات. بۆیە ئەوان لە هەردوو حاڵەتی زۆرینەیی و کەمینەییدا ئامادەی ئاشتین و رەنگە لە داهاتووی کوردستانی ئێرانیشدا حاڵەتێکی ئاوا بێتە ئاراوە. بەڵام دیسان ئەمە قسەو بۆچوونی منەو رەنگە بۆچوون و قسەی بەرپرسان و ئەندامانی رێکخراوە سەلەفییەکانی کوردستانی ئێران شتێکی تر بێت. بۆیە بۆ باشتر گەیشتن لەم مەسەلەیە پێویستە لەگەڵ بەرپرسانی ئەو رێکخراوانەدا قسە بکرێ و مەجالیان پێ بدرێ تاکوو باس لە بەرنامەو داهاتووی خۆیان و کوردستانی ئێران بکەن.

پێدەچێ لەم پێشبینی و هەڵسەنگاندنەدا گەڵێ گەشبینانە داوەریت کردبێ. هەرهەموومان ئەزانین کە دیمۆکراسی، سێکۆلاریزم و دامەزراندنی سیستەمێکی حکومەتیی نوێ و مۆدێرن خواستی هێزە عیلمانی و نەتەوەییەکانەو لە بەرانبەریشدا سەلەفییەکان هەوڵی دابەزاندنی شەریعەتی ئیسلام و دامەزراندنی ئیمارەتێکی ئیسلامی ئەدەن. بێگومان ئەم دوو بەرنامەو مەنهەجە لە هیچ شتێکدا یەك ناگرنەوەو بەم پێیە ئەم دوو بەرەیە لە داهاتووی رۆژهەڵاتی کوردستاندا

**ناتوانن پێکەوە بژین و بێگومان ئەگەر رەوتی رووداوەکان هەر ئاوا بڕوا ئەوا بەگژ یەکیشدا ئەچن. مەگەر ئەوەی سەلەفییەت چیدی لە مەیداندا نەمێنێتەوە. لەم پێوەندییەدا دەتوانین پێشبینی چەند ئەگەر و پێشهاتێک بکەین.**

**یەکەم:ئەگەر سەلەفییەت لەم ئاستەی ئێستادا بمێنێتەوەو لە لایەن دەسەڵاتی کوردییەوە رێگای بانگەشەو پەروەردەی پێ بدرێ رەنگە دژی دەسەڵاتی کوردی نەوەستێ و «جیهادی» لەگەڵ نەکات. پێچەوانەی ئەم حاڵەتە، واتە لەمپەردانان لە بەردەم کار و چالاکیی ئەواندا رەنگە دژکردەوەی توندوتیژ و دژایەتیی دەسەڵاتی کوردیی لێ بکەوێتەوە.**

**دووهەم: ئەگەر سەلەفییەتی جیهادی ببێتە زۆرینەو لایەنی باڵادەستی نێو کۆمەڵگا ئەوا ئیمارەتێکی ئیسلامی لەم بەشەی کوردستاندا رائەگەیەنێ. بێگومان لەم دۆخەدا هیچ هێز و حیزب و گروپ و تەنانەت تاکێکی ناسیۆنالیست یا عیلمانی دەرفەتی کار و چالاکیی پێنادرێت و سەلەفییەت رووبەڕووی هەموو جۆرە رێبازێکی نەتەوەیی و عیلمانی ئەبێتەوە، چونکوو بە بێباوەڕ و مورتەددیان ئەزانێ. بۆیە ئەگەر لایەنی عیلمانی لە ناوچەیەکدا قەتیس مابێ بێگومان دەسەڵاتی سەلەفی شەڕی لەگەڵ ئەکات.**

**بە سەرنجدان بەوەی کە ئێستا سەلەفییەتی جیهادی بە شێوەیەکی زۆر جیدی دژایەتی هەموو دیاردە نەتەوەییەکان بە تایبەت هێماو بۆنەو جەژنە نەتەوەییەکان دەکا، روون و ئاشکرایە کە لە دوارۆژیشدا ئەم دژایەتییە بەردەوام دەبێ و ئەمەش مانای هەڵگیرساندنی شەڕ و پێکدادانە لە نێوان سەلەفییەکان و لایەنە نەتەوەیی و عیلمانییەکاندا.**

**هەروەها بە نیسبەت بەشداریکردنی سەلەفییە جیهادییەکان لە پرۆسەی سیاسیداو لە سەردەمی دەسەڵاتداری عیلمانییەکاندا، تاکوو ئێستا نەمان دیوە رەوتی سەلەفییەتی جیهادی لە هیچ شوێنێکی ئەم دونیایەدا ئاوەها کارێک بکات و بێگومان لە کوردستانی ئێرانیشدا ئەم کارە ناکات.**

**با درێژە بە پرسیارەکان بدەین و دەربارەی جیابوونەوەی جەماعەتی جووتیار والی عەلی، جەماعەتی مەلا عەبدولهادی شکاک، جەیش سەلاحەدین، جەیش سەحابەو تەوحید و جیهاد فی کوردستان لە کەتایب بپرسین و بزانین بۆچی ئەمان بە پێچەوانەی ستراتیژی ئەلقاعیدە لە بەرانبەر حکوومەتی ئێراندا، دژی ئەم دەسەڵاتە دەستیان دایە جیهادکردن؟**

سەرەتا با باسی ئەوە بکەم کە ئەم گروپانە سەرباری ئەوەی لەبەر هەندێ هۆکاری هاوبەش لە کەتائب جیابوونەتەوە بەڵام گەلێ جیاوازیشیان پێکەوە هەیە. جەماعەتی مەلا عەبدولهادی ورمێ و گروپەکەی جووتیار والی عەلی بە ئاستێکی زۆر وەك یەك بیریان ئەکردەوە بە تایبەت لە مەسەلەی تەکفیردا یەك روانگەو بۆچوونیان هەبوو. ئەوان کەتائب و رێکخراوە سەلەفی جیهادییەکانی تریان بەوە تاوانبار ئەکرد کە لە تەکفیرکردندا ئاسانگیر و کەمتەرخەمن و پێنج و پەنای زۆریان هەیەو هۆکاری سەرەکی جیابوونەوەشیان لە کەتائب و رێکخراوی ئەلقاعیدە هەر ئەمە بوو. ئەوان پێش جیابوونەوە هەوڵی زۆریان دا تاکوو بۆچوونەکانی خۆیان بە سەر کەتائبدا زاڵ بکەن و وا لەم رێکخراوە بکەن تەکفیری حکوومەتی ئێران و پێڕەوانی مەزهەبی شیعە بکات و لە دژی ئەوان جیهاد رابگەیەنێت. ئینجا کاتێك هەڵوێستی نەگۆڕی کەتائبیان بینی و زانییان ئەم رێکخراوە ئامادە نییە حکوومەتی ئێران بە کافر بزانێت، بڕیاری دابڕان و جیابوونەوەیان دا. ئەم دوو گروپە ئەوەندە لە تەکفیر کردندا رەهاو دەست ئاوەڵان کە تەنیا خەڵکانێکی زۆر کەم ئەکەونە دەرەوەی بازنەی تەکفیری ئەوانەوە، تەنانەت باسی ئەوە ئەکرێ کە جەماعەتەکەی مەلا عەبدولهادی جگە لە ئەندامانی کەتائب و رێکخراوە سەلەفییەکانی کوردستانی ئێران، شێخ ئوسامە بن لادەن و رێبەرانی قاعیدەشیان تەکفیر کردووەو بە کافریان زانیون. جیاوزی ئەم دوو جەماعەتە ئەوەبوو کە جووتیار و لایەنگرەکانی دەسبەجێ پاش جیابوونەوەیان لە کەتائب، کەوتنە ئەعداد و خۆ ئامادەکردن بۆ لێدانی ئێران بەڵام پێش دەستبەکار بوونیان، لە کاتێکدا لە خانوویەکی نهێنیدا لە گەڕەکی گرێزەی شاری سنە سەرقاڵی دانانی پلان و نەخشە بوون بۆ ئەنجامدانی چالاکی عەسکەری دژی دەسەڵاتی ئێران، لە لایەن هێزەکانی ئێرانەوە دەوریان گیراو پاش شەڕ و تەقەو لێدانێکی چەند سەعاتە جووتیار و چەند کەسێکی

تری گروپەکە کوژران و چەند کەسێکیشیان بە برینداری یاخود بە ساغی دەستگیر کران. ئیتر ئەمە کۆتایی تەمەنی جەماعەتەکەی جووتیار والی عەلی بوو. بەڵام جەماعەتەکەی مەلا عەبدولهادی کە شاری سنەیان کردۆتە سەنتەری چالاکی خۆیان و خودی مەلا عەبدولهادیش کە لە لایەن سەلەفییەکانی سنەوە خێزاندار کراوە، تاکوو ئێستا دەستیان بۆ چەك نەبردووەو هەرچەند حکوومەتی ئێران بە تاغووت دەزانن و سەرجەم پێڕەوانی مەزهەبی شیعەش بە مورتەد ناو دەبەن بەڵام جیهادیان دژی ئەم حکوومەتە رانەگەیاندووە.

هەرچەند گروپەکانی جەیش سەلاحەدین و جەیش سەحابە لە تەکفیرکردندا وەك جەماعەتەکەی جووتیار و مەلا عەبدولهادی نین بەڵام وەك خۆیان دەڵێن، بە ئاستی کەمتائیش کەمتەرخەم و شلگیر نین. ئەوان جگە لەوەی کەوتنە تەکفیرکردنی حکوومەتی ئێران و دژی ئەم حکوومەتە جیهادیان راگەیاند، هەندێ کاری تریشیان کرد کە ئەمە پێوەندیی بە رەهابوونی ئەوانەوە بوو لە مەسەلەی تەکفیر کردندا. هەروەها ئەمە یەکێك لە جیاوازییەکانی ئەوان بوو لەگەڵ بەرپرسانی کەتائب و یەك لە هۆکارەکانی دابڕانیشیان بوو لەم رێکخراوە. بێگومان ئەوان هەم وەك کوردی ئێران و هەم وەك ئەهلی سوننەی ئێران کە زیاتر لەگەڵ حکوومەتی ئێران و کار و کردەوەکانی ئەم حکوومەتەدا ئاشنا بوون و لە نزیکەوە هەڵسووکەوتی ئەم حکوومەتەیان بە نیسبەت کوردە سوننەکان و ئەهلی سوننەی ئێران بینیبووە، بە نیسبەت دەسەڵاتی ئێرانییەوە خاوەن روانگەو بۆچوونێکی ترن و رق و قینێکی زۆریان لە دڵدایەو ئەمەش جیاوازییەکی تری ئەوانە لەگەڵ بەرپرسانی کەتائب کە زۆربەیان خەڵکی کوردستانی عێراقن.

دابڕان و جیابوونەوەی ئەم گروپانەو جیهادکردنی هەندێکیان دژی حکوومەتی ئێران، نەك بووە هۆی بەرکەوتن و لێدان و گیران و کوژرانی خۆیان بەڵکوو بووە ماڵ بە سەر خەڵکانی تریشەوەو کاریگەری نیگەتیڤی لە سەر کار و کردەوەی گروپە سەلەفی جیهادییەکانی تریش داناو پاش ئەمە ئیتر حکوومەتی ئێران دەستی دایە گرتن و زیندانیکردنی ئەوانیش و ساحەی هەڵسووڕان و چالاکیی لێ تەنگ کردنەوە. هەم کەتائب و هەم ئەنسار و هەم ئەحفاد سەلاحەدین و هەمیش خەڵکانێکی زۆری دەرەوەی ئەم رێکخراوانە، بە بێ ئەوەی دژی دەسەڵاتی ئێرانی کارێکیان کردبێ، کەوتنە بەر شاڵاوی گیران و بەندکران و دەزگا ئەمنییەکانی ئێران هەموو جۆرە بەربەستێکیان لە بەردەم ئەواندا داناو ئێستاکەش زۆر بە وردی چاودێری هەڵسووکەوت و جموجووڵی ئەوان دەکات.

**دەربارەی کار و کردەوەی گروپە دابڕاوەکان پێویستە بە ئاگاداری خوێنەری بەڕێز بگەیەنین کە ئەم گروپانە بە پێی ئەو باوەڕە تەکفیرییە بەربڵاوەی کە هەیانبوو و هەیانە، جگە لە بە تاغووت زانینی حکوومەتی ئێران و راگەیاندنی جیهاد دژی ئەم حکوومەتە، هەندێ کاری تریشیان ئەنجام داوە کە زیاتر خەڵکانی ئاساییان تیادا کراوەتە ئامانج. بۆ نموونە جەماعەتەکەی جووتیار والی عەلی یەکەم جار بە مەبەستی خۆ تەیارکردن لە باری ماڵییەوەو بە مەبەستی کڕینی سیلاح و پێداویستییەکانی تر، دەستیان دایە بڕین و تاڵانکردنی تەلافرۆشییەك لە شاری سەقز کە تیایدا چەندین کەس بریندار بوون، ئەم کارە بە سەرپەرشتی و بەشداری خودی جووتیار والی عەلی بەڕێوە چوو. هەروەها ئەم جەماعەتە لە کاتێکدا بە مەبەستی گواستنەوەی سیلاح و تەقەمەنی ماشینێکی نیسانی بارهەڵگر دەبەنە دەرەوەی شاری سنە ، بەهۆی ئەوە کە شۆفێری ماشینەکە ئەهلی نوێژکردن نەبووە تەکفیری دەکەن و دەیکوژن.**

**گروپی جەیش سەحابەش هەندێ کاری هاوشێوەی ئەمانەی ئەنجام داو ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە پاشماوەکانی گروپی جەیش سەلاحەدین واتە ئیسماییل شکاك و چەند کەسێکی تر تێکەڵ بەم گروپە ببوون. بڕین و تاڵانکردنی تەلافرۆشییەك لە شاری زەنجان کە کوژراو برینداری لێ کەوتەوە، تاڵانکردنی دوو تەلافرۆشی لە ناوچەی «خزر»ی شاری هەمەدان کە تیایدا چەندین کەس بریندار بوون، تەکفیرکردن و کوشتنی کەسێکی شیعە مەزهەبی دانیشتووی هەمەدان بە ناوی «هیدایەت حەسەن خانی»و بردنی ماشینەکەی، کوشتنی خەلیفە «ئیبراهیم فەرهادی» دانیشتووی شاری قوروە**

به بیانووی ئەوەی گوایە لە ڕێگای خەلیفایەتی و بەڕێوەبردنی تەکیەی دەروێشانەوە پەرەی بە شیرك و بیّ ئیمانی داوە، تێکدانی قەبری چەندین مەزارگەو شکاندنی قەبری مردووان و.....هتد بەشێکن لە چالاکییەکانی ئەم گروپە.
با بچینەوە سەر باسەکەمان و بگەڕێینەوە بۆ سەرەتاکانی «هیجرەت»ی ئەنسارەکان بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان. جیا لە کەتیبەی فەتح کە لە ئەنسارئیسلام جیابووەوە، پاشماوەکانی ئەنسار بەرەو کویّ چوون و چییان بەسەر هات؟

وەك لە وەڵامی پرسیارەکانی پێشووتریشدا ئاماژەم پێدا، بەشی زۆری ئەنسارەکان گەڕانەوە عێراق و بە ئەمیرایەتی ئەبوو عەبدوڵڵای شافیعی و بە ناوێکی تا ڕادەیەك جیاوازەوە واتە بەناوی ئەنسارولسوننەوە دەستیان بەکار و جیهاد کردەوە. بەشێکیش لە سەر ئیجازەی سەرکردایەتی ئەنسار لە ئێراندا مانەوەو دواتر بەشدارییان لە دروستکردنی لقی ئێرانی ئەنساردا کرد. ئەنسار لە قۆناغی نوێی کارکردندا بە هێواشی و هەستیارییەکی تایبەتەوە کاروباری ڕێکخستنی خۆیان ڕاپەڕاند و ئەمەش هەندیّ جار ماندووبوونی هەندیّ لە ئەندامانی ئەم ڕێکخراوەی لیّ ئەکەوتەوە. هەروەها ڕێکخراوە سەلەفی جیهادییەکانی تر ئەنسارییان بەوە تاوانبار دەکرد (یاخود دەکەن) کە زۆر ورد هەنگاو هەڵەگرێت و ڕەوتێکی خاوی جیهادیی گرتووەتە بەر. ئەم ڕێکخراوانە بەم بیانووانەوە دەستیان داوەتە ساردکردنەوەی ئەندامانی ئەنسارولئیسلام و کاریگەرییەکی وایان لە سەر داناون کە ژمارەیەکیان دەستبەرداری ئەم ڕێکخراوە بن. لە بەرانبەردا ئەنسار نەیویستووە یان نەیتوانیوە ئەم کارە لەگەڵ کەتائب و ڕێکخراوی ئەلقاعیدەدا بکات و ڕەنگە ئەگەر ئاوا کارێکیشی بکردایە سەرکەوتنی بە دەست نەهێنایە چونکوو ئەندامانی ئەلقاعیدەو کەتائب و زۆربەی سەلەفییەکان حەزیان لە خاوەخاو و بە حەزەرەوە هەنگاونان نییە لە ساحەی جیهاددا. هەرچەند ئەنسار لە سەرەتای خۆ ڕێکخستنەوەی دووبارەیدا دەستی دایە چالاکی جیهادی دژی ئەمریکاو هاوپەیمانان و هەروەها هێزە کوردی و عێراقییەکان لە وڵاتی عێراق و هەرێمی کوردستان بەڵام باڵی ئێرانی ئەم ڕێکخراوە لە ئێران هیچ چالاکییەکی جیهادی لە ناوچە سنوورییەکانی هەرێمی کوردستان و وڵاتی ئێران ئەنجام نەداوە.
ئەڵبەت بە پێچەوانەی کەتائبەوە کە خاوەن هەیکەلی ڕێکخراوەیی تایبەت و سەربەخۆییەکی زۆرە لە ئەنجامدانی کاروبار و چالاکیدا، باڵی ئەنسارولئیسلامی ئێران خاوەن ئاوەها هەیکەل و سەربەخۆییەك نییە. بۆ نموونە ئەنساری ئێران وەك کەتائب خاوەن هەیئەی شەرعی و هەیئەی سەربازی تایبەت بەخۆی نییەو ناچارە بە مەبەستی تاووتوێکردن یان بڕیاروەرگرتن لەسەر هەر بابەتێکی شەرعی ڕاوێژ لەگەڵ هەیئەی شەرعی ڕێکخراوی دایکدا لە عێراق بکات. تەنیا ئەندامێك بۆ ڕاپەڕاندنی کارە بچووکە شەرعییەکانی وڵاتی ئێران دیاری کراوە کە ئەمە لە لایەك بە قازانجی ڕێکخراوەکەیەو لە لایەکی تریشەوە ڕێکخراوەکەی بەرەو لاوازی بردووە. لە ڕاستیدا ئەم کارەش پێوەندیی بەو هەستیارییەوە هەیە کە ئەنسار لە هەموو بوارەکاندا بەکاری ئەبات و ئاساییە لە مەسەلەیەکی گرنگی وەك مەسەلەی شەرعیشدا هەمان هەستیاری بەکار ببات. هەروەها ئەم هەستیارییە بە هەمان ئاست لە بەشی سەربازییشدا ڕەنگی داوەتەوەو بۆتە هۆی ئەوە کە ئەنسارولئیسلامی عێراق ئیجازەی دامەزراندنی نەك هەیئە بەڵکوو تەنانەت دەستەو کومیتەیەکی سەربازییش بە باڵی کوردستانی ئێرانی خۆی نەدا. بە پێچەوانەی کەتائب، لقی ئێرانی ئەنسارولئیسلام پێشتر ئەو ئەندامانەی خۆی کە خوازیاری جیهاد بوون، ڕەوانەی وڵاتی عێراق ئەکرد.
لە وەڵامی پرسیارەکانی پێشوودا باسی ئەوەم کرد کە لقی ئەنسارولئیسلامی ئێرانیش لە کاتی دامەزرانیەوە تاکوو ئێستا تووشی چەند دابڕان و جیابووورنەوەیەك هاتووە بەڵام هیچکام لەم جیابوونەوانە وەك ئەوانەی لە کەتائب جیابوونەوە، نەبوونە هۆی دروستبوونی گروپ و ڕێکخراوی تر. تەنیا لە ئاکامی یەك لەو جیابوونەوانەدا لە لایەن چەند کەسێکەوە دامەزرانی گروپێکی سەلەفی جیهادی بە ناوی (سرايا ابوو بصير في شمال العراق) پێشنیار کراو ئیتر هیچ کات

ئەگەیشتە قۆناغی بڕیاردان و ڕاگەیاندن و دەستبەکار بوون. هەڵبژاردنی ئەمیر و ڕاوێژکار و شۆرای شارەکان لە ناو لقی ئەنسارولئیسلامی ئێراندا هاوشێوەی کەتائبەو لەم بوارانەدا جیاوازییەکی وەها لە نێوان ئەم دوو ڕێکخراوەدا نییە.

**ئەوەندەی ئێمە ئاگادارین بە پێچەوانەی وتەکانی جەنابت لقی ئێرانی ڕێکخراوی ئەنسارولئیسلام خاوەن «هەیئەی شەرعی»ی تایبەت بە خۆیەتی، ئەمیری ئەم لقە جگە لەوەی نوێنەری ڕێکخراوی ئەنسارولئیسلامە لە ئێراندا لە هەمان کاتیشدا ئەندامی هەیئەی شەرعیی ڕێکخراوەکەیشە. هەروەها ئەوەندەی ئێمە ئاگادارین لقی ئەنسارولئیسلامی ئێران بە مەبەستی جیهادکردن و پەروەردەی سەربازی، ئەندامانی خۆی هەم ڕەوانەی ئەفغانستان و هەمیش ڕەوانەی وەزیرستانی پاکستان کردووە، ئەگەر هەڵەشمان نەکردبێت ساڵی ١٣٧٨ی هەتاوی لقی ئەنساری ئێران چەند ئەندامێکی خۆی بە مەبەستی پەروەردەی سەربازی ڕەوانەی لای گروپێکی سەلەفی جیهادی لە وەزیرستانی پاکستان کردووە. ئێستا با ئاوڕێك لە دەسپێکی دامەزراندنی لقی ڕۆژهەڵاتی کوردستانی ئەنسارولئیسلام بدەینەوەو بزانین دروستبوونی ئەم لقە ئەگەڕێتەوە بۆ کوێ و بۆ کەی؟ ڕاستە ئەڵێن لایەنگرانی عەبدولقادری تەوحیدی لەو یەکەم کەسانە بوون کە تێکەڵ بە ڕێکخراوی ئەنسارولئیسلامی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوون و بناغەی ئەم ڕێکخراوە لە لایەن ئەوانەوە دانرا؟**

بەنیسبەت ئەوەوە کە ئەمیری لقی ئەنسارولئیسلامی کوردستانی ئێران یەك لە ئەندامانی هەیئەی شەرعیی ڕێکخراوی ئەنسارولئیسلامی دایك بێت منیش لەگەڵ ئێوەدا هاوڕام و ئەمە تەئید دەکەم بەڵام ڕەتی دەکەمەوە کە ئەنساری ئێران خاوەن هەیئەی شەرعی تایبەت بە خۆی بێ و تاکوو ئێستا شتێکی وام نەبیستووەو نەبینیوە. بۆیە هەروەك باسم کرد ئەوان تاکوو ئێستا مەسەلە شەرعییە بچووکەکانیان لە ڕێگای شەرعزانەکانی ناو خۆیانەوەو کە یەکێکیان «مەلا حسەین» هەڵبجەییەو لە سەردەمی ئیمارەتی بیارەدا پێیان دەوت مەلا حسەینی هەیئەی شەرعی، تاووتوێ کردووەو مەسەلە گەورەو جیدیەکانیشیان ڕووبەڕووی هەیئەی شەرعی ئەنسار لە عێراق کردۆتەوەو ئەوانیش وەڵامەکەیان لە ڕێگای مەلا حسەین یان شەرعزانێکی ترەوە ڕەوانەی ئێران کردۆتەوە.
دروستبوونی لقی ئەنسارولئیسلامی ئێران ئەگەڕێتەوە بۆ پاش جیابوونەوەی کەتیبەی فەتح لەم ڕێکخراوە واتە بۆ مانگەکانی شەش و حەوتی ٢٠٠٣ی زایینی. یەکەمجار هەندێ لەو ئەندامانەی کەتیبەی فەتح کە لەگەڵ ئەنساردا مابوونەوە بە هاوکاری چەند ئەندامێکی تری ئەنسارولئیسلام، بەردی بناغەی باڵی کوردستانی ئێرانی ئەم ڕێکخراوەیان داناو دواتریش ئەندامانی بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستانی ئێران واتە لایەنگرانی مامۆستا عەبدولقادری تەوحیدی بە شێوەی تەنسیق پێوەندییان بەوانەوە کردووە. ئەم تەنسیق و پێوەندیی و هاوکاری کردنە نزیك بە دوو ساڵی خایاندووەو پاشان ئەوان واتە لایەنگرانی مامۆستا تەوحیدی بڕیاری تووانەوەو قاڵبوونیان لە ناو ئەنسارولئیسلامدا داو بە تەواوی تێکەڵ بەم ڕێکخراوە بوون و وازیان لە بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستانی ئێران هێنا.

**ئەنسارولئیسلامی ئێران لە سەرەتای دامەزرانییەوە تووشی چەندەها کێشەی ورد و گەورە بوو و لە ئاکامی ئەم کێشانەدا گەڵێ ئاڵوگۆڕ لە ئاستی قیادەو سەرکردایەتی ئەم ڕێکخراوەدا ڕووی داو چەندین ئەمیر و سەرکردەیش جیا بوونەوە. جەنابت هۆکاری ئەم ناکۆکییانە لە چیدا ئەبینی؟**

هەرچەند تەنزیماتی ئەنسارولئیسلامی ئێران جگە لە جیابوونەوەی زۆرینەی ئەندامانی کەتیبەی فەتح رووبەڕووی کێشەیەکی وەها نەبۆتەوە وەك ئەوەی ئێوە وتووتانە بەڵام لە ماوەی ساڵانی ٢٠٠٣ تا ٢٠١١دا هەندێ کێشەی ورد و مامناوەندی لەناو ئەم رێکخراوەدا رووی داوە. هۆکاری سەرەکی ئەم ناکۆکییانە لەوەوە سەرچاوەی دەگرت کە پێوەندیی نێوان سەرکردایەتی لقی ئێرانی ئەنسار و سەرکردایەتی ئەم رێکخراوە لە عێراق بەرەو لاوازی رۆیشتبوو و کادێرە مامناوەندییەکانی ئەنساری ئێرانیش داوایان ئەکرد ئەم پێوەندییە بەهێز بکرێتەوە بەڵام بە هۆی خراپبوونی رەوشی ئەمنییەوە هەروەها گیرانی هەندێ لە سەرکردەکان لە لایەن ئێرانەوە یان لە لایەن عێراقەوە –لە کاتی سەفەرکردنیاندا بۆ ئەم وڵاتە– نەیاندەتوانی ئەم داخوازییەی کادێر و ئەندامەکان جێبەجێ بکەن. هەروەها لە لایەکی تریشەوە سەرکردایەتی ئەنسارولئیسلامی عێراقیش نەیدەتوانی دەست بداتە چارەسەرکردنی گرفت و تەنگ و چەڵەمەکانی نێوان ئەنسارەکانی کوردستانی ئێران، بۆیە بەردەوامبوونی ئەم حاڵەتەو چارەسەرنەکرانی کێشەکان چەند دابڕان و لێکترازانێکی لێ کەوتۆتەوە بەڵام واباشە وردەکارییەکان بهێڵینەوە بۆ خۆیان تاکوو چۆنیان پێ باشە وا باسی بکەن و بیگێڕنەوە. بە نیسبەت گۆڕانی ئەمیر و سەرکردەکانیش کە لە سەرەتای دروستبوونی ئەنسارولئیسلامی ئێرانەوە تاکوو ئێستا چەند جارێك رووی داوە، ئەتوانم بڵێم زۆربەی ئەم گۆڕانانە پێوەندیی بە گیرانی ئەمیرەکانەوە بووە لە لایەن دەسەڵاتدارانی ئێران و عێراقەوە نەك بە کێشە نێوخۆییەکانەوە.

**ئەو بەشەی ئەنسار کە گەڕانەوە وڵاتی عێراق پاش ماوەیەك خۆیان رێکخستەوەو لە ژێر ناوی (ئەنسارولسوننە)دا دەستیان بە کار کردەوە. ئایا ئەم ناو گۆڕینە کارێکی تاکتیکی بوو یاخود گرووپێکی نوێ و جیاوازیان دامەزراند؟ هەروەها بۆچی دواتر ناوی خۆیان گۆڕییەوە بۆ ئەنسارولئیسلام؟**

ئەوەندەی من بزانم ئەنسارەکان پاش گەڕانەوەیان بۆ عێراق، کاتێ خەریکی خۆ رێکخستنەوە بوون چەند گرووپێکی بچووك و مامناوەندیی تریان پێوە پەیوەست بوو. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە لە لایەکی ترەوە کەتیبەی فەتحیان لێ جیا بووبووەوەو ئەم کەتیبەیە لە راگەیاندن و بانگەشەکانیاندا ئەیانوت هەرچەند ئێمە هێمای سەرەکی رێکخراوەکە بووین بەڵام بەردەوام مافەکانمان پێشێل کراوەو داواکانمان پشت گوێ خراوە بۆیە ئێمەش وازمان هێناوەو پێمان وایە ئەمەش بە مانای لێك هەڵوەشانەوەی رێکخراوی ئەنسارولئیسلامە. بۆیە بەرپرسانی ئەنسار کە بە هۆی ئەو چەند گرووپەی ترەوە جێگای کەتیبەی فەتحیان پڕ کردبووەوە، بۆ ئەوەی منەتی کەتیبەی فەتح بە سەر خۆیانەوە نەهێڵن، ناوی رێکخراوەکەیان گۆڕی بۆ ئەنسارولسوننە. بۆیە گۆڕینی ناوەکە بەم هۆکارەوە بووە کەم باسم کرد نەك وەك ئەوەی ئێوە وتووتانە گۆڕینێکی تاکتیکی بووبێت. ئینجا هەرچەند ئەوان توانییان بەم ناوەشەوە لە ئاستێکی باشدا خۆیان بناسێنن و لە دڵی عەرەبەکانی عێراق و دەرەوەی عێراقدا جێگای خۆیان بکەنەوە بەڵام دواتر پاش چەند ساڵێ ناوەکەیان گۆڕییەوە بۆ ئەنسارولئیسلام. هۆکاری ئەمەش ئەوە بوو کە ئەنسارولئیسلام خاوەن ئەزموونی ئیمارەتی بیارە بوو کە بە سەردەمێکی زێڕینی دەسەڵاتداریی ئیسلامییەکان لە دونیای نوێدا دێتە ئەژمار و ئەمەش شانازییەکی گەورەبوو کە نەدەکرا بێ خاوەن بکرێ. بۆیە هەم بەو هۆیەو هەمیش بە مەبەستی دڵخۆشکردنەوەی دڵی ئیسلامییەکانی کوردستان ناوی رێکخراوەکە کرایەوە بە ئەنسارولئیسلام. جا ئەگەر هەندێ کەس ئەم ناو گۆڕینە بە خۆ بواردن لەو هەموو جیهاد و کوشت و کوشتار و سەربڕینەی سەردەمی ئەنسارولسوننە بزانن بەلای منەوە ئەمە رەتکراوەیە چونکوو یەکێك لەو سیدیانەی کە لە لایەن ئەنسارەوە بڵاو کرایەوە بە روونی باسی هەموو قۆناغەکانی ژیانی ئەم رێکخراوەی تیادا کراوەو

ئەنسـار لـەم سـيدييەدا بەرپرسـايەتی هـەموو كـار و چـالاكييەكانی گرتۆتـە ئەسـتۆ بـە چـالاكييەكانی سـەردەمی ئەنساروسوننەيشەوە كە حەسەن بن مەحموود (ئەبوو عومەر) ئەميريان بوو.

لە سەردەمی ئەنساروسوننەدا جگە لە گۆڕانی ناوی ڕێكخراوەكە، ئەميری ئەم ڕێكخراوەش ناوی خۆی گۆڕی بوو واتە وريا ڕەش هەولێری كە لە سەردەمی ئيمارەتی بيارەدا بە ئەبوو عەبدوڵڵا شافيعی دەناسرا ناوی خۆی گۆڕی بۆ حەسەن بن مـەحموود يـان ئـەبوو عومـەر. بـەم ئاڵوگۆڕانـەوەو بـەو شێوازە نوێيـەی چالاكيی جيهادييـەوە كـە گرتبوويـە پـێش، ئەنساروسوننە تـا چـەند تـوانی جێگايـەك بۆخۆی لـەنێو هاوكێشـەكانی دووای ڕووخـانی سـەدامدا بكاتـەوە، لێرەدا مەبەستمان بەراورد كردنێكە لە نێوان پێگەو جێگەی ئەنسار و گرووپە سەلەفييەكانی دیكەی وەك ئەلقاعيدەی عێراق. بە گشتی ئەنسار تا چەند توانی لە مەيدانی جيهاددا خۆی نيشان بداو ڕۆڵی ئەنسـار لـە ساحەی جيهادی عێراقدا چۆن ئەنرخێنرێ؟

بەڕای من ئەنساروسوننە لە ناو ساحەی جيهادی عێراقدا بە پێی ئەو دەورە بەرچاوەی كە هەيبووە پلەو پايەيەكی بەرز و بەرجەسـتەی بـە دەسـت هێنـاوە. ئەمـە قسـەيەك نييـە كـە وەك بانگەشـە بيكـەم يـاخود بـە هـۆی بانگەشـەكانی ئەنساروسوننەوە هاتبمـە سـەر ئـەم بـاوەڕە بـەڵكوو لـە ڕووی ئـەو هـەموو چالاكی و تێكۆشـانەوە ئەمـە ئـەڵێم كـە ئـەم ڕێكخراوە بەڕێوەی بردووەو هەموو كەس چ دۆست و چ دوژمن ئامادەیە ئيعترافی پێ بكات. يەك لەو كەسانە ئەبوو عومەر بەغدادی بوو كە كاتی خۆی لە بەلاغێكی فەرميدا ئەنساروسوننە وەك سوارچاكی ساحەی جيهادی عێراق ناو دەبات و دەستی برايەتی و هاوكارييان بۆ درێژ ئەكاتەوە. ئەو لەمبارەيەوە ئـەڵێت: «من وەك يەكـەم ئـەمير و سـەركردەی دەوڵـەتی ئيسلاميی عێراق ئەك كار و جيهاد و كۆششی خۆمان لە ئێوە بە زياتر نازانم بەڵكوو ئەوەش كە ئێمە هەمانەو كردوومانە ئاكامی ڕەنج و ماندووبوونی ئێوەيە».
بۆيە ئـەم هەڵسـەنگاندەن و ئيعتراف پێكردنە ئاماژەيە بۆ قورسايی و ڕۆڵی ئەنسار لە ساحەی جيهادی عێراقدا دەنا كەسێكی وەك ئەبوو عومەر كە ئەميرايەتی چەندين گرووپ و ڕێكخراوی دەكرد ئامادە نەدەبوو ئاوا بە ئاشكرايی و بە بێ پـەردە باسـی دەور و كاريگـەری ئەنساروسـوننە بكـات. وەك ئاگـادارن دەوڵـەتی ئيسـلامی ماوەيـەك پـاش دروسـتبوونی (شـوری المجاهـدين) ڕاگەيـەنراو هـەموو ئـەو ڕێكخراوانـەی چـووبوونە نـاو ئـەم شـوورايەوە بەشـدارييان لـە دەوڵـەتی ئيسلاميشدا كردبوو. بەڵام ئەنسار تاقە ڕێكخراوێك بوو كە وەڵامی ئەی بەم داواكارييە دايەوەو ئامادە نەبوو بچێتە ژێر سێبەری دەوڵەتی ئيسلامييەوە. بەڕای ئەنسار بە هەمان ئاست كە سەربەخۆ لە جيهاددا ئارام بـووە بـە هـەمان ئاسـتيش جيهادێكی قورس و قايمی كردووەو زەبری كوشندەی لە دوژمنان وەشاندووە.

تـا ئێسـتا ئاگامـان لـە هەڵوێسـتێكی لـەم چەشـنەی ئـەبوو عومـەر بەغـدادی دەربـارەی ئەنسـار نـەبووەو ئـاوا شـتێكمان نەبيستووە، بەڵام ئەيمەن زەواهيری ساڵی ۲۰۰۸ لە كاسێتێكدا كە لە لايەن ڕێكخراوی قاعيدەوە بڵاو بوويەوە دان بە ئامادەبوونی بەرچاوی ئەنسار لە گۆڕەپانی جيهادی عێراقدا ئەنێ و ڕۆڵی ئەبوو عەبدوڵڵای شافيعی بەرز ئەنرخێنێ و داوای لێ دەكا بەيعەت بدات و بچێتە ژێر چەتری ئەلقاعيدەوە. سەرەڕای ئەمە لە ماوەی چەند ساڵی ڕابردوودا ئەنسار هەروا سەربەخۆ ماوەتەوەو تەنانەت ويستوويەتی ببێتە ئەلتەرناتيڤی ئەلقاعيدەو ئەندامانی ئەم گرووپە لەو باوەڕدان كە لقی قاعيدەی عێراق نەيتوانيوە پێش بە شەڕەكاريی گرووپ و لايەنەكانی ژێر ئەمری خۆی بگرێ. لەلايـەكی تريشـەوە

**ئەندامانی قاعیدە بەردەوام هەوڵیان داوە کار و چالاکییەکانی ئەنسار بە کەم بایەخ و هەرزان لە قەڵەم بدەن و تەنانەت ئیدیعا ئەکەن ئەنسار کەسێکی ئەوتۆی لەگەڵدا نەماوە.**
**جیاواز لەم دوو بۆچوونە کە یەکیان باس لە بەرەوپێشچوونی ئەنسار دەکاو ئەوی تریان نایەوێ دان بە قەوارەو پێگەی ئەم گروپەدا بنێ، هەموو نیشانەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەم رێکخراوە بە شێوەیەکی جیدی و شێلگیرانە خەریکی کار و چالاکیی جیهادی و تەبلیغییەو بەردەوام هەوڵی بەرەوپێشچوون ئەدات و تەنانەت ئەیەوێ بە تاقیکردنەوەی شێوازی نوێی کاری رێکخراوەیی و بە کەڵکوەرگرتن لە ئەزموونی رێکخراوەگەلی وەکوو ئەلقاعیدە شکڵی رێکخراوێکی مۆدێرن و پێشکەوتووی سەلەفی جیهادی وەربگرێ. بە سەرنجدان بەم خاڵانە جەنابت داهاتووی ئەنسار چۆن پێشبینی دەکەیت؟**

دەربارەی وتەکانی ئەبوو عومەر بەغدادی کە وتووتانە نەمانبیستووە، قسەیەکم نییەو خوێنەران ئەتوانن هەم سیدییەکەی و هەم نووسراوەکەی لە ئەنترنێتدا بدۆزنەوە. بە نیسبەت ئەوەیشەوە کە پرسیوتانە داهاتووی ئەنسار چۆن پێشبینی دەکەم پێویستە بڵێم پێشبینیکردنی داهاتووی رێکخراوێکی سەلەفی جیهادی وەك ئەنسار و تەنانەت هەموو بزووتنەوەی سەلەفییەت کارێکی دژوارە بە تایبەت بۆ کەسێك کە لە زینداندایەو دوورە لە واقیعەکان ئەم کارە دژوارترە. ئینجا داهاتووی ئەنسار ئەوەندەی پێوەندیی بە رابردووی ئەم رێکخراوەو بەرنامەو پلانەکانیەوە هەیە ئەوەندەیش پێوەندیی بە ئاڵوگۆڕە جیهانی و ناوچەییەکانەوە هەیەو ئەو شتانەی کە لە داهاتوودا روو ئەدات. بەڵام ئەگەر زەمینە بۆ بەرەوپێشچوونی سەلەفییەکان هەروا بەردەوام بێت و ئەنساریش بەوجۆرەی کە تا ئێستا هاتووە درێژە بە کار و چالاکییەکانی خۆی بدات بێگومان لە داهاتوودا لە هەموو رووییەکەوە بەرەوپێشچوونێکی زیاتر بە خۆیەوە ئەبینێ. بە تایبەت ئەوەی کە شێوازی کاری ئەم رێکخراوە شێوازێکی بە بەرنامەیەو لە خوێندنەوەو لێکدانەوەی ورد و دروستی رووداو و ئاڵوگۆڕەکانەوە سەرچاوە ئەگرێ. ئەوەندەی من ئاگادارم تا ماوەیەك پێش ئێستا کە بەرپرسان و ئەندامانی ئەنسار کەمتر لە لایەن دەسەڵاتی ئێرانیەوە تووشی گیران و زیندانی کران ئەهاتن، توانیبوویان لەو هەلومەرجە لەبارەدا کە تیایدا بوون بە باشی پلان و بەرنامەکانیان بخەنە قۆناغی جێبەجێکردنەوە بەڵام پێم وایە لەم دواییانەدا بە گیرانی ئەندامانی ئەم رێکخراوە تا رادەیەك ساحەکە لەوان تەنگ کراوەتەوەو ئیتر ئەوان ناتوانن وەکوو جاران کارەکانیان بەرێوە بەن. هەرچەند گیرانی ئەندامانی ئەنسار لە لایەن ئێرانەوە لە چەند ساڵ لەمەوپێشەوە دەستی پێکردووە بەڵام لەم دواییانەدا زەخت و گوشارەکان بۆسەر ئەوان روو لە زیاد بوونەو رەنگە بەردەوامبوونی ئەم حاڵەتە کاریگەری نیگەتیڤ لە سەر کار و چالاکییەکانی ئەوان دابنێت. جگە لەمەو سەرەرای ئەو خاڵە بەهێز و پۆزەتیڤانەی باسم کرد، رێکخراوی ئەنسارولئیسلام خاوەن هەندێ کێشەو گرفتە کە ئەگەر بیر لە چارەسەرکردنیان نەکرێتەوە ئەوا ئەم رێکخراوە لە داهاتوودا تووشی کێشەو گرفتی گەورەتر ئەبێتەوە. یەکێك لەو گرفتانەی کە من بە گرفتی سەرەکی ئەنسارولئیسلامی ئەزانم دوورەپەرێزی و خۆ بە جیاگرتنی ئەم رێکخراوەیە لە رێکخراوە سەلەفی جیهادییەکانی تر و ئەوەی کە ئەندامانی ئەنسار کار و کردەوەی رێکخراوەکانی تر بە کەمتر لە کار و کردەوەی خۆیان ئەزانن بە تایبەت لە بواری شەرعی و تێگەیشتن لە بابەتە دینییەکاندا. هەرچەند لەوانەیە ئەم حاڵەتە لە ناو بەرپرسانی سەرەوەی ئەنساردا نەبینرێ یان لە ناو ئەواندا کەمرەنگتر بێ بەڵام جێی حاشا کردن نییە کە لە ناو بەشی زۆری ئەندامانی رێکخراوەکەدا هەیەو بە ئاشکرایش باسی لێوە ئەکرێت. هەروەها ئەگەر هەندێ کەس و هەندێ رێکخراوای سەلەفی جیهادی پێیان وابێ ئەنسار کەسی لەگەڵ نەماوە ئەمە قسەیەکی بێ مانایەو رەنگە لە رووی نەزانی و نا شارەزایی یاخود لە رووی بوغزیشەوە بێت، من بە بەرپرسیارییەتییەوە ئەوە ئەڵێم ئەگەر ئەنسار بۆ خۆی بیویستایە، ئەوا هەم لە عێراق و هەم لە ئێران و هەم لە شوێنەکانی تریشدا زۆر زووتر لەمە قەبارەیەکی گەورەتری وەردەگرت و خەڵکانێکی زۆرتری لەگەڵ ئەکەوت بەڵام ئەم

ڕێکخراوە هەر لە سەرەتاوە بەرنامەی بۆ خۆ قەبەکردن لە رووکەش و رووالەتدا نەبووەو زیاتر گرنگی بە مستەوای ئەندامەکانی و سوود و قزانجی گروپەکە داوەو ئەدا.
ئەنسارولئیسلام هەوڵی بەکارهێنانی زیاتری ئیمکانیاتی مۆدێرن و سەردەمیانەو تێگەیشتن و حاڵیبوون لە بەرهەمەکانی دونیای هاوچەرخ ئەداو ئەوەندەی من ئاگادارم ئەم ڕێکخراوە یەك لەو جەماعەتە سەلەفیانەیە کە بە شێوەیەکی زۆر جیدی هەوڵ ئەدا ئەوەندەی شەرع ڕێیان بدات کەڵك لە دەسکەوتە نوێیەکانی مرۆڤایەتی وەربگرێ. بە نیسبەت سەربەخۆ مانەوەی ئەم ڕێکخراوەیشەوەو ئەوەی کە ئێوە وتووتانە خۆی بە ئەلتەرناتیڤی ڕێکخراوی ئەلقاعیدە ئەزانێ، ئەتوانم بڵێم ئەوەی کە تاکوو ئێستا ئەنسار نەچووەتە ژێر سەیتەرەی ڕێکخراوی ئەلقاعیدەوە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە ئەم ڕێکخراوە پلان و بەرنامەی تایبەت بەخۆی هەیەو وای بە باش ئەزانێ بە سەربەخۆیی بمێنێتەوەو بە سەربەخۆیی کارەکانی بباتە پێش. ئیتر من نەمبیستووە ئەنسار خۆی بە جێگرەوەی ئەلقاعیدە بزانێ و کار بۆ ئەمە بکات.

**لەم ساڵانەی دواییدا دوو ڕووداوی گرنگ قەوما کە یەکیان جیابوونەوەی شێخ ئەبوو وائیل و ژمارەیەك بەرپرس و ئەندامی دیکەی ئەنسار و دامەزرانی ڕێکخراوی (جبهة المقاومة الشريف العراقيه) بوو کە لەگەڵ ئامریکاو دەوڵەتی عێراقیشدا کەوتنە وتووێژەوە. ئەوەی تریان گیرانی ئەبوو عەبدوڵڵای شافیعی ئەمیری گشتی ئەنسارولئیسلام بوو لە بەهاری ٢٠١٠دا. پێت وایە ئەم دوو ڕووداوە چ جۆر کاریگەرییەکیان لە سەر ئەنسار داناوە؟**

ئەبوو وائیل لە سەردەمی کارکردنی لە ناو ئەنسارولئیسلامدا هاوڕێیەکی زۆر نزیکی ئەبێ کە ئەویش ئەندامی ئەنسار و هەیئەی شەرعی ئەم ڕێکخراوە بووە، ئەبوو وائیل و ئەم هاوڕێیەی بەینیان زۆر خۆش بووەو زۆربەی کاتیش پێکەوە بوون. ئینجا ئەم دووانە هاوڕێیەکیان بووە بە ناوی «ابو عزام التميمي» کە ئەندامی لیژنەی شەرعی (جماعة الاسلاميه العراقيه) بووە. پاشان ئەوتریێ لە لایەن ئەمریکییەکانەوە داوا لە ئەبوو عەزام کراوە تاکوو پرۆژەیەکی ئاشتەوایی لە نێوان ئەوان واتە ئەمریکییەکان و هێزە جیهادییە عێراقییەکاندا بەدەر لە ئەلقاعیدە، ئامادە بکات و کار بکا بۆ ئەوەی دانیشتن لە نێوان ڕێبەرانی جیهادی و بەرپرسانی ئەمریکادا ساز بکات. ئەمیش بە پێی ئەو هاوڕێیەتییەی لەگەڵ ئەبوو وائیل و هاوڕێکەیدا بوویەتی، لەوانەوە دەس پێ ئەکات و بە بێ ئاگاداریی خۆیان ژمارە مۆبایلەکانیان ئەدا بە بەرپرسانی دەزگای هەواڵگری ئەمریکا لە عێراق. ئینجا ئەبوو عەزام لەگەڵ ئەمریکییەکاندا لە پێوەندیدا ئەبێ و پاشان لە کاتێکدا ئەو و ئەبوو وائیل و هاوڕێکەی تریان پێکەوە سەردانی سووریا ئەکەن، ئەمریکییەکان لە ڕێگای مۆبایلەوە پێوەندییان پێوە ئەکەن. ئەوان لە ناو ئۆتێلێکدا خەریکی حەسانەوە ئەبن کە لە ناکاو ژمارەیەکی نە ناسراو پێوەندیی بە مۆبایلەکەی شێخ ئەبوو وائیلەوە ئەکات. کاتێ ئەبوو وائیل وەڵام ئەداتەوەو، کەسی پێوەندیکەر پێی ئەڵێ من بە نوێنەرایەتی دەزگای ئیستخباراتی ئەمەریکا قسەت لەگەڵ ئەکەم و واباشە بزانی هیچ مەبەستی گرتن یاخود شتێکی خراپمان نییەو لەو ڕووەوە کە ئەتناسین و ئەزانین کێیت و چکارەیت ئەمانەوێ گفتوگۆت لەگەڵدا بکەین. بۆیە ئەبوو وائیل کە پێشتر نەك ئاگاداری ئەم شتە نەبووە بەڵکوو چاوەڕوانی شتێکی وەهاش لە ئاوا کات و ساتێکدا نەبووە، تووشی شڵەژان ئەبێ و مۆبایلەکەی دائەخات.
پاشان نوێنەرەکەی ئیستخباراتی ئەمریکا پێوەندیی بە کەسی دووهەم واتە هاوڕێکەی ئەبوو وائیلەوە دەکات و بە هەمان شێوە قسە لەگەڵ ئەویشدا ئەکاو داوای لێ ئەکا تاکوو هەم خۆی ئامادەی گفتوگۆ بێت و هەمیش قەناعەت بە ئەبوو وائیل بکات بەڵام ئەویش بە هەمان شێوەی ئەبوو وائیل تووشی شڵەژان ئەبێ و مۆبایلەکەی دائەخات. پاشان ئەوان بە مەبەستی ڕاوێژکردن لەگەڵ ئەبوو عەزام، مەسەلەکەی بۆ باس دەکەن و بڕیاری گۆڕینی شوێنەکەیان ئەدەن،

بەڵام ئەبوو عەزام تۆزێ هێوریان ئەکاتەوەو پێیان ئەڵێ من ژمارەکەتانم داوە بە ئەمریکییەکان و لە ڕاستیدا ئەوان لە سەر متمانەی من و بە مەبەستی وتووێژکردن پێوەندییان پێوە کردووە و هیچ مەبەستێکی خراپیان نییە بۆیە پێویست بە شڵەژان و نیگەرانی ناکات. ئەوان بە هۆی ئەم کارەیەوە گلەییەکی زۆر لە ئەبوو عەزام دەکەن و ڕەتی هەرجۆرە وتووێژو دانووستانێك لەگەڵ ئەمریکییەکان ئەدەنەوەو بەرەو پاشان بەرەو جێگایەکی تر ئەڕۆن.

پاش تێپەڕینی ماوەیەکی زۆر بە سەر ئەم ڕووداوەدا، شێخ ئەبوو وائێل و هاوڕێکەی لە لایەن ئەمریکییەکانەوە دەستگیر دەکرێن و پێیان ئەڵێن مەبەست لە گرتنی ئێوە سزادان و هێشتنەوەتان نییە لەناو زینداندا بەڵکوو پێوەندیی بە هەمان ئەو بابەتەوە هەیە کە پێشتر بە تەلەفۆن پێشنیارمان پێ کردن بەڵام ئێوە ترسان و ڕەتتان کردەوە. بۆیە هیچ هەست بە گیراون و ئەسارەت مەکەن چونکوو ئێمە ئازادتان ئەکەین تاکوو لەگەڵ سەرکردەکانی جیش المجاهدین، جیش الاسلامیە، جیش الانصار السنەدا قسە بکەن و پێشنیاری ئاشتەوایی ئێمەیان پێ ڕابگەیەنن و ئامادەی وتووێژ و دانووستانیان بکەن. لەسەر ئەم ڕاسپاردەو پێشنیارە ئەبوو وائێل و هاوڕێکەی ئازاد ئەکرێن و ئەمەش جۆرێك هەستی بەدواداچوون لە ئەواندا دروست ئەکاو ئەوان بڕیار ئەدەن لەگەڵ ئەو لایەنانەدا قسە بکەن و پێشنیاری ئەمریکاییەکانیان پێ بگەیەنن. ئەنسارولسوننە پێش گروپەکانی تر ئەم داواکارییە ڕەت ئەکەنەوەو سەرباری هەوڵی زۆری ئەبوو وائێل و هاوڕێکەی ئامادەی دانوستان و وتووێژ لەگەڵ ئەمریکاییەکان نابن. هەروەها دوو گروپەکەی تریش وەڵامی نە بە داواکارییەکە ئەدەنەوەو ئەبوو وائێلیش لە ڕێگای ئەو کەسانەوە کە دیاری کرابوون، نەتیجەکە ئەنێرێتەوە بۆ ئەمریکییەکان. دواتر کاتێ ئەبوو وائێل ئەبینێ ئەمریکاییەکان سوورن لە سەر کارەکەیان، پەیامیان بۆ ئەنێرێ و پێیان ئەڵێ ئەتوانن لە ڕێگای یەکێك لە دیلەکانی بەردەستتانەوە کە ناوی حاجی عەبدولحەمیدەو جێگری ئەبوو عەبدوڵڵا شافیعییە، کارەکەتان ببەنە پێش. ئەڵێ دەلیلیشم ئەوەیە کە قسەی ئەو هەم لە ناو ئەنساردا و هەمیش لە لایەن ئەمیری ڕێکخراوەکەوە باشتر وەردەگیرێ. بۆیە ئەمریکییەکان لە سەر ئەو پێشنیارەی ئەبوو وائێل، وەك میوانێك قسە لەگەڵ حاجی عەبدولحەمیددا ئەکەن و پەیامی ئاشتەواییەکەی خۆیانی پێ ئەگەیەنن. ئەویش پێیان ئەڵێ کە ئەم کارە بە تەنیا من ناکرێ و پێویستە هەموو ئەو سەرکردانەی ئەنساری لێ ئاگادار بکرێتەوە کە لە ئەسارەتدان تاکوو بتوانن بە ڕاوێژکردن لەگەڵ یەکتر بڕیارێکی حەکیمانە بدەن. ئەمریکییەکان پێشنیارەکەی ئەو قبووڵ ئەکەن و سەرجەم سەرکردە گیراوەکانی ئەنسار لە شوێنە جیاجیاکانەوە دێنن و لە جێگایەکدا کۆیان ئەکەنەوە کە ئەوەندەی من بیستوومە جگە لە خودی حاجی عەبدولحەمید، مامۆستا ئاسۆ هەولێری، مامۆستا هەڵگورد، کاك ئەیوب ئەفغانی (هەولێری)، کاك موحەممەد حەسەن، ئەبوو حارس و چەند سەرکردەیەکی عەرەبی ئەنسار، بەشداری کۆبوونەوەکە بوون. ئەوان لەو ماوەیەدا کە بۆیان دیاری کرابوو، دەست ئەکەن بە هەڵسەنگاندنی پێشنیارەکەی ئەمریکاو لەمبارەیەوە قسە لەگەڵ یەکتردا ئەکەن و پاشان بە ئەمریکییەکان ئەڵێن ئەگەر ئەتانەوێ بگەنە ئەنجام پێویستە هەموومان ئازاد بکەن تاکوو لە دەرەوە بە ئازادی بەدواداچوون بۆ ئەم کارە بکەین. ئەمریکییەکان ڕازی بە ئازادکردنی هەموویان نابن کە ژمارەیان ١١ یا ١٢ کەس بووە بەڵام پێیان ئەڵێن ئامادەین سێ کەستان ئازاد بکەین بۆیە پێویستە لە ناو خۆتاندا ساغ بنەوە لەسەر ئەو سێ کەسەو خۆتان سێ کەس دەستنیشان بکەن بۆ ئەوەی ئازادیان بکەین. ئەوانیش لە ناو خۆیاندا سێ کەس دیاری دەکەن و پاشان ئەو سێ کەسە کە یەکێکیان حاجی عەبدولحەمید بووە، ماوەیەك پاش ئازاد کرانیان وەڵامی نەی قیادەی ئەنسار ئەنێرنەوە بۆ ئەمریکاییەکان و ئیتر لێرەدا ئەم هەوڵەش بە نیسبەت ئەنسارەوە کۆتایی پێ دێت. دواتر کاتێ حاجی عەبدولحەمید و ئەبوو وائێل لە لایەن سوپای ئەمریکاوە دەستگیر ئەکرێنەوە، ئەبوو وائێل بە شێوەیەکی جیدی لەگەڵ سەرکردەکانی دوو ڕێکخراوەکەی تر واتە جیش المجاهدین و جیش الاسلامیدا پێوەندیی ئەگرێت و ئامادەیان ئەکات بۆ دروستکردنی (جبهة المقاومة الشريف العراقية). هەروەها پاش ئەوەی ئەبوو وائێل لە لایەك لەگەڵ ئەنساردا ناگاتە ئەنجام و لە لایەکی ترەوە سوور ئەبێ لە سەر بەدواداچوونی پێشنیاری ئەمریکییەکان، ئیتر ئەنسار وەك

کەسێکی دابڕاو و جیابووەوە حیسابی بۆ نەکەن. بۆیە ئەو و ئەبوو عەزامیش بە ناوی جەبهەی مەقاوەمەی شەریفەی عێراقەوە بڵاوکراوەیەك دژی سەرکردەکانی ئەنسار دەرئەکەن و ئەنساریش دوو نووسراوەو روونکردنەوە بڵاو ئەکاتەوە کە تیایاندا لە زمان سەرکردەکانی ڕێکخراوەکەوە باسی کەسایەتی ئەبوو وائیل و پێشینەو سەربوردەی ئەو کرابوو. مەبەست لە بڵاوکردنەوەی ئەم دوو نووسراوەیە شکاندنی کەسایەتی ئەبوو وائیل و کەمڕەنگ کردنەوەی دەوری ئەو بوو لەناو ئەنسارولئیسلام و ئەنسارولسوننەدا.

دەربارەی دەستگیرکرانی ئەبوو عەبدوڵڵای شافیعی یان هەمان حەسەن بن مەحموود یاخود ئەبوو عومەری سەردەمی ئەنسارولسوننە، کاتی گیرانی ئەو – ئەگەر گیرانەکەی ڕاست بێ– من ماوەی چەند مانگ بوو لە ژووری ئینفرادیدا بووم بۆیە هێشتا لە گیرانەکەی دڵنیا نیم و تەنیا هەواڵەکەییم بیستووە. جا ئەگەر ئەم هەواڵە ڕاست بێ و ئەبوو عەبدوڵڵا دەستگیر کرابێ بێگومان کاریگەری نیگەتیڤی لەسەر ڕێکخراوەکە ئەبێ بەڵام ئەم کاریگەرییە تا چەند ئەنسارولئیسلام تووشی کێشەو گرفت ئەکات ئەوە پێوەندیی بە خودی ڕێکخراوەکەو ئەو داهاتووەوە هەیە کە لە بەردەمی دایە. بە پێی ئەو ئاشنایەتییەی من لەگەڵ ئەنساردا هەمە ئەتوانم بڵێم گیرانی کەسێکی وەك ئەبوو عەبدوڵڵا بۆ ئەوان کوتوپڕ و لە ناکاو نەبووەو بێگومان لە پێشترەوە خۆیان بۆ ئامادە کردووە هەروەك چۆن چەندین سەرکردەی تری ئەم ڕێکخراوە پێشتر هەر بەم شێوەیە دەستگیر کراون. بەڵام ئەوەی کە ئەم گیرانە لەگەڵ گیرانەکانی تردا جیا ئەکاتەوە ئەوەیە کە ئەمجارەیان کەسێك دەستگیر کراوە کە لە سەرەتای دامەزرانی ئەنسارولئیسلامەوە کەسی یەکەم بووەو جگە لە ماوەی ئەو یەکساڵ و چەند مانگەی سەردەمی ئیمارەتی بیارە کە جێگری مامۆستا کرێکار بوو ئیتر لەوە بە دواوە بە تایبەت لە قۆناغی دژواری پاش داگیرکرانی عێراقدا، کەسی یەکەمی ئەنسار بووەو توانیویەتی بە شێوەیەکی باش ڕێکخراوەکە هیدایەت بکات. بۆیە ئەو لە ماوەی چەندین ساڵ ئەمیرایەتیکردنی ئەنسارولئیسلامدا ئەوەندە قاڵ بووبوو کە ئامادە بوو بە خیبرەییەکی کەموێنەوە ئەم ڕێکخراوە بەرەو داهاتوویەکی گەشتر ببات. بێگومان کەسێکی ئاوا ئەوەندە قوتابی و دەسپەروەردەیشی هەیە کە بتوانن پاش ئەو جێگاکەی پڕ بکەنەوەو ئەمیرایەتی ڕێکخراوەکە بکەن.

**لە کاتی ئەنجامدانی ئەم وتووێژەدا هەواڵی کوژرانی سێ سەرکردەی جیهادیمان بیست، ئۆسامە بن لادنی دامەزرێنەر و شێخ لویس عەبدولڕەحمان عەتییەی گەورە بەرپرسی قاعیدەو دواجار تەحسین عەلی عەبدولعەزیزی ئەمیری ڕێکخراوی سەلەفی جیهادی ئەحفاد سەلاحەدین و یەك لە جیهادییە ناسراوەکانی کوردستان. بەڕای تۆ کوژرانی ئەم کەسانە تا چەند کاریگەری لە سەر سەلەفییەتی جیهادی ئەبێت؟ بە تایبەت کوژرانی شێخ ئۆسامە کە جێگەو پێگەی لەناو سەلەفییەتی جیهادیدا پێویستی بە شیکردنەوە نییە. ئایا پێت وانییە ئەم ڕووداوانە لە درێژخایەندا ئاسەواری نیگەتیڤ لە سەر ڕێکخراوی قاعیدەو باڵی نوێی ئیسلامخوازی دائەنێ؟ بۆچی لەم ساڵانەی دواییدا دیاردەی کوژران و دەستگیرکردنی ڕێبەرانی جیهادی ئاوا پەرەی سەندووەو بەڕای تۆ هۆکارەکەی لە چیدایە؟**

کوژرانی سەرکردە سەلەفی جیهادییەکان یان دەستگیرکرانیان شتێکی ئاساییەو تاکوو ئێستا چەندین ئەمیر و گەورە سەرکردەی ڕێکخراوە سەلەفی جیهادییەکان شەهید بوون یان ڕووبەڕووی گیران و زیندان بوونەتەوە. ئینجا لە کاتی ئەو شەڕ و جیهادە جیهانییەدا کە ماوەی چەند دەیەیەکە دەستی پێ کردووە، چەندین گەورە بەرپرس و خەڵکی دەسەڵاتداری وڵاتان و دەوڵەتانی دژبەری سەلەفییەتی جیهادی و ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە لایەن سەلەفییەکان و جیهادییەکانەوە کوژراون کە ئەتوانم وەك نموونە ئاماژە بە ئەنوەر سادات، ئەحمەد قەدیرۆف، بێنەزیر بۆتۆ، ئەحمەد شاە مەسعوود و لە کوردستانی عێراقیشدا فرانسۆ حەریری، شەوکەتی حاجی موشیر، سامی عەبدولڕەحمان و سەعد

عەبدوڵڵا بکەم. بۆیە سەیر نییە لە بەرانبەریشدا سەرکردە سەلەفییەکانی وەك شێخ ئوسامە بن لادەن، ئەبوو مەسعەب زەرقاوی، شێخ عەبدوڵڵا عەزام، ئەبوو ئەنەسی شامی، ئەبوو عومەر بەغدادی، ئەبوو حەمزەی موهاجیر، عەلی وەلی، ئەبوو لەیسی لیبی، موستەفا ئەبوو یەزید، لوویس عەتییە، حاجی تەحسین عەبدولعەزیز، عەبدوڵڵا خەلیفانی، ئەبوو تەییر، حەسەن سۆفی، کامەران مۆریاسی، ئەبوو بەسیری تەوحید و دەیان سەرکردەی تری سەلەفی جیهادی شەهید بن. ئەمە جگە لەو ژمارە زۆرە سەرکردەیەی کە لە ماوەی ساڵانی رابردوودا لە لایەن وڵاتان و دەسەڵاتە جۆراوجۆرەکانەوە دەستگیر و راپێچی زیندانەکان کراون.

بەرای من شەهیدبوون و دەستگیرکرانی سەرکردە سەلەفی جیهادییەکان ناتوانێ کاریگەرییەکی وەها لە سەر گرووپ و رێکخراوەکان و رەوتی سەلەفییەتی جیهادی بە گشتی دابنێ کە نەتوانن درێژە بە جیهاد بدەن و نەتوانن بەردەوام بن لە کار و چالاکی دژی دوژمنانی ئیسلام. هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە بە ئاستی یەکەم بزووتنەوەی سەلەفییەتی جیهادی بە پێچەوانەی سەردەمی کۆن ئێستاکە لە جوگرافیایەکی پان و بەربڵاودا خەریکی جیهادە، بە ئاستی دووهەم ئەم بزووتنەوەیە پشتیوانییەکی بەرینی جەماوەریی لە پشتە کە ئامادەیە بە هەموو شێوەیەك یارمەتی بزووتنەوەکە بدات، بە ئاستی سێهەمیش بزووتنەوەی سەلەفییەتی جیهادی چارەنووسی خۆی بە یەك یان چەند کەسێکەوە گرێ نەداوە کە ئەگەر ئەوان گیران یاخود کوژران ئیتر بزووتنەوەکەش تووشی نسکۆ بێ و توانای مانەوەی لە مەیداندا نەمێنێ. ئێستا ئیتر ئەو سەردەمە نییە کە (طليعه المقاتلـه)ی تیادا سەرکوت کرا. واتە راپەڕینی ئیخوانەکان دژی دەوڵەتی بەعسی سووریا لە ساڵی ١٩٨٤دا کە زۆر بە توندی لە لایەن رژێمی حافز ئەسەدەوە سەرکوت کراو موسوڵمانانی تیادا قەڵاچۆ کراو کەسیش نەبوو بە دەم هاواری ئەوانەوە بچێت. خۆتان ئەزانن ئەو هەلومەرجەی ئێستا بەشار ئەسەدەی لەق و لۆری تێ کەوتووە قورساییەکەی بە سەر شانی موسوڵمانانەوەیەو رەنگە بەشار ئەسەد لە داهاتوویەکی نزیکدا وای بەسەر بێ سەد خۆزگە بە سەدام حسەین بخوازێ کە بە ساغ و سەلامەتی دەستگیر کراو بە پێی خۆی بەرەو پەتی سێدارە چوو.

ئێستا ئیتر هەموو شوێن و ناوچەو وڵاتێك وەك ئەفغانستانی سەردەمی ئەیام ئەلروسی لێهاتووەو سنوورێك لە نێوان موسوڵماناندا نەماوەو موجاهیدین بە زووترین کات ئەگەنە لای یەك و بە دەم یەکترەوە ئەچن و یارمەتی یەکتر ئەدەن. ئیتر نۆرەی ئەوەیە موسوڵمانان لە چەوسانەوەو ژێردەستەیی نەجاتیان بێ و هەناسەیەکی سەربەرزانە هەڵبکێشن. وەك هەموولایەك دەزانن لەم سی ساڵەی رابردوودا ئەهلی ئیسلام راچڵەکانێکی دیار و بەرچاوی بەخۆیەوە بینیوەو گەلێك زنجیری کۆیلەیی و ژێر چەپۆکی لە خۆی داماڵیوەو قۆناغێکی زۆرباشی بووژانەوەی دەستپێکردووە. ئەم جارەیان رابوونەکە جیدی و دەوڵەمەند و بەربڵاوەو بەڵام بە هەمان ئاستیش دوژمن و نەیارەکانی هەوڵی لەناوبردنی ئەم رابوونە ئەدەن. ئەوەی موجاهیدینی ئیسلام لە ماوەی ئەم سی ساڵەدا کردوویانە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە رابوونی ئەمجارە ئەهلی تەسلیم بوون و لەناوچوون نییەو بە پێچەوانەوە ئەیەوێ دوژمنان تەسلیمی خۆی بکاو شەریعەتی ئیسلام بکاتە تاکە یاسای بەڕێوەبردن لە وڵاتانی ئیسلامییدا.

وەك برگەی کۆتایی پێم خۆشە باسی ئەوە بکەم کە ئەو زیان و زەرەر و شکستانەی –ئەگەر بە زەرەر و زیان و شکستیان دابنێین– لە ماوەی ئەم چەند ساڵەی جیهاددا موسوڵمانان و بزووتنەوەی سەلەفییەتی جیهادی تووشی هاتوون بە هیچ جۆر لەگەڵ شکست و سەرشۆڕییەکانی دوژمنانی ئیسلامدا بەراورد ناکرێت چونکوو لە لایەك شکست و زیانەکانی ئەوان بێشومار و زۆر زیاترەو لە لایەکی تریشەوە بۆ ئێمەی موسوڵمان شەهیدبوون و هیجرەت و دەربەدەری لە پێناو دینەکەماندا نەك مانای شکست و زیان نادا بەڵکوو ئەمە جێگای خۆشحاڵییەو سەرکەوتنی گەورەیە بۆ هەر تاکێکی موسوڵمان.